# ئیـســـلام و

# دەوڵەتداریی

بەرگی دووەم

تەوەری دووەم

## بنەمایەکانی سیستەمی حوکمڕانیی لە ئیسلامدا

عەلی باپیر





# ئیسلام و دەوڵەتداریی بەرگی دووەم


نوسینـــــــــــی: عەلی باپیر

بڵاوکردنــــــــەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر

خـــــــــەت: نەوزاد کۆیی

نەخشەســــــــازی: أمين مخلص

نــۆرە و ســاڵی چـاپ: یەکەم ١٤٣٦ك - ٢٠١٥ز

تـــــــــــیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپیاردنی ( ٢٦١٢ ) ساڵی ٢٠١٣ پێدراوە







نوسینگەی تەفسیر

بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس

Mob: +964 750 460 51 22

Tel: +964 750 818 08 66

www.tafseer-pub.com

tafseeroffice@yahoo.com

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ
لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَنزَلۡنَا ٱلۡحَدِيدَ ....﴿٢٥﴾﴾ الحديد

# پێشکەش بێ

بەهەموو ئەوانەی هێندە لەئیسلام تێگەیشتوون، کە دڵنیا بن، بەبێ هەبوونی دەستە و قەوارەیەکی سیاسیی، ناگونجێ وەك بەرنامەی گشتگیری ژیانو گوزەرانی تاكو کۆمەڵ جێبەجێ بکرێو، هەتا باڵا دەست نەکرێ، بۆی نالوێ، وەك درەختێکی پڕ سێبەری بەپیتو فەڕ، سەرجەم پێکهاتەکانی کۆمەڵگا لەبن سێبەری خۆی بگرێو، بەرو میوەی تەباییو ئازادییو یەکسانییو دادگەرییو، بەختەوەریی دنیاو سەرفرازیی قیامەتیان بۆ بگرێ.

# ناوەرۆك

# پێناسەی ئەم كتێبە

خوێنەری بەڕێز!

ئەم كتێبە كۆی پەنجاو شەش (٥٦) ئاڵقەی: ((بەرنامەی سەرنج))ە، كە لە كەناڵی ئاسمانیی پەیام‌و لەماوەی ساڵانی: (٢٠١٠و٢٠١١ز)دا هەفتانە پەخش دەكرا، كە دیارە پاش هێنرانە سەر كاغەزو تایپ كرانیان، ئەو پەنجاو شەش وتارە، خۆیان لەدوو توێی ئەم كتێبەدا بینیوەتەوە.

شایانی باسیشە ئەم كتێبە بەگشتیی بۆ چوار تەوەری سەرەكیی دابەش دەبێ:

**تەوەری یەكەم:** قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەكانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت‌و بناغەی فیكریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك.

كە دیارە ئەم تەوەری یەكەمە، وەك ڕێ خۆشكردن وایە بۆ سەرجەم باس‌و بابەتەكانی دیكەی ئەم كتێبە، كە لەسێ تەوەرەكەی دیكەدا دێن.

**تەوەری دووەم:** بنەماكانی سیستەمی حوكمڕانیی لەئیسلامدا:

شایانی باسیشە ئەم تەوەرەیە گرنگترین‌و گەورەترین تەوەری ئەم كتێبەیەو زۆرترین پانتایی بەركەوتوەو، بەدرێژیی قسە لە دە (١٠) بنەمای گەورەو گرنگی سیستەمی حوكمڕانیی ئیسلامیی (أسس نظام الحكم الإسلامي)دەكات.

**تەوەری سێیەم:** سێ دەسەڵاتەكانی: یاسادانان، جێبەجێكردن، دادوەریی لە قەوارەیەكی سیاسیی ئیسلامییدا:

لەم تەوەری سێیەمەدا تیشك دەخەینە سەر هەرسێك پێكهێنەرە سەرەكییەكەی دەوڵەت‌و قەوارەی ئیسلامیی، وەك:

١- دەسەڵاتی یاسادانان (السلطة التشريعية).

٢- دەسەڵاتی جێبەجێكردن (السلطة التنفيذية).

٣- دەستەڵاتی دادوەریی (السلطة القضائية).

**تەوەری چوارەم:** نامسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا:

لەم تەوەری چوارەمو کۆتایی ئەم کتێبەدا، لەبارەی چۆنیەتی مامەڵەکردنی کۆمەڵگاو قەوارەی ئیسلامیی لەگەڵ نامسوڵمانێك، کە لەژێر سایەیاندا دەژینو هاووڵاتیان، دەدوێین.

هەرلێرەشەوە بەپێویستی دەزانم سوپاسو پێزانینی پڕ بەدڵی خۆم پێشکەشی سەرجەم ئەو برا دڵسۆزانەم بکەم، کە ئەرکو ماندووبوونی زۆریان بەم کتێبەوە کێشاوە، خوا بە باشترینو چاکترین شێوە پاداشتیان بداتەوەو نموونەیان زۆر بکات، بەتایبەت:

١- **کاك (هیواحاجی نجم الدین)**، کە مشوور خۆرێکی باش بوو بۆ سەرپەرشتیکردنی کاروباری هێنرانە سەر کاغەزو تایپ کرانی بەرنامەکان.

٢- **کاك (یعقوب کاکل)** کە زۆربەی ئەرکی تایپکرانی بەرنامەکانی خستە سەرشانی خۆی.

٣- **کاك (مەلا بیلال قەڵادزەیی)**، کە ئەرکی پێداچوونەوەی سەرجەم بەرنامەکانی پاش تایپکرانیانی بەئەستۆوە گرتو کارئاسانییەکی باشی بۆ کردم.

٤- **کاك (قاسم سلام)**، کە پاش پێداچوونەوەی خۆم، ئەرکی هەڵە ڕاستکردنەوەی سەرجەم بەرنامەکانی کێشا.

سەرچاوەکانی ئەم کتێبەشم بەهەرچوار تەوەرەکەیەوە، پاش قورئانو سوننەتو سیرەو ژیانی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئەو کتێبانەن کە هەوڵمداوە هەرشتێکم لێوە هێنابن ئاماژەیان پێبکەمو لەپەراوێزدا دەیاننوسین.

لە کۆتایی پێناسەی ئەم کتێبەشدا دەڵێم:

ئەم کتێبە بەرهەمی چەند ساڵێك تێفکرینو موتاڵاو لێکۆڵینەوەیەو، هیوادارم بەوردییش بخوێندرێتەوەو فام بکرێو بەهرەی لێوەربگیرێ، هەروەها بابەتیانەش لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێو، بەهەمووڵایەکیش هەوڵی پراکتیزە کردنو جێبەجێکردنی نێوەڕۆکەکەی بدرێ.

ئاشكراشە كە بابەتی دەوڵەتداریی‌و حوكمڕانیی، گرنگترین‌و هەستیارترین بابەتە لەژیانی مرۆڤـــدا بەگشتیی‌و، كاریگەریی لەسەر تێكڕای لایەنەكانی دیكەی ژیان‌و گوزەرانی تاك‌و كۆمەڵ هەیەو، جووڵاوترین‌و زیندووترین بابەتیشەو زۆرترین گۆڕان‌و نوێبوونەوەی بەسەردادێ، بۆیە پێویستە هەموولایەكمان بەتەواویی چاو و گوێی عەقڵ‌و دڵمان لەتەك ئەو بابەتە گرنگ‌و هەستیارەدا بكەینەوە، چونكە ئەگەر وانەكەین‌و وانەبین، هەرچی زیاتر دینمان لەژینمان بەجێ دەمێنێ!

ماوەتەوە بڵێم:

هەرچەندە ناوونیشانی زنجیرە وتارەكەی بەرنامەی (سەرنج) بریتیی بوو لـە: {ئیسلام‌و دەوڵەتداریی‌و حوكمڕانیی} بەڵام ناو و نیشانی كتێبەكەمان بەمەبەستی كورتكردنەوە بەمجۆرە لێكرد: **((ئیسلام‌و دەوڵەتداریی))**.

خوایە! بەم كتێبە خوێنەرانی بەڕێز بەهرەمەندو بەرچاو ڕوون بكەو، تا تەرازووی خێرو چاكەكانی بەندەشی لەقیامەتدا پێ قورس بكە.

ئامین

٢٣/ ڕەجەبی/ ١٤٣٤ كۆچی
٢/حوزەیرانی/٢٠١٣ زایینی
هەولێر

## پێشەکی:

الْحَمْدُ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُه، وَنَعُوذُ باللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب.

أَمَّا بَعْدُ: فإِنَّ أَصْدَقَ الحَديث كَلامُ الله وَخَيْرَ الْهَدِي هدْيُ مُحَمَّد "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّار[1] .

---

[1] - ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەکرد، پێش هەر قسەیەکی گرنگ بیڵێن، وەك وتاری جومعە و داخوازیکردن (خِطْبة)و .. هتد، وە ئەم وتارە هەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، والنسائي: (١١٠٤)، وابن ماجه: (١٨٩٢) وأحمد: (٣٧٢٠)، وطبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێکی هێناوە.

**خوێنەری بەڕێزو سەنگین !**

ئەمە تەوەری دووەمە لە چوار تەوەرەكەی بابەتی فراوانی: ئیسلام و دەوڵەتداریی، كە لەم بەرگی دووەمەدا خۆی دەبینێتەوە.

شایانی باسیشە ئێمە لەبارەی كۆی تەوەر و باسەكانی ئەم بابەتی (ئیسلام و دەوڵەتداریی)یەوە، لە بەرگی یەكەم (پێشەكی)یەكی تێروتەسەلمان نووسیوەو ئەوەی لەوێ گوتوومانە بۆ سەرجەم تەوەر و بەرگەكانەو لێرە دووبارەی ناكەینەوە.

بەڵام بەنیسبەت ئەم بەرگەوە دەڵێم:

ئەم بەرگی دووەمە، كە تەوەرەی دووەمی گرتۆتە خۆی، لەڕووی نێوەڕۆكەوە، لە هەموو بەرگەكان گرنگترە، چونكە دە (١٠) بنەما گەورەو گرنگەكانی سیستەمی حوكمڕانیی ئیسلامیی گرتوونەتە خۆی و، گەلێك باسی گرنگی تێدا خراونە ڕوو، كە دوایی بۆ چاكتر تێگەیشتنی تەوەری سێیەم: (سێ دەسەڵاتەكان..) و تەوەری چوارەم (نا مسوڵمانان لە كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیدی دا) پێویست دەبێت.

بۆیە پێویستە گرنگیی پێویست و شایستە بە تێگەیشتن و هەزم كردنی بدرێ.

سبحان ربك رب العزة عما يصفون، وسلام على المرسلين
والحمدلله رب العالمين

٢/ جمادی الاولی/ ١٤٣٥ی كۆچی
٣ی مارتی/ ٢٠١٤ زایینی
بەغداد – ئەنجوومەنی نوێنەران

**خوێنەری بەڕێز!**

ئەوەندەی سەرنجی قورئـان وسـوننەتم داوەو لـە کەلـەپووری زانایـان وردبوومەوە،کـە هەڵبەتە تەنیا قورئـان و سـوننەت وەك هەمیشـە تەئکیـدمان کردۆتـەوە، دینیـان تێـدا بەرجەستەیەو ئیجتیهاد وتێگەیشتنی زانایـان، بـەس بـە ڕوونکردنـەوەی دیـن دادەنـرێ ئەوەی کە وەك دین بۆئێمە پابەندکـەر (ملـزم)ە، تـەنیا قورئـان و سـوننەتە، ئنجـا مـن ئەوەندەی، کـە سـەرنجی قورئـان وسـوونەتو کەلـەپووری زانایـانم داوە، (١٠) بنـەمای گشتییم هاتوونە بەرچاو، کەپێم وایە سیسـتـەمی حـوکمڕانیی ئیسـلامییو دەوڵەتـداریی لەئیسلامدا، لە سەرئەو دە (١٠) بنەمایە بەندە :

بنەمای یەکەم: سەروەریی باڵاو ڕەها هی خوا و شەریعەتەکەیەتی.

بنەمای دووەم: دەستەڵات، هی خەڵکە.

بنەمای سێ یەم: ملکەچیی هەموولایەك بۆدەستورو یاسا.

بنەمای چوارەم : ڕاوێژ بنەمای هەمووکارەکانە.

بنەمای پێنجەم: دادگەریی گشتگیر.

بنەمای شەشەم: یەکسانیی ڕەها.

بنەمای حەوتەم: دابین کردنی ماف و ئازادییەکان بۆهەموو تاکەکان.

بنەمای هەشتەم: فەرمانبەریی لەسنووری چاکەدا(الطاعة في المعروف).

بنەمای نۆیەم: چاودێریی کردنی کاربەدەستان وڕاست کردنەوە و لێپرسینەوەیان.

بنەمای دەیەم و کۆتـایی: پابەنـدیی بەئـەدەبو ڕەوشـت و بـەها بەرزەکانـەوە، واتـە پابەندیی هەرکام لە حوکمڕانو کاربەدەستان و،خەڵك وکۆمەڵگاش.

وشەی (سەروەریی) بەعەرەبی پێی دەڵێن: (السیادة) یاخود (الحاكمیة)، جا ئێمە پێویستە سەرەتا تیشك بخەینە سەر چەمكو واتای وشەی سەروەریی ( السیادة)، كە ئایا لەلای زانا و شارەزایانی بواری یاساو، بەتایبەت یاسای دەستووریی، چی دەگەیەنێ؟ بۆچیش دەڵێن: سەروەریی باڵای ڕەها (السیادة العلیا المطلقة)؟

دیارە دواتر پاش ئەوەی، كە لەلای شارەزاو پسپۆڕانی یاساو دەستوور سەرنجی چەمكو واتای ئەو وشەیە دەدەین، ماشادەكەین داخۆ لەبەر ڕۆشنایی ئایەتاكانی خوای پەروەردگاردا، چۆن باسی ئەو سەروەرییە كراوە، كە بێگومان سەروەریی باڵاو ڕەها، تەنیا بۆ خوا "سبحانە وتعالى" و بۆ شەریعەتی خوایە، لەدەوڵەتێكدا وە لەقەوارەیەكی سیاسییدا، كە بە ئیسلامیی ناوزەد دەكرێت و شەریعەتی خوای تێداپیادە دەكرێت.

وشەی سەروەریی (السیادة) مەبەست پێی دەستەلاتی هەرە باڵایە لەدەوڵەتدا، (بلنتشلی) كەیەكێكە لە پسپۆڕان لەو بوارەدا، بەم جۆرە پێناسەی سەروەریی دەكات، دیارە لەئەسڵدا بەزمانێكی بیانیی گوتوویەتی، بەڵام من تەرجەمە عەرەبییەكەیم خوێندۆتەوە، دەڵێ: (كل سلطة تملك إصدارَ القرار النهائي) واتە: هەردەستەلاتێك، كە بڕیاری كۆتایی بەدەست بێ، هەردەستەلاتێك بڕیاری كۆتاییو قسەی یەكلایی كەرەوەی بەدەست بێ، دەگوترێ: ئەوە سەروەریی بەدەستە[1].

(برجس) كە ئەویش یەكێكی دیكەیە لە پسپۆڕانی ئەو بوارە، بەم جۆرە پێناسەی سەروەریی دەكاتو دەڵێ: (انها سلطة أصیلة مطلقة غیر محددة وهي مهیمنة على الأفراد والمؤسسات كافة في المجتمع) واتە: دەستەلاتێكی ڕەهای بێسنوورەو بەسەر تێكڕای تاكەكانو دمەزراوەكانی كۆمەڵگادا باڵادەستە[2].

شارەزایانی بواری زانستی سیاسەت دەڵێن: سەروەریی، پێویستە ئەم پێنج تایبەتمەندییەی تێدا بن، كە دەگوترێ: ئەو وڵاتە سەروەریی تێیدا بەدەست فلان لایەنە،

---

[1] - حكومة الرسول "صلى الله علیه وسلم" د. هاشم یحیى الملاح، ص٦٣.
[2] - هەمان سەرچاوە، ص٦٣.

یان فلاّن لایەنەی تیّدا بالاّدەستە، پیّویستە ئەو پیّنج تایبەتمەندییەی هەبن، ئـەوجار پیّـی دەگوتریّ سەروەر:

یەکەم: دەستەلاّتیّکی گشتگیرە، واتە: هەموو شتیّك دەگریّتەوە.

دووەم: دەستەلاّتیّکی ڕەهاو بیّ سنوورەو هیچ شتیّك سنوورداری ناکات.

سـیّیەم: دەسـتەلاّتیّکی بەردەوامــە وپەیوەسـت نیــە بــە ژیــانی حـوکمڕانو بگـرە بەدەوڵەتیشەوە پەیوەست نیە، هەمیشە بەردەوامەو کاتیی نیە.

چوارەم: دەستەلاّتیّکی یەك پارچەیەو بەش بەش ناکریّ، ئەوەنیـە بلّیّـی هەنـدیّکی بـۆ ئەوو هەندیّکی بۆ ئەم.

پیّنجەم: ناگونجیّ بگۆڕدریّ، یاخود بگوازدریّتەوە[1].

شایانی باسیشە، کە باسی سەروەریی لە سەدەی شازدەیەمەوە ورووژیّنرا، ئەویش لــە کاردانەوەی سەرکیّشیی و یاخیی بوونو لە دەرچوون لە لایەن ئەوجۆرەڕژیّمــەوە، کــە پیّـی دەگوترا سیستەمی ثیوکراسیی واتە: حکوومەتی دینیی، کە دیـارە پادشـایەکان ئەوکاتــە پشتیان بە سیستەمی ثیوکراسیی دەبەست، وە نیّـوەڕۆکی سیسـتەمی ثیـوکراسـیی، یـان حکوومەتی دینیی، کە ئەو کاتە لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا باو بـووە، ئەوەیـە کــە سەرچـاوەی دەستەلاّت خوایە و، خوای گـەورە بـۆ خـۆی بەشـیّوەیەکی ڕاسـتەوخۆ، یـان ناڕاسـتەوخۆ حوکمڕانــان هەڵدەبـژیّریّ و، ئــەرکی حوکمڕانییــان پــیّ دەسـپیّریّ، وە هــەر شـتیّك ئـەو حوکمڕانانە بڕیاریان دا و دایاننا، دەبیّتە یاسا و بڕیاریّکی پابەند کەر بۆ هەموو لایەك.

ئنجا لە کاردانەوەی ئەم سیستەمەدا جووڵانەوەیەکی فیکریی سیاسیی سەری هەڵدا لە سەر دەستی (تۆماس هۆبس) وە (جۆنلۆك ) و (جان جاك ڕۆسـۆ)وە، کــە نیّـوەڕۆکی ئـەو جووڵانەوە فیکریی و سیاسییە، کە لە کاردانەوەی سیستەمی ثیـوکراسـیدا سـەری هەڵـدا بوو، ئەوە بوو کە دەیانگوت: دەستەلاّت هی خەڵکە، خەڵکیش سەرچـاوەی سـەروەریی و دەسەلاّتە، نەك لایەنیّکی دیکە .

---

[1] - مبادیء علوم السیاسة، بطرس غالي ومحمود خیري عیسی، ص٢٠٣.

هەڵبەتە ئەوانەش وەنەبێ دژی خوا بوو بن، بەڵام دژی ئەوەبوون، کە بەناوی خواوە حوکم بکرێ ، حوکمێکیش بکرێ، کە لە قازانجی دەستەیەك و توێژێکدا بێ و، بە زیان و زەرەری خەڵك و جەماوەر تەواو بێت[1].

ئنجا با بێینە سەر ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای زاراوەی: {سەروەریی باڵا و ڕەها هی خواو شەریعەتەکەیەتی}، ئەوە یانی چی؟

سەرەتا دەڵێین: لە نێو زانا و شارەزایانی هاوچەرخی ئیسلامییدا، ڕا جیایی و مشتومڕ لەو بارەوە هەیە، کە ئایا سەروەریی سەرچاوەکەی کێیە، خوا "سبحانه وتعالى" یان خەڵکی مسوڵمان؟، هەڵبەتە من پێم وایە وەك سەرنجی زۆر کتێبم داوە، کە لەو بارەوە نووسراون، پێم وایە هۆی مشتومڕەکەیان ناگەڕێتەوە بۆ خودی دەقەکانی قورئان و سوننەت، من پێم وایە دەقەکانی قورئان و سوننەت زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی نوختەیان خستۆتە سەر پیت، کە سەروەریی‌و حوکمڕانیی باڵا بە مانا یاساییەکەی: یاسادانان (التشريع)، تەنیا هی خوای پەروەردگارەو، هی شەریعەتێکە، کە ئیرادەی خوای پەورەدگاری تێدا بەرجەستە بووە .

من پێم وایە هۆی کەوتنە مشتومڕ و ڕا جیایی زانایانی مسوڵمانانی هاوچەرخ لەو بارەوە، بریتیە لە کەوتنە ژێر کاریگەرییان بۆ ئەو هەل ومەرجە، یاخود بۆ ئەو بیروبۆچوونانە، کە لەو هەل‌و مەرجەدا پەیدابوون، کە ئاماژەمان پێدا لە پێش سەدەی شازدەیەمی زایینیدا لە ڕۆژئاوا، واتە: ئەو هەل‌و مەرجە، کە سیستەمی دیموکراسی تێدا لە دایك بوو و هاتە دی، جۆرێك لە زەخت و فشاری دروست کردوە لە سەر هەندێك لە زانایان‌و، لە ئەنجامی ئەوەدا کەوتوونەتە جۆرێك لە ئیشکالەوە، کە ئایا سەروەریی هی خوای پەروەردگارو هی شەریعەتەکەیەتی، یاخود هی خەڵکی مسوڵمانە؟! کە بە تەئکید خەڵکێکی مسوڵمانیش بەندەی خوان و شەریعەتی خوای پەروەردگار پیادە دەکەن، ئنجا ئایا فشارەکە لە کوێ وەیە؟ ئەوەیە کە گوتوویانە: ئەگەر بڵێین: سەروەریی هی خوایە

[1] - لە کتێبی: (النظم السياسية: الدولة والحكومة)ی د.محمد كامل ليلة لە لاپەڕە ١٩٢ تا ٢٠٦ ئەو بەسەرهاتە گێڕراوەتەوە کە چۆن لە کاردانەوەی سیستەمی ثیوکراسیی دا ئەو جوولانەوە فیکریی و سیاسی یە پەیدا بوو، کە دواتر بوو بە هۆی لە دایك بوونی سیستەمی دیموکراسی.

(السيادة لله) ئەوە هەمان قسەی سیستەمی ثیوکراسی دوو بارە دەکەینەوە، هەمان قسەی ئەو قەشە و پاپایانەی، کە دەیانگوت: ئێمە سێبەری خواین و نوێنەری خواین، وە ئیرادەی خوای پەروەردگار لە ئێمەدا بەرجەستە بووەو، هەرچی ئێمە بیڵێین، ئەوە خوا لێی ڕازییە، هەرکەسێك ئێمە دایبنێین، دیارە خوا لێی ڕازییە، هەر کەسێکیش ئێمە لای بەرین، دیارە خوا لێی تووڕەیە، ئەو جۆرە زانایانە گوتوویانە: ئەگەر ئێمە بڵێین: سەروەریی هی خوای پەروەردگارە، یەکسەر ئەو شتانە هەموویان دێتە بیر و زەینەوە، سەرەنجام خەڵك سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی، بەوە تۆمەتبار دەکات، کە سیستەمێکی سیۆکراسی یە.

جا ئەگەر تەماشای ثیوکراسیی بکەین دەزانین، کە بە هیچ شێوەیەك ناگونجێ سیستەمی سیاسیی و حوکمڕانیی لە ئیسلام دا، بە سیۆکراسی ناوزەد بکرێ و تۆمەتبار بکرێ، کە لە داهاتوودا بە تەفصیلێ باسی دەکەین، بەڵام لێرەدا هەر بە کورتی دەڵێین: لەبەر ئەوەی سیستەمی ثیوکراسیی هەم حوکمڕانیی بە مانای یاسادانان (تشريع) و هەم حوکمڕانیی سیاسی بە مانای دانانی کاربەدەستان و بەرپرسانی بەدەستەیەك دەسپارد بە ناوی خواو سێبەری خواو نوێنەری خواو وەکیلی خوا، بەڵام لە ئیسلام دا شتی وا نیە، بەڵێ، وەحی خوای پەروەردگار یاسایەکی پابەند کەرە بۆ هەموو لایەك، بەڵام سەروەریی سیاسیی و حوکمڕانیی سیاسیی، بە مانای دانانی کاربەدەستان و لێپێچینەوەیان بە دەستی خەڵکە ، وەك دوایی زیاتر تیشکی دەخەینە سەر.

جا لە ئەنجامی ئەو جۆرە ئیلتیباس و تێکەڵییەدا، ئەوەتا زانایەکی پایە بەرزی وەك ئەبولئەعلای مەودودیی ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە کتێبی: (نظرية الإسلام وهديُه) لاپەڕەی (٣٥)دا {ئەو کتێبە کۆمەڵێك بەرهەمی سیاسیی و فیکریی ئەبولئەعلای مەودوودیی گرتۆتە خۆی دەربارەی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلام}، ئەبولئەعلای مەودوودیی لە پێناسە کردنی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامییدا دەڵێ: (وَلإن سمحتم لي بابتداع مُصطَلَح جديد، لآثرتُ كلمة الديمقراطية الثيوقراطية، أو الحكومة الألهية الديمقراطية) واتە: ئەگەر ڕێگەم بدەن زاراوەیەکی نوێ بە کاربێنم بۆ پێناسەکردنی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلام، دەڵێم: سیستەمی حوکمڕانی ئیسلامی بریتیە لە

(الثیوقراطیة - الدیمقراطیة – ثیوکراسیی- دیموکراسیی) یاخود (الحکومة الإلهیة الدیمقراطیة) حکوومەتی خوایی دیموکراسیی، یان حکومەتی دینی خەڵکی.

ئەبولئەعلای مەودودیی "ڕەحمەتی خوای لێ بێ" بۆیە وا دەڵێ، دەیەوێ بە خەڵك بڵێ: کە سیستەمی حوکمڕانیی لە ئیسلام دا، لە لایەك بە خواوە پەیوەستە، چونکە شەریعەتی خوا پیادە دەکات و هەرشتێك شەریعەتی خوای پەروەردگار ڕەفزی بکاتو لەگەڵ شەریعەتی خوا تێك بگیرێ، جێگای نابێتەوە، لە لایەکی دیکەشەوە دەزانێ، کە لەئیسلامدا دەستەڵات بە دەست خەڵکەوەیەو بە دەست کۆمەڵگاوەیە، بۆیە دێنێ هەردووکیان لێك دەدات، بەڵام لە ڕاستیدا چاك هەر ئەوەیە، کە ئێمە سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلام بە هیچ کام لەو زاراوانەی دیکە پێناسە نەکەینو نەڵێین: سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی سیۆکڕاسییە، لە بەر ئەوەی شەریعەتێك پیادە دەکات، کە وەحی خوای پەروەردگاری تێدا بەرجەستە بووە، کە قورئان و سوننەتن، چونکە کە وامان گوت، هەموو ئەو شتانە دێنە زەینەوە، کە پێشتر باسمان کردن، کە بە تەئکید لەگەڵ ئیسلام ناگونجێ کە چینێك و دەستەیەك خۆیان لە خەڵك بکەنە هەمە کارە، خۆیان بە نوێنەر و وەکیلی خوا دابنێن، شتی وا لە ئیسلام دا نیەو لە ئیسلام دا مرۆڤەکان هەموویان خەلیفەی خوانو هیچ دەستە و کۆمەڵێكو هیچ چین و توێژێك نوێنەری خوا نیەو سێبەری خوا نیە، حوکمڕان و کاربەدەستان نوێنەری خەڵکنو وەکیلی خەڵکن، خەڵك دایان دەنێو لێیان دەپرسێتەوە، لەکاتی پێویست دا لاشیان دەبات، کەواتە: بەرپرسو حوکمڕانان، بە هەموو مانای وشە، نوێنەری خەڵکن ، دیسان نەشڵێین سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی، سیستەمێکی دیموکراسی یە، چونکە بەڵێ، خاڵی هاوبەش لە نێوان سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی و سیستەمی دیموکراسیدا زۆرن، بەڵام خاڵی جیاوازیش هەن، کە لە داهاتوودا ئاماژەیان پێدەکەین، لە ڕاستیدا ئێمە، ئیسلام و سیستەمە حوکمڕانییەکەی، لەوە بەبەرزتر دەزانین ،کە لە گەڵ دیموکراسیدا بەراوردی بکەین، چونکە دیموکراسی لەگەڵ هەبوونی لایەنی چاکە و ئەرێنی تێیدا، بەڵام کەم و کوڕییو عەیب و عاری زۆریش هەن، بە تایبەتی لەم ڕۆژگارەدا، عەیب و عاری زۆری دەرکەوتوون، هەر لە سەر دەستی خەڵکەکەی خۆی، لە سەر دەستی ئەهلی خۆی، نەك لە سەر دەستی

مسولْمانانێك، كە كوێرانە هەندێك دروشمی ڕۆژئاواییـەكان دەڵێنـەوە، خـەڵكی ڕۆژئـاوا كتێبی گەورە گەورە دەنووسن لەسەر كەمو كورپییەكانی دیموكراسیی، دیـارە هـەموو ئـەو شتانەیش، كە زادەی بیرو هۆشی ئینسانن بە تەئكیـد هـەر وان، بـەڵێ دەگونجـێ لایـەنی چاكەیان تێدا هەبێ، بەڵام لایەنی سەلبییشیان تێدا هەیە، بۆ هەلومەرجێك باشـن، بـەڵام دوای ئەوە هەلومەرجە بەكەڵك نایەن، بە پێچەوانەی وەحی خوای پەروەردگارەوە، كـە لـە زانیاری بێ سنووری خواو لە ڕەحمەتی بێ سنووری خواوە سەرچاوە دەگرێو، كاتو شـوێن ناتوانن كاری تێبەكەن، ئەوەی كە خوای پەروەردگار بۆ هەموو كاتێكی فـەرموو بـێ، بـۆ هەمووكات و شوێنەكان بەكەڵك دێ، پێشتریش باسمان كرد، كـە خـوای پـەروەردگار لـە بواری هەڵسوكەوتەكان دا بە گشتیی، كە حوكم و سیاسەت بەشێكیەتی، دەقی زۆر كەمی داناون و، بۆشایی زۆری هێشتۆتەوە، چونكە خوای كاربەجێ زانیویەتی، كە لەو بوارانـەدا ژیانی مرۆڤـــ زۆر بەرەو پێشەوە دەچێ، ئەگەر دەقی زۆر دابنێ، دەست و پێی خەڵك دەبەستێ.

ئنجا ئێمە كە دەڵێین: سەروەریی باڵاو ڕەها هی خواو بەرنامەكەیەتی (السيادة العليـا والمطلقة لله ودينـه)، مەبەستمان ئەوەیە، كە خوای بەرزو مەزن لە وەحی ڕوون و بێ چـەند و چوونی خۆیدا ڕایگەیاندوە، كە پێویستە ئەوەی خوا ڕایگەیاندوە پەیڕەویی لێ بكرێ، بە حوكمڕان و خەڵكەوەو پێوەی پابەند بن، لـە ڕاسـتیدا ڕەوایـی (شـرعية) حـوكمڕانێتی حوكمڕانانو كاربەدەسـتان، بەسـتراوەتەوە بـە پابەنـدییان بـەو شـەریعەتەوە، كـە خـوای پەورەردگار ناردوویەتی، بۆ ئەوەی كە ژیانی تاك و كۆمەڵ ڕێك بخات ، حوكمڕانان كاتێـك لەو شـەریعەتە لادەدەن، شـەرعیەتیی خۆیـان لـە دەسـت دەدەن ، وەك خـوای بـەرز بـە پێغەمبـەری خـۆی دەفـەرموێ: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾الجاثيـة، واتە: پاشان تۆمان لەسـەر بەرنامەیـەك دانـا لـە لایەن خۆمانەوە لە ئایینی خۆمان {واتە: ئەوەی كە پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد بـۆی هاتوە بەرنامەیەكە لە دینی گشتی خوای پەروەردگارەوە} دەجا شـوێنی بكـەوە، وە دوای ئارەزووی ئەوانـە مەكـەوە، كـە نـازانن، كەواتـە: بـەدیل بـۆ شـەریعەت، شـوێنكەوتنی

ئارەزووی نەزانانە، کەواتە: سەروەریی باڵا و ڕەهای خوای پەروەردگار و شەریعەتی خوا "سبحانه تعالی" مەبەست پێی سەروەریی شەریعەتە لە ڕووە یاساییەکەیەوە، ئەگەرنا لە ڕووە سیاسیسەکەیەوە، خەڵك دەستیان ئاوەڵایە، کێ هەڵدەبژێرن بۆ ئەوەی ئەو شەریعەتەیان بەسەردا پیادە بکات، مەرجێکی لەسەر دادەنێن، بۆ ماوەی چەند دایدەنێن، چۆن لێی بپرسنەوەو چاودێریی بکەن، بە چ شێوەیەك لە کاتی لادانیدا لایبەرن؟! ئەوە هەمووی لە چوارچێوەی صەلاحیەت و ئیختیاری خەڵك دایە.

چونکە بەرپرسان و حوکمڕانان هیچ ئیمتیازێکیان نیە بەسەر باقی خەڵك داو نوێنەرو وەکیلی خەڵکن، خەڵك دایان دەنێ، بۆ ئەوەی شەریعەتی خوایان بەسەردا پیادە بکەن، بەو مەرجانەوە، کە خەڵك بۆیان بەمەرج دەگرن، بەلام لە ڕووی یاساییشەوە دیسن خەڵکی مسوڵمان دەستی کراوەیە، کە لەبەر ڕۆشنایی بنەما گرنگەکانی شەریعەت داو لە بەر ڕۆشنایی دەقەکانی شەریعەت دا، کە لە قورئان وسوننەت دا بەرجەستەن، یاسا دا بنێن و بڕیار دەربکەن لە ڕێی ئیجتیهاد و کۆششی خۆیانەوە، بۆ ئەوەی کە ژیانی خۆیان ڕێك بخەن لە بەر ڕۆشنایی شەریعەت دا.

بەکورتی سەروەریی (حاکمیة - سیادة) دەبێتە دوو بەش: سەروەریی سیاسیی و سەروەریی یاسایی، لە ڕووی سیاسییەوە: خەڵك دەستی ئاوەڵایەوسەروەریی سیاسیی بە دەستی خەڵکەوەیە، لە ڕووی قانونییشەوە: خەڵك شەریعەتی خوای پەروەردگار وەردەگرن و قبووڵ دەکەن، پاشان لەبەر ڕۆشنایی هێڵە گشتییەکانی شەریعەتدا، بە تایبەت بۆ ئەو بوارانەی کە شەریعەت بە دانانی هێڵی گشتیی و چوارچێوەی فراوان ئیکتیفای کردوە، کە بواری هەڵسوکەوتەکانە،کە حوکم و سیاسەتیش بوارێکی گرنگی هەڵسوکەوتەکانە، ئیجتیهاد دەکەن بۆ هەڵهێنجانی یاساو بڕیارە پێویستەکان لە هەل و مەرجە جۆراو جۆرو جیاوازەکانداو، خەڵك لەو ڕووەوە دەستیان کراوەیە، کە بە پێی پێداویستی ژیان و گوزەرانی خۆیان، یاسا دابنێن و بڕیار دەربکەن، دیارە بە میکانیزم و شێوازێك، کە لەگەڵ هەل و مەرج و سەردەمی خۆیاندا دەگونجێ.

کورتەی قسان: من لە پێنج خاڵدا چەمك واتای ئەم بنەمای یەکەمە: {سەروەریی باڵاو ڕەها هی خواو شەریعەتەکەیەتی} ڕوون دەکەمەوە:

**یەكەم:**

مەبەست لە سەروەریی ڕەهای خواو شەریعەتەكەی، تەنیاو تەنیا سەروەریی یاساییە (السيادة القانونية) واتە: بەرنامەو وەحییەك، كە خوا ناردوویەتی بۆ ڕێكخستنی ژیانی تاك و كۆمەڵ، پێویستە پابەندكەر بێت بۆ هەموو لایەك‌و پێوەی پابەند بن.

**دووەم:**

سەروەریی سنووردار، كە مەبەست پێی دەستەڵاتی سیاسییە، پێویستە بە دەست خەڵكەوە بێ، كە حوكمڕان و بەرپرسەكانی خۆیان چۆن دادەنێن چاودێرییان دەكەن، لێپرسینەوەیان لەگەڵ دا دەكەن ، ئەوە هەمووی خەڵك دەستی تێدا كراوەیە لە بەررۆشنایی شەریعەت دا .

**سێیەم:**

خەڵك دیسان لە ڕووی یاسا دانانیشەوە دەستی كراوەیە، بە تایبەت لە بوارەكانی سیاسیی و ئابووریی‌و كۆمەڵایەتیی وجەنگ و ئاشتی و هتد..دا، كە شەریعەت تەنیا هێڵە گشتییەكان و چوارچێوەی فراوانی بۆ داناون، وەك پێشتریش باسمان كرد.

**چوارەم:**

سەروەریی خوا و شەریعەتەكەی بۆ هەموو لایەك وەك یەكەو، هیچ كەس لێی هەڵنەوێردراوە، بگرە حوكمڕان و بەرپرسەكان بە بێ پابەندیی بەشەریعەتەوە، ڕەوایی (شرعية)ی خۆیان لەدەست دەدەن.

**پێنجەم:**

بۆیەش گوتوومانە سەروەریی بالاو ڕەها (السيادة العليا والمطلقة) ، چونكە خەڵكیش جۆرێك لە سەروەرییان هەیە، ئەگەر بالاَ و ڕەهاش نەبێت، لە ڕاستیدا بە بێ ئەوە، كە خەڵك بەشێك لە سەروەریی هەبێ، هیچ مانایەك بۆ خەلیفە بوونی مرۆڤ لە سەر زەویدا بۆ خوای پەروەردگار نامێنێتەوە، چونكە خوا "عز وجل" زۆر بە ڕوون و ئاشكرایی دەفەرموێ: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً

﴿٣٠﴾ البقرة، کە دیارە ئەو خەلیفەیەش مرۆڤە، لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ ...وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ... ﴿٧﴾ ﴾ الحدید، واتە: ببەخشن لەوەی کە خوا ئێوەی تێدا کردۆتە جێنشینی خۆی، هەروەها لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ ﴿١٦٥﴾ ﴾ الأنعام، واتە: ئێوەی کردوە بە جێنشینی زەوی، دیارە جێنشین بوونی مرۆڤ بۆ خوای پەروەردگار، ئەگەر دەستی کراوە نەبێ، لە ڕاستیدا هیچ چەمك و واتایەکی بۆ نامێنێتەوە .

ئنجا با تەماشای چەند ئایەتێکی قورئانی بە پێز بکەین، دەربارەی سەروەریی و فەرمانڕەوایی خوای بەرزو مەزن و شەریعەتەکەی، بۆ ئەو کۆمەڵگایەی، کە بە کۆمەڵگایەکی مسوڵمان و ئەو قەوارە سیاسییەی، کە بە قەوارەو دەوڵەتێکی ئیسلامیی لە قەڵەم دەدرێ:

١- خوای کاربەجێ لە ئایەتی ژمارە (٤٠)ی سووڕەتی (یوسف)دا دەفەرموێ: ﴿ ...إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾، واتە: بێگومان حوکم تەنیا هی خوایە، فەرمانی کردوە کە جگە لەو نەپەرستن، ئا ئەوە دینی ڕاست و ڕێکە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

مەبەست لە حوکم لێرەدا یاسادانانەو، مەبەست بەرپرسێتیی سیاسیی نیە، چونکە خوا بەرپرسی خەڵك نیە لە سەر زەوی، خوای بێ وێنە حاکیمی خەڵکە بە مانای یاساییەکەی، واتە: دەبێ خوا بەرنامەیان بۆ دابنێت، بەڵام خوای گەورە خۆی حوکمڕان و بەرپرسی خەڵك نیە، بەڵکو دەبێ خەڵك خۆیان بەرپرسانی خۆیان هەڵبژێرن، بەڵام ئەو بەرنامەیەی، کە خوای پەروەردگار بۆی داناون، پێویستە پیادەی بکەن، بۆیە دەفەرموێ: حوکم تەنیا هی خوایە، واتە: بەرنامە دانان ،وە فەرمانی کردوە، کە تەنیا ئەو بپەرستن، واتە: دەبێ تەنیا خوا بەرنامەدانەر (مشرع)تان بێ، ئەوجار تەنیا خواتان پەرستوە، ئا ئەوە دینی ڕێك و ڕاستە، دینی ڕێك و ڕاست لە لای خوای پەروەردگار ئەوەیە، کە خەڵك

تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا بکات،وە بەندایەتیی بۆ خوا ناکەن، ئەگەر تەنیا خوای بەرزومەزن بەرنامە دانەریان نەبێ، هەر ئەو دەبێت حەلاڵ و حەرامیان بۆ دیاری بکات، کە وا بکەن و وا مەکەن.

٢- لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی ژمارە (٥٤)دا خوای بێ هاوتا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾﴾، خوای کاربەجێ ڕوو لە بەشەر دەکاتو دەفەرموێ:

بێگومان پەروەردگاری ئێوە ئەو خوایەیە، کە ئاسمانەکان و زەوی هێناوەنە دی و پاشان چۆتە سەر بارەگا (عرش) {بەو شێوەی کە بۆ خوا شایستەیە} بە شەوگار ڕۆژگار دادەپۆشێ و، شەوگار بە خێرایی بە دوای ڕۆژگاردا دێ، خۆرو مانگ و ئەستێرەکان بە فەرمانی خوا ڕامو دەستەمۆ کراون (ملکەچن) ، ئاگادار بن دروستکرانو فەرمان، هەر هی خوایە (هەر خوا شتەکان دێنێتە دیو، هەر خوایش بۆی هەیە فەرمان بەسەر بەندەکانیدا بکاتو، فەرمانی موتڵەق لە ڕووی دیاری کردنی چاکە و خراپە و حەڵاڵ و حەرامەوە) بەرز و پیرۆزە خوای پەروەردگاری جیهانییان.

کەواتە: وەك چۆن خوا تاکە بەدیهێنەرە، دەبێت تاکە فەرمانڕەوایش بێت بە مانا یاساییەکەی، وەك چۆن خوای بێ هاوەڵ تەنیا خۆی هەموو شتێکی هێناوەتە دی، تەنیا خوای پەروەردگاریش شایستەی ئەوەیە و مافی ئەوەی هەیە، کە سەروەریی ڕەها و باڵای بەدەست بێت بۆ دانانی بەرنامە و ئایین بۆ بەندەکانی.

٣- لە سوورەتی (المائدة) لە ئایەتی (٤٨)دا خوای زانا دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ﴿٤٨﴾﴾، دوای ئەوەی، کە باسی ناردنە خوارەوەی تەورات بۆ جوولەکانو،

ناردنە خوارەوەی ئینجیل بۆ نەصرانییەكان دەكات، دەفەرمویێ: بە حەق كتێبمان بـۆ تـۆ نارده خوار (كە قورئانە)، كتێبەكانی پێش خۆی، بە ڕاست دەزانـێ (لـەو ڕووەوە كـە لـە لایەن خـواوە هـاتوون وەك ئەسـڵەكەیان ، بەسەریشـیانەوە چـاودێرە (لـە هـەر شـوێنێك دەستكاریی كرابن و گۆڕدرابن، ڕاستیان دەكاتەوە، ئەوەی كە بە پێویستی بزانێ) جـا تـۆ (ئەی موحەممەد! وە هەر كەسێك لە شوێنی موحەممەدە!) دادوەرییان لەنێواندا بكە بـەپێی ئەوە، كە خوا ناردوویەتە خوار و بەدوای ئارەزووەكانیان مەكەوەو، لەو هەقە لامەدە، كـە بۆت هاتوە، بۆ هەر كامێك لـە ئێـوە (ئۆممـەتی ئیسـلامو ئۆممـەتی نەصـرانییو ئۆممـەتی یەهوودیی لە كاتی خۆیداو ئۆممەتەكانی دیكە) بەرنامەیەك و ڕێبازێكمان داناوە.

كەواتە: جگە لە خوای تاكو تەنیا، كێ بۆی هەیە بەرنامە و ڕێبـازدا بـنێ؟ بێگومـان هیچكەس.

٤- لـە سـووڕەتی (الشـوری) لـە ئایـەتی (٢١)دا خـوا دەفـەرموێ: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟ شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةُ ٱلْفَصْلِ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢١﴾ ﴾، خوای پەروەرگار بە نكـوڵیی كردنـەوە دەفەرموێ: ئایا (ئەوانەی كە هاوبەش بـۆ خـوا دانـەرن) چـەند هاوبەشـێكیان هـەن كـە بەرنامەیەكیان بۆ داناون كە خوا مۆڵەتی لە سەر نیە؟، یانی: چـۆن شـتی وا دەكـەن كـە غـەیری خوا بێننە ڕیزی خوا و ئایین و بەرنامەیان بۆ دابنێن، ئاین و بەرنامەیەك كـە خـوا مۆڵەتی لەسەر نیە، چونكە خوا مۆڵەتی نەداوە بەكەس، كە بەندەكانی بكاتـە كۆیلـەی خۆی و، ئایینو بەرنامەیان بۆ دابنێ، واتە: بەرنامـەی ژیـانو گـوزەران بـەس دەبـێ خـوا دایبنێ، چونكە خوای زانا، بەس خۆی دەزانێ ئینسانەكانی چۆن دروسـت كـردوەو بۆچـی دروستی كردوون، چۆنیش بەختەوەر دەبنو پێویسـتە چـۆنیش بـە ڕێـوە بچـن؟!وە هـیچ كەسێكی دیكە ئەو شایستەییەی نیەو، ئەو مافەی نیـە، بۆیـە لەكۆتاییـدا دەفـەرموێ: ئەگەر ئەوە نەبوایە كە خوا پێشتر بڕیاریداوە كە لە كاتی خۆیداو لە ڕۆژی دواییدا لێكیـان هەڵداوێرێ، لەسەر ئەو تاوانە هەر لە دونیادا خـوای پـەروەردگار دادوەریـی لـە نێـوان دا دەكردن، بێگومان ستەمكاران ئـازارێكی بـە ئێشـیان هەیـە، ئایـا سـتەمكاران كـێن

ئەوانەن کە خۆیان لە خەڵك دەکەنە پەرستراو و پەروەردگارو، سەروەریی باڵاو ڕەها بۆ خۆیان قۆرخ دەکەن و بەرنامەی ژیان بۆ خەڵك دادەنێنو حەڵاڵ و حەرامیان بۆ دیاریی دەکەن، ئەوانە ستەمکارن، ئەوانەیش کە شوێنیان دەکەون بە هەمان شێوە ستەمکارن، چونکە غەیری خوا دەپەرستن وە غەیری خوا دەکەنە فەرمانڕەوای ڕەهای خۆیان، دەیکەنە شەرع دانەرو ئایین دانەری خۆیان، لە حاڵێك دا کە پێویستە دین و شەریعەت، تەنیا خوای پەروەردگار دایبنێ، چونکە هەر ئەو مرۆڤەکانی خولقاندوە، هەر ئەویش مافی ئەوەی هەیە پێیان بڵێ: ئاوا بژین و ئاوا مەژینو ئەووەم پێ خۆشەو ئەووەم پێ ناخۆشە.

٥- لە سووڕەتی (النحل) ئایەتی (١١٦)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ ﴾، دیارە ڕوو لە هاوبەش دانەرو کافرەکان دەکات دەفەرموێ: بەوەی کە زمانتان بە درۆ وەسفی دەکات، مەڵێن ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەرامە (هەر لە خۆتانەوە حەڵاڵ و حەرام بۆ خۆتان دیاریی مەکەن) بۆ ئەوەی بەناوی خواوە درۆ بکەنو پاڵی بدەنە لای خوا، بە تەئکید ئەوانەی درۆ بەناوی خواوە دەکەن، سەرفراز نابن.

کەواتە: هەر کەسێكو هەر لایەنێك، حەڵاڵ و حەرام بۆ خەڵك دیاریی بکات، هەڵبەتە لەلایەن خۆیەوەو بە بێ گەڕانەوە بۆ شەریعەتی خوای پەروەردگار، ئەوە بە تەئکید جۆرێك لە خوایەتیی و پەرستراویێتی و پەروەردگاریێتی بەسەر خەڵکەوە دەکات، ئەوەیش گەورەترین گوناه و تاوانە، چونکە تەنیا خوا "سبحانه وتعالى" بۆی هەیە پەرستراوی خەڵك بێو پەروەردگاری خەڵك بێ، ئنجا پەرستراویێتی خوای بێ وێنە لە چیدا بەرجەستە دەبێ؟ لە وەدا کە خوا سەروەریی ڕەهاو باڵای هەبێ، کە لە شەریعەتەکەیدا بەرجەستەیە.

٦- هەروەها لە سووڕەتی (الجاثیة) ئایەتی (١٨ و ١٩)دا خوای بەرز مەزن دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُمْ لَن يُغْنُواْ عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ وَٱللَّهُ

﴿وَلِيُّ ٱلْمُتَّقِينَ ١٩﴾، واتە: پاشان (واتـە: دوای ئـەوەی کـە جوولەکـە و نەصـرانییەکان کتێبیان بۆ هات) دوای ئەوان تۆمان لە سەر بەرنامەیەك لـە دینـی خۆمـان دانـا، دەجـا شوێنی بکەوەو بە دوای ئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە نازانن، ئەوانەی کـە تـۆ ئەگـەر بـە دوای ئارەزوویان بکەویو لە شەریعەتی خوا لابدەی، ناتوانن هیچ بەرگرییەکت لـێ بکـەن لە لایەن خـواوە، سـتەمکاران هەنـدێکیان دۆسـت و پشـتیوانی هەنـدێکیانن، خـوایش سەرپەشتیاری پارێزکارانە.

٧- ئایەتی کۆتایی کە خـوای تـاكو پـاك ئـەو ڕاسـتییە، کـە دەبـێ فـەرمانڕەواییو سەروەریی باڵاو ڕەها تەنها بـۆ خـوا و بـۆ شـەریعەتەکەی بێ،تێـدا ڕادەگەیـەنێ ئایـەتی (٦٤)ی سووڕەتی (النسـاء)ە، کە دەفـەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ٦٤ ﴾،واتە: هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوان نەکردوە، مەگەر بۆ ئەوە کـە بـە مۆڵەتی خوا فەرمانبەریی بۆ بکرێ، واتـە: پێغەمبـەری خـوا "صَلَى اللہ عَلَيهِ وَسَلَمَ" کـە فەرمانبەریی بۆ دەکرێ، بێگومان ئێمـە پێغەمبـەر ناپەرستین، ئێمـە فەرمانبـەریی بـۆ پێغەمبەر دەکەین، چونکە خوا وای فەرمووە، بەڵام پەرستراو تەنیا خوایـە ، پێغەمبـەری خوا "صَلَى اللہ عَلَيهِ وَسَلَمَ" تـەنیا گەیەنـەر و ڕاگەیەنـەری بەرنامـەو پـەیامی خـوا بـووە، ئەگەرنا ئێمە فەرمانبەریی بۆ پێغەمبەری خوا "صَلَى اللہ عَلَيهِ وَسَلَمَ" دەکەینو بـە قسـەی دەکەین، چونکە خوا بە قسە کردن و فەرمانبەریی بۆ کردنی پێغەمبەری خوای "صَلَى اللہ عَلَيهِ وَسَلَمَ" لەسەر ئێمە فەرز کردوە.

لەو ئایەتانەشەوە زۆر بە جوانیی ڕوون بووەوە، کە سەروەریی باڵاو ڕەها لە ئیسلامداو لە کۆمەڵگایەکی مسـوڵماندا، تـەنیا هـی خـوای پـەروەردگارە، کـە ئـەویش لـە چـیدا بەرجەستە دەبێ؟ لە شەریعەتەکەیدا، کەواتـە: کۆمەڵگایـەكو خـەڵکێك کـە خۆیـان بـە مسوڵمان دەزانن، دەبێ سیستەمی حوکمڕانییەکەیان ببەسترێتەوە بە شـەریعەتی خـواوە، تاکو سەروەریی (سیادة)ی باڵاو ڕەهای خوای پەروەردگار لە ژیانیان دا بەرجەستە ببێ.

لێرەدا كۆتایی بەم باسە دێنین ، خوا پشتیوان بێ لە باسی داهاتوودا وەڵامی دووپرسیار و ئیشكال دەدەینەوە، كە لەسەر ئەم حەقیقەتە هەڵدەستن.

## وەڵامی دوو پرسیار و ئیشكال:

ئێمە لە باسی ڕابردوودا باسمان كرد، كە سەروەریی باڵاو ڕەها هی خواو شەریعەتەكەیەتی، ئەمە یەكەمین بنەما و بەڵكو بەردی بناغەی سیستەمی حوكمڕانیی ئیسلامییە.

وەتیشكمان خستە سەر ئەو بنەمایەو، چەمك و واتاكەیمان ڕوون كردەوە، چ لە لای پسپۆڕ و شارەزایانی یاسا و دەستوور، كە سەروەریی (السيادة - الحاكمية) چی دەگەیەنێ؟ وە لە بەر ڕۆشنایی چەند ئایەتێكی قورئانی بەرز و بە پێزیشدا باسمان كرد، كە چۆن سەروەریی باڵاو ڕەها تەنها هی خوایە "سبحانه وتعالى" كەئەویش لە شەریعەت و بەرنامەكەیدا بەرجەستە دەبێ، كە بە پێغەمبەری كۆتایی خۆیدا موحەممەد "صَلَّى الله عَلَيهِ وَسَلَّم" بۆمرۆڤەكانی ناردوە، ئنجا لێرەدا دووپرسیار دروست دەبن:

## پرسیار و ئیشكالی یەكەم:

ئایا سەروەریی باڵاو ڕەهای خوای بەرزو مەزنو شەریعەتی خوا، نابێتە مایەی دەست و پێ بەستنی مرۆڤەكان، لە بواری دنیادارییو بەڕێوەبردنی وڵات و دەوڵەت دا ؟ ئایا لە حاڵێكدا كە خوای بێ وێنە، سەروەریی باڵاو ڕەهای هەیەو شەریعەتی خوا سەروەریی باڵاو ڕەهای هەیە- واتە: نابێ هیچ كەسێك قسەیەك بكاتو بڕیارێك بدات كە پێچەوانەی شەریعەتی خوابێ- ئایا ئەوە نابێتە هۆی ئەوە كە خەڵك دەست و پێی ببەسترێ لەبواری حوكمڕانییو دەوڵەتدارییدا؟ لەوەڵامدا دەڵێین: نەخێر، چونكە ئێمە پێشتریش ڕوونمان كردەوە، كە خوای كاربەجێ و دانا و زاناو شارەزا، لە بوارەكانی ئیمان و عەقیدە و خووڕەوشت و چاكەكاندا، واتە: ئەو بوارانەی كە پەیوەندییان هەیە بە حەقیقەتی بوون (وجود)ەوەو پەیوەندییان هەیە بە خوای بێ وێنەوەو، پەیوەندییان هەیە بە

جەوهەری مرۆڤ و جەوهەری ژیانەوە، کە ئەوانە هەموویان شتی نەگۆڕن، واتە: لەو بوارانەدا کە پەیوەندییان هەیە بە لایەنە نەگۆڕو چەسپاوەکانی بوون و ژین و مرۆڤەوە، خوای کاربەجێ لە شەریعەتی خۆیدا نوختەی خستۆتە سەر پیتو چۆتە نێو وردەکارییەکانەوەو چۆتە نێو تەفاصیلەوە، بۆچی؟ چونکە ئەو لایانانە، ئینسان تێیاندا تووشی گۆڕانکاریی نابێ، بۆ وێنە: لە ڕووی ئیمانو عەقیدەوە، لە ڕووی بوونناسییەوە، کە وەك پێشتر باسمان کرد، خوا "سبحانه وتعالى" چۆنە، هەر وایە، ئەم ئاسمان و زەمینە چۆنن، هەروان، مرۆڤ چۆنە، هەر وایە، بەڵێ گۆڕان بەسەر ڕواڵەتیدا دێ، بەڵام حەقیقەتی ئینسانو جەوهەرەکەی گۆڕانی بەسەردا نایەت، مرۆڤ لە چاخی بەردین دا پێویستی بە خواردن و خواردنەوە و بەرگ و پۆشاك و خەو و شوێنی حەوانەوە بووە، ئێستایش هەر پێویستیی پێیەتی، ئەو کاتە بە شێوەیەکی سادە ئەو پێداویستییانەی خۆی دابین کردوونو، ئێستا بە شێوەیەکی ئاڵۆزو بەشێوەیەکی ڕێك و پێکتر ، ئەو کاتە بە شەر پێویستی بەلایەنی کۆمەلایەتیی هەبووە، کە خێزان پێکەوە بنێت و کۆمەڵ کۆمەڵ پێکەوە بژین، ئێستایش هەر پێویستی پێیەتی، بەڵام ئەو کاتە بەشێوەیەکی سادە ئەوەی ڕێکخستوەو، ئێستا بە شێوەیەکی ڕێك و پێکتر.

هەروەها ئەو خۆرەی کە کاتی خۆی تیشك و ڕووناکی دابینکردوە بۆ مرۆڤەکان لە سەر زەوی، ئێستاش هەر خۆی بۆمانیان دابین دەکات، ئەو ڕۆڵەی مانگ گێڕاویەتی، ئێستاش بەهەمان شێوە ئەو ڕۆڵەمان بۆ دەگێڕێ، بەڵکو ئێستا ئێمە زیاتر بەهرە مەند دەبین لە تیشکی خۆر و لە ڕۆشنایی مانگ و لەو نیعمەتانەی، کە خوا بۆی داناوین و ژیانی خۆمانیان پێ ڕێکتر دەکەین، بەڵام بێگومان حەقیقەتەکانی ئاسمان و زەوی ژیانو مرۆڤ، نەگۆڕاون، هەروەها خوای پەروەردگار بۆ خۆی، وەك خودیو وەك ناوە هەرە چاکەکانیو سیفەتە هەرە بەرزەکانی، گۆڕانی بەسەردا نەهاتوە.

ئنجا ئەو شتانەی کە حەقیقەتیان ناگۆڕێ، خوای کاربەجێ یاسای نەگۆڕی بۆ داناونو چۆتە نێو وردەکارییەکانەوەو نوختەی خستۆتە سەر پیت تێیاندا، کە وەك گوتم ئەو بوارانەش کە ئاوان، بریتین لە: بواری بوونناسیی، بواری ئیمان و عەقیدە، بواری عیبادەت، بواری باری کەسێتیو پێکەوەنانی خێزان، بواری خووڕەوشتەکان، بۆ نموونە:

ڕاستگۆیی هەر چاك بووەو لەسەرەتای دونیاوە تاكۆتایی هەر چاك دەبێ، درۆكردن هەر خراپ بووە و هەر خراپ دەبێ، ئەمینیی هەر باش بووەو باش دەبێ، ناپاكیی هەر خراپ بووەو هەر خراپ دەبێ تاكۆتایی دنیا، هەموو ڕەوشتە بەرزو پەسەندەكان، هەربەرزو پەسندن و خوو خدە دزێو و ناپەسندەكانیش، هەر خراپن.

بەڵام ئەو بوارانەی كە ژیانی مرۆڤــــ تێیاندا بەرەو پێش دەچێ‌و دەگۆڕێن، شەریعەتی خوای كار بەجێ نەچۆتە نێو وردەكارییەكانەوە، بەڵكو بەس هێڵی گشتی بۆ داناون‌و چوار چێوەیەكی فراوانی داناوە، بەڵام بۆشاییی زۆری بەجێهێشتوە، بۆ ئەوەی كە بەشەر بە پێی پێویستی هەل و مەرجە گۆڕاوەكان‌و بە پێی پێداویستی بەرەو پێشچوونی ژیان و گوزەرانی، ئەو بۆشاییانە پڕ بكاتەوە، جا چ بواری حوكم و سیاسەت بێ، یان بواری ئابووریی و بازرگانیی و مامەڵە بێ، یان بواری كۆمەلایەتیی، یان بواری جەنگ و ئاشتیی، یان بواری پەیوەندییەكان، لە هەموو ئەو بوارانەدا كە ژیان تێیاندا دەگۆڕێ‌و بەرەو پێشەوە دەچێت، واتە: ژیانی ئینسان لە ڕووە ماددییەكەیەوە، خوای زانا نەچۆتە نێو وردەكارییەكانەوە لە ڕێی شەریعەتەكەیەوە، بەڵكو ئیكتیفای كردوە بە دانانی چەند هێڵێكی گشتیی‌و چەند بنەمایەكی گشتیی‌و ، چوارچێوەیەكی فراوانی دیاریی كردوە، هەر بۆیەش ئێمە دە (١٠) بنەمامان هەڵبژاردوون، وەك بنەمایەكانی سیستەمی حوكمڕانیی لە ئیسلامدا، چونكە ئێمە لە ئیسلامدا سیستەمێكی حوكمڕانیی لە قاڵبدراومان نیە، بەڵكو كۆمەڵێك بەهاو بنەمای سەرەكییمان هەن، كە پێویستە لە سیستەمی حوكمڕانییدا مسوڵمانان ڕەچاویان بكەن، بەڵام چوارچێوە و قاڵبێكمان نیە، كە دەست و پێی مسوڵمانانی بەستبێ و ڕێگای لێ گرتبن، كە بە پێی بەرەو پێشچوونی ژیان و گوزەرانیان‌و بە پێی گۆڕانی هەل ومەرجەكان، ئەوانیش شێوەی حوكمڕانیی و شێوەی دەوڵەتداریی خۆیان بگۆڕن.

ئنجا زانایان وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا، بنچینەیەكیان هەڵهێنجاوە لە ئەنجامی سەرنجدانی ئەو دوو بوارە لە یەك جیایەدا، واتە: ئەو بوارەی كە ژیانی ئینسان تێیدا ناگۆڕێ، ئەو بوارەی كە ژیانی ئینسان تێیدا دەگۆڕێ، بەواتایەكی دی: ئەو بوارانەی كە پەیوەندییان بە جەوهەر و ڕووح و ماهیەتی مرۆڤــــەوە هەیەو، پەیوەندییان بە

جەوهەری ژیانو بوون (وجود)ەوە هەیەو ناگۆڕێن، ئیسلام بە شێوەیەك مامەڵەی كردوە، وەئەو بوارانەی كە ژیانی ئینسان زۆر تێیاندا دەگۆڕێ، بە شێوەیەكی دیكە مامەڵەی كردوە، بەڵێ زانایان لەسەر بناغەی ئەو دەقانە، كە پەیوەندییان بەهەر كام لەو دوو بوارە لێكجیایەوە هەیە، بنچینەیەكیان داناوە دەڵێن: (إجمالٌ في المتغيرات تفصيلٌ في الثوابت). واتە: ئەو شتانە كە دەگۆڕێن شەریعەت بە كورتیی قسەی لە بارەوە كردوونو تەنیا هێڵی گشتی بۆ داناون،وە ئەو شتانەی كە ناگۆڕێنو چەسپاون، شەریعەت چۆتە نێو وردەكارییەكانیانەوە، با لێرەدا وێنەیەك بێنمەوە: خوای زانا لە باسی دەستنوێژدا، هەموو ئەو شتانەی كە بۆ دەستنوێژ پێویستن، لە یەك ئایەتدا هەموویانی بەیان كردوە لە سوورەتی (المائدة) لە ئایەتی (٦)دا فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ بِرُءُوسِكُمۡ ٦﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕوادارن! كاتێك هەستان بۆ نوێژ، دەموچاوتان بشۆن، دەستەكانتان بشۆن لەگەڵ ئانیشكەكانتاندا،وە مەسحی سەرتان بكەن،وە هەردوو پێیانتان بشۆن لەگەڵ گوێزینگتان... تەماشا دەكەین هەموو فەرزەكانی دەستنوێژ لە یەك ئایەتدا بەیان كراون، كە دەستنوێژ بۆ خۆی شتێكی بچووكە لەچاو بابەتێكی وەك وڵات بەڕێوەبردندا،بێگومان سیستەمی حوكمڕانیی بواری حوكم و سیاسەت زۆر گەورە و فراوانە، بەڵام تەماشا دەكەین خوای زاناو توانا بە دانانی چەند بنەمایەكی گشتییو بە دیاریی كردنی چوارچێوەیەكی فراوان، بۆ بابەتی حوكم و سیاسەت ئیكتیفیای كردوە، لە حاڵێكدا كە لە دەستنوێژدا نوختەی خستۆتە سەر پیت، بۆچی؟ چونكە دەستنوێژ هەر دەستنوێژەو، دەستنوێژ لە بواری عیبادەتو چۆنیەتی مامەڵەكردن لەگەڵ خوادا، هیچ گۆڕانی بەسەردا نایەت، چونكە پەیوەندیی هەیە بە ڕووحو جەوهەری مرۆڤـــەوە.

بەڵام بابەتی حوكم و سیاسەت و ئابووریی و جەنگ و ئاشتیی، پەیوەندیی بە نێوان مرۆڤـــەكانەوە هەیەو، پەیوەندیی بە ژیانی دنیایانەوە و بەلایەنی ماددییانەوە هەیە،كە ئەوەش گۆڕانی بەسەردا دێ، بۆیە شەریعەت نەچۆتە نێو وردەكارییەكانەوە.

جا بەزەیی خوا "سبحانه وتعالى"و حیکمەتی خوا، وەك چۆن لەوەدا بەرجەستەیە، کە شەریعەت (تفصیل في الثوابت)ی ڕەچاوکردوەو ئەو شتانەی، کە نەگۆڕن چۆتە نێو وردەکارییەکانیانەوە، ئنجا بۆیەش ڕەحمەت و حیکمەتی خوا لەوەدا بەرجەستەیە، چونکە خوای پەروەردگار، ئەگەر بە وردیی‌و بە تەفصیلێ بۆی باس نەکردباین ، ئیمان و عەقیدەمان چۆن بێ؟ عیبادەتمان چۆن بێ؟ ئەخلاق و ڕەوشتمان چۆن بێ؟ چۆن خێزان پێکەوە بنێین؟ مەسەلەی میرات‌و ئەو شتانە، کە پەیوەندییان بە باری کەسێتییەوە هەیە، ئەگەر خوای پەروەردگار نەچووبایە نێو وردەکارییەکانیانەوە، ئەوە بەتەئکید لەبەرئەوەی پەیوەندییان بە ڕووحەوە هەیەو، پەیوەندییان بە خواو بە غەیبەوە هەیە، مرۆڤ ـ تێیاندا بەهەڵەدا دەچوو، بۆیە ڕەحمەت و حیکمەتی خوا لەو ڕووەوە زۆر بەرجەستەیە، کە خوا بۆ نەگۆڕەکان (ثوابت) چۆتە نێو وردەکارییەکانەوە، بەڵام بۆ گۆڕاوەکان (متغیرات) بە کورتیی فەرمایشتی فەرمووەو، یەك بازنەی گشتیی‌و فراوانی دیاریی کردوە، لێرەشدا دیسان جارێکی دی ڕەحمەت و حیکمەتی خوای پەروەردگار دەدرەوشێتەوەو، چونکە خوای کاربەجێ، ئەگەر لەو شتانەدا کە زۆر دەگۆڕێن، چووبایە نێو وردەکارییەکانەوەو چووبایە نێو تەفاصیلەوەو نوختەی خستبایە سەر پیت، لە دوو حاڵەت بەدەر نەدەبوو:

١- یان دەبوو ئەو کاتە کە قورئان دابەزیوە بۆ کۆمەڵگای یەکەم، قاڵبێکی داڕشتبایە، کە بەتەئکید ئەو کاتە ئەو قاڵبە بەکەڵکی قۆناغەکانی دواتر نەدەهات .

٢- یان دەبوو بە پێی دوا قۆناغی گەشەسەندنی ژیانی ئینسان، چوار چێوەیەکی دانابا و قاڵبێکی دانابا ، کە ئەو کاتە بە تەئکید ئەو قاڵبە بە کەڵکی دوا قۆناغی گەشەکردنی ژیانی مرۆڤ ـ دەهات، بەڵام بەکەڵکی قۆناغەکانی دیکە نەدەهات، بەڵام خوای پەروەردگار هیچ کام لەو دوانەی نەکردوە، بەڵکو چەند هێڵێکی گشتی داناون و چوارچێوەیەکی فراوانی داناوەو فەرموویەتی بەس لە وچوارچێوەیە دەر مەچن، وەك دوایی باسی دەکەین، بۆ وێنە: مسوڵمانان دەبێ بە ڕاوێژ کاروباری خۆیان بەرێوە بەرن‌و هیچ کەس بۆی نیە بەپێی حوکمی میراتیی و خۆسەپاندن بەڵێ: مـن ئیمتیاز و پلەم هەیە بەسەرتاندا، بەڵکو دەبێ بەهەموویان وڵاتەکەیان بەڕێوە بەرن، بەڵام چۆنی بەڕێوە دەبەن‌و

چۆن ڕاوێژ دەکەن؟ وردەکارییەکانی بەجێهێشتوون بۆ مرۆڤـــــ خۆی، بۆ قۆناغە جیاجیاکان و هەل و مەرجە جیاجیاکان .

بۆیە ئێمە زۆر بە ڕوونیی وەڵامی ئەو پرسیارە دەدەینەوەو دەڵێین: نەخێر، بە هۆی سەروەرێتیی باڵاو ڕەهای خوای بەرزو مەزنو شەریعەتەکەیەوە، لە ژیانی بەشەردا، دەست و پێی مرۆڤـــــ ناگیرێ، لە بواری دنیاداریی و دەوڵەتداریی و بەڕێوەبردنی وڵاتیاندا، چونکە شەریعەتی خوا چەند هێڵێکی گشتییو چەند بەهایەکی بەرزی داناونو چوارچێوەیەکی فراوانی دیاریی کردوەو، لەو چوارچێوە فراوانەداو لە بەر ڕۆشنایی ئەو بەها بەرزو هێڵە گشتییانەدا، مرۆڤـــەکان بۆیان هەیەو دەستیان کراوەیە، کە ژیانو گوزەرانی خۆیان ڕێك بخەن.

## پرسیار و ئیشکالی دووەم:

پرسیارێکی دیکەش دەگونجێ لە زەینی هەندێك کەسدا سەرهەڵدات، ئەویش ئەوەیە: چۆن چۆنی مرۆڤـــ لە سایەی حوکمی شەریعەتدا، دەتوانێ یاسا دابنێو بۆ خۆی یاساو بڕیاری پێویست بۆ ڕێکخستنی ژیانی خۆی دەر بکات؟! چونکە ئێمە باسمان کرد کە سەروەریی خوای کاربەجێو سەروەریی شەریعەتەکەی، سەروەرییەکی یاساییە، نەك سیاسیی، چونکە سەروەری سیاسیی بەدەست خەڵکەوەیە، واتە: ئەوە خەڵکن کە خۆیانو بەرپرسانی خۆیان و حوکمڕانانی خۆیان دادەنێن، بەڵام ئەو کاربەدەست و حوکمڕانانە، کە هەڵیان دەبژێرن و دایان دەنێن، دەبێ ملکەچ بن بۆ ئەو شەریعەتەی، کە خوا ناردوویەتی و ئەو شەریعەتەی خوایان بەسەردا پیادە بکەن، باسیشمان کرد، کە شەریعەتی خوای پەروەردگاریش لە بەرئەوەی لەزۆربەی لایەنەکانی ژیاندا بە هێڵە گشتییەکان ئیکتیفای کردوەو وردەکارییەکانی بۆ بەشەر بەجێهێشتوون ، بۆ مسوڵمانان خۆیان کە دایانبنێن، جا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئایا چۆن چۆنی ئینسانەکان دەتوانن یاسا دابنێنو بڕیار دەربکەن، لەبەر ڕۆشنایی شەریعەتو بنەماکانی شەریعەتداو لە چوارچێوەی دیاریی کراوی فراوانی شەریعەتدا؟ لە وەڵامدا دەڵێین: لە ڕێی ئیجتیهادەوەو لە ڕێی بەکارهێنانی عەقڵەوە، مرۆڤـــەکان دەتوانن ئەو بۆشاییانە پڕ بکەنەوە، ئنجا پێش ئەوەی بێمە سەر باسی بوارەکانی ئیجتیهاد، ئەو بوارانەی کە مسوڵمانان بۆیان هەیە

یاساو بڕیاریان تێدا دەربکەن لەبەررۆشنایی شەریعەتدا، دەمەوێ چەند بەڵگەیەکی کورت بهێنمەوە لەسەر ئەوە، کە مسوڵمانان لەسەریان پێویستە ئیجتیهاد بکەنو لەسەریان پێویستە کە وردەکارییەکانی دەوڵەتداریی و حوکمڕانییان لە بەر ڕۆشنایی بنەما نەگۆڕەکانی شەریعەتدا بخەنە ڕوو:

## بەڵگەکانی ڕەوایی ئیجتیهادکردن

### بەڵگەی یەکەم:

لە ئایەتی ژمارە (٣٨)ی سووڕەتی (الشورى)دا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾، لە درێژەی باسکردنی سیفەتەکانی کۆمەڵی مسوڵماناندا، پێش ئەوەی ببنە کۆمەڵگاو دەوڵەتیش، دەیخاتە ڕوو، کە کۆمەڵی مسوڵمانان پێویستە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانیان ئەوە بێ، کە کاروباریان بە ڕاوێژ بێ، خوا دەفەرموێ: ئەوانەی بەدەم فەرمانی پەروەردگاریانەوە چوون و، نوێژیان بەرپا کردو، کاورباریان بە ڕاوێژە و، لەوەی پێمان داون دەبەخشن. کەواتە: کاروبار بەڕێوە بردن بە ڕاوێژ، وەك نوێژ بەرپا کردن و ماڵبەخشین " کە زەکات گەورەترین جۆریەتی" لەسەر مسولمانان فەرزە، دیارە ڕاوێژ کردنیش، یانی ئیشێك دێتە پێش مسوڵمانان، ئەگەر دەقێکی شەرع لەبارەیەوە هەبێ پیادەی دەکەن، چونکە ڕاوێژ لەکاتێکدا دەکرێ کە دەقێکی شەرعیی ڕوون نەبێ، یان دەقێك هەبێ، بەڵام نەزانن چۆنی پیادە بکەن، ڕاوێژ بۆ ئەوە دەکرێ، کە چۆنیەتی پیادەکردنی ڕوون بکەنەوە، کەواتە: ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە، کە مسوڵمانان دەبێ ئیجتیهاد بکەن.

### بەڵگەی دووەم:

لە سووڕەتی (النساء) ئایەتی ژمارە (٨٣)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٞ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡۗ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَٱتَّبَعۡتُمُ ٱلشَّيۡطَٰنَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٣﴾ ﴾، واتە: کاتێك هەواڵێکیان بۆ هات، کە پەیوەندیی بە هێمنیی و ئاساییشەوە،

یان بە ترسەوە هەبوو، ئەوانە (کە دڵ نەخۆشن، یان ئیمان لاوازن) یەکسەر بڵاوی دەکەنەوە ﴿ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ﴾،وە ئەگەر گێڕابایانەوە بۆلای پێغەمبەر خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" و بۆ لای کاربەدەستانی مسوڵمانان، ئەوە ئەوانەیان کە توانای هەڵهێنجانیان هەیە، دەیانزانی ئایا ئەو هەواڵە بەکەڵکی بڵاوکردنەوە دێ، یان نا؟، کەواتە: ئێمە تەنانەت بۆ ئەوەش، کە فلانە هەواڵە بڵاوبکرێتەوە، یان بڵاونەکرێتەوە؟ بۆ ئەوەیش پێویستیمان بە کەسانێك هەیە کە یاسا هەڵدێنجنو بڕیار دەردەکەن، بۆ هەڵهێنجانی یاساو بڕیار لەبارەی ڕێکخستنی ژیانو گوزەرانەوە.

## بەڵگەی سێیەم:

بەڵگەیەکی دیکەش ئەو وتووێژەیە، کە لە نێوان پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"و موعازی کوڕی جەبەل خوا لێی ڕازی بێ ڕوویداوە، کاتێك کە دەینێرێ بۆ یەمەن، پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لێی دەپرسێ: {«**كَيْفَ تَقْضِي إِذَا عَرَضَ لَكَ قَضَاءٌ**»؟ **قَالَ أَقْضِي بِكِتَابِ الله. قَالَ: «فَإِنْ لَمْ تَجِدْ فِي كِتَابِ الله»؟ قَالَ فَبِسُنَّةِ رَسُولِ الله** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم". **قَالَ: «فَإِنْ لَمْ تَجِدْ فِي سُنَّةِ رَسُولِ الله** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" **وَلاَ فِي كِتَابِ الله»؟ قَالَ أَجْتَهِدُ بِرَأْيِي وَلاَ آلُو. فَضَرَبَ رَسُولُ الله** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" **صَدْرَهُ وَقَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى وَفَّقَ رَسُولَ رَسُولِ الله لِمَا يُرْضِي رَسُولَ الله »**} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٢١١٤) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف، وَرَوَاهُ أَيْضاً أَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٥٩٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٣٢٧) وَضَعَّفَهُ الشيخ الألباني في (ضعيف أبي داود) برقم: (٧٧٠)).

واتە: پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" پرسیاری لە (معاذ) کرد، کە ناردی بۆ یەمەن بە سیفەتی قازیی، فەرمووی: چی دەکەی ئەگەر کێشەیەکت هاتە بەردەم ؟ گوتی: دادوەریی دەکەم بەو پێیەی کە لە کتێبی خوادا هاتوە، فەرمووی: ئەگەر لە کتێبی خوادا بڕیار و یاسات دەستنەکەوت ؟ گوتی: بە پێی ڕێبازی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دادوەریی دەکەم، فەرمووی: ئەدی ئەگەر نەلە سوننەتی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ونەلە کتێبی خوادا دەستت نەکەوت؟ گوتی: بەبۆچونی خۆم و کۆشش دەکەم و کەمتەرخەمیی ناکەم، واتە: عەقڵی خۆم بەکار دێنم لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتی

پێغەمبەری خوادا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەستی لە سینگی داو فەرمووی: ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە نوێنەری پێغەمبەری خوای سەرکەوتوو کرد بۆ شتێك، کە پێغەمبەری خوا لێی ڕازییە. واتە: پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لەوە ڕازییە کە ئێمە بۆ هەر یاساو بڕیارێك، کە لە قورئاندا چنگمان نەکەوت و، لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" چنگمان نەکەوت، عەقڵی خۆمان بەکار بێنین‌و کۆشش بکەین.

## بوارەكانی ئیجتیهاد تێداكران:

١ – **بواری یەکەمی ئیجتیهاد کردن :** ئەوەیە کە لە ڕێی ئیجتیهادەوە یاسا گشتییەکانی شەریعەت بخرێنە سەر ڕەو ڕەوەی جێبەجێکردن، بۆ وێنە خوای زانا دەفەرموێ: ﴿...وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ...﴿٢٧٥﴾﴾البقرة، خوا کڕین و فرۆشتنی حەلاڵ کردوەو، سوودی قەدەغە کردوە. ئەوانە دوو یاسان: بازرگانیی حەلاڵە، سوودو ڕیبا حەرامە، بەڵام ئەوە پێویستیی بەوەیە کە بخرێتە سەر ڕەو ڕەوەو میکانیزمی بۆ دابنرێ، ئنجا ئەوە کاری ئیجتیهاد و کۆششی زانایانە.

وێنەیەکی دیکە: خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ﴿٣٨﴾﴾الشوری، کاروباری مسوڵمانان بە ڕاوێژە، ئنجا ئایا ئەو ڕاوێژە ڕاستەوخۆبێ، یان ناڕاستەوخۆ؟ کە نوێنەرانی خۆیان هەڵدەبژێرن، بە چ شێوەیەك بێ؟ ئایا هەندێکی بە ڕاستەوخۆو هەندێکی ناڕاستەوخۆبێ؟ ئەوە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ مسوڵمانان، کە ئیجتیهادی بۆ بکەن، بە پێی هەل و مەرجە گۆڕاو و جیاوازەکانی خۆیان.

٢ – **بواری دووەمی ئیجتیهاد :** ئەو یاساو بنەمایانەی شەریعەت، کە زیاتر لە تەفسیرێك هەڵدەگرن، دەبێ تەفسیر و لێکدانەوەیەکیان بۆ بکرێ‌و تەبەننیی بکرێ، کە بۆ ئەو کات و قۆناغە گونجاوە. ئێمە گەلێك ئایەتمان هەن، گەلێك فەرمایشتی

پێغەمبەری خوا "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَم" مان هەن، کە زیاتر لەواتایەك هەڵدەگرن، ئنجا ئیشی ئیجتیهادو ئیشی موجتەهیدانو کۆششکەران ئەوەیە، کە بێنن ئەو دەقانەی قورئان و سوننەت بەشێوەیەك تەفسیر بکەن، کە بۆ ئەو کاتەیان پێویستە ئەو مانایەیان بۆ لێك بدەنەوە، یاخود تەبەننیی بکەن، کە کاری ئەوکاتەیان، یان ئەو قۆناغەیانی پێ ڕایی دەبێ و، وەڵامی ئەو پرسیارەیانی پێ دەدەنەوە، کە لەو کاتەدا بۆیان هاتۆتە پێش.

٣ – **بواری سێیەمی ئیجتیهاد:** ئەوەیە ئەو بوارانەی کە شەریعەت بە بۆشی هێشتوونیەوە (واتە: نوختەی تێدا نەخستوونە سەر پیت)، ئەوە مانای وایە خوا "سبحانە وتعالی" بە مسوڵمانانی فەرمووە: خۆتان کۆشش بکەنو عەقڵی خۆتان بەکار بێنن، بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییانە، بۆیەش خوای زاناو توانا، لەوبوارەدا ڕێنمایی نەکردووینو یاساو ڕێسای دیاری کراویی بۆ دانەناوین، چونکە وەك پێشتر باسمان کرد، خوا زانیویەتی کە ئەگەر هەر یاسا و ڕێسایەك دابنێ، بەکەڵکی قۆناغێك دێ، بەڵام بۆ قۆناغێکی دیکە ڕەنگە ببێتە بەر بەست و کۆسپ لەبەردەمیاندا، وەك چۆن دینی شێوێندراوی نەصرانیی، بوو بە کۆسپ لەبەردەم ڕۆژئاواییەکانداو ناچار فڕێیاندا، بەڵام شەریعەتی خوای کاربەجێ:

یەکەم: ڕێی نەداوە هیچ کەس قسەی خۆی لە خەڵك بکاتە دین، تاکو ئەگەر بەکەڵکی سەردەمی خۆی هات، سەردەمێکی دیکە لە ڕێیاندا ببێتە کۆسپ و پەرچ ، بەڵکو قسەی هەر کەسێك هەرچەندە زۆر زانا بێ، شێوەی تێگەیشتنی ئەوە دەربارەی دینو ئەزموونی ئەوە دەربارەی دینداریی، بۆ هیچ کەسێك پابەندکەر (ملزم) نیەو دین تەنیا ئەو وەحییەیە، کە لە قورئانو سوننەتدا بەرجەستەیە.

دووەم: پاشانیش وەك گوتمان خوای پەنهانزان نەچووە قاڵبێك دابڕێژێ، کە ئێمە نەتوانین لێی دەربچین، بەبەڵگەی ئەوە کە شەریعەت ئەو بوارانەی بە بۆشیی هێشتوونەوە، کەواتە: دەستی خەڵك ئاوەڵایە کە بە پێی پێداویستی ژیانی خۆیان، لە بەر ڕۆشنایی بنەما بنەڕەتییەکانی شەریعەتدا، بێنن یاسا دابنێن، ئەوەی کە لەو حاڵەتەشدا دەبێتە سەنگی مەحەك، بریتیە لەوە کە تا چ ڕاددەیەك

بەرژەوەندییان بۆ دێتە دی‌و دادگەرییان بۆ دەچەسپێ، چونکە خوا "سبحانە وتعالى" هەموو پێغەمبەرانی "علیهم الصلاة والسلام" بۆ چەسپاندنی دادگەریی ناردوون، وەك باسمان کرد، حیکمەت لە هاتنی شەریعەتدا ئەوەیە، کە بەرژەوەندیی خەڵك، کە خۆی لە بەرژەوەندیی دنیاو دوا ڕۆژیاندا دەبینێتەوە، بێتەدی.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم کە ئاماژە بکەم بە قسەی یەکێك لە زانایان، کە (ابن عقیل الحنبلي)یەو (ابن القیم) لە کتێبی (الطرق الحُكْمية في السياسة الشرعية) لاپەڕە (٢٢)دا ئەو قسەیەی لێ نەقڵ دەکات، کە بە ڕاستی قسەیەکی زۆر بە جێیە، دەڵێ: (السياسة ُماكانَ فعلاً يكون معهُ الناس أقرب الى الصلاحِ وَ أبعَدَ عَنِ الفسادِ وان لَم يَضعُه الرسولُ ولا نَزلَ بِه وَحيٌ) واتە: سیاسەت بریتیە لە هەر کردەوەو هەر بڕیارێك، کە خەڵك بەهۆیەوە لە چاکە نزیکتر بن‌و لە خراپە دوورتر بن، هەرچەندە ئەو بڕیارو کردارە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" یش دای نەنابێ‌و وەحیشی لەسەر نەهاتبێ، واتە: هەر شتێك ببێتەهۆی ئەوەی کە خەڵك بەرەو چاکە بەرێ‌و لە خراپەیان دوور بخاتەوە، بەرەو سوودەکانیان بەرێ‌و لە زیانەکانیان دوور بخاتەوە، ئەوە سیاسەتێکی شەرعیی‌و ڕەوایە، چونکە بەرژەوەندیی (مصلحة) یانی: (دفع المَضارِّ وجلب المنافع) دوور خستنەی زیانەکان‌و هێنانە پێشی قازانجەکان، هەر شتێك سوودو قازانی خەڵك بێنێتە پێش‌و زەر و زیانیان لێ دوور بخاتەوە، ئەوە مەصلەحەتە، شەریعەتیش بۆ هێنانە دی بەرژەوەندیی خەڵك هاتوە، کەواتە: هەرشتێك دەقی لەسەر نەبێ، تەماشا دەکەین بەرژەوەندیی خەڵك چۆن دەستەبەر دەبێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە بەرژەوەندییەکە، بەرژەوەندیی ڕاستەقینە بێ‌و بەرژەوەندیی خەیاڵیی نەبێ‌و بەکردەوەو لەواقیعدا خەڵك بە هۆیەوە بەهرەمەند بن‌و لە زەرەرمەندیی دووربن.

ئنجا هەر (ابن القیم ) لە کتێبی پێشوویدا (الطرق الحكمية في السياسة الشرعية) لە لاپەڕە (٢٣)دا قسەیەکی جوان دەکات، دەڵێ: (فإن ظَهَرَت أمارات العدل وأسفر وجهه بأي طريقٍ كان، فثَمَّ شرعُ اللهِ و دينهُ) واتە: هەر کاتێك نیشانەکانی دادگەریی دەرکەوتن‌و ڕووی گەشاوەی دادگەریی دەرکەوت، بە هەرشێوەیەك لە شێوەکان بێ، ئەوە شەرعی

خوا و دینی خوا لەوێیە، واتە: دادگەریی لە کوێ بوو، شەرعی خواو دینی خوای پەروەردگار لەوێیە، بەهەر شێوازێك بێ.

هەر (ابن القیم) لە لاپەڕە (٢٢)ی هەمان کتێبدا وتوێژێکمان بۆ نەقڵ دەکات کە (ابن عقیل)ی حەنبەلیی لە گەڵ زانایەکی شافیعیی مەزهەبدا بوویەتی، ئەو زانا شافیعیی مەزهەبە گوتوویەتی: (لا سیاسة الا ما وافَقَ الشرع) واتە: هیچ سیاسەتێك ڕەوا نیە، مەگەر لەگەڵ شەریعەتدا بگونجێ، (ابن عقیل)یش گوتوویەتی: (فإن أردت: بقولكَ لا سیاسة الاّ ماوافق الشرعُ، أي لم يخالف ما نطَقَ بِهِ الشرعُ ، فصَحيحٌ و إن اردت لا سیاسة الاّ مانطَقَ به الشرعُ، فغَلَطٌ وتغلیط للصحابة) قسەکەی زۆر جوانە دەڵێ: ئەوە کە دەڵێی: هیچ سیاسەتێك ڕەوا نیە، مەگەر موافیقی شەرع بێ، ئەگەر مەبەستت ئەوەیە، کە پێچەوانەی ئەوە نەبێ، کە شەرع قسەی دەربارە کردوەو لەگەڵی تێك نەگیرێ، ئەوە ڕاستە، بەڵام ئەگەر مەبەستت ئەوەبێ هیچ سیاسەتێك ڕەوا نیە، مەگەر ئەوە کە شەرع بۆ خۆی قسەی لە بارەوە کردبێ، ئەوە هەڵەیەو بەهەڵەدانانی هاوەڵانیش. بەڵێ: لە بواری سیاسەتداو، لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا بەگشتیی گرنگ ئەوەیە، کە لەگەڵ دەقێکی شەرعییدا تێك نەگیرێین، نەك ئێمە ناچاربین لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا " کە حوکم و سیاسەت بەشێکیەتی" بۆ هەر مەسەلەیەك دەقێکی شەرعیی بێنینەوە، بۆ وێنە: زانایان لەوبارەوە کەوتوونەتە مشتومڕەوە "وەك لە باسەکانی ڕابردوودا باسمان کرد" ئایا دانانی حوکمڕانان: خەلیفە، ئەمیر، سوڵتان، حوکمڕانێك، کە کاروباری مسوڵمانان ڕێك بخات، فەرزە، یان فەرز نیە؟ ئنجا کە فەرزە، بەعەقڵ زانراوە، یان بەوەحی؟ کە وەك پێشتر " لەتەوەری یەکەمدا" باسمان کردوەو خستوومانەتە ڕوو، پێویست بە مشتومڕ ناکات، چونکە ئەوە لە بەڵگە نەویستەکانە، کە ژیانی خەڵك بە بێ هەبوونی حوکمڕانێكو بە بێ هەبوونی دەستەڵاتێك ڕێك ناکەوێ، ئنجا ئەوەش کە عەقڵ بە ئاشکرا دەلالەتی لە سەر دەکات، پێویست ناکات شەرع بیهێنێ، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار لە قورئان دا نەیفەرمووە: دەبێ پۆشاك و بەرگێگ لە بەربکەنو خۆ لە سەرماو گەرما بپارێزن! چونکە ئەوە شتێکە، عەقڵی مرۆڤ دەیزانێ، کە ئینسان لە ڕێی عەقڵەوە پێی دەگا،

شەریعەت نەهاتوە خۆی پێوە ماندوو بکات، مەگەر ڕێنمایی گشتی دابێ، بەڵام ئەوەی کە عەقڵ دەرکی ناکات، شەرع قسەی لەبارەوە کردوە.

کەواتە: لە بواری حوکم و سیاسەتدا گرنگ ئەوەیە لەگەڵ شەریعەتدا تێکگیران نەبێ،نەك حەتمەن دەقی شەرعیی بۆ هەموو مەسەلەیەك هەبێ.

لێرەشدا کۆتایی بەتوێژینەووەمان لەبارەی بنەمای یەکەمی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامییەوە دێنین.

مەبەستمان لە دەسەڵات لێرەدا دەسەڵاتی سیاسییە، واتە: حوکمڕانیی کردنو بەڕێوەبردنی وڵات، کە ئەویش بە چی دەبێ؟ بە دانانی بەرپرسان و مشوورخۆران لە هەر سێ بوارەکانی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەریی (التشریع و التنفیذ والقضاء)دا، ئنجا ئایا مافی کێیە کە کار بەدەستانێك بەرپرسانێك دابنێ بۆ یاسادانان، (تشریع) کەسانێك هەبن یاسا دابنێنو بڕیار دەربکەنو مشور بخۆن، وە بۆ ڕاپەڕاندن (تنفیذ) کەسانێك هەبن کە ئەو یاسا و بڕیارانە جێ بەجێ بکەن، وە بۆ دادوەریی (قضاء) کەسانێك هەبن کە لە کاتی کێشە و مشتومڕی خەڵکدا دادوەریی بکەن، ئەو هەقە هەقی کێیە؟!؟ بێگومان مافی خەڵکەو دەستەڵاتی خەڵکە، یانی:(دەستەڵاتی سیاسیی)، بەڵێ سەروەریی هی خوایە "سبحانه وتعالی" کە لە شەریعەتەکەیدا بەرجەستە دەبێ، بەڵام دەستەڵات و سوڵتە بە دەست خەڵکەوەیە، لە ڕابوردویشدا باسمان کرد کە لە سیستەمی سیۆکراسییدا سەروەریی یاسایی، وە سەروەریی سیاسیی هەردووکیان بەدەستی چینێکەوە بوون، چینی (ئەکلیرۆس) یان: پیاوانی ئایین، کەسانێك کە خۆیان بە نوێنەرو سێبەری خوا دەزانی، بەڵام لە ئیسلامدا دەستەڵات (سلطة) بە تەواویی هی خەڵکەو سەروەریی (سیادة)یش هی خوایە "سبحانه وتعالی" نەك هی توێژێكو دەستەیەك، کە ئەویش لە شەریعەتەکەیدا بەرجەستەیە.

ئنجا لەو بارەوە کە دەستەڵات (سلطة) لە دەوڵەتو قەوارەی ئیسلامییدا هی خەڵکە، بەڵگە زۆرن: یەکێکیان ئەوەیە کە ئەگەر تەماشا بکەین سەرجەم دواندنەکانی قورئان ڕوویان لە کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمانانە.

١- بۆ وێنە: خوا "عز وجل" لە سوورەتی (النساء) لە ئایەتی (٥٨)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴿٥٨﴾ ﴾، خوای دادگەر ڕوو لە خەڵكو جەماوەرو کۆمەڵگای مسوڵمان دەکات و دەفەرموێ: خوا فەرمانتان پێدەکات کە سپاردەکان بگێڕنەوە بۆ خەڵکی خۆیان، وە هەر کاتێك دادوەرییتان لە نێوان خەڵك دا کرد

بە شێوەیەکی دادگەرانە دادوەریی بکەن، ئەوە باشترین شتێکە کە خوا ئێوەی پێ ئامۆژگاریی دەکات، بێگومان خوا بیسەری بینەرە ، کەواتە: خوای کاربەجێ فەرمان دەکات بە مسوڵمانان کە سپاردەکان بگێڕنەوە بۆ ئەهلی خۆیان، ئنجا هەرچەندە وشەی (أمانات) کۆی (أمانة)یە، واتە: سپاردەکانو هەموو جۆرە ئەمانەتێك دەگرێتەوە، بەم لە ڕاستیدا لێرەدا بە پێی سیاقی ئایەتەکان دەردەکەوێ کە مەبەست پێی بەرپرسیارێتییەکانە، واتە: خوا فەرمان دەکات بە کۆمەڵگای مسوڵمان کە ئەمانەتی بەرپرسیارێتییو مشورخۆرێتیی بەخەڵکی شایستە بسپێرن، وەدوایی فەرمان دەکات بەوانەش کە ئەمانەتی حوکمڕانییان پێ سپێردراوە، کە بەشێوەیەکی دادگەرانە دادوەریی لە نێوان خەڵکدا بکەن.

٢- وە خوا هەر لە سوورەتی (النساء) لە ئایەتی (٥٩)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩ ﴾، خوای تاكو پاك ڕوو لە کۆمەڵگەی مسوڵمان دەکات و دەفەرموێ: ئەی ئەوانەوی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بکەن، وە فەرمانبەریی پێغەمبەر "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَم" بکەن، وە هی کاربەدەستانێك کە لەخۆتانن، ئنجا ئەگەر لە شتێکدا کەوتنە کێشەوە، بیگێڕنەوە بۆلای خواو پێغەمبەر "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَم" ئەگەر ئیمانتان بە خوا و بە ڕۆژی دوای هەیە، ئەوە بۆ ئێوە باشترەو سەرەنجامیشی چاکترە، وەك دیارە لێرەشدا خوا "سبحانە وتعالى" ڕوو لە ئیمانداران دەکات کە بەقسەی خوا بکەنو بە قسەی پێغەمبەری خوا "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَم" بکەن، وە بە قسەی کار بەدەستانێك بکەن کە لە خۆیانن، واتە: مسوڵمانن وە خۆشیان دایان ناون، وەدەشفەرموێ: هەر کاتێك کەوتنە کێشەو مشتومڕەوە دەربارەی شتێك، بیگێڕنەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەری خوا "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَم" واتە: بۆ لای قورئان و سوننەت، ئەگەر بڕواتان بە خواو بە ڕۆژی دوای هەیە، لێرەشدا ڕووی دواندن لە مسوڵمانانەو لەو کۆمەڵگایە بەگشتی، نەك لەچینو توێژێك، یان دەستەو گرووپێك.

٣- وە خوا لە سوورەتی (الأنفال) ئایەتی (٢٤)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە دەم بانگی خواو پێغەمبەری خواوە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بچن، هەر کاتێك بانگیان کردن بۆ شتێك کە دەبێتە مایەی زیندووبوونەوەتان، وە بزانن کە خوا دەکەوێتە نێوان مرۆڤ و دڵەکەیەوە (واتە: بەهۆی گوناه و تاوانەوە، پەردە پەیدادەبێ لە نێوان مرۆڤ و دڵ و عەقڵەکەیدا، زۆر جار مرۆڤ حەقیقەت نابینێ بە هۆی گوناح و تاوانەوە عەقڵو دڵەکەی دەرکی حەقیقەت ناکات، کەواتە: ئاگاتان لە لادان بێو ئاگاتان لە گوناحەکانتان بێ کە نەبێتە پەردە بەسەر عەقڵ و دڵتان هەڵبکشێ، وەسەرەنجام حەقیقەت نەبینن) وە ئاگاداربنو بزانن کە بۆ لای خوا کۆ دەکرێنەوە، واتە: وەڵام حازر بکەن بۆ بەردەم دادگای خوا، لێرەشدا دیسان خوای زاناو شارەزا بە گشتیی بانگی مسوڵمانان دەکات، کە بەدەم بانگی خواو پێغەمبەری خواوە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بچن، وە ئەو شەریعەتەی کە دەبێتە هۆی زیندووبوونەوەیانو دەبێتە هۆی ڕێكو ڕاستبوونی ژیانی دنیاو دوارۆژیان، بەدەمیەوە بچنو قبووڵی بکەنو پابەندی بن.

٤- وە لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی ژمارە (١)دا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِۚ ......﴿١﴾﴾ ئەی ئەوانەی ئیمانتان هەیە! وەفاداربن بە پەیمانەکان، بە گرێبەستەکان، دیارە وشەی (عقود)یش تێکڕای ئەو بەڵێنو پەیمانانە دەگرێتەوە کە مسوڵمانان لەنێوان خۆیاندا یان لەنێوان خۆیانو خوادا دەیاندەن.

وەخوا بەبێ جیاوازییو بەگشتیی دیسان ڕووی دواندنی لەتێکڕای مسوڵمانانە.

وە لە سوورەتی (الصف)یش لە ئایەتەکانی ژمارە (١٠ و ١١)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿١٠﴾ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿١١﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان

هێناوە! بازرگانییەکتان پێ بڵێم کە لە ئازارێکی بە ئێشتان دەرباز دەکات؟ بڕوا بـە خـواو پێغەمبەرەکەی بێنن وە لە ڕێی خوادا بە ماڵ و گیانتـان تێبکۆشـن، ئـا ئـەوە بـۆ ئێـوە چاکترە ئەگەر بزانن، لێرەشدا دیسان بۆ بەرگریی کردن بۆ خەبات و جیهاد کردن، خـوا ڕوو لە کۆی مسوڵمانان دەکات، نەك لە دەستەو تاقمێکیان.

شایانی باسیشە کە ئێمە خوا پشتیوان بێت لە تەوەرەیێکی سـەربەخۆدا "کـە تـەوەری سێیەمە" لە داهاتوودا باسی سێ دەستەڵاتەکانی: یاسادانان و جێبـەجێکردن و دادوەریـی لە دەوڵەتی ئیسلامییدا دەکەین، وە لەوێ بە ڕوونیی باسـی سـنووری دەسـتەڵاتی خـەڵك دەکەین، بـۆ چـۆنێتی دیـاریی کـردن و دانـانی بەرپرسـانی هـەر سـێ دەسـتەڵاتەکە، وە چاودێریی کردنیانو لێپێچانەوەیان، بۆیـە لێـرەدا بـەم ئەندازەیـە لێـی دەگـەڕێین، وە لـە بنەمای چوارەمیشدا: (ڕاوێژ بناغەی بەڕێوەبردنی کارەکانە) لەوێشـدا بـاس دەکـەین کـە خەڵك سنووری دەستەڵاتی تاکوێیە؟ کۆتایی ئەم باسەش بەقسەی یەکێك لـە شـارەزایانی بواری حوکم و سیاسەت دێنین، کە لە بـارەی دەسـتەڵات بەدەسـتی خەڵکـەوە بـوون، لـە سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامییدا پاش لێکۆڵینەوەیەکی ورد دەڵێ: (يَتَّضَحُ لَنا مما تقدم ان السيادةَ فِي الدولـة الإسـلامية تستندُ الى إرادةِ الأمـةِ الـتي تعمـلُ في نطـاقِ الشـريعة الغراء وتعتبر السيادةُ مُبَرَّرةً ومشروعةً علـى هـذا الأسـاس، فـاذا تجـاوَزَت السـيادةُ نطـاقَ أحكام الشريعة ولم تنسجِم مَعَ مَصْدَرِها، وهو إرادةُ الأمةِ، فَقَـدَتِ أسـاس مشـروعيَّتها)[1]، واتە: لەوەوە کە ڕابورد بۆمـان ڕوون دەبێتەوە کە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا سەروەریی پشـت بەئیرادەی گەل دەبەستێ، (ئەڵبەتە لێرەدا مەبەستی پـێ سـەروەریی سیاسـییە) کـە ئـەو سەروەرییەش لە چوارچێوەی شەریعەتی پاکدا کار دەکات، وە سەروەریی سیاسیی کاتێـك پاساودارو ڕەوا دەبێ، کە پشت بـەو بناغەیـە ببەسـتێ، وە هـەر کاتێـك سـەروەریی لـە چوارچێوەی حوکمەکانی شەریعەت چـووە دەرێ، وە لەگـەڵ سەرچـاوەکەیدا نـەگونجا (کـە بریتیە لە ویست (إرادة)ی خەڵك) خـەڵك ئـەوە بناغـەی ڕەوایـی بـوونی خـۆی لەدەسـت دەدات.

---

[1] - النظم السياسة: الدولة والحكومة، ص ٢١٣-٢١٨، د. محمد كامل ليلة.

کەواتە: سەروەریی سیاسیی- کە ئێمە ناومان ناوە دەسەڵات لە بەر ئەوەی (سەروەریی) ئەوەیە کە گشتگیربێ و بەردەوام بێ و هەمە لایەنە بێ، کە ئەوەش لە ڕاستیدا تەنیا لەگەڵ ئەو بەرنامەیەدا گونجاوە کە لەوەحی خوادا بەرجەستەیە، ئەمەیان پێی دەگوترێ سەروەریی (سیادة) ئەوەی دیکە لە ڕاستیدا دەسەڵاتەو دەسەڵاتیش هی خەڵکە، وە ئەو شەریعەتەیش کە پێویستە سەروەریی با و ڕەهای هەبێ، ئەویش تەنیا لە کاتێکدا پیادە دەکرێ کە خەڵك ئیمانو قەناعەتی پێی بێ، وەبڕیار بدات کە ژیانی خۆی بە پێی ئەوە ڕێکبخات-موڵك ومافی خەڵك وکۆمەڵگایە.

لێرەشدا دێینە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەمان لەبارەی دووەمین بنەمای سیستەمی حوکمڕانییەوە.

لە دەوڵەتێكو لە قەوارەیەكی سیاسییدا، كە ئیسلام تێیدا باڵادەستەو، سیستەمی حوكمڕانیی ئیسلامیی تێیدا فەرمانڕەوایە، هەمووﻻیەك چ وەك تاكەكان، چ وەك دامو دەزگایەكان، پێویستە ملكەچی دەستووربن، واتە: یاسای بنەڕەتیی،وە ملكەچی یاساكان بن، واتە: ئەو یاسایانەی كە لە دەستوورەوە هەڵدەهێنجرێن، بەواتایەكی دیكە: دەوڵەتی ئیسلامییو قەوارەی سیاسیی ئیسلامیی، قەوارەیەكی قانوونییە، وەك لە ڕۆژگاری ئێستاماندا بەو جۆرە دەوڵەت و قەوارانەی، كە پابەندن بە دەستوورەو پابەندن بە یاساكانەوە، هیچ كەس لە سەرووی یاساوە نابێ، پێیان دەڵێن: دەوڵەتی قانوونیی (الدولة القانونية)، دەوڵەتی قانوونییش بەچەند شێوەیەك پێناسە كراوە:

یەكێك لە زانایان بە ناوی (جیركە) كە دیارە قسەكەی تەرجەمەی عەرەبی كراوە، دەڵێ: (الدولة التي تُخْضِعُ نَفْسَها للقانون، وليست تلك التي تضع نفسها فوق القانون)[1].واتە: دەوڵەتی قانونیی ئەو دەوڵەتەیە، كە خۆی ملكەچ دەكات بۆ یاسا، نەك خۆی لە سەرووی یاساوە دابنێ.

(د.سەروەت بەدەویی) بەو جۆرە پێناسەی دەوڵەتی قانونیی دەكاتو دەڵێ: (القول بنظام الدولة القانونية معناه خضوع الدولة للقانون في جميع مظاهر نشاطها، سواء من حيث الإدارة أو القضاء أو التشريع، وذلك بعكس الدولة البوليسية حيث تكون السلطة الإدارية مطلقة الحرية في أن تَتَّخِذ قِبَلَ الأفراد ماتراه من الإجرائات محققةً للغاية التي تسعى اليها وفقاً للظروف والملابسات).

واتە: دەوڵەتی قانونیی واتە: ملكەچكردنی دەوڵەت بۆ یاسا لە هەموو چاﻻكییەكانیدا، لە هەموو جموجۆڵەكانیدا، چ لە ڕووی بەڕێوە بردنەوە، چ لە ڕووی دادوەرییەوە، چ لە ڕووی یاسادانانەوە، ئەویش بە پێچەوانەی دەوڵەتی پۆلیسییەوە، كە دەستەڵاتی ئیداریی‌و دەستەڵاتی جێبەجێكردن، ئازادیی ڕەهای دەبێ، لەوەدا كە لە

---

[1] - النظم والسياسة: د. ثروت بدوي، ص١٦٩.

بەرانبەر تاکەکاندا، هەر شێوە ئیجرائاتێك بگرێتە بەر، کە ئەو ئامانجەی پێ بێنێتە دی کە هەوڵی بۆ دەدات، بە پێی ئەو ژینگە و هەل و مەرجە، کە تێیدایە .

شایانی باسیشە کە بیرۆکەی دەوڵەتی یاسایی، پێش سەدەی شازدەیەم لە ئەورووپا و ڕۆژئاوا، هیچ باس و خواسی نەبوو، هەروەها لە دەوڵەتە پێشووەکان و لە شارستانیەتە پێشووەکانیشدا، بەهەمان شێوە باسی دەوڵەتی یاسا نەبووە، واتە: لە شارستانیەتەکانی مصر و فارس و هیند و چین، پاشان ئیغریقیی و ڕۆمانیی، ئەوانەی کە لە عێراقدا وەك: سۆمەریی و ئەکەدیی و ئاشووریی و بابلییەکان بوون، نەك هەر یاسا سەروەر نەبووە، بەڵکو زۆر جار حوکمڕان وەك خوا "سبحانه وتعالى" مامەڵەی لەگەڵ دا کراوە و پەرستراوە و ملکەچیی موتڵەقیی بۆ کراوە، وەك خوا "سبحانه وتعالى" لە سووڕەتی (القصص)دا دەربارەی فیرعەون بۆمان دەگێڕێتەوە لە ئایەتی ژمارە (٣٨)دا کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِي ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە: ئەی قسە بەدەست و قسە ڕۆیشتووەکان! جگە لە خۆم، پەرستراوێکی دیکەم بۆ ئێوە پێ شك نایەت! واتە: دەبێ هەر خۆم دەبێ پەرستراو بم.

هەروەها لە سووڕەتی (النازعات) ئایەتی (٢٤)دا هەر فیرعەون دەڵێ: ﴿ فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: گوتی: من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم، هەڵبەتە ئەوە هەر فیرعەونی میصر نەبووە کەوابووە، بەڵکو زۆربەی حوکمڕانەکان بەرگێکی پیرۆزیی خوایەتییان بە بەردا کراوە، ئەوە بەردەوام لە ئەورووپا بووە، هەتا سەدەی شازدەیەم، بەڵکو وەك لە باسەکانی پێشوودا باسمان کرد، سیستەمی ثیوکراسیی و حوکومەتی دینیی، یان حوکومەتی خوایی، بە ڕەواجترین شێوەی سیستەمی حوکمڕانیی بووە لە ئەورووپا، بەڵام ئایا لە کوێ و، لە کەیەوە ئەو بیرۆکەی دەوڵەتی یاسایی، واتە: ملکەچکردنی دەوڵەت و ملکەچکردنی دام ودەزگاکانی دەوڵەت و هەموو تاکەکان بۆ یاسا، سەری هەڵداوە؟ لە ڕاستیدا لە ئەورووپاو لە سەدەی شازدەیەمەوە سەری هەڵدا.

ئەویش دوای چی ؟ دوای ئەوە کە دوو دیاردە پەیدا بوون، بوونە ڕێخۆشکەر بۆ سەرهەڵدانی دیموکڕاسیی، بیرۆکەی گرنگی نێو دیموکڕاسیی، کە بریتیە لە گرێ بەستی کۆمەڵایەتیی (العقد الإجتماعي) ئەو دوو دیاردەیەش، کە بوونە زەمینە خۆشکەر بۆ پەیدابوونی بیرۆکەی گرێبەستی کۆمەڵایەتیی و، سیستەمی دیموکڕاسیی بەگشتی، ئەم دوانە بوون:

**دیاردەی یەکەم :** بانگەشەکردن بۆ حوکمی ڕەهای پادشایەکان، کە لەسەردەستی (میکیاڤیللی) بۆ یەکەم جار دەستی پێکرد، لەسەرەتای سەدەی شازدەیەمەوە، کە کتێبێکی نووسی بەناوی (میر)، ئنجا (میکیاڤیللی)و هاو وێنەکانی، ئەو بانگەشەیان بۆ حوکمی ڕەهای پادشایەکان دەکرد لەبەرانبەر حوکمی دەرەبەگایەتیی (الحکم الإقطاعي)دا. واتە: حوکمڕانیی ئەوانەی خاوەنی زەوی بوون و خەڵکیان دەکردە مسکێنی خۆیانو زۆر ستەمیان لەخەڵك دەکرد، سەرەنجام خەڵك لە کاردانەوەی ئەوەدا گوتیان: لە جیاتی ئەوەی هەر شوێنە کەسێك حوکمڕان بێت بەسەریەوەو خەڵکەکە بچەوسێنێتەوە، با لە هەموو وڵاتەکەدا ئەو موقاتەعانە[1] بخرێنە سەریەك و یەك دەوڵەتی بەهێز هەبێ و، کەسێك حوکمڕان بێت بەسەریەوەو بەشێوەیەکی بەهێز حوکم بکات.

**دیاردەی دووەم :** بریتی بوو لە سەرهەڵدانی ئازادیی ئایینی، ئەویش لە ئەنجامی ئەوەدا، کە کێشە و مشتومڕێکی زۆر لەنێوان کاسۆلیكو پرۆتستانت ،کە دیارە پرۆتستانتەکان لە کاسۆلیکەکان جیا بوونەوەو هەندێك تایبەتمەندیی خۆیان هەن:

١- پابەند نین بە پاپاوەو حیسابی زۆری بۆ ناکەن.

٢- بە شێوەی سەردەمیانە تەفسیری کیتابی پیرۆزی خۆیان دەکەن.

٣- بڕوایان بە ئازادیی بیروڕا هەیە.

هەروەها سەرهەڵدانی داواکردنی ئازادیی سیاسییو ئازادیی ئایینیو ئازادیی دەربڕینی بیروڕادا، بە تایبەت لەلایەن پرۆتستانتەکانەوە ئەوەش دیسان زەمینە

---

[1] - (المقاطعات) کۆی (مقاطعة)یە، واتە: زەمینو ناوچەیەکی دابڕێنراو و دەست بەسەردا گیراو لەلایەن بابایەکی دەستڕۆیشتووە کە بە (إقطاعي) ناوبراوە، بەکوردیی: دەرەبەگ.

خۆشکەرێك بوو بۆ پەیدابوونی دەوڵەتی یاسایی، کە کۆمەڵە یاسایەك هەبن، هەموو لا بۆیان ملکەچ بن.[1]

سەرەنجام لەسەدەکانی حەڤدەو هەژدەدا، کۆمەڵێك نووسەر و بیرمەندو فەیلەسووف چەند لێکۆڵینەوەکیان دەربارەی دەوڵەتی یاسایی و سەروەریی یاسا پێشکەش کرد، کە ئەوانیش لە نێو خۆیاندا دوو ئاراستەی جیاوازیان هەبوو، واتە: کۆمەڵێك بیرمەندو فەیلەسووف ئەو دوو دیاردەیە، کە پەیدابوون، بوونە هاندەریانو مایەی زەمینە خۆشکردن بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە لە تەرحکردنی سەروەریی یاسا، یاخود دەوڵەتێك، کە یاسا تێیدا سەروەر بێ.

**ئاراستەی یەکەم:** بریتیی بوو لە بانگەشە کردن بۆ حوکمڕانی ڕەها (الحاكم المطلق)، کە (هۆبز) لە ئینگلتەراو، (بۆسیۆ) لە فەڕەنسا نوێنەری ئەو بیرۆکەیە بوون، واتە داوایان دەکرد کە حوکمڕانی ڕەها هەبێ، بەڵام پابەندبێ بە یاساوە.

**ئاراستەی دووەم:** بانگەشەی دەکرد بۆ ئازادییو شۆڕش لەسەر حوکمڕانی ڕەهاو، پەسەند کردنی بنەماکانی دیموکراسیی، کە (جۆن لۆك) لە ئینگلتەرا (مونتسیکۆ) و (جان جاك ڕۆسۆ) لە فەڕەنسا نوێنەرایەتی ئەو بیرۆکەیان دەکرد.

واتە: بیرۆکەی یەکەم دەیگوت: دەبێت حوکمڕان دەسەڵاتی ڕەهای هەبێ، لەچوارچێوەی یاسادا، بەڵام بیرۆکەی دووەم دەیگوت: پێویستە حوکمڕان دەستبەستراو بێو، پابەند بکرێ و، بەپێی سیستەمی دیموکراسیی، بە ئیرادەی خەڵك بچێتە سەر حوکم، خەڵکیش بەسەریەوە چاودێر بێ.

ئەوە بە نیسبەت ئەورووپاو ڕۆژئاوا بەو شێوەیە، وردە وردە بیرۆکەی دەوڵەتی یاسایی سەری هەڵدا، کە وەك گوتمان: سەرەتا وەك ئێستا نەبووە کە هەموو کەس بڵێ: دەبێ یاسا سەروەربێو دەستوورێك هەبێ و یاساکان لەو دەستوورە هەڵبهێنجرێن، بەڵکو قۆناغ بە قۆناغ هاتوە، بەڵام بە نسبەت جیهانی ئیسلامییەوە دەتوانین زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی

---

[1] - تەفصیلێ و درێژەی ئەم ڕووداوە لە کتێبی: (النظم السياسية) لاپەڕە (١٥٦) وە کتێبی: (اصول الفكر السياسي والنظريات و المذاهب السياسية الكبرى) لاپەڕە (١٢٩) تا (١٤٤)دا هاتوە، کە هەردووکیان هی (د.ثروت بدوي)ین.

بڵێین: بە دە (١٠) سەدە بەر لە چەکەرەکردنی بیرۆکەی گرێبەستی کۆمەڵایەتیی و گێڕانەوەی سەروەریی و دەسەڵات بۆ خەڵك لە ئەورووپا، ئیسلام یەکەمین دەوڵەتی بنیات نا، کە بە کردەوە دەسەڵاتی دایە دەست خەڵك و هەرچی پیرۆزیی هەیە، کە لە ئەورووپاو لەوڵاتانی دیکەدا باو بووە بۆ حوکمڕانانیان بڕیار دەدا، ئیسلام هەر لە سەرەتاوە حوکمڕان و کار بەدەستانی بەپیرۆز (مقدس) دانەناوە، ئەوەی کە لە زاراوەی سیاسیی ئەمڕۆدا باوە: دارنینی پیرۆزیی لە دەسەڵات لەئیسلامدا دەسەڵات هەر پیرۆز نەبووە، تاکو پێویست بکات لێی دابڕنرێ!! [1] بەڵام بەداخەوە هەندێك لە نووسەرو ڕۆشنبیرانی خۆمان، نەزانانە یان زۆر زانانە، هەمیشە وەرەقەکان تێکەڵ دەکەن‌و، ئیسلام و غەیری ئیسلام تێکەڵ دەکەن‌و، مێژووی مسوڵمانان‌و غەیری مسوڵمانان تێکەڵ دەکەن! ڕاستە لە ئەورووپا حوکمڕان‌و دەسەڵاتداران بە پیرۆز دانراون، بۆیەش شۆڕشیان لە دژ کرا، کە پیرۆزیان لێ دابڕنرێ و، بکرێنەوە بە خەڵکی ئاسایی، بەڵام لە ئیسلامدا وەك ڕوونی دەکەینەوە، هەر لەسەرەتاوە حوکمڕان‌و دەسەڵاتداران، ئیمتیاز و پلەیەکی زیاتریان لە خەڵك پێ نەدراوە، بەڵکو هەروەك خەڵك تەماشا کراون، ئەوەندە هەیە، کە باری شانیان قورستر بووەو ئەرکیان گرانتر بووەو، خەڵکیش چاودێریی کردوون‌و بەسەریانەوە چاودێر بووە، بۆ ڕاستکردنەوە و لە کاتی پێویستیشدا بۆ لادانیان.

جا ئێمە سەرەتا چەند ئایەتێك بەبەڵگە دێنینەوە، لەسەر ئەوە، کە ئیسلام‌و سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی، یەکێك لە بنەما گرنگەکانی بریتیە لە پابەندیی بە دەستوور و یاساوەو، بەکردەوە یاسا سەروەرە بەسەر هەموو کەسێکەوە، پێویستە هەموو لایەك ملکەچ بن بۆ دەستوور و ئەو یاسایانەی، کە لەو دەستوورە هەڵدێنجرێن، کە دیارە هەم دەستوورەکەو هەم یاسایەکانیش لە بنەما و بنەڕەتەکانی شەریعەتەوە هەڵدەقوڵێن.

[1] - وەك لە کتێبی (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی..)دا بەدرێژیی باسمان کردوە، بڕوانە: چاپی سێیەم.

## بەڵگەکانی پێویستبوونی پابەندیی دەوڵەت بەدەستوور و یاساوە لەئیسلام دا:

١- لە سوورەتی (الجاثیة) ئایەتی (١٨)دا کە دیارە پێغەمبەری خوا "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَم" دەدوێنیٚ و دەفەرمویٚ: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾، واتە: ئنجا دوای ئەزموونی جوولەکەو نەصرانییەکان) تۆمان لەسەر بەرنامەیەك دانا لە لایەن خۆمانەوە، دەجا شوێنی بکەوەو شوێن ئارەزووی ئەوانە مەکەوە، کە نازانن، واتە: پێغەمبەری خوا "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَم" کە پێغەمبەری خوا بووە، مولزەم کراوەو پابەند کراوە بەوە، کە دوای بەرنامەیەك بکەویٚ، کە لە خواوە بۆی هاتوە، نەك بە کەیفی خۆی ڕەفتار بکات، لەگەڵ خەڵك و کۆمەڵگادا.

٢- لە سوورەتی (المائدة) لە ئایەتی ژمارە (٤٩)دا خوای گەورە دیسان پێغەمبەری خوا "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَم" دەدوێنیٚ و دەفەرمویٚ: ﴿ وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ ﴿٤٩﴾ ﴾، واتە: وەحوکمیان لە نێواندا بکە بەوە، کە خوا ناردوویەتە خوارو، بە دوای ئارەزووەکانیان مەکەوەو،وریا بە کە لات بدەن لە هەندێك لەوەی، کە خوا بۆی ناردوویتە خوار! کەواتە: پێغەمبەری خوا "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَم" پابەند بووە بەوەوە، کە ئەوەی لە خواوە بۆی دابەزیوە، بەوە بەڕێوە بچیٚ و حوکمڕانیی بکات.

٣- لە سوورەتی (الأحزاب) ئایەتی ژمارە (٣٦)دا خوای بیٚ هاوەڵ بە گشتی بە ئیمانداران دەفەرمویٚ: ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ ﴾، واتە: وە هیچ بڕوادارێکی پیاو وئافرەت بۆیان نیە، کاتێك خوا و پێغەمبەرەکەی "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَم" بڕیارێك دەردەکەن، لە لایەن خۆیانەوە سەرپشك بن، (واتە: سەرپشك بن: ئایا ئەو فەرمانەی خوا جێبەجیٚ دەکەن، یان نا؟) هەر کەسێك سەرپێچیی لە فەرمانی خواو

پێغەمبەرەکەی "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بکات، ئەوە زۆر بە ئاشکرایی گومڕابووە.

٤- لە سوورەتی (الممتحنة) لە ئایەتی ژمارە (١٢)دا خوای بەرزو مەزن ڕوو لە پێغەمبەری خۆی "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەکات و دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ يُبَايِعۡنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشۡرِكۡنَ بِٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡرِقۡنَ وَلَا يَزۡنِينَ وَلَا يَقۡتُلۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأۡتِينَ بِبُهۡتَٰنٖ يَفۡتَرِينَهُۥ بَيۡنَ أَيۡدِيهِنَّ وَأَرۡجُلِهِنَّ وَلَا يَعۡصِينَكَ فِي مَعۡرُوفٖ فَبَايِعۡهُنَّ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُنَّ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٢﴾ واتە: ئەی پێغەمبەر! هەرکاتێك ئافرەتانی ڕوادار هاتنە لات، پەیمانت لەگەڵ دەبەستن، کە هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشی خواو، دزیی نەکەن و، زینا نەکەن و، منداڵەکانی خۆیان نەکوژن و، بوختان نەکەن لە بەینی دەست و پێیاندا بوختان هەڵببەستن، لەچاکە دا سەرپێچیی لە فەرمانت نەکەن، لەو کاتە دا پەیمانیان لەگەڵ ببەستە، داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکە، بێگومان خوا لێبوردەی بەبەزەییە.

جێی سەرنج ئەوەیە، کە خوای زانا دەشزانێ کە موحەممەد "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" پێغەمبەری خۆیەتی و پابەندە بەشەریعەتەوەو پارێزراوە لە هەڵە، بێجگە لە چاکە، فەرمان بە هیچ شتێك ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا پابەندیی ئافرەتان بە فەرمانی پێغەمبەری خواوە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەبەستێتەوە بەوەوە، کە لە شتی چاکەدا لە قسەی دەرنەچن، واتە: ئەگەر گریمان پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" شتێکی خراپیان پێ بڵێ، ئەوان لەسەریان پێویست نیە بە قسەی بکەن! دیارە پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" هەرگیز فەر مانی خراپ بە خەڵك ناکات، بەڵام لێرەدا مەبەست ئاگادارکردنەوەی مسوڵمانانە لەبواری چۆنیەتی هەڵس‌و کەوتیان لەگەڵ بەرپرس‌و حوکمڕاناندا.

واتە: ئەوە بۆ ئەوەیە، کە وەك گوتراوە: دیوار لەگەڵ تۆمە، گوێسوانە گوێت لێ بێ، بۆ ئەوەیە کە ئەوانەی بە دوای پێغەمبەری خوادا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دێن، لە حوکمڕان و دەسەڵاتداران، بزانن کە بە قسە بۆ کرانیان‌و فەرمانبەریی بۆ کرانیان لەلایەن خەڵکەوە بێ مەرج‌و ڕەها نیە، بەڵکو پابەندە بە شەریعەتەوە، ئەوەتا تەنانەت پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" خوا پێی فەرمووە: ئافرەتان پەیمانت لەگەڵ دەبەستن، کە لە شتێکدا چاك بێ بە قسەت بکەن، بەڵام لە شتێکدا کە چاك نەبێ، بە قسەی پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ناکرێ، چ جای بە قسەی غەیری ئەو!.

٥- لەسوورەتی (الشعراء) لە ئایەتەکانی ژمارە (١٥١ و ١٥٢)دا خوای بێ هاوەڵ دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُطِيعُوٓاْ أَمۡرَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا يُصۡلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ ﴾، لە سەر زمانی یەکێك لە پێغەمبەران کە (صالح)ە "سەلامی خوای لێبێ، دەفەرموێ، وەفەرمانبەریی فەرمانی زێدەڕەوان مەکەن، ئەوانەی کە خراپە دەکەن لە زەویداو چاکسازیی ناکەن، کەواتە: مسوڵمانان لێیان قەدەغەیە کە فەرمانبەریی کەسێك بکەنو ئیتاعەی حوکمڕانو سەرۆکێك بکەن، کە خراپە دەکات لە زەویداو چاکسازیی ناکات و، زیادە ڕۆیی دەکات.

٦- لە سووڕەتی (البقرة) لە ئایەتی (٢٢٩)دا خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعۡتَدُوهَاۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ ﴾، دوای ئەوەی خوا چەند شتێك باس دەکات دەفەرموێ: ئەوانە سنوورەکانی خوان مەیان بەزێنن، هەر کەسێك سنوورەکانی خوا ببەزێنێ، ئا ئەوانەن ستەمکار، کەواتە: هەر کەسێك سنووری خوا ببەزێنێ، حوکمڕان بێ، یان حوکم بەسەردا کراو، ئەوە ستەمکارە.

لە سووڕتی (المائدة) لە ئایەتەکانی (٤٤ و ٤٥ و ٤٧)دا خوای زانا دەفەرموێ:

﴿ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾،﴿ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾، ﴿ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: وە هەر کەسێك حوکم نەکات بەوە، کە خوا ناردوویەتە خوار، ئا ئەوانەن کافران، هەر کەسێك حوکم نەکات بەوەی، کە خوا ناردوویەتە خوار، ئا ئەوانەن ستەمکاران، هەر کەسێك حوکم نەکات بەوەی، کە خوا ناردوویەتە خوار، ئا ئەوانەن فاسقان و لە ڕێ دەرچوان، دیارە ئەو کافر بوون و زاڵم بوون و فاسق بوونە، هەرکامێکیان لە کات و شوێنی خۆیدا، کە ئێستا بواری چوونە نێو ئەو وردەکارییانەمان نیە، بە م گرنگ ئەوەیە خوا "سبحانە وتعالی" بە گشتی دەفەرموێ: هەر کەسێك حوکم نەکات بەوەی، کە خوا ناردوویەتە خوار، لە هەندێك حاڵەتدا کافر

دەبیٚو، لە هەندیٚك حاڵ دا بە ستەمكار لە قەڵەم دەدریٚ، لە هەندیٚك حاڵ دا بە فاسق و لەڕیٚ دەرچوو لە قەڵەم دەدریٚ. [1]

## مەرجەكانی دەوڵەتی یاسایی

ئنجا ئایا دەوڵەتی یاسایی (الدولة القانونية) مەرجەكانی چین‌و چۆن دەوڵەتی یاسایی دیٚتە دی؟! پسپۆڕان و شارەزایانی بواری یاساو، بواری دەوڵەتداریی دەڵیٚن: چوار مەرج هەن، بۆ هەر قەوارەیەكی سیاسیی‌و، هەر دەوڵەتیٚك كە بیەویٚ بە دەوڵەتیٚكی یاسایی لە قەڵەم بدریٚ:

١ - هەبوونی دەستوور: دەبیٚ دەستووریٚك هەبیٚ (كە دوایی پیٚناسەی دەستوور دەكەین، هەرچەند لە ڕابوردوشدا پیٚناسەمان كردوە)، كە یاسای بنەڕەتیی (القانون الأساسي)یشی پیٚ دەڵیٚن.

٢ - ئەوەیە كە پلە پلەیی لە بنچینە یاساییەكاندا هەبیٚ (التدرج في القواعد القانونية) واتە: یاسای بەرزترو یاسای دوای ئەو و هی دوای ئەو هەبن.

٣ - ئەوەیە كە ئیدارە و شیٚوەی بەڕیٚوەبردن، پابەند بیٚ بە یاساوە (خضوع الإدراة للقانون).

٤ - ئەوەیە كە دان بهیٚنریٚ بە ماف و ئازادییەكانی هەموو تاكەكاندا.

بەڵیٚ، دەوڵەتی یاسایی ئەو دەوڵەتەیە كە ئەو چوار مەرجەی تیٚدا بیٚنە دی.

ئنجا ئیٚمە ئیٚستا پیٚناسەی هەركام لەو چوار مەرجانە دەكەین و، تیشك دەخەینە سەر گرنگییەكەیان و، هۆی بەمەرج گیرانیشیان بۆ پەیدابوونی دەوڵەتی یاسایی، پاشانیش باسی ئەوە دەكەین، كە ئایا دەوڵەتی ئیسلامیی، ئەو چوار مەرجانەی تیٚدا هەن، تاكو بەدەوڵەتیٚكی یاسایی لەقەڵەم بدریٚ یان نا؟.

---

[1] - ئەوە لەسەر ڕای زۆربەی زانایان، بەڕای هەندیٚك لە زانایانیش، كە منیش ئەو ڕایەم پیٚ ڕاستە، تەفسیری ئەو سیٚ ئایەتە ئەوەیە كە ئەوانەی حوكم بە شەریعەتی خوا ناكەن، بە ئیعتباریٚك كافرن و، بە ئیعتباریٚكی دیكە ستەمكارن و، بە ئیعتباریٚكی دیكەش فاسقن.
بڕوانە: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی.. بەرگی چوارەم.. وە تەفسیری قورئانی بەرز و بەپیٚز. بەرگی چوارەم (سووڕەتی المائدە)، وە (الاسلام كما يتجلى في كتاب الله) ج٢ و ج٧.

١- **هەبوونی دەستوور:** دەستوور چییە؟ دەستوور وەك (د. وحید رأفت)و (وایت ابراهیم) لە كتێبی (القانون الدستوري) لە لاپەرە (٣)دا پێناسەیان كردوە دەڵێن: (الدستور: مجموعةُ القواعدِ الأساسية التي تبينِ شَكلَ الدولةِ ونظام الحكمِ فيها ومدى سُلطَتها إزَاءِ الأفراد) واتە: دەستوور بریتیە لە كۆمەڵێك بنچینەی بنەڕەتیی، كە شێوەی دەوڵەت و شێوەی سیستەمی حوكمڕانیی لەو دەوڵەتەدا و، ئەندازەی دەسەڵاتی دەوڵەت بەرانبەر بە تاكەكان، ڕوون دەكاتەوە.

گرنگیی هەبوونی دەستوور بۆ پەیدابوونی دەوڵەتی یاسایی، لە چ ڕوویەكەوەیە؟ لەو ڕووەوەیەكە چەند بنچینیەك دادەنرێن بۆ سنوور داركردنی دەسەڵاتی سیاسییو دەوڵەت و دام و دەزگاكانی و، دیاریی كردنی مافەكانی دەوڵەتو سنووری دەسەڵاتەكانی، پاشان بڕیاری ماف و ئازادییەكانی تاكەكان دەدات، كە دەبێ لە لایەن دەوڵەتەوە دابین بكرێنو بپارێزرێن.

ئنجا وەك زانیارییەكی مێژوویی: بە نسبەت ئەورووپا و ڕۆژئاواوە، یەكەمین دەستوور وەك شارەزایان دەڵێن: دەستووری فیلادلفیای ئەمریكا بوو، كە لە ساڵی (١٧٨٧)ز دا هاتە دی، دووەم دەستووریش، دەستووری پادشای فەرەنسا بوو، كە لە ساڵی (١٧٩١)ز واتە: دوای شۆڕشی فەرەنسا هاتە دی.

٢ - **پلە پلەیی بنچینە یاساییەكان:** ئەمیش بەم شێوەیە پێناسە كراوە كە (د.فؤاد العطار) لە كتێبی (النظم السياسية و القانون الدستوري) لاپەڕە (٢٣١)دا هێناویەتی، دەڵێ: (القوانين تتدرج قوة وضعفاً بحسب السلطةِ التي أصدرتها وتأتي القواعدِ الدستورية فى قمة هذا الهَرم ثم تأتي قواعدُ القوانين العادية، ثم القرارات التنظيمية) واتە: مەبەست لە پلە پلەیی بنچینە یاساییەكان ئەوەیە، كە یاسایەكان لە ڕووی بەهێزییو كەم هێزییەوە پلە پلە ڕیز بەند دەكرێن، بەپێی ئەو دەستەڵاتەی، كە یاسایەكانی دەركردوە، بنچینە دەستوورییەكان لە سەری سەرەوە دادەنرێن، لە دوای وان بنچینە یاساییەكانی دیكەی ئاسایی، پاشان بڕیارە ئیدارییەكان.

ئنجا ئایا گرنگیی ئەم مەرجە لە چی دایە؟ لەوەدایە كە بۆ پەیداكردنی

دەوڵەتێکی یاسایی، بەپێی ئەم مەبدەئە، وەك (د.ثروت بدوي) لە كتێبی (النظم السياسية) لە لاپەڕە (١٧٦ و ١٧٧)دا دەڵێ: (لا يَجوز للقاعدةِ الأدنى ان تتعارض مع القاعِدة الأعلى منها، و بالتالي فإن أي قانونٍ يتعارض مع الدستور يعتبر باطلاً إعمالاً لمبدأ تدرّج القاعدة القانونية) واتە: بە پێی ئەم بنچینەیە، ناگونجێ بنچینەیەکی خوارتر دژ بوەستێ لەگەڵ بنچینەیەکی لە خۆی سەرتردا.

بۆیە هەر یاسایەك لەگەڵ دەستووردا تێك بگیرێ، بە پووچ لەقەڵەم دەدرێ، بە پێی مەبدەئی پلە پلەیی بنچینەی قانونیی.

٣- **ملکەچیی ئیدارە بۆ یاسا:** ئەمیش بەم جۆرە پێناسە کراوە، وەك کتێبی: (نظرية الدولة وآدابها في الإسلام)ی (د. سمير عالية) لە لاپەڕە (٩٨)دا دەڵێ: (وهو يَعني عَدَمُ جواز اتخاذ الإدراة لأيِّ إجراءٍ الا بمقتضى القانون و تنفيذاً لَهُ لأن القانون الصادر عن المجلس النيابي هو الممثل للشعب و يتعَيَّنُ على الكل الخضوعُ لأحكامه العامة والمجردة التي تُحَقِّق المساواة والعدالة للجميع) واتە: مەبەست لە ملکەچیی ئیدارە بۆ یاسا (واتە: شێوەی بەڕێوەبردنی دەوڵەت بۆ یاسا) ئەوەیە کە ئیدارەو دەوڵەت و دامەزراوەکانی، بۆیان نیە هیچ بڕیارێك دەربکەن، مەگەر بە پێی یاساوجێ بەجێ کردنی یاسا، چونکە ئەو یاسایەی کە لە ئەنجوومەنی نوێنەران دەردەچێ،کە بەنوێنەری خەڵك و میللەت لەقەڵەم دەدرێ، بۆیە لەسەر هەموولایەك پێویستە ملکەچ بن بۆ بڕیارە گشتیو بێ جیاوازییەکانی، کە لەئەنجامدا یەکسانیی و دادگەریی بۆ هەموو لایەك فەراهەم دێنن.

گرنگیی ئەم بنەمایەش لەوەدایە، کە ڕێگا لە حوکمڕانانو کاربەدەستان دەگرێ، کە میزاجیان بکەن بە یاساو، بە کەیفی خۆیان وڵات بەڕێوە بەرنو فەرمان بەسەر خەڵکدا بکەن.

٤ - **دانهێنان بە ماف و ئازادییە تاکییەکاندا:** ئەم بنەمایەش مەبەست پێی ئەوەیە کە مرۆڤەکان وەك خودی خۆیانو بەبێ لەبەرچاوگرتنی دین و فیکر و ڕەچەڵەك و ڕەگەز و ڕەنگ و زمان، وەك خودی خۆیان، هەرکامێکیان چەند ماف و ئازادییەکیان هەن، پێویستە دانیان بۆ پێدا بهێنرێنو بۆیان دابینبکرێن، چونکە

ئامانج لە بوونى دەوڵەت بە پلەى يەكەم ڕێز لێگرتنى مرۆڤـــــەكانو دابينكردنــى مافەكانيانو ئازاديەكانيان، وە فەراهەمهێنانى ژيانێكى وايە كە تێيــدا بەختــەوەر بن، وەك كتێبى: (النظم السياسـية) لە لاپەڕە (١٧٨)دا هێناويەتى، وەگرنگيى ئەم بنەمايەش بۆ هێنانە دى دەوڵەتێكى ياسايى لەو ڕووەوەيە كە هەر لە ڕێوە دان بــە ماف و ئازادييەكانى تاكەكاندا دێــنێ، ديــارە وەختێــك كــە تاكــەكانى كۆمــەڵگا هەركامێكيان بزانێ كە ئەو مافانــەى هــەنو ئــەو ئازادييانــەى هــەن، ئــەو كاتــە پێشێلكرانيان لە لايەنى دەوڵــەت و دامــەزراوە و دەزگاكانيــەوە ئاسـان نـابێ، وە خەڵك لەسەر مافەكانى خۆيان وە دەنگ دێن.

*****

# ئیسلام و دەوڵەتی یاسایی

ئێستا کە پێناسەی دەوڵەتی یاساییمان کردو، هەر چوار مەرجەکەیمان باس کردن، با تەماشا بکەین، ئایا لە سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامداو لە دەوڵەتێکدا ،کە بە پێی ئیسلام بەڕێوە دەچێ، ئەو چوار بنەمایە چنگ دەکەون، کە دروستبوون و بنیاتنانی دەوڵەتی یاسایی پەکی لەسەریان دەکەوێ؟ با سەرنج بدەین:

## ١) مەرجی یەکەمی دەوڵەتی یاسایی: هەبوونی دەستوور

وەك پێشتر باسمان کرد یەکەمین مەرجی دەوڵەتی یاسایی، هەبوونی دەستوورە، لەڕاستییدا دەستوور بناغەیە بۆ مەرجەکانی دیکەش، چونکە لە دەستووردا هەموو شتەکانی دیکە دیاریی دەکرێن.

ئنجا ئایا لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، هەر لە سەردەمی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"و هەتا دوایی، دەستوورێك هەبووە، یان چەند بنەمایەکی دەستووریی هەبوون، کە دەوڵەت پێیانەوە پابەند بێ، یان نا؟ زۆرێك لە زانایان و پسپۆڕانی بواری حوکم و سیاسەت ئەو صەحیفەیەی، کە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لەنێوان مسوڵمانان و جوولەکەو هاوبەش دانەراندا لە مەدینەدا نووسی، بەیەکەمین دەستووری نووسراوی دادەنێن، چونکە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کە چوو بۆ مەدینە، وەك لە تەوەری ڕابردوودا باسمان کرد، چەند کارێکی گرنگی کردن، یەکێکیان، یاخود گرنگترینیان ئەوەبوو، کە صەحیفەیەکی نووسی، کە لە هەندێك لە سەرچاوەکاندا بە (الوثيقة) ناوی دەبەن وەهەندێکی دی (الكتاب)ی پێ دەڵێن، پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" صەحیفەیەکی نووسی، کە لە جێی دەستووری ئێستایە، لەو دەستوورەدا شێوەی هەڵسوکەوت کردنی ئەو دەوڵەت و قەوارە سیاسییە، کە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" سەرۆکی بوو، لەگەڵ پێکهاتەکانیدا، لەگەڵ تاکەکاندا دیاریی کراون.

(د.محمدحميدالله) خاوەنی کتێبی (مجموعة الوثائق السياسية ، للعهد النبوي و الخلافة الراشدة)دا وتارێکی بەناو و نیشانی: (أقدم دستور مُسجَّلٍ في العالم) واتە: دێرینترین

دەستووری نووسراو لەدنیادا نووسیوە، تێیدا ڕوونی دەکاتەوە، کە لە پێش ئەو دەستوورەدا، کە پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" داینـاوەو بەئـەمری وی نووسـراوە، هیچ دەوڵەتێکی دیکە لە سەر ڕووی زەوی لەوەو بەر، خاوەنی دەستورێکی ئاوا نەبووە،[1] هەروەها (د.أکرم ضیاء العمري) خاوەنی کتێبی: (السیرة النبویة الصحیحة)، ئەویش وتارێکی لەو بارەوە بەناو ونیشانی: (أول دستور أعلنَهُ الإسلام) نووسیوەو ڕوونی کردۆتەوە، کە یەکەمین دەستورێك کە لە مێژووی مرۆڤایەتییدا ئیعلان کرابێو دەوڵەت و قەوارەی سیاسی پێوەی پابەند بووبێ، ئەوە بووە، کە پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" نووسیویەتی[2].

شایانی باسیشە کە وەسیقەی ناوبراو لە زۆرێك لە سەرچاوەکانی مێژووی پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم"دا هاتوە، بۆ وێنە:

١. (السیرة النبویة لابن هشام).
٢. کتێبی (مجموعة الوثائق السياسية، العهد النبوی والخلافة الراشدة) کە دابەشی کردوە بۆ (٤٧) بەند.
٣. (السیرة النبویة الصحیفة) لأکرم ضیاء العمري.

دیارە لەو (صحیفة) و (کتاب)ەدا، کە پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" وەك دەستورێك نووسی، هەموو ئەو مەسەلە گرنگانەی کە پێویست بوون بۆ ڕێکخستنی کاروباری ئەو کۆمەڵگا و دەوڵەتە ئیسلامییەی ئەو کاتە، هەموویان باسکراون.

---

[1] - مجموعة الوثائق ... ص٥٨، ط٨.

[2] - هەمان سەرچاوە، ص٥٨.

## دەقی دەستوورەکەی
## پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم":

١. "بسم الله الرحمن الرحيم، هذا كتاب من محمد النبيَ صلَى الله عليه وسلم، بين المؤمنين والمسلمين من قريش ويثرب، ومن تبعهم، فلحق بهم، وجاهد معهم:
٢- أنهم أمة واحدة من دون الناس.
٣- المهاجرون من قريش على ربعتهم يتعاقلون.
٤- وبنو عوف على ربعتهم يتعاقلون معاقلهم الأولى، كل طائفة تفدي عانيها بالمعروف والقسط بين المؤمنين وبنو ساعدة على ربعتهم يتعاقلون معاقلهم الأولى ، وكل طائفة منهم تفدي عانيها بالمعروف والقسط بين المؤمنين.
٥- وبنو الحارث على ربعتهم يتعاقلون معاقلهم الأولى ، وكل طائفة تفدي عانيها بالمعروف والقسط بين المؤمنين.
٦- وبنو ساعدة علماء ربعتهم يتعاقلون معاقلهم الأولى ، وكل طائفة تفدي عانيها بالمعروف والقسط بين المؤمنين.
٧- وبنو جشم على ربعتهم يتعاقلون معاقلهم الأولى ، وكل طائفة منهم تفدي عانيها بالمعروف والقسط بين المؤمنين.
٨- وبنو النجار على ربعتهم يتعاقلون معاقلهم الأولى ، وكل طائفة منهم تفدي عانيها بالمعروف والقسط بين المؤمنين.
٩- وبنو عمرو بن عوف على ربعتهم يتعاقلون معاقلهم الأولى ، وكل طائفة تفدي عانيها بالمعروف والقسط بين المؤمنين.
١٠- وبنو النَبيت على ربعتهم يتعاقلون معاقلهم الأولى، وكل طائفة تفدي عانيها بالمعروف والقسط بين المؤمنين.

١١- وبنو الأوس على ربعتهم يتعاقلون معاقلهم الأولى ، وكل طائفة منهم تفدي عانيها بالمعروف والقسط بين المؤمنين.

١٢- أ) وأن المؤمنين لا يتركون مفرحاً[1] بينهم أن يعطوه بالمعروف في فداء وعقل[2].

ب) وأن لا يحالف مؤمن مولى مؤمن دونه.

١٣- وإن المؤمنين المتقين على من بغى منهم أو ابتغى دسيعة[3] ظلم، أو إثم، أو عدوان، أو فساد بين المؤمنين؛ وإن أيديهم عليه جميعهم، ولو كان ولد أحدهم.

١٤- ولا يقتل مؤمن مؤمنا في كافر، ولا ينصر كافراً على مؤمن.

١٥- وأن ذمة الله واحدة، يُجير عليهم أدناهم، وإن المؤمنين بعضهم موالي بعـ دون الناس.

١٦- وأنــه مــن تبعنــا مــن يهـود فـإن لــه النصـر والأسـوة، غـير مظلـومين ولا متناصرين عليهم.

١٧- وأن سلم المؤمنين واحدة، لا يسالم مؤمن دون مؤمن في قتال في سبيل الله، إلا على سواء وعدلٍ بينهم.

١٨- وأنَّ كل غازية غزت معنا يعقب بعضها بعضاً.

١٩- وأنّ المؤمنين يُبيء[4] بعضهم على بعض بما نال دماءهم في سبيل الله.

٢٠- أ) وأنّ المؤمنين المتقين على أحسن هدى وأقومه.

ب) وأنه لا يجير مشرك مالاً لقريش ولا نفساً ولا يحول دونه على مؤمن.

٢١- وأنه من اعتبط[1] مؤمناً قتلاً عن بينة فإنه قود به إلا أن يرضى ولي المقتول وأن المؤمنين عليه كافة ولا يحل لهم إلا قيام عليه.

---

١ المُفرّح: هو الذي أثْقَلَه الدَّين. مختار الصحاح. ص٤٣٢.

٢ العقل: الديّة. مختار الصحاح. ص٣٩٢.

٣ دَسَعَ الشيء يَدْسَعُهُ دَسْعاً ودسوعاً: دفعها. المعجم الوسيط، ص٢٨٣.

٤ أَباءَ الشيءَ: رَفَعَهُ، وأَباءَ فُلاناً بفلانٍ: قَتَله به. المعجم الوسيط، ص٧٥.

٢٢- وأنه لا يحل لمؤمن أقر بما في هذه الصحيفة وآمن بالله واليوم الآخر أن ينصر مُحْدِثاً ولا يؤويه، وإنه من نصره أو آواه فإن عليه لعنة الله وغضبه يوم القيامة، ولا يؤخذ منه صرف ولا عدل.

٢٣- وأنكم مهما اختلفتم فيه من شيء فإن مردّه إلى الله عز وجل وإلى محمد صلى الله عليه وسلم.

٢٤- وأن اليهود ينفقون مع المؤمنين ما داموا محاربين.

٢٥- وأن يهود بني عوف أمة مع المؤمنين لليهود دينهم وللمسلمين دينهم مواليهم وأنفسهم إلا من ظلم وأثم فإنه لا يُوتِغ[٢] إلا نفسه وأهل بيته.

٢٦- وأن ليهود بني النجار مثل ما ليهود بني عوف.

٢٧- وأن ليهود بني الحارث مثل ما ليهود بني عوف.

٢٨- وأن ليهود بني ساعدة ما ليهود بني عوف.

٢٩- وأن ليهود بني جشم مثل ما ليهود بني عوف.

٣٠- وأن ليهود بني الأوس مثل ما ليهود بني عوف.

٣١- وأن ليهود بني ثعلبة مثل ما ليهود بني عوف.

٣٢- وأن جفنة بطن من ثعلبة كأنفسهم.

٣٣- وأن لبني الشطيبة مثل ما ليهود بني عوف، وإن البر دون الإثم.

٣٤- وأن موالي ثعلبة كأنفسهم وإن بطانة يهود كأنفسهم.

٣٥- وأن بطانة يهود كأنفسهم.

٣٦- أ) وأنه لا يخرج منهم أحد إلا بإذن محمد صلى الله عليه وسلم.

ب) وأنه ولا ينحجز على ثأر جرح.

وأنه من فتك فبنفسه فتك وأهل بيته، إلا من ظلم وإن الله على أبر هذا.

---

١ عَبَطَ: مات فلان عَبْطَةً أي صحيحاً شاباً. مختار الصحاح، ص٣٦١.

٢ وَتَغَ فلانٌ يَوْتَغُ: هَلَك.. أوتغ: أهلك. المعجم الوسيط، ص١٠١٠.

٣٧- أ) وأن على اليهود نفقتهم وعلى المسلمين نفقتهم، وإن بينهم النصر على من حارب أهل هذه الصحيفة، وإن بينهم النصح والنصيحة، والبر دون الإثم.

ب) وأنه لم يأثم امرؤ بحليفه، وإن النصر للمظلوم.

٣٨- وأن اليهود ينفقون مع المؤمنين ماداموا محاربين.

٣٩- وأن يثرب حرام جوفها لأهل هذه الصحيفة.

٤٠- وأن الجار كالنفس غير مضار ولا آثم.

٤١- وأنه لا تجار حرمة إلا بإذن أهلها.

٤٢- وأنه ما كان بين أهل هذه الصحيفة من حدث أو اشتجار يخاف فساده، فإن مرده إلى الله عز وجل، وإلى محمد رسول الله صلى الله عليه وسلم، وإن الله على أتقى ما في هذه الصحيفة وأبره.

٤٣- وأنه لا تجار قريش ولا من نصرها.

٤٤- وأن بينهم النصر على من دهم يثرب.

٤٥- أ) وإذا دعوا إلى صلح يصالحونه ويلبسونه، فإنهم يصالحونه، وأنهم إذا دعوا إلى مثل ذلك فإنه لهم على المؤمنين، إلا من حارب في الدين.

ب) على كل أناس حصتهم من جانبهم الذي قبلهم.

٤٦- وإن يهود الأوس ، مواليهم وأنفسهم على مثل ما لأهل هذه الصحيفة. مع البر المحض من أهل هذه الصحيفة. وإن البر دون الإثم لا يكسب كاسب إلا على نفسه.

وأن الله على أصدق ما في هذه الصحيفة وأبره.

٤٧- وأنه لا يحول هذا الكتاب دون ظالم أو آثم، وإنه من خرج آمن، ومن قعد آمن بالمدينة، إلا من ظلم أو أثم، وإن الله جار لمن بر واتقى، ومحمد رسول الله صلى الله عليه وسلم."[1]

---

١ سيرة ابن هشام، ٢/٣٦٨-٣٧٠، ومجموعة الوثائق السياسية.. ص٥٩-٦٢، ط٨، دار النفائس، ٢٠٠٩م.

**ئێستاش باسەرنجێکی خێرای ئەو دەستووره بدەین:**

١- لە بەندەکانی (١و٢)دا بنیاتنرانی قەوارەیەکی سیاسیی تازە لە کۆچکەرو پشتیوانان و کەمینە ئاینییە نیشتەجێیەکانی مەدینە و دەوروبەری، ڕاگەیەنراوە، واتە: لەبەندی یەکەم و دووەمی ئەو وەسیقەیەدا: ئەوە کە ئەو دەوڵەتە کە پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" سەرۆکیەتی، بە قەوارەیەکی سیاسیی تازە سەرهەڵداو، ڕاگەیەنراوە.

٢- لە بەندەکانی (٣تا ١٢)دا بە تەنگ یەکدییەوە بوونی کۆمەلایەتیی (التكافل الإجتماعي) کە چۆن چینو توێژەکانی کۆمەڵگا دەبێ بە تەنگ یەکدییەوە بنو دەستبار بۆ یەکدی بگرنو بەهانای یەکدییەوە بچن، ڕاگەیانراوە.

٣- لە بەندی (١٣) دا بەرپا کردنی دادگەرییو ڕێکخستنی دادوەریی، ڕاگەیەنراوە.

٤- لەبەندەکانی: (٣٧و٤٦)دا تایبەت بوونی سزای تاوان، کەسێك تاوانێك دەکا خراپەیەك دەکات، بەس خۆی بەرپرسیارەو دەبێ تەنیا خۆی ڕووبەڕووی سزا ببێتەوە، ڕاگەیەنراوە.

٥- لە بەندی: (٢١)دا دیاریی کردنی سزای تۆڵە بۆ کوشتنی بەئەنقەست ڕاگەیەنراوە، واتە: کەسێك یەکێك بە ئەنقەست بکوژێ، سزای تۆڵەی بۆ دیاری کراوە.

٦- لەبەندەکانی: (١٣و ٢٢و٣١)دا قەدەغەکردنی تاوانە گیانییو سامانییەکان ڕاگەیەنراوە، واتە: هەرچی تاوان و ئیجرامە، چ لە ڕووی مەعنەویی، چ لە ڕووی مادديی یەوە، قەدەغە کراوە.

٧- لە بەندی: (٣٩)دا ئاسایشی گشتی بۆ هاوولاتییانی نیشتەجێی مەدینە بەگشتی ڕاگەیەنراوە، کە هەر کەسێك لە مەدینەدایە، پێویستە هێمنیی و ئاسایشی بۆ بەرقەرار و دەستەبەر بکرێ، واتە بۆ هەموو هاوولاتییان.

٨- لەبەندەکانی: (١٦و٢٤و٢٥و٢٦) وە بەندەکانی (٣٧)و(٤٤)دا پێگەی کەمینە ئایینییەکان کە لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا دەژین، دیاریکراوە، واتە: بۆیان دیاریی کراوە، کە هەموو ئەو کەمینە ئایینییانە و فیکرییانە، چۆن مافەکانیان دەپارێزرێن!.

٩- لە بەندەکانی: (٢٣و٤٢) دیاریی کردنی دادوەرییو سەروەریی باڵای پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە دەوڵەت دا، وەك مەرجیع، چونکە دەبێ کەسێك هەبێ، کە کێشەکان یەکلایی بکاتەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" وەك ئەو کەسو لایەنە،کە کێشەو مشتومڕەکان هەڵدەبڕێ، دیاریی کراوە.

١٠- لە بەندەکانی: (٣تا ٤٧) بە پچڕ پچڕیی، دیاریکردنی مافو ئازادییە تاکییو کۆمەڵایەتییو ئابوورییەکان، بۆ وێنە: لە بەندی (٢١)دا مافی ژیان بۆ هەموو لایەك دەستەبەر کراوە، لە بەندی (٢٥)دا ئازادییە فیکرییو عەقیدەیی یەکان دانیان پێدا نراوەو بۆ هەموو لایەك مسۆگەر کراون. لەبەندی (٢٥)دا مافی موڵکایەتیی بۆ هەموو هاووڵاتییان دەستەبەر کراوە، مافەکانی: ئاسایشو نیشتەجێ بوون و گواستنەوە و هاتوچۆ لە بەندەکانی: (٣٩و٤٧) دا دیاریکراون، مافی یەکسانیی لە بەندەکانی (٢تا١٦)دا دیاریی کراوە، مافی تاك بۆ هاوکاریی کرانی لەکاتی لێقەومان دا، لەبەندەکانی: (٣تا١٢) دیاریی کراوە، مافی کۆبوونەوە لەسەر بناغەی تیرە و هۆز (ئەو کاتە دیارە کۆمەڵگا شێوەی پێکهاتەی بۆ تیرە و هۆزەکان دابەش بووە) لە بەندەکانی: (٤تا١١)دا دیاریی کراوە، مافی کۆبوونەوە لەسەر بناغەی ئایین، کە مسوڵمانان دینی خۆیان هەیەو جوولەکەش دینی خۆیان هەیەو، موشریکەکانیش هەروا، لە بەندی (٢٥)دا دیاریی کراوە، ئازادی بیروڕا بۆ هەموو لایەك لەبەندی (٤٧)دا دیاریی کراوە.

چۆنیەتیو شێوەی وەرگێرانی ئەو چەمكو واتایانەش، لەبەندەکانی ئەو صەحیفەیەدا بە ڕوونیی کتێبی (النظام السياسي الإسلامي مقارناً بالدولة القانونية)ي (د.منير حميد البياتي) لە لاپەڕە (٤٥تا٤٧)دا خراوەتە ڕوو، هەرکەسێك سەرنجی ئەو وەسیقەیە بدات هەموو ئەو بڕگە و بەندانە بەو چەمكو واتایانەوە دەبینێ.

## هەڵهێنجانی بیست بنەمای گرنگی دەستووریی لە قورئاندا:

ئێستا بابزانین: ئایا لە قورئانی بەرێزدا ، پاشان لە سوننەتی پێغەمبەری خـوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" دا، دەتوانین دەستوورێك هەڵبهێنجین، كە ببێتە یاسای بنەڕەتیی و هـەموو یاساكانی دیكە لەوەوە هەڵبهێنجرێن؟ لە وەڵامدا دەڵێم: بە ئەنـدازەی ئـەوە كەتوانیومـە سەرنجی قورئان بدەم، هەڵبەتە بە بەهرە وەرگرتنیش لەو كتێبانەی، كە موتاڵەعەم كردوون لەو بارەوە، بیست بنـەمای دەسـتووریيم كەوتۆتـە بەرچـاو، كـە بێگومـان دەگـونجێ زۆر زیاتریش لەوە هەڵبهێنجرێن، بەڵام من بیست بنەمای دەستووریيم كەوتۆتە بەرچـاو، كـە دەگونجێ بخرێنە نێو ئەو دەستوورەوە، كە قەوارەیەكی سیاسـیی ئیسـلامیی، دەوڵـەتێكی ئیسلامیی دەیانكات بە چوارچێوەی یاسایی خۆی و لێیان دەرناچێت:

**بنەمای یەكەم: پێویستیی هەبوونی دەسەڵاتێكی حوكمڕان:** لە ئایـەتی ژمـارە (٥٨)ی (النساء)دا خوای تاكو بێ هـاوەڵ فەرموویـەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ...﴿٥٨﴾﴾ خوا كۆمـەڵگای مسـوڵمان دەدوێـنێو دەفـەرمووێ: خوا فەرمانتان پێدەكات، كە سپاردەكان بگێڕنەوە بۆ خـەڵكی شایسـتەی خۆیـان، سپاردەكان تەسلیمی خەڵكی شایستەی خۆیان بكـەن، بـە پێـی سـیاق و بـە پێـی سوننەتی پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم"یش مەبەست لە (الأمانات) وەك لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە بەرپرسیارێتییەكانن {**عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" جَالِسٌ فِي مَجْلِسِهِ جَاءَهُ أَعْرَابِيٌّ فَقَـالَ يَا رَسُولَ اللهِ مَتَى السَّاعَةُ؟ ... حَتَّى إِذَا قَضَى حَدِيثَهُ قَـالَ: «أَيْـنَ السَّـائِلُ عَـنِ السَّاعَةِ»؟ قَالَ: هَـذَا أَنَـا يَـا رَسُـولَ اللهِ. قَـالَ: «إِذَا ضُـيِّعَتِ الأَمَانَـةُ فَـانْتَظِرِ السَّاعَةَ»! قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ مَا إِضَاعَتُهَا؟ قَالَ: «إِذَا أُسْنِدَ الأَمْـرُ إِلَـى غَيْـرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ»**}(رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٨٧١٤) الْبُخَارِيُّ برقم: (٥٩)).

واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيـهِ وَسَلَم" لە مەجلیسێ لـە نێومـان دانیشـتبوو، دەشـتەكییەكەك هاتـە لایو گـوتی: ئـەی پێغەمبەری خوا! قیامەت كەنگێ دێ؟ (دوای ئەوەی لە قسەكردن بۆوە) فەرمووی:

کوا ئەو کەسەی پرسیاری کرد؟ گوتی: ئەوە من بووم، فەرمووی: هەرکاتێك سپاردە زایە بوو و فەوتا، چاوەڕێی کۆتایی هاتن بکە (چاوەڕێی قیامەت بکەن)، گوتیان: فەوتان‌و بەزایەچوونی سپاردە چۆنە؟ فەرمووی: هەرکاتێك ئیش بەغەیری خەڵکی شایستەی خۆی سپێردرا، چاوەڕێی قیامەت بکەن.

واتە: قیامەتی هەرکارێك ،کە بە غەیری خەڵکی شایستەی خۆی دەسپێردرێ، کاری وا کۆتایهاتنەکەی نزیکە.

کەواتە: لێرەدا خوای بێ هاوەڵ فەرمان دەکات بە کۆمەڵگای مسوڵمانان، کە دەبێت ئەمانەتی حوکمڕانیی‌و بەرپرسیارێتی، بە خەڵکی شایستەی خۆیان بسپێرن، واتە: کەسانێك هەبن بیانکەنە حوکمڕان‌و مشوورخۆری خۆیان و شایستەش بن، کە دیارە ئەوەش فەرزکردنە لە لایەن خواوە لەسەر مسوڵمانان، کە پێویستە دەسەڵاتی سیاسی بۆ خۆیان دابنێن‌و حوکمڕانانێك دابنێن، کە کاروباریان بۆ بەرێوە بەرن.

**بنەمای دووەم: دادوەریی کردن بە دادگەرانە**: وەك خوای دادگەر هەر لەهەمان ئایەتی پێشووی سوورەتی (النساء)دا دەفەرمووێ: ﴿ ...وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِٱلْعَدْلِ ... ﴿٥٨﴾ ﴾ النساء، کاتێك دادوەرییتان کردو حوکمتان کرد لە نێوان خەڵکدا، دادگەرانە دادوەریی‌و حوکم بکەن، واتە خوا (سبحانە و تعالى) فەرمانتان بەوە پێدەکات، کە قەوارەیەکی سیاسییتان هەبێت‌و حوکمڕانانێکتان هەبن،وە فەرمانیشتان بەوە پێدەکات، کە هەرکاتێك حوکمتان کرد، دادوەرانە لە نێوانی خەڵکدا، دادوەریی بکەن.

**بنەمای سێیەم: مافی خەڵك لەسەر حوکمڕانان**: ئایا خەڵك و کۆمەڵگا مافی چییە لەسەر حوکمڕانان؟ خوا(سبحانە وتعالى) لە ئایەتی ژمارە (٧١)ی سوورەتی (التوبة)دا دەفەرمویێ: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ

بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ ﴾

خوای زانا، پێناسەی ئیمانداران دەکات بە پیاو و ئافرەتەوەو دەفەرموێ: ئیماندارانی پیاوو ئافرەت هەندێکیان، دۆست و پشتیوانی هەندێکیانن، فەرمان بەچاکە دەکەنو ڕێ لە خراپە دەگرن و، نوێژ بەرپا دەکەنو زەکات دەدەن وەفەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەکەن، ئا ئەوانە خوا بەزەیی پێیاندا دێتەوە، بێگومان خوا زاڵی کار بەجێیە، کەواتە مسوڵمانان نەك هەر مافیان هەیە، بەڵکو ئەرکە لە سەر شانیان، کە دەبێ فەرمان بەچاکەو ڕێگریی لە خراپە بکەن، بەتایبەت لە بەرانبەر حوکمڕانو کاربەدەستانیان دا، چونکە چاکە کردنو خراپە کردن، زیاتر ئەوان دەستیان بۆ کراوەترە، هەم ئەوان زیاتر چاکەیان لە دەست دێ، ئەگەر بیانەوێو، هەم خراپەشیان زیاتر لە دەست دێ، کەواتە: ئەرکی فەرمان بە چاکە و ڕێگرتن لە خراپە، لە لایەنی خەڵکەوە بەپلەی یەکەم ڕوو لە حوکمڕان و دەسەڵاتداران دەکات.

هەروەها لەئایەتی ژمارە (١٠٤)ی سوڕەتی (آل عمران)دا خوا (سبحانه وتعالى) فەرزی دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾، واتە: ئەی مسوڵمانینە! با لە نێو ئێوەدا کۆمەڵێك هەبن، یان ئێوە هەمووتان کۆمەڵێك بن، بانگەواز دەکەن بۆ چاکە و، فەرمان بەشتە پەسەندەکان دەکەنو ڕێگریی لە شتە ناپەسەندەکان دەکەن، هەر ئەوانەش سەرفرازن .

**بنەمای چوارەم: مافی حوکمڕانان لەسەر خەڵك:** دیارە وەك چۆن خەڵك مافی هەیە لەسەرحوکمڕانان، دیارە حوکمڕان و کاربەدەستانیش مافیان هەیە لەسەر خەڵك، لە ئایەتی ژمارە (٥٩)ی سووڕەتی (النساء)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا

ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ...﴿٥٩﴾ ﴾النساء، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بکەن و، فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن و، هی کاربەدەستانێکیش کە لە خۆتانن، کەواتە: کاربەدەستانێك کە لە مسوڵمانانن، واتە: مسوڵمانان خۆیان دایانناون‌و کاریان پێ سپاردوون، لەسەریان پێویستە، کە بە قسەیان بکەن، واتە: فەرمانبەریی پێشی بۆ خوایە، دوایی بۆ پێغەمبەری خوایە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" واتە: پابەندیی بە قورئانەوە، دوایی بە سوننەتەوە، ئنجا دوایی گوێڕایەڵیی‌و فەرمانبەریی بۆ حوکمڕانانێك،پێویستە کە لە شێرازەی قورئان‌و سوننەت دەرناچن.

**بنەمای پێنجەم: ڕاوێژ بناغەی کاروبارەو لە سەر حوکمڕانان فەرزە، کە کاروباریان بەڕاوێژ بێ:** وەك خوا (سبحانە و تعالی) لە سوورەتی (الشوری)دا دەفەرموێ: ﴿ ... وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ...﴿٣٨﴾ ﴾ الشوری، واتە: کاروباری مسوڵمانان لە نێوان خۆیاندا بە ڕاوێژە، ئەوە بەگشتی وەك مسوڵمانان و کۆمەڵگا، بەنسبەت کاربەدەستان‌و فەرمانڕەوایانیش، خوای بێ هاوتا لە ئایەتی ژمارە (١٥٩)ی سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ ..وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ ...﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران، واتە: لە کاروباردا ڕاوێژیان پێ بکە، دیارە دواندن (خطاب) ڕووی لە پێغەمبەری خوایە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"، ئەویش دوای چی ؟ دوای ئەوەی کە لە جەنگی ئوحوددا مسوڵمانان تێکشکاون، لە ئەنجامی ئەوەدا کە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" پابەند بووە بە ڕای زۆرینەوە، کە ڕایان وا بووە لە مەدینە بچنە دەر بۆ جەنگ کردن لە گەڵ کافرە قوڕەیشییەکان دا، بەڵام لێرەدا خوا تبارك و تعالی بە پێغەمبەری خۆی "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: ﴿ ...وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ ...﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران، واتە: هەرچەندە پابەندییت بە ڕای زۆرینەوە دوای ڕاوێژکردن، یەکێك بوو لە هۆکارەکان، کە جەنگەکەتان نەبردەوە، بەڵام دیسان هەر

پابەند بە بەوە، کە لە کاروباردا ڕاوێژ بە هاوەڵان بکەی! جا ئەگەر پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لەسەری پێویست بووە، ڕاوێژ بە هاوەڵانی بکات، کە بێگومان ئەو "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" وەحی بۆ هاتوەو پارێزراو بووە لە هەڵە بەتەئکید غەیری پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" حەوتجار لەسەریان پێویستە، کە پابەند بن بەڕاوێژ کردن بە خەڵکەوە ، هەڵبەتە ئێمە لە بنەمایەکی سەربەخۆدا باسی مەسەلەی ڕاوێژ دەکەین .

**بنەمای شەشەم: ئاشتیی کردن لەگەڵ ئاشتیخوازانداو جەنگ کردن لەگەڵ جەنگخوازاندا**: خوا (سبحانه و تعالى) لە سوورەتی (الأنفال) ئایەتی (٦١) دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦١﴾ ﴾ الأنفال، واتە: ئەگەر بەرانبەرەکانت، دوژمنەکانت، ملیان بۆ ئاشتیی دا، مەیلی ئاشتییان کرد، تۆش مەیلی ئاشتیی بکە و پشت بەخوا ببەستە، واتە: کەسێك کە ئامادەیە ئاشتییتان لەگەڵ دا بکاتو ئامادەیە لەگەڵتاندا لە حاڵەتی ئاشتییدا بێت، ئێوەیش ئاشتەواییان لەگەڵ دا بکەن .

لەسورەتی (البقرة) ئایەتی (١٩٠)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ ﴾ البقرة، واتە: لەگەڵ ئەوانەدا، کە لە دژتان دەجەنگن، بجەنگن، بەڵام دەستدرێژیی مەکەن، ئایەتەکەی سوورەتی (الأنفال) باسی ئەوەی کرد کەسانێك، کە ئاشتییتان لەگەڵ دا دەکەن، ئێوەش ئاشتییان لەگەڵ بکەن، بەڵکو دەبێت مسوڵمانان دەستپێشخەریی ئاشتی و تەبایی و سەلامەتیی بن، لەگەڵ خەڵك و، هەرگیز نابێت موشتەری ئاژاوە و شەڕبن، بەڵام کاتێك شەڕیان پێ دەفرۆشرێ و گێچەڵیان پێ دەکرێ و دەستدرێژییان دەکرێتە سەر، وەك چۆن کەسێك دەستی ئاشتییان بۆ درێژ بکات، لەسەریان پێویستە ئاشتەوایی بکەن، کەسێکیش کە شەڕیان پێ دەفرۆشێت، لەسەریان فەرزە، کە بەرگریی لە خۆیان بکەن، لەخاکیان، لە دینو ژینیان، لە

حورمەتیان:﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ... ﴿١٩٠﴾ ﴾البقرة، لە پێناوی خوادا جەنگ بكەن لەگەڵ ئەوانەدا، كە لەدژتان دەجەنگن، بەلاّم (ولاتعتدوا) ئاگاتان لە دەستدرێژیی بێ، لەجەنگیشدا، نابێ دەستدرێژیی بكەن.

**بنەمای حەوتەم: پابەندیی بە پەیمان و بەڵێنەوە:** خوا تبارك و تعالی لە سووڕەتی (المائدة) لەئایەتی (١)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِۚ ... ﴿١﴾ ﴾ المائدة، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وەفادار بن بە گرێبەستەكان، وەفادار بن بەپەیمانەكان، (عُقُود) كۆی (عقد)ە، كە بەمانای پەیمانو گرێبەستێكە، كە لەنێوان دوو كەس دا، یان دوو لادا دەبەسترێ.

**بنەمای هەشتەم: یەكسانیی لە نێوان هاووڵاتییان دا:** هاولاّتییانی ژێر سایەی حوكمی ئیسلامیی و چوارچێوەی دەوڵەتی ئیسلامیی، یەكسانن، هەڵبەتە لەڕوانگەی شەریعەتەوە بەشەر هەموویان یەكسانن، بەلاّم لێرەدا مەبەست قسە لە دەوڵەتی ئسلامیی دەكەین ئەگەرنا خوا لە ئایەتی (١٣) سووڕەتی (الحجرات)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴿١٣﴾ ﴾ الحجرات، لێرەدا ڕووی دواندن لە هەموو مرۆڤایەتییە، واتە: ئەی خەڵكینە! ئێوەمان لە نێر و مێیەك دروست كردوە و، گێڕاومانن بۆ چەند گەل و تیرەیەك، تاكو یێك ئاشنابن، بێگومان بەڕێزترتان لەلای خوا، پارێزكارترتانە، بە تەئكید خوا زانای شارەزایە.كەواتە: هاووڵاتییانی دەوڵەتی ئیسلامیی، بەڵكو مرۆڤایەتی هەموویان لە بەرانبەر خوادا یەكسانن و، لە تەرازووی خوادا وەك یەكن.

**بنەمای نۆیەم: دابینكردنو پاراستنی ژیانی تاك تاكی هاولاّتییان:** لە دەوڵەتی ئیسلامیدا هەموو ئینسانێك، هەموو هاووڵاتییەك مافی هەیە، كە ژیانی پارێزراو بێتو سەلامەت بێ، وەك لە سووڕەتی (البقرة) ئایەتی (١٧٩)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡقِصَاصِ حَيَوٰةٞ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾ البقـــرة، واتە: لەتۆڵەدا ژیان هەیە بۆ ئێوە ، ئەی خاوەن عەقڵان! بەڵكو خۆ بپـارێزن، واتـە: خۆ بپارێزن لەوەی کەدەستدرێژیی بکەنە سەر خوێن و ژیانی خـەڵك، ئەگـەر بـزانن تۆڵەتان لیٚ دەستێنرێتەوە،هەبوونی تۆڵە دەبێتە بەربەستێك‌و كۆسـپێك لـە بـەردەم ئەوانەدا، کە چاویان لە دەستدرێژییو زوڵمە، بەڵام ئەگەر کابرا بزانیٚ وەك بەرزەکی بابـان بـۆی دەردەچـێت‌و لەسـەرووی یاسـاوەیەو، کـەس ناتوانێـت تۆڵـەی لـیٚ بستێنێتەوە،ئەوا بەناهەق‌و بە نوێژی نیوەڕۆ خەڵك دەکوژیٚ‌و بیٚ منەتیشە!!.

**بنەمای دەیەم: ئازادیی ئاینداریی‌و فیكریـی:** وەك خوا لە سوورەتیی (البقـرة) لـە ئایـەتی (٢٥٦)دا دەفـەرمویٚ: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ...﴿٢٥٦﴾ ﴾ البقـرة، واتـە: تۆبزیی کردن و زۆرلێکردن لە دین دا نیـە، کـە دیـارە هـۆی هاتنـەخوارەوەی ئـەم ئایەتە، واتاو چەمکی ئایەتەکەمان زیاتر بۆ دەردەخـات: هـۆی هاتنەخوارەوەکـەی ئەوەبوو کە پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بچێت بـۆ مەدینـە، واتە: پێش ئەوەی خەڵکەکە مسوڵمان ببیٚ‌و دەوڵەتی ئیسلامیی دابمەزریٚ، خـەڵکی مەدینە جوولەکەیان لە نێودا هەبوون‌و نەصرانییان لەنێودا هەبوون، جا هەنـدێکیان لەسەر خۆیان نەزر کردبوو، کە ئەگەر خوا کوڕێکیان بـداتیٚ، کوڕەکـەی بکـات بـە جوولەکە یان بیکات بە نەصرانیی، دەیانگوت: خوایە! کوڕەکەمان نـەزر دەکـەین کە بیکەین بە ئیندارو پەیڕەویی لە یەکێك لە کتێبـە ئاسمانییـەکان بکـات، ئنجـا هەندێك لەو کوڕانە کە خوا لەو کاتەدا بەو خێزانانەی بەخشیبوون‌و کردبوویانن بـە جوولەکەو نەصرانیی، دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" چـوو بـۆ مەدینـە، هەنـدێك لـە بـاب‌و دایکـەکان گوتیـان: بـا کوڕەکانمـان بێنینـەوە بـۆ ئیسلامـەتیی‌و مسوڵمان بن، خـوای پـەروەردگاریش ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـواریٚ: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ...﴿٢٥٦﴾ ﴾ خـوا ڕێـی لێگـرتن، کـە ناچـاریان بکـەن و

بیانگێڕنەوە بۆنێو ئیسلام، مەگەر بە ویستی ئازادی خۆیان، ئەگەرنا تۆبزیی کردن لە دین دا نیە[1].

لە ڕاستییدا دینی هەق پێویستی بەوە نیە، کە تۆبزیی بۆ لە خەڵك بکەی، ئیسلام بێ منەتە، ئیسلام لەگەڵ عەقڵ و فیترەت دا قسە دەکات، ئیسلام دینێك نیە کە پێویستی بە زەبر وزەنگ و بەهێز بێ، بۆ ئەوەی خەڵك ناچار بکەی شوێنی بکەوێت، ئنجا بەدڵنیاییەوە خەڵکێکیش کە بەناچاریی بە دوای ئیسلام، یان هەر بەرنامەیەکی دیکە دەکەوێ، نابێتە شوێنکەوتوویەکی ڕاستەقینە، بەڵکو دەبێتە ئینسانێکی مونافیق و دوو ڕوو، کە ئەو کاتە زیان و زەڕی زۆر زیاترە لەوەی، کە کافرێکی ئاشکرا بێت.

**بنەمای یازدەیەم: مافی ڕێزلێگیران:** لە دەوڵەتی ئیسلامییدا هەموو ئینسانێك پێویستە وەك ئینسان ڕێزی لێ بگیرێ، وەك خوا لە ئایەتی ژمارە (٧٠)ی سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ٧٠﴾ الإسراء، واتە: بێگومان ڕێزمان لەوەچەی ئادەم گرتووە، و، لە وشکانیی و دەریادا هەڵمان گرتوون و، لە ڕۆزییە بەتامەکان پێمان داون و بەسەر زۆر لە دروستکراواندا هەڵمانبژاردوون. کە بێگومان ئەوە بە گشتی بۆ هەموو مرۆڤەکانە، هەموو مرۆڤێك لە تەرازووی شەریعەتی خوا دا حورمەت و ڕێزی تایبەتی خۆی هەیە، هیچ کەسێك بۆی نیە ئەو حورمەت و ڕێزە پێشێل بکات، وەك دوایی لە باسی ماف و ئازادییەکاندا بە تەفصیل باسی دەکەین.

---

[1] بڕوانە: زاد المسير في علم التفسير، لإبن الجوزي، ص١٥٧، کە ئەمە دەقی قسەی (ابن عباس)ە لەو بارەوە: وكانت المرأة تكون مقلاة، فتجعل على نفسها إن عاش لها ولد أن تُهوِّده، فلما أُجليت بنو النضير كان فيهم من أبناء الأنصار، فقالوا: لا ندع أبناءنا. فأنزل الله عزوجل: ﴿لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الغَيِّ﴾. رواه أبوداود والنسائي والبيهقي في السنن وغيرهم.
المقلاة: ئەو ژنەیە کە منداڵی بۆ نازێن.

**بنەمای دوازدەیەم: مافی موڵکایەتیی:** خوا (سبحانه و تعالى) لە سوورەتی (البقرة) لە ئایەتی (٢٧٩)دا دەفەرموێ: ﴿ ... فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَالِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ ﴾ البقرة، واتە: ئەنجاسەرمایەکانی خۆتان بۆ خۆتان بێ، نەستەم بکەن ، نە با ستەمیشتان لێ بکرێ، ئیسلام وەك چۆن زوڵم کردن لە ئینسان قەدەغە دەکات، قبووڵکردنی زوڵمیشی لێ قەدەغە دەکات‌و، دەڵێت نەزاڵم بەو نە مەزڵووم بە، چونکە هەرکاتێك مەزڵووم هەبوو، دیارە زاڵمیش هەیە،وە هەرکاتێك زاڵم هەبوو، دیارە مەزڵوومیش هەیە، ئەو دوانە هەمیشە پێکەوەن، بۆیە خوای پەروەردگار هەردووکیانی قەدەغە کردوە، لە کۆمەڵگاش دا نابێ نەزاڵم هەبێت، نەمەزڵووم، پێویستە یەکسانییی‌و دادگەریی‌و تەبایی هەبێ.

**بنەمای سێزدەیەم: مافی بیروڕا دەربڕین:** وەك لە ئایەتی ژمارە (٣٨)ی سوورەتی (الشورى)دا خوای مەزن دەفەرموێ: ﴿ .. وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ... ﴿٣٨﴾ ﴾ واتە: وەکاروباریان لە نێوان خۆیان دا بەڕاوێژە، دیارە وەختێك ڕاوێژ دەکرێ، کە خەڵك ئازاد بێ لە دەربڕینی بیروڕای خۆیداو لەبۆچوونی خۆیدا، بابەڕای بەرانبەرەکەیشی هەڵە بێت، دەبێ لێبگەڕێ بیرو ڕای خۆی بڵێ‌و قسەی خۆی بکات، با دوایی بەبەڵگە بۆی دەربخات، کە لەو بۆچوونەدا بەهەڵەدا چووە.

**بنەمای چواردەهەم: مافی پاراستنی هێمنیی‌و ئاسایش:** لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، پێویستە هێمنیی و ئاسایشی هەموو لایەك دەستەبەر بکرێ‌و بپارێزرێ، وەك خوا عزّ وجلّ لە ئایەتی (٣٣)ی سوورەتی (المائدة) دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِي ٱلْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوْ يُصَلَّبُوٓاْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ ٱلْأَرْضِ ۚ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِي ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾ ﴾ المائدة، واتە: بێگومان سزای ئەوانەی، کە دژایەتیی خوا و پێغەمبەرەکەی

دەکەن و، هەوڵ دەدەن لە زەویدا ئاشووب و خراپە پەیدا بکەن، سزایەکەیان ئەوەیە، کە بکوژرێن، یان هەڵبواسرێن، یان دەست و پێی ڕاست و چەپیان ببڕدرێ، یان دەربکرێن، ئەوە سەرشۆڕییە بۆیان لە دنیادا ، لە دوارۆژیش دا سزای مەزنیان بۆ هەیە.

کەواتە: هەرکەسێك هێمنییو ئاسایشی خەڵك تێك بدات، یەکێك لەو چوار سزایانەی بەسەردا دەچەسپێت، بە پێی ئەندازەی تاوانەکەی، وەك توێژەرەوانی قورئان و شەرعزانان بە تەفصیلْ باسیان کردوە.

**بنەمای پازدەیەم: مافی گەڕان وگواستنەوە:** لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، هەموو هاووڵاتییان بۆیان هەیە بگەڕێن و، لەشوێنێك بگوازنەوەو بۆ شوێنێکی دی بچن، وەك خوا (سبحانه و تعالى) لە سوورەتی (الملك) ئایەتی (١٥)دا دەفەرموێ: (هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾ )
واتە: (خوا) ئەو کەسەیە، کە زەوی بۆ ئێوە ڕامو دەستەمۆ کردوە (بەرتان ناداتەوە لەگەڵ ئەوەش دا بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوەو بەدەوری خۆردا دەخولێتەوەو لەگەڵ خۆردا بە دەوری چەقێکی دیکەدا دەخولێتەوەو...هتد، پێنج شەش خولانەوەی هەن کە ئێستا بۆ گەردوونناسان دەرکەوتوون، بەڵام وەك وڵاخێکی هێمنو ئارامەو ئەو بارەی لەسەر پشتیەتی نایخاتە خوارەوە) دەجا بەکەلێن و قەدپاڵەکانیدا بڕۆن (خوا بەندەکانی خۆی ئازاد کردوە کە بەکەلێن وقەدپاڵەکانیدا بڕۆن) و لە ڕۆزیی خوا بخۆن، بشزانن کە بۆ لای ویش دەگەڕێنەوە.

**بنەمای شازدەیەم : مافی کارو کاسپیکردن:** وەك لە سوورەتی (الجمعة)دا لە ئایەتی ژمارە (١٠)دا دەفەرموێ:﴿ ...فَٱنتَشِرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ... ﴿١٠﴾ ﴾، واتە: ئنجا دوای ئەوەی، کە نوێژی هەینیتان کرد، بە زەویدا بڵێوببنەوە و لە ڕزق و ڕۆزیی خوا داوا بکەن. خوا لێرەدا ناوی لە ڕزق ناوە (فَضْل)

واتە: ئەو ڕزق و ڕۆزییە، کە تۆ لە ئەنجامی کاروکەسابەت دا پەیدای دەکەی، ئەوە چاکە و نیعمەتێکی خوایە.

کەواتە: سوور بە لەسەری، وەك چۆن نوێژی جومعەت لەسەر پێویستە، پەیداکردنی ڕزقی حەڵاڵییش بۆ خۆت و بۆ ئەوانەی، کە ئەرك و بژێویان لەسەرتە، فەرزە .

**بنەمای حەڤدەیەم: مافی ڕێز و حورمەتی جێگا و ڕێگا:** هەموو کەسێك پێویستە ئەو جێگاو ڕێگایەی، کە تێیدا نیشتەجێیە، ڕێز و حورمەتی لێ بگیرێ و، هیچ کەس دەستدرێژیی نەکاتە سەری، وەك خوا سبحانە و تعالی لە ئایەتی ژمارە (٣٧)ی سووڕەتی (النور)دا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُوا۟ وَتُسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ واتە: ئەی ئیماندارینە! مەچنە هیچ ماڵێك، جگە لەماڵەکانی خۆتان، هەتا مۆڵەت وەرنەگرن و سڵاو لە خەڵکەکەی نەکەن، ئەوە بۆ ئێوە باشترە، ئەگەر بزانن، واتە: تەنیا سڵاوکردن نا، بەڵکو دەبێ مۆڵەتیش وەربگری، بەڵکو وشەی (تَسْتَأْنِسُوا۟) لێی دەفامرێتەوە، کە تۆ دەبێ دڵنیا بی لەوەی، کە نابیتە بارگرانیی بەسەریانەوە، ئەگەر لەو کاتەدا سەردانیان بکەی.

**بنەمای هەژدەیەم: مافەکانی کەمینە ئایینییەکان پارێزراون:** وەك خوا لە سووڕەتی (الممتحنة) لە ئایەتی (٨)دا دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾ واتە: خوا لێتان قەدەغە ناکات ئەوانەی، کە لە سەر دین لەگەڵتان ناجەنگن و، لەماڵ و حاڵی خۆتان دەرتان ناکات، کە چاکەیان لەگەڵدا بکەن (لەڕووی مەعنەوییەوە) و پێشیان ببەخشن (لەڕووی ماددییەوە) واتە: بە

بەشێك لە ماڵ و سامانی خۆتان، ئەگەر پێویستیان بوو، هاوکارییان بکەن بێگومان خوا هاوکاریی کاران و بەخشندانی خۆش دەوێن.

**بنەمای نۆزدەیەم: مافی دروستکردنی حیزبو ڕێکخراوەکان:** وەك خوا (سبحانه و تعالی) لە ئایەتی ژمارە (١٠٤)ی سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ آل عمران، واتە: با لە نێو ئێوەدا کۆمەڵێك هەبن، کە بانگەواز دەکەن بۆ چاکەو فەرمان بەشتە پەسەندەکان دەکەن و، ڕێ لە شتە ناپەسەندەکان دەگرن، هەر ئەوانەش سەرفرازن، ئەم ئایەتە دەگونجێ بیکەینە بەڵگە، هەم بۆ دروستکردنی ڕێکخراوی مەدەنییو، هەم ڕێکخراوی سیاسیی، چونکە خوای کاربەجێ فەرمان بە مسوڵمانان دەکات، کە لە نێویان دا کۆمەڵێکیی وا هەبن، کە ئەو سێ ئەرکە جێ بەجێ بکەن:

١- بانگەواز کردن بۆ چاکە، کە بەگشتی فەرموویەتی.

٢- فەرمانکردن بە شتە پەسەندەکان.

٣- ڕێگرتن لە شتە ناپەسەندەکان .

**بنەمای بیستەمو کۆتایی: هاوکاریی کۆمەڵایەتیی بۆ کەسانی بێ تواناو کەم دەست، وەك: نەفام، هەتیو، هەژار، ڕێبوار، قەرزدار...هتد:** ئەم بنەمایەش لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئان دا بەرجەستەیە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (النساء)دا خوای بەبەزەیی دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَامًا وَارْزُقُوهُمْ فِيهَا وَاكْسُوهُمْ وَقُولُوا لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٥﴾ ﴾ النساء، واتە: ئەوانەتان کە نەفامن (واتە: عەقڵیان کامڵ نیە، جا چ بەهۆی کەمتەمەنییەوە، چ لە ئەسڵی دروستبوون و خیلقەتیان دا گێل و سادە بن) ئەو ماڵ و سامانەتان (هەرچەندە هی خۆیانە، بەڵام پاڵی داوەتە لای هەموو مسوڵمانان، چونکە ماڵ و سامانی منداڵێکیش، هی هەتیوێکیش، هی هەر کەسێکی دیکەش، هی هەموو لایەکە)

کە خوا گێڕاویەتی بە مایەی ڕاوەستانتان، تەسلیمیان مەکەن،وە لەو ماڵەدا کەسابەتیان بۆ پێ بکەن، یا بە دەستتانەوە بێ بژێویان بۆ دابین بکەن، بەرگ و پۆشاکیان بۆ دابین بکەن، وەقسەی باشیان بۆ بکەن، (تاکو وردە وردە پەروەردەیان بکەن‌و ڕایان بێنن‌و بە کەڵکی ئەوە بێن، کە ماڵەکانیان تەسلیم بکەنەوە).

هەروەها خوای بەخشندە لەسوورەتی (المعارج) لە ئایەتەکانی: (٢٤و٢٥)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ فِىٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ مَّعۡلُومٞ ٢٤ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ ٢٥ ﴾ المعارج، باسی کەسانی باش و نوێژکەر و خواناس دەکات و دەفەرموێ: وە ئەوانەی لە ماڵ و سامانیان دا ئەندازە و مافێکی دیاری کراو هەیە، بۆ سواڵکەر و بۆ خەڵکی بێ بەش. کەسێك دێت داوات لێ دەکات و، کەسێك بێ بەشە و ڕوویشی نیە داوات لێ بکات، ئەویش حەقی هەیە.

هەروەها لە سوورەتی (الماعون)دا خوای بەخشەر دەفەرموێ:﴿ أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ١ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِي يَدُعُّ ٱلۡيَتِيمَ ٢ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ٣ ﴾ واتە: دەزانی کێ بڕوای بە دین نیە؟ کەسێکە کە پاڵ بە هەتیوەوە دەنێت و، هانی خەڵك نادات بۆ یارمەتیدانی هەژاران. واتە: بۆ خۆیشی هاوکارییان ناکات‌و هانی خەڵکیش نادات.

ئەوانە بیست بنەمای دەستووریی بوون، کە لە قورئان هەڵمانهێنجان، لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ( صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم )یش دا زۆر بنەمای دیکەی تێدان، بەڵام ئێمە بەو ئەندازەیە،وەك نموونەیەك وازی لێ دێنین.

## ٢) مەرجی دووەمی دەوڵەتی یاسایی: پلە پلەیی لە بنچینە یاسایی یەکان دا:

ئنجا بێینە سەر مەرجی دووەمی دەوڵەتی یاسایی، کە بریتی بوو لە پلە پلەیی بنچینە یاساییەکان (تدرج القواعد القانونية): ئایا ئەوە لە ئیسلام دا هەیە؟ دەڵێین:

بەڵێ، ئەم بنەمایەش لە ئیسلام و سیستەمە سیاسییەكەیدا، شتێكی ڕوونو بێ چەندو چوونە، چونكە:

بەڵگەی یەكەم// هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن، كە سەرچاوەی یەكەمی یاسا شەرعییەكان بریتییە لە قورئانی بەڕێز، هەر قورئانیشە كە ڕەوایی بۆ سەرچاوەكانی دیكە فەراهەم دێنێت، كەواتە: یاساو بنچینەكانی، كە لە قورئان وەردەگیرێن، بە تەئكید پلەیان بەرزترە لەوانەی دیكە، كە لەسوننەتو لە ئیجماع و لە قیاس و هتد... وەردەگیرێن، ئەوە بەڵگەی یەكەم لەسەر هەبوونی پلە پلەیی لە بنچینە یاساییەكان لە ئیسلام دا.

بەڵگەی دووەم// یاسا شەرعییەكانی قورئان دوو جۆرن:

جۆری یەكەم: ئەوانەی كە بەڵگەكانیان ڕوون و مشتومڕ و تەئویل هەڵنەگرە، واتە: ئەو یاسا شەرعییانەی كە بە شێوەیەكی یەكلاییكەرەوە (قطعي) لەو ئایەتانە وەردەگیرێن، بێ ئەوەی زانایان مشتومڕیان لەسەریان هەبێت، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿...وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ...﴿٢٧٥﴾﴾البقرة، واتە: خوا كڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ كردوە و ڕیبای حەرام كردوە.

جۆری دووەم: ئەو یاسایانەی كە لە قورئان وەردەگیرێن، بەڵام بەڵگەكانیان مشتومڕ هەڵگرن، كە پێیان دەگوترێ: گومانیی (ظنّي) زانایەك دەڵێ: ئەو یاسایە، كە لە فلاَن ئایەتە وەردەگیرێ، من پێم وایە لێی وەردەگیرێ، یەكێكی دیكەش دەڵێ: نەخێر لێی وەرناگیرێو لەو بارەوە مشتومڕ هەیە، كەواتە: هەرخودی حوكمە شەرعییەكانیش، كە لە قورئان وەردەگیرێن، یەك جۆر نین، بەڵكو بە گشتی دوو جۆرن.

بەڵگەی سێیەم// سوننەتی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" یش دیسان چەند جۆرێكەو ئەویش هەمووی یەك پلە نیە، بەڵكو ئەویش پلە پلەیی تێدایە، چونكە بەلای كەمەوە سوننەتی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دابەش دەبێت بۆ:

١- (متواتر) واتە ئەوەی، کە کۆمەڵێك لە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"یان بینیوە، یان بیستوە، سوننەتی (متواتر) ئەوەیە، کە ئەگەر (إحتمال)ی هەڵەی تێدا نەبێ.[1]

٢- جۆری دووەمی سوننەتی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" پێی دەگوترێ: (آحاد) واتە: لە یەك کەسەوە ئەو قسەیە، یان کردەوەیە لە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بیستراوە، یان بینراوە، ئەویش دوایی گەیاندوویەتی بە یەکێکی دیکە، یان زیاتر گرنگ ئەوەیە، کە لە ڕێی کەسێکەوە ئەو دەقەی سوننەت گەیشتوە، کەواتە: بە تەئکید لە حوکم دا، سوننەتی (ئاحاد) وەك هی (متواتر) نیە.[2]

بەڵگەی چوارەم// یەکدەنگیی زانایان (إجماع العلماء)و قیاسو سەرچاوەکانی دیکەش، دیسان هەرکامێکیان پلە و شوێنی خۆی هەیەو، لەنێوان ئەوانیش دا بەرزییو نزمیی هەیە.

ئنجا ئەم ئایەتەی (النساء) ئایەتی ژمارە (٥٩) زۆر بە ڕوونیی ئاماژە دەکات بە پلە پلەیی لە نیوان بنچینە یاساییەکانی ئیسلام دا، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ ..﴿٥٩﴾ ﴾ النساء، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بکەن (واتە: پابەند بن بە قورئانەوە) فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن (پابەندبن بەسوننەتەوە) و هی کاربەدەستانێك، کە لە خۆتانن، (واتە: پابەند بن بەفەرمانی کاربەدەستانو حوکمڕانانەوە، مادام فەرمانێکتان پێ نەکەن، کە پێچەوانەی شەریعەت بێت) وە ئەگەر لە شتێکیش دا

[1] السنة المتواترة: التي رواها جمع كثير تُحيل العادة تواطأهم على الكذب، أو وقوعه منهم من غير قصد التواطؤ عن جمع مثلهم حتى يصل المنقول إلى النبي صلى الله عليه وسلم ويكون مستند علمهم بالمنقول عن النبي المشاهدة أو السّماع. الوجيز في أصول الفقه، للدكتور عبدالكريم زيدان. ص١٦٨

[2] سنة الآحاد: ما رواها عن النبي صلى الله عليه وسلم عدد لم يبلغ حدّ التواتر، وذلك في عصر التابعين وعصر تابعي التابعين، فهي ما ليست متواترة. الوجيز في أصول الفقه، ص١٦٨

کەوتنە مشتومڕەوە، ئەوە بیگێڕنەوە بۆلای خواو پێغەمبەر، یانی: قورئان وسوننەت، کەواتە: قورئان وسوننەت، سەروەریی بالآیان هەیە بەسەر ئیجتیهادی زانایانو بیروبۆچوونی زانایان دا، ئەگەر مشتومڕ هەبوو لە نێوان کاربەدەستان خۆیان دا، یاخود خەڵك و کاربەدەستان دا، پێویستە مەرجیع و تەرازووی هەڵسەنگاندن و یەکلایکردنەوە شەریعەتی بەرجەستە لە قورئان و سوننەتدا بێ.

ئنجا ئەو فەرموودەیەی، کە باسی نێردرانی موعاز دەکات لە لایەن پێغەمبەری خواوە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بۆ یەمەن، ئەو یش دیسان بەڵگەیە لەو بارەوە، کە پێشتریش هێنامانو (أبو داود والترمذي والبيهقي) هێناویانە، کە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بە (معاذ) دەفەرموێ: بەچی حوکمو دادوەریی دەکەی، ئەگەر کێشەیەکت هاتە بەردەم؟ ئەویش دەڵێت: بەکتێبی خوا، دەفەرموێ: ئەگەر لە کتێبی خوادا حوکمەکەت نەدۆزیەوە؟ دەڵێت: بە سوننەتی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"، دەفەرموێ: ئەدی ئەگەر لە سوننەتی پێغەمبەریش دا نەتدۆزیەوە؟ دەڵێ: کۆشش دەکەم، عەقڵی خۆم بەکاردێنم وکەمتەرخەمیی ناکەم، پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"یش دەست لە سینگی دەدات و پێی دەفەرموێ: {«الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَفَّقَ رَسُولَ رَسُولِ الله لِمَا يُرْضِي رَسُولَ الله »}(أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٢١١٤) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف، وَرَوَاهُ أَيْضَاً أَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٥٩٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٣٢٧) وَضَعَّفَهُ الشيخ الألباني في (ضعيف أبي داود) برقم: (٧٧٠)).

واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە نێردراوی پێغەمبەری خوای سەرکەوتوو کردوە بۆ شتێك، کە پێغەمبەری خوا پێی ڕازییە، کەواتە: پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بەوە ڕازییە، کە لە پێش دا قورئان و، دوایی سوننەت، ئنجا ئیجتیهاد، بۆ هەڵهێنجانی یاسا شەرعییەکان پشتیان پێ ببەسترێ.

### ٣) مەرجی سێیەمی دەوڵەتی یاسایی: ملکەچیی ئیدارە بۆ یاسا:

ئنجا با بزانین ئایا لە شەریعەتی ئیسلامییدا (ملکەچیی ئیدارە بۆ یاسا)، چنگ دەکەوێ؟!

ئـەمیش دیسـان بـە سـەرنجدانی دەقـەكانی قورئـان وسـوننەت، شـتێكی زۆر ڕوونو ئاشكرایە، بۆ وێنە:

١- لە ئایەتی ژمارە (١٨)ی سـوورەتی (الجاثیـة)دا خـوا دەفـەرموێ:﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ الجاثیـة، واتـە: دوایی تۆمان لەسەر بەرنامەیەك داناوە لە لایەن خۆمانەوە، دەجا شوێنی بكەوە و بەدوای ئارەزووەكانی ئەوانە مەكەوە، كە نازانن، كەواتە: بەرنامەیەك هەیە، شـەریعەتێك هەیـە، لەخواوە دانراوەو ئەو ئیدارەیەو ئەو بەڕێوەبەرە، ئەگەر پێغەمبەری خوایە "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ" ئەگەر خەلیفە ڕاشیدەكانن، هـەر حوكمڕانێـك هەیـە، پێویسـتە پابەنـد بـێ بـەو شەریعەتەوە ، كەواتە دەبێت ئیدارە ملكەچ بێت بۆ یاسا.

٢- هەروەها ئایەتی ژمارە (٤٩)ی سوورەتی (المائـدة) كە خـوا فەرموویـەتی: ﴿ وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ ...﴿٤٩﴾ ﴾ المائـدة، واتـە: بـەوەی كـە خـوا ناردوویەتـە خـوار، حوكمیان لە نێوان دا بكە، كەواتە: حوكمێـك كـە لـە لایـەن خـواوە نێـردراوە، لـە سـەر حوكمڕانان پێویستە، كە پێوەی پابەند بن .

٣- ئەم فەرمایشتەش، كە بوخـاریی و موسـلیم هێناویانـە و بـە فـەرموودەی: (ابن اللُّتبيَّـة) مەشهوورە، ئەویش دیسـان بەڵگەیـەكی پتـەوە لـەو بـارەوە، كـە ئەمـە دەقـی فەرمایشتەكەیەو بەسەرهاتەكەیشی ئەوەیە، كە پێغەمبەری خـوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ" پیاوێك دەنێرێ زەكات كۆ بكاتەوە، كە دەگەڕێتەوە دەڵێـت: ئـەوە زەكاتـە هێناومـە بـۆ ئێوە، ئەوەش دیاریی‌و خەڵاتە و داویانە بە خۆم و پێشكەشی خۆمیان كردوە! پێغەمبـەری خواش "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ" دەچێتە سەر مینبەر لەو بارەوە بۆ ئەو كاتیش‌و بۆ ئێستاش‌و بۆ دوای ئێستاش ئەو حەقیقەتە ڕوون دەكاتەوەو دەفەرموێ: {**مَا بَالُ الْعَامِلِ نَبْعَثُهُ عَلَى بَعْضِ أَعْمَالِنَا، فَيَقُولُ: هَذَا لَكُمْ، وَهَذَا لِي، فَهَلاَّ جَلَسَ فِي بَيْـتِ أَبِيـهِ، أَوْ بَيْـتِ أُمِّـهِ، فَيَنْظُرُ يُهْدَى إِلَيْهِ أَمْ لا، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لا يَأْخُذُ أَحَدٌ مِنْهَـا شَـيْئًا إِلا جَـاءَ بِـهِ يَـوْمَ الْقِيَامَةِ، يَحْمِلُهُ عَلَى رَقَبَتِهِ، إِنْ كَانَ بَعِيرًا لَهُ رُغَاءٌ، أَوْ بَقَرَةً لَهَا خُوَارٌ، أَوْ شَاةً تَيْعَرُ، ثُمَّ**

**رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْنَا عُفْرَةَ إِبْطَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: اللهمَّ هَلْ بَلَّغْتُ، اللهمَّ هَلْ بَلَّغْتُ}** (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٥٩٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦) وغيرهما).

واتە: بۆچی پیاوێك كە كارێكی پێ دەسپێرین لەوەی، كە خوا بە ئێمەی سپاردوە، دوایی دێتەوە دەڵێت: ئەوە بۆ ئێوەیەو ئەوەش پێشكەش كراوە بە خۆم، دیاریی یە بۆ خۆم! بۆچی لە ماڵی بابی، یان لە ماڵی دایكی دانەدەنیشت، تاكو بزانێت، داخۆ دیاریی بۆ دێت یان نا؟!! سوێند بەو كەسەی نەفسی منی بە دەستە (كە خوایە)، هیچ شتێك وەرناگرێ (لەئەنجامی ئەو كارەدا كە پێمان سپاردوە، هیچ شتێك ئیستیفادە ناكات و وەرناگرێت) مەگەر ڕۆژی دوایی دێ لە سەر ملی خۆی هەڵی دەگرێ، واتە: لەسەر ملی دادەنێن‌و سزای دەدەن، جا لە درێژەی فەرموودەكەدا دەفەرموێ: ئەگەر حوشترە دەیخەنە سەر ملی باعەباعی دێ‌،وە ئەگەر مانگایە بۆڕەبۆڕی دێ‌،وە ئەگەر مەڕە باڕە باڕی دێ وەك سزا دانی.

لێرەدا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە هیچ كەسێك بۆی نیە لە پەنای بەرپرسێتیدا سوودی شەخصیی ببینێ، ئەوەی كە ئێستا پێی دەڵێن: گەندەڵیی، ئەوەتا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" زۆر بەڕوونییو ڕاشكاویی دەفەرموێ: بۆ لە ماڵی دایك و بابی دانەدەنیشت! واتە: لە پەنای ئەو كارەدا ئەو خەڵاتو دیارییانەیان بۆ هێناوە، كەواتە: دەبێت خەڵاتو دیارییەكەیش بێنێتەوە بۆ خەزێنەی مسوڵمانان، چونكە لە پەنای كارە ئیدارییەكەدا سوودی وەرگرتوە.

٤- ئنجا (إبن تيمية) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لە كتێبی (السياسية الشرعية) لە لاپەڕە (٣٧)دا دەڵێت: **(وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَخُلَفَاؤُهُ يُحَاسِبُونَ الْعُمَّالَ عَلَى الصَّدَقَاتِ وَالْفَيْءِ وَغَيْرِ ذَلِكَ)** واتە: پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"و جێنشینەكانی (مەبەستی پێ ئەبو بەكرو عومەرو عوسمانو عەلی یە خوا لێیان ڕازی بێ، كە ئەوانە خەلیفەی ڕاشید بوون و بە ڕاستی پابەند بوون بە ڕێوشوێنی پێغەمبەری خواوە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم") كاربەدەستانێك، كە لەسەر صەدەقەو دەستكەوت كۆكردنەوە دایان دەنان، یان لەسەر ئەو ماڵو سامانانەی دیكە، كە دێنەوە بۆ خەزێنەی مسوڵمانان

لێپرسینەوەیان لەگەڵ دا دەکردن و، لەسەر غەیری ئەوەش لێپرسینەوەیان لەگەڵ دا دەکردن .

کەواتە: پێویستە ئیدارە ملکەچ بێت بۆ یاسا، ئنجا ملکەچیی ئیدارە بۆ یاسا، لە شەریعەت دا دوو زەمانەتی هەن:

**زەمانەتی یەکەم**: کارسپاردن بە کەسانی بە هێزو ئەمیندار، وەك لە سوورەتی (القصص) لە ئایەتی (٢٦)دا خوا دەفەرمویٚ: ﴿...إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ ﴿٢٦﴾﴾، لەسەر زمانی یەکێك لە دوو کچەکانی ئەو پیاوە صالحە، کە مووسا (علیە السلام) ئاژەڵەکانی بۆ ئاودان، دوای ئەوەی، کە مووسا دەچێت بۆ لای باییان، یەکێك لە دوو کچەکان بە بابی دەڵێت: يَـٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُ ۖ إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ ﴿٢٦﴾﴾ القصص، واتە: ئەی بابە! بیگرە بەکرێ (بۆ شوانیی) چونکە باشترین کەسێك، کە تۆ (بیکەیتە شوان و) بەکرێی بگری ئەوەیە، کە بەهێزو ئەمیندار بێ. ئەو کابرایەش - مووسا (علیە السلام)- بەهێزە بۆ ئەنجامدانی کارەکەی، ئەمیندارو دەستپاکیشە.

کەواتە: پێویستە کاری بەرپرسێتیی بەکەسێك بسپێردرێ، ئەودوو مەرجەی تێدابن، هەروەها دوو مەرجی دیکەیش کە بریتین لە: پاراستن و زانست، وەك یوسف (علیە السلام) بە پادشای میصری فەرموو: ﴿ قَالَ ٱجْعَلْنِى عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلْأَرْضِ ۖ إِنِّى حَفِيظٌ عَلِيمٌ ﴿٥٥﴾﴾ یوسف، واتە: من لەسەر عەمبارەکانی زەوی دابنێ (بە زاراوەی ئەمڕۆ: بمکە بە وەزیری ئابووریی‌و داراییی) چونکە من پارێزەری زانام، واتە: زانام، دەزانم چۆن کارەکەم دەکەم، پارێزەریشم‌و هیچ شتێکم لەدەست زایە نابێت و گەندەڵیی و خیانەتیی تێدا ناکەم، ئەوە زەمانەتی یەکەمی ملکەچکردنی ئیدارەیە بۆ یاسا.

**زەمانەتی دووەم**: چاودێریی کردنی ئیداریی، کە پێشتر چەند دەقێکمان لەبارەوە هێنانەوە، کە حوکمڕانی یەکەمی مسوڵمانان‌و خوار ئەویش، پێویستە هەرکامێکیان

چاودێریی ئەوانەی خوار خۆی بکات و، ئاگای لێیان بیٚ‌و نەهێڵیٚ لا بدەن و، لە کاتی لادانیدا، لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکات.

## ٤) مەرجی چوارەم: دان پێداهێنانی ماف و ئازادیەکانی تاکەکان:

پێشتر خستمانە ڕوو، کە ئەم مەرجی چوارەمەش لە شەریعەتی ئیسلام‌و سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلام دا، هێنراوەتە دی‌و دەستەبەر کراوە، وەك لەو بنەما دەستوورییانەدا، کە لە قورئان وەرمانگرتن، هەموو ماف و ئازادییەکانی، وەك ئازادیی دینداریی، مافی ژیان، مافی کەرامەت پارێزران، مافی موڵکایەتیی‌و کاروکاسبی کردن، مافی گەڕان و گواستنەوەو غەیری ئەوانەش، لەدەقە ڕوون وڕاشکاوەکانی قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوادا "صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ" بۆ هەموو لایەك دەستەبەر کراون، بەڵام ئێمە ئێستا ناچینە نێو وردەکاریی و درێژەی ئەو باسە، چونکە یەکێك لە بنەماکانی سیستەمی حوکمڕانی ئیسلامی، بریتیە لە دابینکردنی ماف و ئازادییە تاکییەکان‌و لەوێدا خوا پشتیوان بیٚ، بە درێژیی باسی دەکەین‌و نوختەی تێدا دەخەینە سەر پیت.

لێرەش گەیشتینە ئەوە، کە ڕاستە سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی، سیستەمێکە، کە دەوڵەتێکی یاسایی لەسەر بنیات دەنێ، چونکە ئەو چوار مەرجەی، کە پێویستن بۆ پەیدا بوونی دەوڵەتێکی یاسایی، لە شەریعەتی ئیسلامیدا، لە دەقە ڕوون‌و ڕاشکاوەکانی قورئان وسوننەت دا، هەرچوار مەرجەکە دەستەبەر کراون، کە بریتی بوون لە: هەبوونی دەستوور، پلە پلەیی یاساییەکان، ملکەچکردنی ئیدارە بۆ یاسا، دابینکرانی ماف و ئازادییە تاکییەکان.

لێرەشدا دێینە کۆتایی توێژینەووەمان دەربارەی بنەمای سێیەمی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی، کە بریتی بوو لە ملکەچیی هەموو لایەك بۆ یاسا.

# بنەمای چوارەم

# ڕاوێـــــــــژ

# بناغەی هەموو کارەکانە

دیارە ئێمە لە باسەكانی ڕابوردودا باسی سێ بنەمای گرنگ و بنەڕەتیی سیستەمی حوكمڕانیی ئیسلامییمان كرد، كەیەكەمیان بریتی بوو لە: (سەروەریی باڵاو ڕەها هی خواو شەریعەتەكەیەتی)، دووەمیان: (دەسەڵات هی خەڵكە)، سێیەمیشیان: (ملكەچیی هەموو لایەك بۆ یاسا).

ئێستاش بنەمای چوارەم دەتوێژینەوە: (ڕاوێژ بناغەی هەموو كارەكانە)، كە ئەمیش وەك سێ بنەمایەكەی پێشوو، بەڕاستی بنەما و بنچینەیەكی زۆر گەورە و گرنگە لە دیاریی كردنی سیما و شێوەی سیستەمی حوكمڕانیی ئیسلامیی و، جیاكردنەوەی لە سیستەمەكانی حوكمی دیكەدا.

ئنجا ئێمە هەوڵ دەدەین ئەم بنەمایە لە حەوت بڕگەدا بتوێژینەوە: لە بڕگەی یەكەمدا پێناسەی ڕاوێژ دەكەین، چییەو چۆنە؟ لە بڕگەی دووەم دا باسی گرنگیی و پێویستیی ڕاوێژ دەكەین، لە بڕگەی سێیەم دا باسی حوكمی ڕاوێژ دەكەین ، پاشان لە بڕگەی چوارەمدا باسی بوارەكانی ڕاوێژ تێدا كران دەكەین،كە ئایا ڕاوێژ لە چیو چیدا دەكرێتو لە چیو چیدا ناكرێتو بوارەكانی ڕاوێژ چین؟ لە بڕگەی پێنجەمدا باسی چۆنیەتی دیاریی كرانی ئەو كەسانە دەكەین، كە پێویستە ڕاوێژیان پێ بكرێو بە مشوور خۆر دادەنرێن، لەبڕگەی شەشەمدا باسی ئەوە دەكەین، كە تا چ ڕاددەیەك ئەنجامی ڕاوێژ كردن پابەندكەرە بۆ حوكمڕان و كاربەدەستان، یان پابەندكەر نیە؟ وەك زاراوە باوە: كە (الشورى مُلْزِمة أم مُعْلِمة؟) ڕاوێژ پابەندكەرە، یان هەر ئاگاداركەرەو شارەزاكەرە؟ لە بڕگەی حەوتەمیشدا بەراوردێك دەكەین لە نێوان دیموكراسی و شووڕادا، خاڵە هاوەبەشەكانیان چین و، خاڵە جیاوازەكانیان چین؟.

## بڕگەی یەكەم: پێناسەی ڕاوێژ:

دیارە ڕاوێژ ماناو تەرجەمەی وشەی (شورى)یە، كە وشەیەكی عەرەبییە و، كورد وشەی ڕاوێژ بەكار دێنن، كە مەرجیش نیە وشەی ڕاوێژ ڕاستەوخۆ تەرجەمەو واتای وشەی (شورى) بێت، چونكە مەسەلەی ڕاوێژ لە نێو خۆداكردنی خەڵك و میللەتان، شتێكی لە

مێژینەیەو بەدرێژایی مێژوو، کۆمەڵگاکانی بەشەر کەم و زۆر ڕاوێژیان لە نێودا هەبووە، بە تایبەت لە ڕووی ئیدارەی وڵات و حوکمڕانییەوە، وشەی (شوری) کە سەرنجی فەرهەنگەکانی زمان دەدەین لە: (شَارَ يشُورُ شَوْراً)ەوە هاتوە، عەرەب دەڵێن: (شَارَ العَسَلَ أي: إستَخرَجَهُ منَ الخَليَّة) کاتێك، کە هەنگوین لە خەڵیەی، یان سندووقەکەی دەردەهێنرێ، دەڵێن: (شار العسل) واتە: هەنگوینەکەی دەرهێنا، واتە: هەروەك چۆن هەنگوین لە شوێنی تایبەتیی خۆی دەردەهێنرێ، بیرو ڕای ڕاستیش لە عەقڵی خەڵکی دەردەهێنرێ، دوای ئەوە کە لە نێو خۆیان دا مەسەلەیەك گفتوگۆی لەسەر دەکەن و وتووێژی لەسەر دەکەن و دەیهێنن و دەیبەن، لە ئەنجامی ئەوەدا وەك چۆن هەنگ لە ئەنجامی مژینی شیلەی گوڵان و گەڕان و سوڕانێکی زۆردا، دەتوانێ هەنگوین دروست بکات، خەڵك و کۆمەڵگاش لە ئەنجامی وتووێژ و گفتوگۆی نێو خۆیان و، لە ئەنجامی گوێ بۆ یەکدی گرتن و پرس و ڕا بەیەکدی کردندا، دەتوانن بگەنە ڕای ڕاست و ڕێك.

کەواتە: ڕاوێژ (شوری) واتە: پرس و ڕا بەیەکدی کردن و وتووێژ بەیەکەوە کردن، بە ئامانجی ئەوە، کە ڕای ڕاست و بڕیارو هەڵوێستی ڕاست وەدەست بێ.

## بڕگەی دووەم: گرنگیی و پێویستیی ڕاوێژ کردن:

دەتوانین لە حەوت خاڵ دا گرنگیی و سوودەکانی ڕاوێژ کردن بخەینە ڕوو:

١- ڕاوێژ کردن، فەرمانبەریی کردنی خوایە (سبحانه و تعالى)، چونکە خوای بێ هاوەڵ فەرمانی کردوە، کە ڕاوێژ بکرێ، وەك دوایی ئاماژە بە ئایەتەکان دەکەین، هەم فەرمانی بە مسوڵمانان کردوە، کە دەبێت لە نێوان خۆیاندا ڕاوێژ بکەن، هەم فەرمانی بە حوکمڕانانیش کردوە، کە پێویستە ڕاوێژ بە خەڵکەکەی خۆیان بکەن کەواتە: ئەوانەی هەڵدەستن بە ڕاوێژ کردن لە نێوان خۆیاندا، چ لەسەر ئاستی خێزان، لە سەر ئاستی گەڕەك و گوندو شار، چ لەسەر ئاستی وڵات، چ لە سەر ئاستی حوکمڕان و کاربەدەستان، ئەوە فەرمانی خوا جێ بەجێ دەکەن و مانای وایە تاعەتێك بۆ خوا ئەنجام دەدەن، کە لەبەرانبەریدا پاداشت وەردەگرنەوە.

٢ – ڕاوێژکردن، شوێنپێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خوایە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"، چونکە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" هەرچی خوا پێی ڕاگەیاندوەو پێی فەرمووە، بێگومان موو بە موو، بەبێ کەم‌و زیاد جێبەجێی کردوە، ئنجا پێغەمبەری خوا (صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم)یش سەرمەشق‌و پێشڕەوی ئێمەیە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: بێگومان لەپێغەمبەری خوادا سەرمەشقییەکی باش بۆ ئێوە هەیە، بۆ هەر کەسێك بە ئومێدی خوایەو، بە ئومێدی (ڕەحمەتی) خواو (پاداشتی) دوا ڕۆژە و، زۆر یادی خوا دەکات.

کەواتە: هەرکەسێك بە تەمای ڕەحمەت و بەخشش و پاداشتی خوایەو، بەتەمای پاداشتی دوا ڕۆژە، پێویستە شوێن پێی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" هەڵبگرێ، پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"یش هەموو کارەکانی بەڕاوێژ بوون، وەك (أبو هريرة) خوالێی ڕازی بێ، زوهریی لێی دەگێڕێتەوەو گوتوویەتی: {**مَا رَأَيْتُ أَحَدًا قَطُّ كَانَ أَكْثَرَ مَشُورَةً لِأَصْحَابِهِ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ**} (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٨٩٢٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٧١٤)، وَابْنُ حِبَّان برقم: (٤٨٧٢) قال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح)، واتە: هیچ کەسم نەبینیوە بەقەدەر پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ڕاوێژ بە هاوەڵانی بکات.

کەواتە: هەر کەسێك دەیەوێ لەڕێی پێغەمبەری خواوە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بڕوات‌و بە شێوەی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دینداریی‌و دنیاداریی بکات و، حوکمڕانیی بکات، پێویستە زۆر ڕاوێژ بکات، دیارە شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" یش، پاداشتی لە بەرانبەردا هەیەو سەربەرزیی دنیاو دوارۆژی لەبەرانبەردا هەیە، لادانیش لە ڕێبازی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بە پێچەوانەوە، شەرمەزاریی و پەشێمانیی دنیاو دوا ڕۆژو جەزرەبەی خوای دادگەری لە بەرانبەردا هەیە.

٣- خەڵك و کۆمەڵگا مافی خۆیانە، کە لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات دا ڕاوێژیان پێ بکرێ، واتە: حوکمڕان و کاربەدەستان، چاکە لەگەڵ خەڵك ناکەن و خێریان پێ ناکەن، کە ڕاوێژیان پێ دەکەن و، پرسیان پێ دەکەن و، گوێیان بۆ دەگرن، بەڵکو مافێکی ڕەوای خۆیانە پێیان دەدەن، لەڕاستیدا کاتێك حوکمڕان و کاربەدەستان ڕاوێژ بەخەڵك ناکەن و گوێیان بۆ ناگرن، مانای وایە ڕەوایەتیی (شرعية) لە دەست دەدەن، چونکە ئێمە لە ڕابردودا باسمان کرد، کە یەکێك لە بنەماکانی سیستەمی حوکمڕانیی، ملکەچکردنی هەموو لایەکە بۆ یاسا، ئنجا یەکێك لە یاساکانی خواش ئەوەیە، کە حوکمڕانان ڕاوێژ بکەن و کاروباری مسوڵمانان بە ڕاوێژ بەڕێوە بەرن، وەك خوای زانا لە ئایەتی ژمارە (٣٨)ی سوورەتی (الشورى)دا دەفەرموێ:
﴿ وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾ الشورى، واتە: ئەوانەی بەدەم بانگی پەروەردگاریانەوە چوون و نوێژ بەرپا دەکەن و، کاروباریان بە ڕاوێژە و، لەوەی پێمان داون دەبەخشن، کەواتە: کاروباری مسوڵمانان هەمووی پێویستە بەڕاوێژ بەڕێوە بچێ، ئەوە حەقێکی خەڵك و کۆمەڵگایە، کە پێویستە ڕاوێژیان پێ بکرێ و سوود لەعەقڵ و بیرو بۆچوونیان وەربگیرێ و، گوێیان بۆ بگیرێ.

چونکە وشەی (أمر)، کە لە قامووسەکانی زمان دا بە: (الحال و الشأن)[1] لێك دراوەتەوە، واتە: حاڵ و کارو ئیش، مانای وایە هەموو حاڵەکان، هەموو ئەو ئیشانەی، کە دێنەڕێی مسوڵمانان لە هەردوو بواری دینداریی و دنیاداریدا، پێویستە بە ڕاوێژی خۆیان کاروبارەکان هەڵسووڕێنن و دەبێ حوکمڕان و کاربەدەستانیش ڕاوێژیان پێ بکەن،ئنجا ئەو دوو ئایەتەش،کەوشەی(شورى)یان تێداهاتوە، لەهەردووکیان دا وشەی (أمر) هاتوە: ﴿ ..وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ

---

[1] - المعجم الوسيط، ص٢٦.

...﴿٣٨﴾ ﴾ الشورى، لە ئایەتی ژمارە (٣٨)ی سوورەتی (شورى)دا وەئایەتی (١٥٩)ی سوورەتی (آل عمران)دا ﴿ ...وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ ...﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران، کە ئەمیان فەرمانە بە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دوای ئەویش بە هەموو ئەوانەی لە ڕێی پێغەمبەری خواوە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەڕۆن و حوکمڕانیی بەسەر مسوڵمانان دا دەکەن ﴿ ...وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ ...﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران،وە لە کاروباردا ڕاوێژیان پێ بکە.

٤- ڕاوێژکردن بریتیە لە ڕێگرتن لە ستەم و تاکڕەویی حوکمڕانان، هەڵبەتە حوکمڕانانێك" کە ڕاوێژ بکەن و بەئەنجامی ڕاوێژکردنەوە پابەند بن، دیارە پارێزراو دەبن لە ستەم و لە تاکڕەویی و خۆسەپاندن و چەوساندنەوە.

٥ - ڕێگرتن لە ناکۆکیی و ئاژاوە و ناتەبایی نێو کۆمەڵگا، ناکۆکیی و ناتەبایی و ئاژاوە و پەشێویی لە ئەنجامی چیدا پەیدا دەبێت؟ لەئەنجامی ئەوەدا، کە حوکمڕانان گوێ بەخەڵك نادەن و گوێیان بۆ ناگرن پرسیان پێ ناکەن، بە بێ ئیرادەی ئەوان دەچنە سەر کورسی حوکم، بەپێی ئیرادەی تاکڕەوانەی خۆیان کاروباریان بۆ بەڕێوە دەبەن، خۆیان بەسەردا دەسەپێنن و ئاشووب و ئاژاوە پەیدا دەبێ، کەواتە: ئەگەر ڕاوێژ بکرێ، بە تەئکید ڕێگا دەگیرێ لە ناکۆکیی و دووبەرەکیی و پەرتەوازەیی کۆمەڵگا.

٦ - پارێزران لە بەهەڵەدا چوون، کورەدەواریی خۆمان دەڵێن: عەقڵی دوان لە هی یەکێك زیاترە ! بە تەئکید کاتێك کۆمەڵە کەسێك کۆدەبنەوە و لە شتێك دەکۆڵنەوە و دەتوێژنەوە، بەیەکەوە قسەی لێ دەکەن و بیروڕای لەسەر دەگۆڕنەوە، بەدڵنیاییەوە گەیشتنە حەقیان و لە نیشانە دانیان و ئامانج پێکانیان، زۆر چاوەڕوانکراوترە لەوەی یەکێك، یان دوو کەس بە تەنیا بڕیار بدەن .

٧- سوودی حەوتەمی ڕاوێژ کردن بریتیە لە دڵخۆش بوونی خەڵك و دڵڕاگیرانیان و پەیوەست بوونیان بە حوکمڕان و کاربەدەستان، لەڕووی خۆشەویستییەوە، چونکە

هەرکەسێك ڕێزی لێ بگیرێو مافەکانی خۆی بۆ دابین بکرێنو، دڵی ڕابگیرێو گوێی بۆ بگیرێ، بە تەئکید ئەو بڕیارەی، کە دەردەچێت لە لایەن ئەو کاربەدەستانەوە، کە پرسیان بە خەڵك کردوەو گوێیان بۆ گرتوون، خەڵکەکە خۆیان بە خاوەنی بڕیارەکە دەزانن، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوە، کە یەکڕیزیی نێو کۆمەڵگاو خۆشەویستی نێوان حوکمڕانانو خەڵكو کۆمەڵگا، شتێکی سەقامگیرو ڕیشە داکوتراو بێت.

## بڕگەی سێیەم: حوکمی ڕاوێژ کردن:

ئنجا با بزانین حوکمی ڕاوێژ کردن چۆنە ؟ ئەگەر سەرنجی هەرکام لەو دوو ئایەتە موبارەك و بە پێزە بدەین، کە ئاماژەمان پێدان، واتە: ئایەتی ژمارە (٣٨)ی سوورەتی (الشورى) و ئایەتی ژمارە (١٥٩)ی سوورەتی (آل عمران) کە هەڵبەتە تەنیا لەو دوو ئایەتەیشدا باسی ڕاوێژ کردن نەکراوە، بەڵکو لە چەندان ئایەتی دیکەی قورئان دا باسی ڕاوێژ کراوە، بۆ وێنە : لە سوورەتی (البقرة) دەربارەی ئەوە، کە دایك و باب چۆن شیر بەمنداڵەکەیان دەدەن، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿...عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ...﴿٢٣٣﴾﴾ البقرة، واتە: بە ڕەزامەندییو ڕاوێژی هەردووکیان، هەروەها لەسوورەتی (النمل)دا خوای زانا، کە باسی بەسەرهاتی مەلیکەی سەبەئمان بۆ دەکات، کە دەڵێت: ﴿قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَفْتُونِي فِي أَمْرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴿٣٢﴾﴾ ئەو مەلیکەیە کەدوایی خەڵکەکەی بەرەو ئاکام و سەرەنجامێکی باش دەبات، دەڵێ: ئەی مشوورخۆرانو کاربەدەستان! ڕای خۆتانم پێ بڵێن، من هیچ بڕیارێك نادەم، تاکو ئێوە ئامادە نەبن و بیرو ڕای خۆتان نەخەنە ڕوو، کەواتە: ڕاوێژی کردوە.

هەروەها لە سوورەتی (القصص)دا کاتێك، کە مووسا (علیه السلام) ئاژەڵی دوو کچەکان ئاو دەدات، دوایی یەکێك لە کچەکان بە دوای دادێو دەیبات بۆ لای بابی ، کە زۆربەی توێژەرەوان و مێژوو نووسان دەڵێن: ئەوە شوعەیب پێغەمبەر بووە (علیه السلام)،

یەكێك لە دوو كچەكان بۆ بابی پێشنیار دەكات: ﴿ قَالَتْ إِحْدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ ﴿٢٦﴾ ﴾ واتە: یەكێك لە دوو كچەكان گوتی: ئەی بابە! ئەم پیاوە بەكرێ بگرە (بۆ شوانیی)، چونكە باشترین كەسێك، كە تۆ بەكرێی بگری ئەوەیە كە بەهێزو ئەمیندار بێ (ئەو كابرایەش هەردوو سیفەتەكەی تێدان)، كەواتە: لێرەشدا دیسان ڕاوێژ كراوە، كە چۆن ئەو پیاوە بگرن بە شوانیان، هەروەها لە گەلێك شوێنی دیكەی قورئان دا باسی ڕاوێژ كراوە، بەڵام ئەو دوو ئایەتە موبارەكەی پێشتر ئاماژەمان پێدان، بۆ هەڵهێنجانی حوكمی ڕاوێژ كردن سەرنجێكیان دەدەین:

(١) ئایەتی یەكەمیان كە ئایەتی ژمارە (٣٨)ی سوورەتی (الشورى)یە و، سوورەتی (الشورى)یش سوورەتێكی مەككییە، واتە: كاتێك ئەو سوورەتە موبارەكە دابەزیوە، كە جارێ مسوڵمانان هەر لە قۆناغی مەككییدا بوون، جارێ قەوارەی سیاسییو دەوڵەتیان نەبووە، خوای بەرزو مەزن لەسیاقی چەند ئایەتێكدا ، كە باسی دە (١٠) سیفەتی سەرەكیی كۆمەڵی مسوڵمان دەكات، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾ الشورى، واتە: ئەوانەی، كە بەدەم بانگی پەروەردگاریانەوە چوون و، نوێژ بەرپا دەكەن و، كاروباریان بە ڕاوێژ بەڕێوە دەبەن و، لەوەی پێمان داون، دەبەخشن.

تەماشا دەكەین خوای كاربەجێ، كاروبار بەڕێوە بردنی مسوڵمانان بەڕاوێژی، كردوە بەشتێكی چەسپاو، چونكە بەڕستەی ناویی (الجملة الإسمية) هێناویەتی، واتە: ئەوە كە كاروباریان بە پرس و ڕاوێژ بەڕێوە دەبەن، شتێكی چەسپاوە، چونكە ناو دەلالەت لە سەر چەسپاویی دەكات، هەروەك كردار (فعل) دەلالەت لەسەر نوێبوونەوە (تجدّد) دەكات، كاروبار بەڕێوەبردنی مسوڵمانان بە ڕاوێژ، شتێكی چەسپاوو نەگۆڕە، وشەی (أمر)، كە خوای پەروەردگار پاڵی داوەتە لای ڕاناوی (هم)، كە هەموو مسوڵمانان دەگرێتەوە (وأمرهم) واتە: هەموو كاروبارێكیان دەگرێتەوە، هەموو كاروبارێك، كە پێویست بكات ڕاوێژی تێدا بكرێت.

ئنجا خوای زاناو شارەزا ڕستەی: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾ ﴾ی خستۆتە نێوان: ﴿ ... وَأَقَامُوا الصَّلَوٰةَ ... ﴿٣٨﴾ ﴾ و ﴿ ... وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾ واتە: خستوویەتە نێوان: نوێژکردن و ماڵ بەخشینەوە، کە نوێژ پایەی مەعنەویی‌و ڕۆحیی دینداریییە، ماڵ بەخشینیش پایەی ئابووریی‌و ماددییەتی، کاروبارەڕێوەبردنیش، پایەی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی یەتی، کەواتە: وەك چۆن مسوڵمانان بەرپاکردنی نوێژیان لەسەر فەرزەو زەکات دانیان‌و ماڵ بەخشینیان لەسەر فەرزە، بەهەمان شێوەش کاروبار بەڕێوەبردن لەسەر بناغەی ڕاوێژیان لەسەر فەرزە.

(٢) ئایەتی ژمارە (١٥٩)ی سوورەتی (آل عمران)، خوای بێ هاوتا بەو شێوەیە دەستی پێدەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران، ڕووی دواندن لە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەکات‌و دەفەرموێ: بە هۆی بەزەیی خوایە، کە تۆ بۆیان نەرم بووی، (ڕەحمەت‌و بەزەیی خوایە لە دڵت دا، کە تۆی وا لێکردوە بۆیان نەرم بی: دڵت نەرم بێ‌و قسەت نەرم بێ‌و ڕەفتارو ئاکارت نەرم بێ‌و، بەخشندە و میهرەبان بی لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەکانت‌و شوێنکەوتوانت دا) ئەگەر تۆ قسە ڕەق و دڵڕەق بوای، لە دەورت دەپرژان‌و بەهۆی ئەو نەرمیی‌و بەخشندەیی‌و میهرەبانییەوە، ئەوانت بە دەوری خۆتەوە کۆکردۆتەوە، دەجا لێیان ببوورە (چاوپۆشییان لێ بکە، ئەگەر هەڵەیەکیان کرد)، داوای لێبوردنیشیان بۆ لە خوا بکە، (خۆیشت لێیان ببوورە، داوای لێبوردنیشیان بۆ لە خوا بکە) لەکاروباریش دا ڕاوێژیان پێ بکە.

وەك دەبینین، خوا سێ ئەرکی بەرانبەر بە هاوەڵانی بە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" سپاردوون:

أ- لێبوردن.

ب- داوای لێبوردن بۆ لەخوا کردن.

ج- ڕاوێژ پێکردن لە کارو باردا.

هەرسێکیان بە صیغەی (أمر) هاتوون: ﴿فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ﴾ کەواتە: لەسەر پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" پێویست بووە، کە چاوپۆشیی لە هاوەڵە بەڕێزەکانی بکات،وە لەسەری پێویست بووە داوای لێبوردنیان لە خوا بۆ بکات،وە لەسەریشی پێویست بووە، کە ڕاوێژیان پێ بکات، ئنجا ئەگەر لەسەر پێغەمبەری خوا"صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" پێویست بێ ڕاوێژ بە هاوەڵانیو بە مسوڵمانان بکات بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دین و دنیایان، بەدڵنیاییەوە بۆ خەڵکی دیکە پێویست ترە، چونکە پێغەمبەری خوا"صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" پارێزراو بووە لە هەڵە، وەحی بۆ هاتوە، فریشتە لەگەڵیدا بووەو بەسەریەوە چاودێر بووە، بەڵام دیارە غەیری پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" وانیە، کەواتە: بەسەرنج دانی ئەو دوو ئایەتە: (ئایەتی ژمارە (٣٨)ی سووڕەتی (الشوری)و ئایەتی ژمارە (١٥٩)ی سووڕەتی (آل عمران)، زۆر بەڕوونیی بۆمان دەردەکەوێ، کەڕاوێژکردن لە نێو مسوڵمانان دا بەگشتی لەسەریان فەرزە، بەتایبەتی لەسەر حوکمڕان و کاربەدەستانیان فەرزە، کە ڕاوێژیان پێ بکەن و بەتاکڕەوییو تەنیا بە ڕای خۆیان کاروباریان بەڕێوە نەبەن.

## بڕگەی چوارەم: ڕاوێژ لە چی و چیدا دەکرێ و بوارەکانی ڕاوێژ کامانەن؟

سەرەتا دەڵێین: بێگومان ڕاوێژ بەگشتی لە هەردوو بواری دینداریيو دنیاداریی دایە، واتە: هەردووك بواری مامەڵە کردن لەگەڵ خوادا (سبحانە و تعالی) و مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکدا، پێویستییان بە ڕاوێژ کردن هەیە، هەڵبەتە لێرەدا ئێمە مەبەستمان ئەو شتانە نیە، کە وەحی بڕاندوونیەوە، چونکە ئەوە ڕاوێژی تێدا ناکرێ، بۆ وێنە: ڕاوێژ ناکرێ، ئایا مسوڵمانان نوێژ بکەن، یان نەیکەن؟، یان ڕۆژوو بگرن، یان نەیگرن؟ بەڵام نوێژەکەیان لە کوێ بکەن، چۆنی بکەن، کاتی ترسە، کاتی ئاشتییە، لەوانەدا ڕاوێژ دێتە پێشێ، واتە: بواری عیبادەتیش، کە مامەڵە کردنە لەگەڵ خوادا، ڕاوێژی دێتەوە نێوێ، بەڵام لەچۆنیەتی ئەنجامدانیو لە هەلو مەرجەکانو لە شوێنو کاتو ئەوانەدا، دنیاداریيش، کە ئەو شتانەن پەیوەندییان بە مامەڵەی نێوخۆی خەڵکەوە هەیە، ئەوە بواری سەرەکی ڕاوێژ تێدا کردنە، بەڵام بە تەئکید ڕاوێژ کردن لەشتێکدا نیە، کە دەقی ڕوون و بێ چەند و

چوونی لەسەر بێت، لە لایەن خوای پەروەردگارەوە مشتومڕەکە بڕا بێتەوە، زانایان لێرەدا بنچینەیەکیان داناوە دەڵێن: (لا إجتهاد في مورد النص) یان (لا إجتهاد عند وجود النص) لە کاتی هەبوونی دەق دا، واتە: دەقی وەحی، کە ئایەتی قورئانە، یان سوننەتی صەحیحی پێغەمبەری خوا "صَلَى اللہ عَلَيهِ وَسَلَم"، لەو کاتەدا کۆشش کردن (إجتهاد) نیە.

دیارە ڕاوێژو بیروڕا گۆڕینەوەش جۆرێکە لە ئیجتیهاد، بەڵکو ئیجتیهادێکی بەکۆمەڵە ، بەڵام لەکاتی هەبوونی دەقیش دا بۆ چۆنیەتی پراکتیزەکردنی ئەو دەقەو دابەزاندنی بۆ سەر واقیع، دیسان ئیجتهادو ڕاوێژ کردن دێتەوە پێشێ، بەڵام بە تەئکید ئەو شتانەی، کە خوای پەوەردگار بڕیونەتەوە، یان پێغەمبەری خوا "صَلَى اللہ عَلَيهِ وَسَلَم" نوختەی تێدا خستوونە سەر پیت، بۆ وێنە: سنوورە قەدەغەکراوەکان، وەك ئەوەی، کە زینا قەدەغەیە، قەتڵ قەدەغەیە، دزیی قەدەغەیە، سوود خۆریی قەدەغەیە، زوڵم قەدەغەیە، بۆ هیچ کەس دروست نیە ڕاوێژیان تێدا بکات، کە داخۆ قەدەغە بن، یان قەدەغە نەبن؟! هەروەها ئەو شتانەی، کە خوای پەروەردگار فەرزی کردوون، وەك پێنج نوێژە فەرزەکان، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان ، زەکات، حەج و عومرە، صیلەی ڕەحم و چاکە لەگەڵ دایكو باب‌و لەگەڵ دراوسێ، دادگەریی، هەموو ئەو شتانەی، کە خوای پەروەردگار فەرزی کردوون، جا چ لە قورئان دا، چ لە سوننەتی پێغەمبەری خوا"صَلَى اللہ عَلَيهِ وَسَلَم"دا، ڕاوێژیان تێدا ناکرێ، بەڵکو ئەگەر ڕاوێژیان تێدا بکرێ، بۆ ئەوە دەکرێ، کە چۆنیان جێبەجێ بکەن! بەنیسبەت قەدەغەکراوەکانیشەوە، چۆن خۆیانیان لێ دوور بگرن!

(الزمخشري) لەتەفسیری ئەم ڕستە قورئانییەدا: ﴿ ..وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ ...﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران، دەڵێت: (أي في أمر الحَربِ ونَحوِهِ مِما لَم يَنزِل عليكَ فيهِ وَحيٌ) واتە: لە کاروباری جەنگ و وێنەی جەنگ دا، لەوەدا، کە وەحییت بۆ دانەبەزیوە لە سەری[1].

کەواتە (في الأمر) واتە: چ کاروباری جەنگ، چ کاروباری ئاشتی، کە دیارە کە گوتمان جەنگ و ئاشتی مانای، وایە هەمووی دەگرێتەوە.

[1]) بڕوانە: الکشاف، ج١ ص ٣٣٢.

(إبن كثير)یش ڕەحمەتی خوا لەهەموو توێژەرەوانی قورئان بێ، دیسان لە تەفسیرەکەی خۆیدا لە لێکدانەوە و توێژینەوەی ئەو ڕستە قورئانییەدا: ﴿...وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ...﴾ (١٥٩) آل عمران، چەند بوارێکی گرنگ بۆ ڕاوێژ تێدا کردن دەخاتە ڕوو و دەڵێ:

(ولذلك كان رسول الله "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" يشاور أصحابه في الأمر إذا حَدَث، تطييبًا لقلوبهم؛ ليكونوا فيما يفعلونه أنشط لهم كما شاوَرَهم يوم بدر في الذهاب إلى العير فقالوا: يا رسول الله، لو استعرضت بنا عُرْض البحر لقطعناه معك، ولو سرت بنا إلى بَرْك الغَمَاد لسرنا معك، ولا نقول لك كما قال قوم موسى لموسى: اذهب أنت وربك فقاتلا إنا هاهنا قاعدون، ولكن نقول: اذهب، فنحن معك وبين يديك وعن يمينك وعن شمالك مقاتلون، وشاوَرَهم - أيضًا - أ ين يكون المنزل؟ حتى أشار المنذر بن عمرو المُعْنق ليموت، بالتقدم إلى أمام القوم، وشاورهم في أحد في أن يقعد في المدينة أو يخرج إلى العدو، فأشار جمهُورُهم بالخروج إليهم، فخرج إليهم.

وشاورهم يوم الخندق في مصالحة الأحزاب بثلث ثمار المدينة عامئذ، فأبى عليه ذلك السَعْدَان: سعدُ بن معاذ وسعدُ بن عُبَادة، فترك ذلك.وشاورهم يومَ الحُدَيبية في أن يميل على ذَرَاري المشركين، فقال له الصديق: إنا لم نجيء لقتال أحد، وإنما جئنا معتمرين، فأجابه إلى ما قال، وقال عليه السلام في قصة الإفك: "أشِيروا عَلَيَّ مَعْشَرَ الْمُسْلِمينَ فِي قَوْمٍ أبَنُوا أهلِي ورَمَوهُم، وأَيْمُ اللهِ مَا عَلِمْتُ عَلَى أهْلِي مِنْ سُوءٍ، وأبَنُوهم بمَنْ - واللهِ - مَا عَلِمْتُ عَلَيْهِ إلا خَيْرًا". واستشار علياً وأسامة في فراق عائشة، رضي الله عنها)[1]

لێرەدا (إبن كثير) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، ئاماژە دەکات بە حەوت جۆر، یان حەوت موفرەدە لە شێوەکانی ڕاوێژ کردنی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" سەرەتا دەڵێ: بۆیە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" راوێژی بە هاوەڵانی دەکرد، لە هەر کارێکدا

---

[1]) المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير، ص٢٥٥-٢٥٦.

کە ڕووی دەدا، بۆ ئەوەی کە دڵیان خۆش بکات و بۆ ئەوەی بە چالاکیی زیاترەوە ئـەوەی، کە پێیان دەسپێررێ، ئەنجامی بدەن:

یەك: ڕاوێژ پێکردنییان لە ڕۆژی بەدردا، کە ئایا بچیٚ بۆ گرتنی کاروان، یان نا؟

دوو: ڕاوێژی پێکردنیان، کە لە کوێدا مەنزڵگە دابنێن (مەنزڵگـەی جـەنگ لـە کـوێ بێ‌و لەکوێ بارگە وبنە بخەن؟).

سێ: ڕاوێژی پێکردنییان لە ڕۆژی ئوحوددا (لە جەنگی ئوحوددا) کە ئایا لە مەدینەدا دابنیشێ، یان بچێتە دەر بۆ دوژمن؟

چوار: ڕاوێژی پێکردنیان لە ڕۆژی خەندەق دا (جەنگی ئەحزاب)، کە ئایا ڕێککـەوتن بکات لەگەڵ ئەحزاب دا لەسەر ئەوە، کە سـێیەکی بـەروبوومی مەدینـەی ئـەو سـاڵەیان بداتێ، یان نا؟

پێنج: ڕاوێژی پێکردنییان لە ڕۆژی حودەیبییـەدا (صـوڵحی حودەیبییـە)، کـە ئایـا بەسەر ماڵ و منداڵی هاوبەش پەیداکەرەکان دا بدات، لەمەککە یان نا؟

شەش: لەبەسەرهاتی (ئیفك)دا (ئەو بوختانەی بۆ دایکمان عائیشە خوای لێ ڕازی بێت هەڵبەسترا) فەرمووی: ئـەی کۆمـەڵی مسـوڵمانان! بـیروڕای خۆتـانم پـێ بڵـێن‌و ڕاوێـژی پێکردن.

حەوت: ڕاوێژی بە عەلی و ئوسامە کرد خـوا لێیـان ڕازی بێـت لـەوەدا، کـە ئایـا لـە عائیشە (دایکی مسوڵمانان) جیا ببێتەوە، یان نا؟

کەواتە: ئەوانە حەوت جۆر، یان حەوت وێنە هێنانـەوە بـوون، کـە پێغەمبـەری خـوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" ڕاوێژی بە هاوەڵانی کردوە ، کە (إبن كـثير) باسی کردوون، ئەگـەرنا ئەو حاڵەتانەی، کە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" ڕاوێـژی پێکـردوون، زۆر لـەوە زیاترن.

ئنجا ئەگەر سەرنجی چۆنێتی ڕاوێژ کردنەکانی پێغەمبەری خـوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" بدەین، دەبینین بەگشتی سێ جۆرە ڕاوێژی کردوون:

**جۆری یەکەم**: ڕاوێژکردن بە خەڵك‌و جەماوەر بە گشتی، کە ئێستا ڕاپرسی گشتی پـێ دەڵێن (الإستفتاء العام) - ڕفراندۆم - وەك لە جەنگی بەدرو، جەنگی ئوحودداو، لـەکاتی

دابەشکردنی دەستکەوتەکانی جەنگی حونەینداو، جەنگ کردن لەگەڵ قورەیش دا، ئەگەرهاتو عوسمانیان کوشتبێ (خوا لێی رازی بێت)، لە صولحی حودەیبییەدا.

لەو چەند حاڵەتەدا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بەگشتی پرسی بە مسوڵمانان کردوەو ڕاپرسی گشتی کردوە.

**جۆری دووەم:** ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ڕاوێژی کردوە بە مشوور خۆرانو قسە بەدەستانی کۆمەڵگا، واتە: نەچووە پرس بە هەموویان بکات، بەڵکو بەس ڕاوێژی بەوانە کردوە، کە قسە بەدەستن، چونکە زانیویەتی خەڵکەکە بەقسەی ئەوانە دەکەن، کە قسە بەدەستیانن، وەك ڕاوێژکردنی بە سەعدی کوڕی موعاذو سەعدی کوڕی عوبادە (خوا لێیان ڕازی بێ) لە جەنگی ئەحزاب دا، کە ئایا صولْح و ڕێککەوتن لەگەڵ هۆزی غەتەفان (غَطَفان)دا بکات کە سێیەکی بەروبوومو میوەی مەدینەیان- هی ئەو ساڵە- پێ بدات، یان نا؟ چونکە زانیویەتی کە ئەوس و خەزرەج بە قسەی سەعدی کوڕی عوبادە و سەعدی کوڕی موعاذ دەکەنو لە قسەی ئەو دوانە دەرناچن، بۆیە ئەوەندەی بە کافی زانیوە، کە ڕاوێژ بەو دوانە بکات، ئەو کاتەش مانای وایە ڕاوێژی بە هەمو مسوڵمانانی پشتیوان (الأنصار) کردوە (خوا لێیان ڕازی بێ).

**جۆری سێیەم:** جۆرێکی دیکە ڕاوێژکردنی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئەوەیە، کە ڕاوێژی کردوە بە کەسانێکی پسپۆڕ، وە ك ڕاوێژکردنی بە (الحباب بن المنذر) لە جەنگی بەدر دا، کە لە کوێ بارگە و بنە بخات؟! هەڵبەتە پێشێ لە شوێنێك بارگە و بنە و قۆناغیان دامەزراندبوو، بەلاّم (الحباب بن المنذر) (خوا لێی رازی بێ)، لە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەپرسێ: ئایا ئەم مەنزڵگایە فەرمانی خوایە، یان تاکتیکی جەنگییە؟ واتە: ئەگەر فەرمانی خوا و وەحییە، ئەوە قسەی لێ ناکرێ، بەلاّم ئەگەر تاکتیکی جەنگە، قسەی لێ دەکەین، پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: (**بَلَ هيَ الحَربُ والرأي و المَكيدة**) بەڵکو ئەمە جەنگەو بیرو بۆچوونی خۆمەو تاکتیکی جەنگییە، ئەویش پێشنیاری بۆ دەکات، کە لەوێ بگوازێتەوەو بچێتە سەرتر، پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" پێشنیارەکەی جێ بەجێ دەکات.

پاشان لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکان دا (خوا لێیان رازی بێ)، جۆرێکی دیکەی ڕاوێژ کردن دەبینین، کە بریتیە لە دیاریی کردنی کەسانێکی تایبەت بۆ ڕاوێژ پێ کردن، وەك لە داهاتوودا بە وردیی باسی دەکەین، بەڵام لێرەدا ئاماژە دەکەین بەو هەڵوێستەی عومەری کوری خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ)، کە لە کاتێکدا ئەبو لوئلوئەی مەجووسیی بریندراری کرد، چاوەڕێی مەرگی دەکرد، هەڵسا بۆ دیاریی کردنو هەڵبژاردنی سەرۆكو گەورەی مسوڵمانان لە دوای خۆی، ئەنجوومەنێکی شەش کەسیی پێکهێنا، لە: عەلیو عوسمانو عبدالرحمنی کوڕی عەوفو زوبەیری کوڕی عەوامو تەلحەی کوڕی عوبەیدولڵاو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (خوا لێیان رازی بێ)،وە پێویستی کرد، کە ئەو شەش کەسە لەماوەی سێ ڕۆژان دا یەکێك لە نێو خۆیان دا بە بەرپرسو گەورەی مسوڵمانان هەڵبژێرن.

کەواتە: ئەوەش جۆرێکی دیکە بووە لە جۆرەکانی ڕاوێژ کردن، هەڵبەتە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"یش دا ناتوانین بڵێین: پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کەسانێکی دیاریی کراویی نەبوون، ڕاوێژی پێ کردبن، چونکە لە یەکێك لە فەرموودەکانی دا بە ئەبو بەکر و عومەر دەفەرموێ: {**لَوْ اجْتَمَعْتُمَا فِي مَشُورَةٍ مَا خَالَفْتُكُمَا**}( أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٠٢٣)، وَقَالَ الهيثمي: رجاله ثقات إلا أن ابن غنم لم يسمع من النبي، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف لضعف شهر بن حوشب وحديث عبد الرحمن بن غنم عن النبي مرسل) واتە: هەرکات ئێوە هەردووکتان لەسەر ڕاو بۆچوونێك کۆك بن، پێچەوانەتان نابم. واتە: هەر شتێك ئێوە لەسەری کۆك و تەبا بنو هەر پێشنیارێك بکەن، پێشنیارەکەتان لێ وەردەگرم، مانای وایە ئەبو بەکرو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێت) (کە بەدوو وەزیرەکانی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ناسراون) بیروڕاو بۆچوونیان لە لای پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" قورساییو ئیعتیبارێکی تەواوی هەبووە، لە سۆنگەی ئەوەوە، کە ئەزموونیان زیاتربووەو شارەزاییان زیاتر بووە، پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" متمانەی بە عەقڵ و ئەزموونو دڵسۆزییان زیاتر بووە، لەوانی دیکەو هەر کەسێکی دیکەش بەگوێرەی پێگەی خۆی.

لێرەدا دەگەینە ئەو ئەنجامە، کە دەستی مسوڵمانان کراوەیە بۆ چۆنیەتی ڕاوێژ کردن، بەڵام دیارە بەپێی جیاوازیی حاڵەتو جۆرەکانی ئەو شتانەی، کە ڕاوێژیان تێدا دەکرێ، چۆنیەتییەکەشیان دیاریی دەکرێ.

بابەت هەیە پێویستیی بە ڕاپرسییەکی گشتی هەیە، وەك پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بۆچوون بەرەو ڕووی دوژمن لە جەنگی بەدردا، بەڕاپرسیی گشتی کردی، (کە دواییش باسی دەکەین)، وەلە جەنگی ئوحوددا دیسان ڕاپرسیی گشتی کرد، پابەندیش بوو بە ئەنجامی ڕاپرسییەکەوە.

بەڵام بابەت هەیە کە پەیوەندیی هەیە بە مشوورخۆرانی مسوڵمانانەوە، کەواتە: ئەگەر ڕاوێژ بەقسە بەدەستو نوێنەرو مشوورخۆرانیان بکرێ، ئەوەندە بەسە.

وە بابەت هەیە کە پەیوەستە بە خەڵکێکی شارەزا و پسپۆڕەوە لە بوارێکی دیاری کراودا، وەك لە بارەی دیاریکردنی مەنزڵگاو بارەگا لە جەنگی بەدردا، کە (الحباب بن المنذر) (خوای لێ رازی بێ) پێشنیاری کردو پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" پێشنیارەکەی وەرگرت و، پرسی بە هاوەڵانی دیکە (خوا لێیان ڕازی بێ) نەکرد، چونکە دیارە زانیویەتی هاوەڵانی دیکەش متمانەیان بە عەقڵو ئەزموونی (الحباب بن المنذر) هەیە لەمەسەلەی تاکتیکی جەنگیی دا، بۆیە ئەوانیش بێ دەنگ بوون، ئەگەرنا بە تەئکید، ئەگەر کەسێکی دیکەیش ڕایەکی دیکەی هەبوایە، یان ئەگەر بە گشتی بیانگوتایە: ڕای (حەبباب) بەکەڵك نایەت، پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" گوێی بۆ ئەوانیش دەگرت.

ئنجا با وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە، کە ئایا ئەگەر کۆڕێکی ڕاوێژی دیاریی کراو (مجلس شوری مُحدَّد) هەبێ، کە ئێستا (پەرلەمان) یان (ئەنجوومەنی نوێنەران)ی پێ دەڵێن، ئایا لە ئیسلام دا جێگای دەبێتەوە، یان نا؟ دەڵێین بە تەئکید شتێکی زۆر ئاساییەو زۆر سروشتییە، کە مسوڵمانان کۆڕێکی ڕاوێژی دیاریی کراویان هەبێ، لە کەسانێکی دیاریی کراو، ئنجا ئەگەر بگوترێ: بۆچی لەسەردەمی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"دا نەبووە؟ دەڵێین: لەڕۆژگارو سەردەمی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کۆمەڵگاو پێکهاتەکەی سادە بووە، ئنجا مەرجیش نیە، کە لە کتێبەکانی سیرەدا

هەموو شتێك بۆ ئێمە نەقڵ كرابێ، ڕەنگە كەسانێكی دیاریی كراو هەبووبن، پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ڕاوێژی پێ كردبن، بەڵام ئەگەر گریمان ئەو كاتە كۆڕێكی ڕاوێژی دیاریی كراو و شوێنێكی دیاریی كراویشیان نەبووبێ، ئەوە مانای وانیە، كە ئێمە ئێستا ئەووەمان بۆ نیە، چونكە ئەوە دەكەوێتە بواری هەڵسوكەوتەكانەوە، كە دیارە لە بواری هەڵسوكەوتەكانیش دا، ئەسڵ دەستكراوەییە، نەك ئەسڵ ئەوە بێت، كە تۆ پابەندبی بەوەوە، كە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" چی كردوە، بەموو لێی لانەدەی، كە ئەوە بواری خوا پەرستییەكان (عبادات) وایە، ئەگەرنا بواری هەڵسوكەوتەكانو عادەتەكان، وەك جارانی دیكەیش باسمان كردوە، ئەسڵ تێیدا دەستكراوەیی و ڕەواییەو، دەبێ بەڵگە هەبێ لەسەر ئەوە، كە ئەو جۆرە مامەڵەیە قەدەغەیە، ئەگەرنا مادام بەڵگە لەو بارەوە نەبێ، ئەوە بەتەئكید هەر جۆرە مامەڵەیەك بۆ ئێمە بە ڕەوا دادەنرێ.

## بڕگەی پێنجەم: ئەندامانی ڕاوێژ چۆن دیاریی دەكرێن؟!

هەڵبەتە هەردوو ئایەتەكەی سووڕەتی (الشورى)و سووڕەتی (آل عمران)، كە ئاماژەمان پێدان، بە شێوەی گشتی فەرمان بەڕاوێژ كردن دەكەن، بەڵام چۆنیەتی دیاریی كردنی ئەندامانی ڕاوێژیان دیاری نەكردوە، بەڵام وەك پێشتر باسمان كرد، ئەو ڕێی نەگرتوە لەوە كە مسوڵمانان بە پێی سەردەم و بارودۆخی خۆیان میكانیزم و شێوازی گونجاو بدۆزنەوە، بۆ دیاریی كردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی ڕاوێژ، چونكە ئەوە شتێكە لە بواری هەڵسوكەوتەكاندایەو، لە بواری هەڵسوكەوتەكانیش دا ئەسڵ دەستكراوەییە.

ئنجا لێرەدا دەپرسین: ئایا لەبەر ڕۆشنایی دەقەكانی قورئانو سوننەت دا، شێوازێكو میكانزمێك دیاریی كراوە بۆ دانان و دیاری كردنی كەسانێك، كە پێویستە ڕاوێژیان پێ بكرێو بكرێنە مشوورخۆرو بڕیار بەدەستی كۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی؟

دەڵێین: ئەگەر تەماشای دەقەكانی قورئان و سوننەت بكەینو، سەرنج بدەینە سیرەو ژیانی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" زۆر بە ڕوونیی بۆمان دەردەكەوێ، كە باشترین میكانیزمو چاكترین شێواز بریتیە لە هەڵبژاردن، ئەوەی كە لەم ڕۆژگارەی ئێستای ئێمەدا باوە، دەتوانین سێ بەڵگەی سەرەكی بێنینەوە، لەسەر ئەوە كە پێویستە

ئەندامانێك، كە ڕاوێژیان پێ دەكرێ، جا چ لە ئەنجوومەنێكی دیاریی كراوەدا كۆببنەوە، وەك لە سەردەمی ئێستامان دا( ئەنجوومەنی ڕاوێژ) هەیە، كە لەهەندێ شوێن (ئەنجوومەنی نوێنەران)و، لە هەندێ شوێن (پەرلەمان)و لە هەندێك شوێنیش: (ئەنجوومەنی نیشتمانیی) پێدەڵێن،چ لە دوو ئەنجومەن،یان یاتردا كۆببنەوە.

**بەڵگەی یەكەم:** وەك زۆر جاری دیكەمان، گوتومانە بواری هەڵسوكەوتەكان بناغە تێیدا، دەستكراوەییە (الأصل في المعاملات العفو) بناغە ڕەواییە لە بواری هەڵسوكەوتەكان داو دەبێ بەڵگە هەبێ لەسەر ئەوەی فلانە هەڵسوكەوتە ناڕەوایە، ئەگەرنا هەموو هەڵسوكەوتێكو عادەتێك لە ئەسڵ دا بەڕەواو ڕێپێدراو دادەنرێو ئەوە بنچینەیەكی شەرعییە.

كەواتە: مادام ئێمە پێویستییمان بە میكانیزمی هەڵبژاردن هەیە بۆ دیاریی كردنی كەسانێك، كە دەبێ ڕاوێژیان پێ بكرێو بكرێنە بڕیار بەدەست و یاسادانەر بۆ كۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی، مادام پێویستیمان پێی هەیە، بناغەیش لە هەڵسوكەوتەكان دا دەستكراوەییە، مانای وایە هیچ پەرچێكمان لە بەردەمدا نیە، كە ئەوە بكەین.

**بەڵگەی دووەم:** بنچینەیەكی دیكەیە كە زانایان لەسەری ڕێككەوتوون، كە چۆن بەرژەوەندیی دەستەبەر بكرێو دادگەریی بچەسپێنرێ، بەهەر ڕێگاو شێوازێك بێ، ئەوە دروستە ئەو ڕێبازو شێوازە بگیرێتە بەر، وەك زانایان باسیان كردوە، بۆ وێنە (ابن قیم الجوزیة) لە كتێبی (الطرق الحكمیة) لە لاپەڕە (٢٢و ٢٣)دا هێناویەتی، كە بە هەر شێوەیەك لە شێوەكان، بەرژەوەندیی مسوڵمانان بچەسپێو دادگەری بچەسپێو بەرژەوەندییان دابین بكرێ، ئەوە بۆیان هەیە ئەو شێواز و ڕێبازە بگرنە بەر.

**بەڵگەی سێیەم:** ئەوەیە كە ئێمە چەندان دەقی شەرعیی ڕوونو بێ چەند و چوونیشمان هەن، كە پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" فەرمانی كردوە بەوە، كە مسوڵمانان هەڵسن بە هەڵبژاردن لە نێوان خۆیاندا، واتە: بەرپرسانی خۆیان، جا چ ئەوەی، كە لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا پێی دەگوترێ: دەستەڵاتی یاسادانان، چ دەستەڵاتی جێبەجێكردن، لەنێو خۆیاندا هەڵسن بەدیاریی كردنی بەرپرسانو مشوورخۆرانو كاربەدەستانی خۆیان.

بـۆ وێنــە:

**یەکەم:** لە پەیمانی دووەمی عەقەبەدا، کە (٧٥) کەس تێیـدا بەشـدار بـوونو پێشـتر باسمان کردوە، کە (٧٣) پیاوو دوو ئافرەت بوون، پێغەمبەری خـوا "صَلَى الله عَلَيـِهِ وَسَلَمَ" دوای ئەوەی، کە پەیمانیان لەگەڵ بەسـتو وەك سـەرۆکی خۆیـانو مشـوورخۆریی خۆیـان قبووڵیان کرد، پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَمَ" بۆ ڕێکخستنی کاروبـاری ئیـدارییان فەرمووی: {أَخْرِجُوا إِلَيَّ مِنْكُمْ اثْنَيْ عَشَرَ نَقِيبًا يَكُونُونَ عَلَـى قَـوْمِهِمْ}( أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد برقم: (١٥٨٣٦)، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث قوي وهذا إسناد حسـن)[1] واتە: لە نێو خۆتان دا دوازدە نەقیبم (نەقیب دیـارە ئـەو کاتـە وەك زاراوەك بـەکارهێنراوە واتـە: مشـوورخۆرو کاربەدەست) لە نێو خۆتان دا بۆ دەربێنن (واتە: بۆم هەڵبژێرن) ، تاکو بەسەر خەڵکەکـەی خۆیانەوە مشوورخۆر بن (دیارە پێغەمبەری خـوا "صَلَى الله عَلَيـِهِ وَسَلَمَ" زانیویـەتی، کـە ئەوانەی کۆبوونەتەوە، {تیرەو هۆز بوون هەرچی بوون}، زانیویەتی کە پێویسـتیان بـەوە هەیە، کە دوازدە مشوورخۆریان هەبن، بۆیە فەرموویەتی دوازدە کەس لـە نێـو خۆتـان دا هەڵبژێرن).

**دووەم:** لــە جــەنگی (مُؤتــە)دا پێغەمبــەری خــوا "صَلَى الله عَلَيـِهِ وَسَلَمَ" ســێ کــەس هەڵدەبژێرێ بۆ ئەوەی فەرماندەیان بن: زەیدی کـوڕی حاریســەو جەعفــەری کـوڕی ئــەبی تاڵیبو عـبدالله ی کوڕی ڕەواحە، (خوا لە هەمویان ڕازی بـێ)، دەفەرموێ: هەرکاتێك زەیدی کوڕی حاریسە کوژرا، با جەعفەری کوڕی ئەبی تاڵیب ببێتە فەرماندەی سوپا، هەرکاتێك ئەویش کوژرا، با عـبدالله ی کوڕی ڕەواحە بێ، دوایـی فـەرمووی: ئەگـەر ئـەویش کـوژرا {فَلْيَـرْتَضِ الْمُسْـلِمُونَ رَجُـلاً} بـا مسـوڵمانان لـە نێـو خۆیانـدا پیاوێـك هەڵبـژێرن، فەرماندەیەك بۆ خۆیان دیاریی بکەن[2].

---

[1] - السيرة النبوية لإبن هشام ج٢ ص ٢٢٩ ، دار ابن الهيثم. وە (مجموعة الوثائق السياسية) د. محمد حميـد، ص ٥٠.

[2]) الأحكام السلطانية، ص ٢٦ ، للماوردي.

جــا ئەمــە بنچــینەیەکی گشــتییە، کــە مســـوڵمانان هــەرکاتێك پێویســـتییان بەمشوورخۆرێك، کارەبەدەستێك، بڕیار بەدەستێك بوو، لە نێو خۆیاندا هەڵی بژێرن.

**سێیەم:** نموونەی سێیەم لەو بارەوە: لە کاتی دابەشکرانی دەسکەوتەکانی (هــەوازن)دا، کە (٦٠٠٠) کەس لە ژنو منداڵیان ، لە لایــەن ســوپای ئیســلامەوە بــەدیل گیرابــوون ، دوایی جەنگاوەرەکان هاتن مسوڵمان بوون، پێغەمبــەری خــوا "صَلَى الله عَلَيـهِ وَسَلَمَ"یــش سەرپشکی کــردن، کــە ئایــا مــاڵ و ســامانەکانتان بدەمــەوە، یــان ژن و منداڵــەکانتان؟ ئەوانیش گوتیان: ژن و منداڵەکانمان دەوێتــەوە، ئنجــا پێغەمبــەری خــوا "صَلَى الله عَلَيـهِ وَسَلَمَ" بە گشتی ڕاپرســی بــە هــاوەڵانی بــەڕێزی کــرد، کــە ژنو منداڵــەکانیان بداتــەوە، بەمەرجێك، کە دوایی هەر کەسێك داوای مــافی خــۆی دەکــات، لــە کــاتی دیکــەدا بــۆی قەرەبوو بکاتەوە ، جا لەو کاتەدا مسوڵمانان بــە گشــتی گوتیــان: (**يَا نَبِيَّ الله قَد رَضِينا وَسَلَّمْنا**) ئەی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيـهِ وَسَلَمَ" ئێمە ڕازین و ملکەچین بــۆ فــەرمانی تۆ، پێغەمبەری خوا"صَلَى الله عَلَيـهِ وَسَلَمَ" بەوەندە قسەیە ڕازی نــەبوو، بــەڵکو فــەرمووی: (**إِنِّي لا أَدْرِي لَعَلّ فِيكُمْ مَنْ لا يرضى، فمروا عرفاءكم يرفعون ذَلِـك إِلَيْنـا، فرفعـت إِليه العرفاء أن قد رضوا وسلموا**)[1]، واتە: پێغەمبەری خوا"صَلَى الله عَلَيـهِ وَسَلَمَ" دوای ئەوەی ئەوان بەگشتی قسەیان کرد فەرمووی: من نازانم ڕەنگە تێتاندا هــەبێت، کــە ڕازی نەبێ، بۆیە بە عەریفەکانتان بڵێن ، با ئەو شتە بــۆ لای ئێمــە بێــنن (واتــە: مشــورخۆرو نوێنەرەکانتان)، عەریفەکانیش ئەوەیان هێنا بۆلای پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيـهِ وَسَلَمَ" کە بەڵێ، هەموو خەڵکەکە ڕازین، لێرەشدا بۆمان دەرەکەوێ، کە پێغەمبەری خــوا "صَلَى الله عَلَيـهِ وَسَلَمَ" بۆ ئەوەی بزانێ ئەو خەڵکە هەموویان ڕازین، یان نا؟ پشتی بە مشورخۆران و نوێنەرانێك بەستوە، کە لە نێو خۆیاندا دیارە هەڵیانبژاردوون، یاخود دەبوایە لەو کاتەدا هەڵیان ببژێرێن.

کەواتە زۆر ڕوون وئاشکرایە، کە مەسەلەی هەڵبژاردن، واتــە: کــە مســوڵمانان لــەنێو خۆیاندا کاربەدەستانی خۆیان هەڵبژێرن، چ بۆ دەستەڵاتی یاسادانان، کە ئێســتا خــەریکی

---

[1]) طبقات إبن سعد، ج٢ ص١٥٥.

باسکردنینی، چ بۆ دەستەڵاتی جێ بەجێ کردن، کە دوایی باسی دەکەین، مەسەلەی هەڵبژاردن و ڕاوێژ بە خەڵك کردن، ئەوە کە خەڵك لەنێو خۆیاندا بەر پرسانی خۆیان هەڵبژێرن، لە شەریعەتی ئیسلامییدا شتێکی چەسپاوە ، بۆیە ئێمە دەڵێین: هەرکاتێك مسوڵمانان پێویستییان بەوە بوو، کە مشوورخۆرانێك بۆ خۆیان هەڵبژێرن، ئەوە دیارە دەبێ لەڕێی میکانیزمی هەڵبژارنەوە ئەوە بکرێ، چونکە ئەوە هیچ بەدیلی دیکەی نیە، مەگەر ئەوە، کە کەسانێك خۆیان فەرز بکەنو لەخۆوە ئیرادەی خەڵك زەوت بکەن، چ وەك حوکمی میراتیی، چ تاکڕەویی.

## بڕگەی شەشەم: ئەنجامی ڕاوێژکردن لە نێوان ئاگادار کردنەوەو پابەند کردن دا:

ئایا دوای ئەوەی ڕاوێژ دەکرێو کەسانێك ڕایەکیان هەیەو، کەسانێکی دیکە ڕایەکی دیکەیان هەیە، چۆن ئەوە یەکلایی دەکرێتەوە، بە تایبەت بە نیسبەت بابای حوکمڕانو کاربەدەستەوە، کاتێك کە زۆرینەی خەڵك ڕایەکیان هەیە، ئایا ئەو ڕایەی ئەو زۆرینە پابەندکەرە بۆ کاربەدەستو بەرپرس، یاخود هەر ئاگادار کەرەوەیەو، بۆی هەیە ڕای زۆرینە وەرنەگرێ؟.

سەرەتا دەڵێین: زانایان لە مێژووی ئیسلامییدا لەو بارەوە مشتومڕی زۆریان بووە، کە ئایا ئەنجامی ڕاویژ پابەندکەر (مُلْزِم)ە ، یان تەنیا ئاگادارکەرەوە (مُعْلِم)و بەرچاوڕوون کەرەوەیە بۆ کاربەدەستان؟ هەندێکیان گوتوویانە: بەڵێ پابەند کەرەو هەرکات لەو شتانەدا، کە ڕاوێژی گشتییان تێدا دەکرێ، زۆرینەی خەڵك لەسەر ڕایەك کۆبوون، پێویستە کاربەدەست و بەرپرس ڕای زۆرینە جێبەجێ بکاتو، ئەگەر ڕای خۆی جیاواز بێ، لەڕای خۆی دابەزێ، بەڵام هەندێکیان گوتوویانە: نەخێر، بەڵکو بۆی هەیە بەپێی ڕای زۆرینە بەڕێوە نەچێ، چونکە شەریعەت چوارچێوەیەکی دیاریی کردوەو ڕاوێژ هەر لەو شتانەدا دەکرێ، کە دەقی شەرعیی لەسەر نیەو مادام دەقی شەرعیشی لەسەر نەبوو،

پێویستە دەستەڵاتی جێبەجێکردنو حوکمڕان دەستی کراوە بێتو بۆی هەبێ، کە پابەند بێ بەڕای زۆرینەوە یاخود پابەند نەبێ.

هەندێکیشیان گوتوویانە: ڕاوێژ دەبێتەوە بە دوو بەش: ڕاوێژی گشتیی و، ڕاوێژ پێکردنی تایبەتی (الشورى و الإستشارة) وەك (د.توفیق الشاوي) لەو بارەوە کتێبێکی هەیە بەناوی: (فقه الشورى والإستشارة) کە تێیدا دەڵێ: ئەوەی کە بەگشتی ڕاوێژی تێدا دەکرێ، ئەوە ڕای زۆرینە پابەند کەرە، بەلاّم ئەوەی کە بەتایبەت بەرپرسو حوکمڕان ڕاوێژی تێدا بە خەڵکێکی تایبەت دەکات، ئەوە ئەنجامەکەی تەنیا بەرچاو ڕوونکەرەوەو شارەزا کەرە بۆ حوکمڕانو، بۆی هەیە کە ڕایەکە وەربگرێ، یان وەرنەگرێ.

هەڵبەتە من لە سەرەتاوە دەڵێم: بەڕاستی دوای توێژینەوەی ورد و قووڵ دەربارەی ئەم مەسەلەیە، بۆم دەرکەوتوە، کە ڕای زۆرینە پابەند کەرە، ئەگەر تەماشای دەقەکانی قورئانو سوننەتو سیرەو ژیاننامەی پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ" وسیرەی خەلیفە ڕاشیدەکان بکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەنجامی ڕاوێژ، پابەند کەرە بۆ کاربەدەست لەو شتانەدا، کە بە گشتی ڕاوێژیان تێدا دەکرێ، دیارە ئەو شتانەش، کە بەتایبەت ڕاوێژیان تێدا دەکرێ، واتە: بە خەڵکێکی پسپۆڕو شارەزا، لەو حاڵەتەدا بەڵگە دەیخوات‌و کێ بەڵگەی بەهێزتر بێ، پێویستە قسەکەی بچەسپێت، بەلاّم بە بۆچوونی من، بە هیچ شێوەیەك دروست نیە، کە کاربەدەست و حوکمڕانان ڕای زۆرینە پشتگوێ بخەن مەگەر بتوانن ئەو زۆرینەیە قەناعەت پێ بکەن، بەوەی کە ڕای ئەوان بەهێزترە لە ڕووی بەڵگەوە، بەلاّم ئەگەر نەیانتوانی و، زۆرینە لەسەر ڕای خۆیان سوور بوون، دەبێت ڕای زۆرینە پابەندیی پێوە بکرێ.

جا ئەوانەی، کە دەڵێن: ڕای زۆرینە پابەند کەر نیە، یاخود ئەنجامی ڕاوێژ کردن، هەرچەندە زۆرینەش لەسەری کۆببنەوە پابەندکەر نیە بۆ حوکمڕانو کاربەدەستان، چەند شتێك بە بەڵگە دێننەوە، کە ئێمە سەرەتا بەڵگەکانی ئەوان دەخەینە ڕوو، دوایش ڕوونی دەکەینەوە، کە ئەو شتانەی ئەوان بە بەڵگەیان دێننەوە، بە بەڵگە ناشێن.

## بەڵگەکانی ئەوانە کە دەڵێن: ڕای زۆرینە پابەندکەر (مُلْزِم) نیە:

**بەڵگەی یەکەمیان:** ئەوەیە کە دەڵێن: ئەو ڕستە قورئانییەی سوورەتی (آل عمران) لە ئایەتی ژمارە (١٥٩)دا کە دەفەرموێ: ﴿ وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ ﴾، واتە: ڕاویژیان پێ بکە لە کاروباردا، جا ئەگەر عەزمت لە سەر شتێك جەزم کرد، پشت بە خوا ببەستە، خوا پشت پێ بەستوانی خۆش دەوێن، دەڵێن: مانای ﴿ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ﴾، واتە: پاش ڕاوێژکردن، سەرپشکی چی دەکەی، ڕاوێژ بکە! بەڵام دوایی خۆت سەرپشکی، عەزمت لەسەر هەر شتێك بوو و ئیرادەت لەسەری جێگیر بوو، ئەنجامی بدە، پێچەوانەی ڕای زۆرینە یاخود موافیقی بێ.

**بەڵگەی دووەمیان:** دەڵێن: لە صولْحی حودەیبییەدا هەرچەندە هاوەڵان نارازی بوون (خوا لێیان ڕازی بێ)، بەڵام پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمْ" گوێی بەڕای زۆرینە نەدا، صولحەکەی ئیمزا کرد.

**بەڵگەی سێیەمیـ ن:** دەڵێن: دەربارەی دیلەکانی جەنگی بەدر، پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمْ" تەنیا قسەی ئەبوبەکری وەرگرت و، ڕاوێژی بەکەسی دیکە نەکرد.

**بەڵگەی چوارەمیان:** دەڵێن ئەبو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، لە جەنگی دژی هەڵگەڕاوەکان (المرتدین) دا لەسەر هەڵوێستی خۆی سوور بوو، هەرچەندە هاوەڵانیش بەگشتی نارازی بوون، لە نێویشیان دا عومەری کوڕی خەتتاب، (خواله هەموویان ڕازی بێ).

**بەڵگەی پێنجەم:** دەڵێن لە بە ڕێکردنی سوپای ئوسامەدا، واتە: ئەو سوپایەی کە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمْ" ئوسامەی کوڕی زەیدی کردبووە فەرماندەی، دیسانەوە ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێ) سوپایەکەی بەڕێکردو، گوێی بە ڕەخنە ونارەزایی زۆرینەی هاوەڵان نەدا.

**بەڵگەی شەشەمیان:** دەڵێن: عومەر خوا (لێی ڕازی بێت) لە دابەشکردنی (سواد العراق)دا واتە: ئەو سەرزەمینەی، کە هەمووی کشتوکاڵ بوو، هەمووی بەروبوومی زۆری تێدا بوو، لە دوورەوە لە سەوزاییدا ڕەش دەبینراو پێیان دەگوت: (سواد العراق)، لە

دابەش نەکردنی و هێشتنەوەی بەدەستی خاوەن زەویەکاندا، ڕای زۆرینەی هاوەڵانی ڕەتکردەوە و لەسەر ڕای خۆی سوور بوو.

دەڵێن: کەواتە بەم بەڵگانە دیارە کە حوکمڕانو کاربەدەستان بۆیان هەیە پابەند نەبن بە ڕای زۆرینەوە.

## بەر پەرچدانەوەی بەڵگەکانی ئەوانەی دەڵێن: دەرەنجامی ڕاوێژ پابەندکەر(مُلْزِم) نیە:

ئەگەر سەرنجێکی ورد لە هەرکام لەو بەڵگانە بدەین، بۆمان دەردەکەوێ، کە ئەو بۆچوونە ڕاست نیە، کە دەڵێ: ڕای زۆرینە پابەندکەر نیە بۆ حوکمڕانو کاربەدەستان، کاربەدەستو حوکمڕانان بۆیان هەیە، کە هەر ڕایەکەی خۆیان بچەسپێننو بڕیارەکەی خۆیان جێبەجێ بکەن، جا چ زۆرینە پێی ڕازی بێ، یان نا.

**بەڵگەی یەکەمیـن:** کەتەفسیری ئایەتەکەیان ئاوا کرد، دەڵێن: ﴿ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ﴾، واتە: ڕاوێژیان پێ بکە، دوایی بڕیارت لەسەر هەر شتێك دا، پشت بە خوا ببەستەو جێبەجێی بکە، دەڵێین: ئەوە وانیە، بەڵکو مەبەستی ئایەتەکە ئاوایە: ڕاوێژ بە هاوەڵانت بکە، ئنجا دوای ڕاوێژ پێکردنیان و دەرکەوتنی ئەنجامی ڕاوێژەکە، ئیرادە و عەزمت بخەکار بۆ جێبەجێکردنی ئەو بڕیارەی، کە لە ئەنجامی ڕاوێژکردندا هاتۆتە کایەوەو ڕای زۆرینەی لەسەرە.

ئنجا ئایا بەڵگەمان چیە لەو بارەوە؟ (القرطبي) لە (قتادة)وە هێناویەتی دەڵێ: (العَزمُ هو الأمر المُروَّى المنقَّحُ وليس ركوب الرأي دون رَوِيَّةٍ عزماً)[1]، واتە: قەتادە گوتوویەتی: عەزم بریتیە لەو کارەی، کە وردبونەوەی تێدا کراوە و پاڵێوراوە (واتە: لە ئەنجامی قسە لێکردن و ڕاوێژ تێداکردندا هاتۆتە دی) بەڵام سواری قسەی خۆ بوون بەبێ لێ وردبوونەوە، بە عەزم لە قەڵەم نادرێ، کەواتە: کاربەدەستو حوکمڕانێك سواری قسەی خۆی ببێ، بێ ئەوەی زۆرینە پێی ڕازی بن، ئەوە پێی ناگوترێ: عەزم. بەڵێ، دوایی

---

[1]) الجامع لأحكام القرآن، ج٤ ص٥٤.

قورتوبیی لە تەفسیری ﴿فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ﴾ دا دەڵێ: نابێ پشت بە ڕاوێژ ببەستی، ئنجا هەندێك گوتوویانە: ئەوە مانای وایە مەبەست لە عەزم هەر ئەوە مانایەکەیەتی، کە چیت پێ چاك بوو وا بکە!! بەڵام ئێمەش دەڵێین: وانیە، چونکە ڕاستە نابێ پشت بە ڕاوێژ ببەستریو پشت هەر بەخوا دەبەستریٚ، بەڵام پێویستە ڕاوێژ بکرێ و پابەندییش بە ئەو ئەنجامەوە بکرێ، کە لە ڕاوێژ پەیدا دەبێو زۆرینە لەسەری پێك دێن.

ئنجا (الطبري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا (جامع البیان)[1] بەشێوەیەکی دیکە ئەو ڕستە قورئانییە تەفسیر دەکاتو دەڵێ: (فإذا صحَّ عزمك بتثبيتنا إياك، وتسديدنا لك فيما نابك وحزبك من أمر دينك ودنياك، فامض لما أمرناك به على ما أمرناك به، وافق ذلك آراء أصحابك وما أشاروا به عليك، أو خالفها)، (طبري) ئاوا ڕستە قورئانییەکە تەفسیر دەکاتو دەڵێ: هەرکاتێك عەزمی تۆ ساغ بووەوە بەهۆی چەسپاندنی ئێمەوە بۆتۆو، بەهۆی ڕێنمایی کردنی ئێمەوە بۆ تۆ، لەو کاروبارانەدا، کە دێنە پێشتو لەو گرفتانەدا، کە دێنە پێشت لە کاروباری دین و دنیات، ئەوە بەرەو ئەو ئامانجە، کە فەرمانمان پێ کردووی، بەو شێوازە کە فەرمانت پێکراوە، بڕۆو بەردەوام بە، کارت جێ بەجێ بکە، لەگەڵ ڕای هاوەڵانتدا یەك بگرێتەوە، یاخود تێکبگیرێ، ئەوەی کە پێمان گوتووی، مادام فەرمانی خوای لەسەرە، تۆ جێ بەجێی بکە، کەواتە: لێرەدا مەبەست ئەوەیە ئەوەی، کە بەوەحی فەرمان بە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کراوەو دەقی لەسەرە، دیارە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بۆی دروست نیە، کە ڕاوێژی تێدا بکات، بە هاوەڵان، یان ئەگەر هاوەڵان ڕەخنەشیان لێگرت، لە بەر ئەوەی زۆرینە ڕەخنەی لێ دەگرن، جێ بەجێی نەکات، فەرمانی خوا، هەر دەبێ جێبەجێ بکرێ، ئەوە بۆ شتانێکە، کە وەحییان لەسەرەو دەقیان لەسەرە، بەڵام شتێك، کە وەحیو دەقی لەسەر نەبێ، هەر کات خرایە بەر قسەلێکردنەوەو خرایە بەر پرسو ڕاوێژەوە، پێویستە بەرپرسو حوکمڕان بە ڕای زۆرینەوە پابەند بێت.

---

[1]) جامع البیان، ج٧ ص ٣٤٦.

**بەڵگەی دووەم** : کە باسی صوڵحی حودەیبییە دەکەنو دەڵێن: پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" گوێی نەدا بە ڕای زۆرینەی هاوەڵانی بەڕێزی، صوڵحەکەی ئیمزا کرد ، ئێمە دەڵێین : ئەوە وا نیەو بەدەقی فەرموودەی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" جێبەجێ کردنی ئەو صوڵحە و ئیمزا کردنی بەفەرمانی خوا بووە، بۆیە پێغەمبەری خوا"صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ڕاوێژی تێدا نەکردوە، ئنجا چۆن دەزانین وایە؟ پێغەمبەری خوا"صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی رازی بێ) بە ڕەخنە گرتنەوەو بە بێزارییەوە پرسیاری لێدەکات: بۆچی ئەو صوڵحە دەکات؟! پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" پێی دەفەرموێ: **{أَنَا عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ لَنْ أُخَالِفَ أَمْرَهُ وَلَنْ يُضَيِّعَنِي}** (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٩٣٠) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن)[1] واتە: پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: من بەندەو ڕەوانە کراوی خوام، سەرپێچیی لە فەرمانی ناکەم و ئەویش زایەم ناکات.

لە صەحیحی بوخاریی دا بە تەعبیرێکی دیکە هاتوە، کە دەفەرموێ: **{إِنِّي رَسُولُ اللهِ وَلَسْتُ أَعْصِيهِ وَهُوَ نَاصِرِي}** (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٧٣٢)، واتە: من ڕەوانە کراوی خوام، سەرپێچیی لە فەرمانی ناکەم، خوایش سەرم دەخات.

کەواتە: ئیمزا کردنی سوڵحی حودەیبییە لە لایەنی پێغەمبەری خواوە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"، هەرچەندە زۆر لە هاوەڵان نارازی بوون، لەبەر ئەوەبووە،کە وەحی خوای پەروەردگاری لەسەر بووە، پێشتریش گوتمان: هەرشتێك وەحی لەسەر بوو ئیجتیهادی تێدا ناکرێو ڕاوێژی لەبارەوە ناکرێ.

**بەڵگەی سێیەمیان** کە دەڵێن: دیلەکانی بەدر، پێغەمبەری خوا"صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" تەنیا ڕاوێژی بە ئەبو بەکر کردوە، ئەوەیش وانیە، بەڵکو بەگشتی ڕاوێژی بە هاوەڵانی بەڕێزی کردوە، (خوا لە هەموانیان ڕازی بێ). وەك لەم دەقەوە دیارە: (**عن أنس قال استشار النبِيُّ النّاسَ في الأسرى يوم بدر**)[2]. ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ:

---

[1] السيرة النبوية لأبن هشام، ج٣ ص١٦٩، دار إبن الهيثم.
[2] المسند (٣/٢٤٣)، وە (المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير) ص ٥٤٩.

پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" دەربارەی دیلەکانی جەنگی بەدر بە گشتی ڕاوێژی بە خەڵك کرد، کەواتە: ئەوە ڕاست نیە، کە تەنیا ڕاوێژی بە ئەبوبەکر کردبێ،خوالێی ڕازی بێ.

**بەڵگەی چوارەمیان** کە دەڵێ: ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، سوور بوو لەسەر جەنگ کردن لە دژی هەڵگەڕاوەکان، هەرچەندە زۆربەی هاوەڵان ناڕازی بوون، هەر قسەی خۆی جێبەجێکرد، دەڵێین: ئەوەشیان بەو شێوەیە نیە، بەڵکو ڕاستییەکەی ئەوەیە، کە دوای ئەوەی ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، لەسەر ڕایەکەی خۆی سوور بوو وتوێژی لەگەڵ هاوەڵاندا کرد، هاوەڵان قەناعەتیان هاتو چوونە سەر ڕایەکەی ئەبوبەکر، ئەگەرنا ئەگەر خەڵکەکە ڕازی نەبوونایە، چۆن ئەبو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ) ڕایەکەی خۆی بۆ جێبەجێ دەکرا، خۆ هەر دەبوو هاوەڵان جێبەجێی بکەن؟ بەلاّم ڕاستییەکەی ئەوەیە، کە ئەوان هاتنە سەر ڕایەکەی ئەبو بەکرو قەناعەتیان بە ڕایەکەی ئەبوبەکر هێناو وازیان لە ڕایەکەی خۆیان هێنا، دوای ئەوەی، کە بۆیان دەرکەوت ڕایەکەی ئەو ڕاستەو بەڵگەی بەهێزی بەدەستەوەیە، وەك بوخاریی و موسلیم لەو بارەوە لە عومەری کوری خەتتابەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕنەوە کە عومەر لەوبارەوە گوتوویەتی: **{فَوَالله مَا هُوَ إلاّ أَنْ رَأَيْتُ أَنَّ الله عَزَّ وَجَلَّ قَدْ شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ الله عَنْهُ لِلْقِتَالِ فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ}**( أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١١٧)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٨٥٥)، وَمُسْلِمْ برقم: (٢٠)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٥٥٦)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٠٧)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٤٤٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢١٧)) واتە: سوێند بەخوا هەر، کە بینیم خوا سینەی ئەبوبەکری بۆ جەنگ کردن گوشاد کردوەو ئەو قەناعەتەی لە دڵ دا داناوە، زانیم کە حەقە، واتە: لە ڕایەکەی خۆی دابەزی، کە بە تەئکید ئەو ڕایە و ئەو هەڵوێستەی عومەریش تەعبیر دەکات لە ڕا و هەڵوێستی زۆرینەی هاوەڵان (خوا لێیان رازی بێ)، ئەگەر نەشڵێین هەموویان، بەلاّم دوایی هەموویان چوونەتە سەر ڕای ئەبو بەکر خوا لێی رازی بێ.

**بەڵگەی پێنجەمیان:** دەڵێن ئەبو بەکر (خوا لێیی ڕازی بێ) سوپای ئوسامەی بە ڕێکرد، هەرچەندە هاوەڵان ناڕازی بوون، ئەوەشیان وانیە، بەڵکو ڕاستییەکەی ئەوەیە، کە ئەبوبەکر فەرمانی پێغەمبەری خوا"صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَمَ"ی جێبەجێکرد، نەك ڕای خۆی بسەپێنێت، دواییش هاوەڵان، کە زانییان فەرمانی پێغەمبەری خوایە "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَمَ" کە دیارە لەو کاتەدا لە بیریان چووە، یان لێی بێئاگابوون، بەڵام دوای ئەوەی ئەبوبەکر (خوا لێی رازی بێ) شتەکەیان بۆ باس دەکات، دێنە سەر قسەکەی ئەو وەك لە (تأریخ الأمم والملوك)[1]دا هاتوە، کە ئەبوبەکر گوتوویەتی: (**والذي نفسي بيده لو ظننت أن السباع تأكلني بالمدينة لأَنْفَذْتُ هذا البعث ولا بدأت بأول منه، كيف ورسول الله** "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَمَ" **ينزل عليه الوحي من السماء يقول: أَنْفِذوا جيش أسامة**) واتە: سوێند بەو کەسەی گیانی بەدەستە، ئەگەر بزانم دڕندە لەنێو مەدینەدا دەمخۆن، ئەم سوپایە هەر بەڕێ دەکەم و لەپێش ئەوەدا هیچ کارێك ناکەم، ئنجا چۆن! لە حاڵێك دا کە پێغەمبەری خوا"صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَمَ" لە ئاسمانەوە وەحی بۆ دابەزیوەو فەرموویەتی: سوپاکە ی ئوسامە بەڕێ بکەنّ یانی: من سوپایەك کە پێغەمبەری خوا "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَمَ" بە ڕێی کردوە، ڕێگریی لێ ناکەم. کەواتە: ئەبوبەکر فەرمانی پێغەمبەری خوا "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَمَ"ی جێبەجێ کردوە، نەك ڕای خۆی بسەپێنێ، دواییش بەتەئکید هاوەڵانی بەڕێز هاتوونەتە سەر ڕایەکەی ئەبوبەکر، ئەگەرنا وەك گوتمان نەدەگونجا ئەو سوپایە وەڕێ بکەوێ، لە حاڵێکدا،کە بە بڕیاری خەلیفە ڕازی نیەو ئەویش ناتوانێ بە زۆر ملیان بگرێو بیان نێرێ.

**بەڵگەی شەشەمیان:** کە دەڵێن: عومەر (خوا لێی رازی بێ) سەرزەمینی کشتوکاڵگوزاری عێراقی دابەش نەکرد، هەرچەندە زۆربەی هاوەڵان ڕایان لە سەر بوو،بەڵام ڕایەکەی خۆی چەسپاند، دەڵێین: ئەوەش وانیە، بەڵکو وەك (أبو عبيد قاسم بن سلام) لە کتێبی (الأموال)دا[2] هێناویەتی، دوای ئەوەی عومەر (خوا لێی رازی بێ) دەکەوێتە

---

[1] تأريخ الأمم والملوك للطبري، ج٤ ص ٤٥.
[2] ص ٨٣.

مشتومڕەوە لەگەڵ هاوەڵانی بەڕێزدا، هەندێکیان پشتگیریی دەکەن و هەندێکیان ڕێگریی لێدەکەن، دوایی بەردەوام دەبێ لە سەر ڕاوێژ کردن و بەردەوام دەبێ لەسەر وتوویژ، هەتا زۆرینەیان قەناعەت پێ دێنێ، ئەبو عوبەید بە تەفصیلێ ئەوەی هێناوە و لەسەرچاوەکانی دیکەشدا هاتوە.

کەواتە: هیچ بەڵگەیەك نیە، کە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"و چوار خەلیفە بەڕێزەکانی (خوا لێیان ڕازی بێ) پابەند نەبوو بن بە ڕای زۆرینەوە، لە کاتێکدا، کە شتێکیان خستبێتە ڕاوێژو پرسو ڕا بەخەڵك کردنەوە، بەڵکو بە ڕای زۆرینەوە پابەند بوون.

## سێ بەڵگە لەسەر پێویستبوونی پابەندیی بەڕای زۆرینەوە

ئنجا با چەند بەڵگەیەکی ڕوون بێنینەوە لەسەر ئەوە، کە زیاتر ئەو مەبەستەمان بۆ دەردەخات:

**بەڵگەی یەکەم:** جەنگی بەدر: (طبري) لە تەفسیرەکەیدا دەربارەی ڕاوێژ کردنی پێغەمبەری خوا (صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم) بە هاوەڵانی بۆ ڕوو بە ڕووبوونەوە، یان ڕوو بە ڕوو نەبوونەوە لەگەڵ سوپای قوڕیشدا، کە بەفەرماندەیی ئەبو جەهل هاتبوون، دەڵێت: (**فاستشار رسول الله الناسَ و اخبرهم عن قُريش، فقام أبوبكر فقال فأحسن ثم قام عمر فقال فأحسن ثم قام المقداد ابن عمرٍ فقال يا رسول الله امض لما امرك الله به ثم قال رسول الله أشيروا عليَّ أيها الناس و انما يريد الأنصار و ذلك لانهم كانوا عدد الناس**)[1] واتە: پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ڕاوێژی کرد بە خەڵك و هەواڵی پێدان دەربارەی قوڕەیش (کە ئەوە بە سوپایەکەوە کە ئەبو جەهل فەرماندەیەتی هاتوون بۆ ڕوو بە ڕووبونەوە لە گەڵمان، کە ڕاوێژی پێکردن) ئەبو بەکر قسەی کرد و قسەی باشی کرد، دوای ئەو عومەر قسەی کردو

---

[1]) جامع البيان، ج١٣ ص ٣٩٩.

قسەی باشی کرد، دوای ئەو میقدادی کوڕی عەمر هەڵساو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَی اللہ عَلَیہِ وَسَلَم) ئەوەی فەرمانی خوایە ئەنجامی بدەو ئێمەیش لە خزمەتین، بەلاّم پێغەمبەری خوا "صَلَی اللہ عَلَیہِ وَسَلَم" دیسان فەرمووی: (**أشیروا عليَّ أيها الناس**) خەڵکینە ڕاوێژتان پێدەکەم، بیرو ڕای خۆتانم پێ بڵێن، دەڵێ مەبەستی پێ پشتیوانەکان بوو، چونکە ئەوان زۆرینەی خەڵك بوون، (کە لە گەڵ پێغەمبەری خوا "صَلَی اللہ عَلَیہِ وَسَلَم" دا دەرچوو بوون بۆ گرتنی کاروانی ئەبو سوفیان، کەچی کاروانەکە تێپەڕیبوو، سوپایەك بە فەرماندەیی ئەبو جەهل هاتبوو).

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا "صَلَی اللہ عَلَیہِ وَسَلَم" هەرچەندە هەرکام لە ئەبوبەکرو عومەرو میقدادی کوری عەمر بیروڕای خۆیان دەخەنە ڕوو، بەلاّم هەر دەفەرموێ: (**اشیروا عليَّ ايها الناس**) بۆچی؟ دەیەوێ گوێی لە پشتیوانەکان بێت، چونکە زۆرینەی خەڵکەکە پشتیوانەکان پێکیان دەهێناو، بۆ هەرکارێکیش، کە پێغەمبەری خوا "صَلَی اللہ عَلَیہِ وَسَلَم" ڕاوێژی تێدا کردبێ‌و شتێکی گشتی بوو بێ، پێویستیی بە زۆرینەی خەڵك بووە، داخۆ زۆرینە دەڵێن چی؟ ئەگەر زۆرینە گوتبیان: با بچین، ئەوجار ئەنجامی داوە، ئەگەر زۆرینە ڕایان نەبووبێ ئەنجامی نەداوە.

**بەڵگەی دووەم**: جەنگی ئوحود: لە جەنگی ئوحوددا دیسان پابەندیی بە ڕای زۆرینەوە، وەك مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە، (إبن هشام) لە (السيرة النبوية)دا لەبارەی جەنگی ئوحودەوە دەڵێت:

(**وَكَانَ رَسُولُ اللّهِ "صَلَی اللہ عَلَیہِ وَسَلَم" يَكْرَهُ الْخُرُوجَ فَقَالَ رِجَالٌ مِنْ الْمُسْلِمِينَ مِمّنْ أَكْرَمَ اللّهُ بِالشّهَادَةِ يَوْمَ أُحُدٍ وَغَيْرِهِ مِمّنْ كَانَ فَاتَهُ بَدْرٌ يَا رَسُولَ اللّهِ اُخْرُجْ بِنَا إلَى أَعْدَائِنَا ، لايَرَوْنَ أَنّا جَبُنّا عَنْهُمْ وَضَعُفْنَا ، فَقَالَ عَبْدُ اللّهِ بْنُ أُبَيّ ابْنُ سَلُولَ: يَا رَسُولَ اللّهِ أَقِمْ بِالْمَدِينَةِ لاَ تَخْرُجْ إلَيْهِمْ،فوالله ماخرجنا منها الى عدوّ لنا قطّ إلاّ أصاب منّا، وَلاَ دَخَلَهَا عَلَيْنَا إلاّ أَصَبْنَا مِنْهُ فَدَعْهُمْ يَا رَسُولَ اللّهِ فَإِنْ أَقَامُوا أَقَامُوا بِشَرّ مَحْبِسٍ وَإِنْ دَخَلُوا قَاتَلَهُمْ الرّجَالُ فِي وَجْهِهِمْ وَ رَمَاهُمْ النّسَاءُ وَالصّبْيَانُ بِالْحِجَارَةِ مِنْ فَوْقِهِمْ وَإِنْ رَجَعُوا رَجَعُوا خَائِبِينَ كَمَا جَاءُوا . فَلَمْ يَزَلْ النّاسُ بِرَسُولِ اللّهِ "صَلَی اللہ عَلَیہِ**

وَسَلَم" الّذِينَ كَانَ مِنْ أَمْرِهِمْ حُبّ لِقَاءِ الْقَوْمِ حَتّى دَخَلَ رَسُولُ اللّهِ "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بَيْتَهُ فَلَبِسَ لَأْمَتَهُ وَذَلِكَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ حِينَ فَرَغَ مِنْ الصّلاَةِ . وَقَدْ مَاتَ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ رَجُلٌ مِنْ الْأَنْصَارِ يُقَال لَهُ مَالِكُ بْنُ عَمْرٍو، أَحَدُ بَنِي النّجّارِ، فَصَلّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللّهِ "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ثُمّ خَرَجَ عَلَيْهِمْ وَقَدْ نَدِمَ النّاسُ وَقَالُوا: اسْتَكْرَهْنَا رَسُولَ اللّهِ "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" وَلَمْ يَكُنْ لَنَا ذَلِكَ. فَلَمّا خَرَجَ عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللّهِ "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" قَالُوا: يَا رَسُولَ اللّهِ اسْتَكْرَهْنَاك وَلَمْ يَكُنْ ذَلِكَ لَنَا، فَإِنْ شِئْت فَاقْعُدْ صَلّى اللّهُ عَلَيْك، فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" مَا يَنْبَغِي لِنَبِيّ إذَا لَبِسَ لَأْمَتَهُ أَنْ يَضَعَهَا حَتّى يُقَاتِلَ فَخَرَجَ رَسُولُ اللّهِ "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" فِي أَلْفٍ مِنْ أَصْحَابِهِ)[1]

واتە: پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" حەزی نەدەکرد لە مەدینە بچێتە دەرەوە بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ ئەو سوپایەدا کە لە مەککەوە هاتوە، بە فەرماندەیی ئەبوسوفیان، بەڵام پیاوانێك لە مسوڵمانان لەوانەی، کە خوا ڕێزی لێ گرتن بەپلەی شەهیدیی لە جەنگی ئوحودو لە غەیری جەنگی ئوحوددا، لەوانەی بەشدار نەبوون لە جەنگی بەدردا، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا"صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لەگەڵمان وەرە دەر بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دوژمنانمان، تاکو پێیان وانەبێ، کە ئێمە دەترسین و ئێمە بێ هێزین، زۆر لەگەڵ پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" خەریك بوون، ئەوانەی پێیان خۆش بوو لە دەرەوەی مەدینە لەگەڵ دوژمندا ڕوو بە ڕوو ببنەوە، هەتا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" یان قەناعەت پێهێنا، ئەویش چووە ژوورەکەی خۆی و زرێی پۆشی (بەرگی جەنگی پۆشی) دوایی هاتە دەر بۆ لایان، خەڵکەکەش پەشێمان بوونەوەو گوتیان: پێغەمبەری خوامان "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ناچار کرد، ئەوەشمان بۆ نیە، کاتێك، کە پێغەمبەری خوا"صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" چوو بۆ لایان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئێمە تۆمان ناچار کرد، ئەگەرنا ڕات لەگەڵ هاتنەدەر نەبوو، ئەوەشمان بۆ نیە، بۆیە ئەگەر حەز دەکەی سەڵاتی خوات لەسەر بێت، هەر لە مەدینەدا دابنیشە، با نەچینە دەر، پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" (وەك چۆن پێشتر دەرسێکی فێر

[1]) السيرة النبوية لإبن هشام، ج٣ ص٥٨٣.

کردبوون، کە دەبێ ڕای زۆرینە حورمەتی بگیرێ ئەمجار دەرسێکی دیکەی فێر کردنو) فەرمووی: هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیە، کە زرێ و بەرگی جەنگی پۆشی دایبنێ، تاکو جەنگ نەکات ، ئیدی پێغەمبەری خوا "صَلَی اللہ عَلَیهِ وَسَلَم" لەگەڵ هەزار لەگەڵ لە هاوەڵانیدا بەرەو چیای ئوحود چوون (کە لە گەڵ دوژمن دا ڕوو بە ڕوو ببنەوە).

هەروەها (إبن کثیر) هەر لەو بارەوە دەڵێ: (**فَصَلّی رَسُولُ الله "صَلَی اللہ عَلَیهِ وَسَلَم" یَوْمَ الجُمُعَة، فَلَمّا فَرَغَ مِنْهَا صَلَّى عَلَى رَجُلٍ مِنْ بَنِي النجار، يُقَالُ لَهُ: مَالِك بن عَمْرو، واستشار الناس: أيخرج إليهم أم يمكث بالمدينة؟**)[1] واتە: پێغەمبەری خوا "صَلَی اللہ عَلَیهِ وَسَلَم" ڕۆژی جومعە نوێژی کرد، کاتێك لە نوێژەکەی بۆوە، نوێژی لەسەر پیاوێك لە بەنی نەججار کرد، کە مالیکی کوڕی عەمر بووە (دیارە وەفاتی کردوەو نوێژی مردووی لەسەر کردوە)، دوایی پێغەمبەری خوا "صَلَی اللہ عَلَیهِ وَسَلَم" ڕاوێژی بە خەڵك کرد، ئایا بۆیان بچێتە دەر (بۆ دوژمنان)، یاخود لە مەدینەدا بمێنێتەوە؟

کەواتە: پێغەمبەری خوا "صَلَی اللہ عَلَیهِ وَسَلَم" ڕاوێژی کردوە و، زۆرینە کە ڕایان وا بووە بچنە دەر، پێغەمبەری خوا "صَلَی اللہ عَلَیهِ وَسَلَم" پابەند بووە بە ڕای زۆرینەوە، هەرچەندە بۆ خۆی ڕای وا بووە لە مەدینەدا بمێنێتەوە، دوایش، کە لە ڕای خۆیان پەشێمان بوونەتەوە، پێغەمبەری خوا "صَلَی اللہ عَلَیهِ وَسَلَم" زانیویەتی لەبەر دڵ و لەبەر ڕای ئەوە، بۆیە پێی خۆش بووە هەر ڕایەکەی ئەوان جێبەجێ بکات، مادام هەڵقولاوی قەناعەتیانە و ڕایەکەی خۆی پشتگوێ خستوە.

**<u>بەڵگەی سێیەم</u>**: سوڵح لەگەڵ هۆزی (غطفان)دا لەسەر سێیەکی بەروبوومی مەدینە:

(إبن هشام) لە (السيرة النبوية)دا لەو بارەوە دەڵێ:

(**بَعَثَ إلَى سَعْد بْنِ مُعَاذٍ وَسَعْد بْنِ عُبَادَةَ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُمَا، وَاسْتَشَارَهُمَا فِيهِ فَقَالا لَهُ يَا رَسُولَ اللّهِ أَمْرًا نُحِبّهُ فَنَصْنَعُهُ أَمْ شَيْئًا أَمَرَك اللّهُ بِهِ لا بُدّ لَنَا مِنْ الْعَمَلِ بِهِ أَمْ شَيْئًا تَصْنَعُهُ لَنَا؟ قَالَ بَلْ شَيْءٌ أَصْنَعُهُ لَكُمْ، وَاَللّهِ مَا أَصْنَعُ ذَلِكَ إلاّ لأَنّنِي رَأَيْت الْعَرَبَ قَدْ رَمَتْكُمْ عَنْ قَوْسٍ وَاحِدَةٍ وَكَالَبُوكُمْ مِنْ كُلّ جَانِبٍ فَأَرَدْت أَنْ أَكْسِرَ عَنْكُمْ مِنْ**

---

[1]) المصباح المنير، ص٢٤٢.

شَوْكَتِهِمْ إِلَى أَمْرٍ مَا، فَقَالَ لَهُ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ : يَا رَسُولَ اللّه قَدْ كُنَّا نَحْنُ وَهَؤُلاَءِ الْقَوْمُ عَلَى الشِّرْكِ بِاَللّهِ وَعِبَادَةِ الأَوْثَانِ لاَ نَعْبُدُ اللّهَ وَلا نَعْرِفُهُ وَهُمْ لاَ يَطْمَعُونَ أَنْ يَأْكُلُوا مِنْهَا تَمْرَةً إلّا قِرًى أَوْ بَيْعًا، أَفَحِينَ أَكْرَمَنَا اللّهُ بِالاسْلامِ وَهَدَانَا لَهُ وَأَعَزّنَا بِك وَبِهِ نُعْطِيهِمْ أَمْوَالَنَا (وَاَللّهِ) مَا لَنَا بِهَذَا مِنْ حَاجَةٍ وَاَللّهِ لاَ نُعْطِيهِمْ إلاّ السّيْفَ حَتّى يَحْكُمَ اللّهُ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ قَالَ رَسُولُ اللّهِ "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" فَأَنْتَ وَذَاكَ)[1]

واتە: پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بەدوای سەعدی کوڕی موعاز و سەعدی کوڕی عوبادەی دا نارد و، بۆی باسکردن‌و ڕاوێژی پێکردن لەو بارەوە، (کە ئایا سولّح لەگەڵ غەتەفان دا بکات بۆ ئەوەی واز لە ئابلّوقەی مەدینە بێنن و، سێیەکی بەروبوومی ئەو ساڵەی مەدینەیان بداتێ ؟) ئەوانیش پرسیان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئەوە شتێکە هەر بۆ خۆت حەزی لێ دەکەی، تا بیکەی؟ یان شتێکە خوا فەرمانی پێکردووی؟ یان شتێکە مەبەستت پێی بەرژەوەندیی ئێمەیەو لەبەر ئێمە دەیکەی؟ ئەویش فەرمووی: بەڵکو شتێکە بۆ ئێوەی دەکەم، سوێند بە خوا هەر لەبەر ئەوەش دەیکەم، چونکە تەماشا دەکەم هەموو عەرەب لەیەك کەوانەوە تیرتان تێدەگرن‌و گەلە کۆمەکییان لێکردوون (واتە: عەرەبی موشریك و کافر) بۆیە ویستم، کە هەندێك لە زەبریی ئەوانتان لێ بشکێنم (واتە: هەندێك لە هێزو پێزی ئەوانتان لێ کەمبکەمەوە) هەتاکو خوا دەروویەك دەکاتەوە، دەڵێ سەعدی کوڕی موعازیش پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئێمەو ئەو خەڵکە (واتە: غەتەفان)، کاتێك ئێمە لەسەر شیرك بووین‌و بتمان دەپەرست خوامان نەدەناسی‌و نەدەماندەپەرست، ئەوان تەماعیان نەبوو، کە لە ماڵی ئێمە دەنکە خورمایەك بخۆن)، مەگەر بە میوانیی هاتبان، یان پێمان فرۆشت بانایە، جا ئایا دوای ئەوەی، کە خوا ڕێزی لە ئێمە گرتوە بەهۆی ئیسلامەوەو ئێمەی هیدایەتداوە بۆ ئیسلام و، بە هۆی تۆوە ئێمەی بە عیززەت کردوە، ماڵ‌و سامانی خۆمانیان بدەینێ؟! بەخوا پێویستیمان بەوە نیە، بەخوا جگە لە شمشێرەکانمان شتێکی دیکەیان نادەینێ، هەتا خوا حوکمان لەبەیندا دەکات، پێغەمبەری

[1]) السيرة النبوية، ج٣ ص ٧٠٧.

خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" فەرمووی: مادام وایە چۆنتان پێ چاکە وا بکەن.

لێرەدا دەبینین پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" پێشنیاری ئەو صولحەی، کە پێی باش بووە بۆ سەعدی کوڕی موعازو سەعدی کوڕی عوبادەی کردوە، کە سەرۆك هۆزو نوێنەری ئەوس و خەزرەج بوون، بەڵام دوای ئەوەی، کە زانیویەتی ئەوان ڕایان لەسەری نیە، هەڵیوەشاندۆتەوە، کەواتە: دیسان پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" ڕای خۆی واز لێهێناوە بۆ ڕای زۆرینە، کە لە ڕای ئەو دوو سەعدەدا، کە سەرۆکی هەردوو تیرەکە بوون، بەرجەستە بووە.

کەواتە: ڕاوێژکردن بناغەی کاروباری کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییە، لەسەر خەڵكو کاربەدەستان فەرزە، کە کاروباریان بە ڕاوێژ بەڕێوە ببەن، ئەنجامی ڕاوێژییش پابەندکەرە بۆ هەموو کەسو، ڕای زۆرینە پابەندکەرە بۆ کەمینە، با حوکمڕانیشیان تێدابێ، چۆنیەتی ڕاوێژکردنو وردەکاریەکانیشی، خوای زانا بەکراوەیی بەجێی هێشتوە، مسوڵمانان دەستیان کراوەیەو کۆمەڵگای ئیسلامیی‌و دەوڵەتی ئیسلامیی دەستی کراوەیە، چ میکانزمێك، چ شێوازێك، چ ڕێبازێك هەڵدەبژێرێ بۆ ئەوەی ئەو ڕاوێژکردنە بەرجەستە بکات، بەپێی سەردەم و ڕۆژگار، بە شێوەیەکی گونجاو، ئەوە مسوڵمانان دەستیان ئاوەڵایەو دەستیان بەستراو نیە.

هەڵبەتە ئەو ڕاوێژ کردنەش، کە بناغەی کاروبارە، بۆ هەر سێ دەستەڵاتی یاسادانانو جێبەجێکردنو دادوەرییشە، کە خوا پشتیوان بێت لە تەوەرەیەکی سەربەخۆدا، ـ کەتەوەری سێیەمە ـ، وەك پێشتر بەڵێنمان داوە، باسیان دەکەین.

## بڕگەی حەوتەم: خاڵە هاوبەش وجیاوازەکانی نێوان ڕاوێژو دیموکڕاسیی

دیموکراسیی یەکێکە لە شێوازو چۆنیەتییەکانی حوکمڕانیی، لە پێناسە سادەکەیدا، دیموکراسیی واتە: حوکمی خەڵك لە لایەنی خەڵکەوەو لە بەرژەوەندیی خەڵکدا، ئەوە پێناسە سادەکەیەتی، پێشتریش باسی ڕاوێژمان کرد، جا ئایا ڕاوێژ - دیارە ڕاوێژ (شوری) بریتیە لە شێوازی حوکمڕانیی ئیسلامیی‌و وەك باسمان کرد، بناغەی هەموو

كاروبارەكانــە- ئایــا ڕاوێــژی ئیســلامیی لەگــەڵ دیموكراســی ڕۆژئاواییــدا خاڵــەكانی بەیەككگەیشتنو هاوبەشیان چیو چین،وە خاڵەكانی جیاوازو لێكجیابوونەوەیان چــیو چــین؟ ئەوەندەی، كە سەرنجی هەردووكیانم داوە، چــوار خــاڵی هاوبــەشو چــوار خــاڵی جیــاوازم كەوتوونەتە بەرچاو، سەرەتا باسی خاڵە هاوبەشەكانیان دەكەین:

## ١- خاڵە هاوبەشەكانی نێوان ڕاوێژو دیموكراسیی:

خــاڵی هاوبەشــی یەكــەم: لــە نێــوان ڕاوێــژی ئیســلامییو دیموكراســیدا، بریتیــە لــە سەرچاوەبوونی خەڵك بۆ دەستەڵات، وەك پێشتر باسمان كرد، یەكێك لە بنــەماكانی سیستەمی حومكڕانیی ئیسلامیی ئەوەیــە، كــە دەســتەڵات هــی خەڵكــە، دیــارە دیموكراسیش هەر یانی حوكمی خەڵك، كەواتە: ئەوە خــاڵی بەیەككگەیشــتنی نێــوان ڕاوێژ و دیموكراسییەو لە هەردووكیاندا حوكم بە دەست خەڵكەو، خەڵك بەرپرسەكان دادەنێو لە بەرپرســەكان دەكۆڵێتــەوەو چــاودێرییان دەكــات و، بــۆی هەیــە لێیــان بپێچێتەوەو لەكاتی لادانیاندا سزاشیان بدات.

خــاڵی هاوبەشــی دووەمــی: ڕاوێــژو دیموكراســیی، بریتیــە لەچــەند مەبــدەئێك، وەك یەكسانیی، دادگەریی، ئازادیی بیروڕا، بە تــەنگ یەكدییــەوە بــوونی كۆمەڵایــەتی (التكافل الإجتماعی)، ئەمانە چەند پڕەنسیب (مبـدأ)ێكن، هــەم لــە شــەریعەتی ئیسلامییدا هەن،كە شــووڕا بناغــەی كاروبارەكانیــەتی ، هــەم لــە دیموكراسیشــدا تەبەنیی كراون، واتە وەك دواتر باسی دەكەین.

خاڵی سێیەمی هاوبەشیان: بریتیــە لــەحوكم كردنــی زۆرینــەو، كەمینــەش پێویســتە مافەكانیان دابین بكرێن، ئەم خاڵە لە زۆرێك لە فەرمایشتەكانی پێغەمبــەری خــوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"دا، جەختی لەسەر كراوە، بۆ وێنە:

١) پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: **{إِنَّ أُمَّتِي لا تَجْتَمِعُ عَلَـى ضَلالَةٍ}**(أَخْرَجَهُ عَبْد بن حُمَيد برقم: (١٢٢٠)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٩٥٠)) واتــە: بێگومان ئۆممەتی من بە گشتیی، لەسەر گومڕایی كۆنابێتــەوە ، كەواتــە: هــەر شتێك زۆرینەی ئۆممەتی پێغەمبەری خوای "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لەســەر بــوو،

ئەوە ئینشەڵڵا حەقە، چونکە ئۆممەت بە تێکڕا لەسەر گومڕایی کۆنابێتەوە، بەڵێ هەندێك لەخەڵكو هەندێك دەستە لادەدەن، بەڵام تێکڕای ئۆممەت لەسەر گومڕایی کۆنابێتەوە.

٢) لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: {عَلَيْكُمْ بِالسَّوَادِ الْأَعْظَمِ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٤٧٣) قال الهيثمي: رواه الطبراني، ورجاله ثقات) واتە: ئێوە لە گەڵ زۆرینەدا بن، واتە: زۆرینەی ئۆممەت.

٣) هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: {يَدُ الله مَعَ الْجَمَاعَةِ} (أَخْرَجَهُ التِّرمذي برقم: (٢١٦٦) قال الشيخ الألباني: صحيح) واتە: (لەگەڵ کۆمەڵ و جەماوەردابن)، چونکە دەستی خوا (دەستی یارمەتیو خوا هاوکارییو پشتگیریی خوا) لەگەڵ کۆمەڵو زۆرینەی مسوڵمانان دایە.

زانایانی ئیسلام باسیان کردوە، کە ڕای زۆرینە کێشە مشتومڕ لەسەربووەکان یەکلایی دەکاتەوەو بە بارێکدا دەیانخات.

(الآمدي) لەو بارەوە گوتوویەتی: (إنَّ الكثـرَةَ يَحصُـلُ بـالترجيحُ)[1] واتە: زۆرینە دەبێتە مایەی هەڵبژاردنی ئەو ڕایەی زۆرینەی لەسەرە.

هەروەها (الماوردی) لە (الأحكام السلطانية)ی خۆیدا دەڵێت (وَإذا اختَلفَ أهلُ المَسجدِ في اختيارِ إمامٍ عُمِلَ على قولِ الأكثَرِ)[2] واتە: ئەگەر خەڵکی مزگەوتێك دەربارەی پێش نوێژێك بوو بە مشتومڕیان، ئیش بەقسەی زۆرینە دەکرێ زۆرینەیان ڕایان لە گەڵ کام پێشنوێژە بوو، ئەویان دەکرێتە ئیمام.

هەروەها (**أبو حامد الغزالي**) لە کتێبی (الرد على الباطنيـة)دا دەڵێ: (فَإنَّهُم لَو إختَلَفوا في الأمورِ وَجَبَ التَرجيحُ بالكَثرَة)[3] واتە: ئەگەر مسوڵمانان دەربارەی

---

[1] الإحكام في أصول الأحكام، ج١ ص٢٩٦ ،ط٣/ ،١٩٩٨/دارالكتاب العربي.
[2] ص ١٨٢.
[3] ص ٦٢.

کاروبارەکانی خۆیان کەوتنە کێشەو مشتومڕەوە، ئەوە بە زۆرینە ئەو ڕایە یەکلایی دەکرێتەوەو بەو لایەدا دەخرێ، کە زۆرینەی لەگەڵ دایە.

خاڵی چوارەمی هاوبەشی نێوان ڕاوێژ و دیموکراسیی: بریتیە لەوە، کە لەهەرکام لە ڕاوێژی ئیسلامییو لەدیموکراسیدا کەسانێك، کە دەکرێن بە ئەندامانی ئەنجوومەنی ڕاوێژ (پەرلەمان) پێویستە چەند مەرجێکیان تێدا هەبن، بۆ وێنە: تەمەن پەرێزپاکیی، توانای فیکریی...هتد، هەڵبەتە مەرجەکانی، کە لەئیسلام دا دانراون زیاترن، بە م گرنگ ئەوەیە دیموکراسیش هەندێ مەرجی داناون بۆ کەسانێك، کە لە لایەن خەڵکەوە وەك نوێنەر هەڵدەبژێردرێن.

## ٢) خاڵە جیاوازەکانی نێوان ڕاوێژو دیموکڕاسیی:

وێڕای خاڵە هاوبەشەکانیان، ڕاوێژو دیموکڕاسیی چوار خاڵی جیاوازیی سەرەکییشیان لە نێوان دا هەن، کە بەڕاستی لەسەر مسوڵمانان پێویستە زۆر باش، هەم سەرنجی خاڵە هاوبەشەکان بدەن، هەم سەرنجی خاڵە جیاوازەکانیش بدەن، چونکە هەندێك کەس هەر لە خۆوە دەڵێت: ڕاوێژە، یانی دیموکراسیی، دیموکراسیی، یانی ئیسلام! بەلاّم وا نیەو دیموکراسیی شێوازی حوکمڕانییە، واتە: دیموکراسی بەرنامەی ژیان نیە، بەڵکو شێوازێکە لە شێوازەکانی حوکمڕانیی، هەروەك چۆن ڕاوێژیش لە ئیسلام دا بریتی نیە لە هەموو ئیسلام، بەڵکو بناغەی بەڕێوە بردنی کاروبارەکانی کۆمەڵگاو خەڵکی مسوڵمانانە.

### خاڵە جیاوازەکانیان:-

یەکەم/ ڕاوێژی ئیسلام لەکەش و هەوای دینداریيدا سەری هەڵداوە، بەلاّم دیموکراسی ڕۆژئاوا بەپێچەوانەوە، لە کەشو هەوای بێ دینییدا سەری هەڵداوە، چونکە پێشتریش باسمان کرد، کە دوای ئەوەی لە ڕۆژئاوا کێشە پەیدا بوو لە نێوان کەسانێك دا، کە بەپیاوانی دینیی (چینی ئەکلیرۆس) دەناسران، کەسانێك لەزاناو چاکخوازەکان، کە سەرۆکایەتی زۆرینەی جەماوەریان دەکرد، کاتێك کێشەو مشتومڕ پەیدا بوو و، خەڵك لەو دینە شێوێنراوەی نەصرانیی دڵزەدە بوو، کە بەدەستی پیاوانی کلێساو پادشایەکانەوە بوو بووە بازیچە، حوکمڕانان پاساوی زوڵم و ستەمی خۆیانیان پێدەدایەوەو پەردەپۆشی زوڵمو ستەمی خۆیانیان پێ

دەرکردو، خۆیان بە وەکیل و سێبەری خـوا دەناسـاند بەسـەر خەڵکـەوەو زوڵمیـان بەناوی خواوە دەکرد ، ئیدی لەو کەش و هەوایەدا،کە خەڵك ڕووی لە بێ دینایەتیی (سیکۆلاریزم)و پشت لە دین کردن کرد ، بۆ پڕکردنـەوەی ئـەو بۆشـاییە، چـاویان گێڕا باشترین شتێك، کە وەك میکانیزمی حوکمڕانیی دەستیان کەوت، بـریتی بـوو لە دیموکراسیی، سەرەنجام دیموکراسیی لـەو کـەش و هەوایـەدا لـە لایـەن خـەڵکی ڕۆژئاواوە بۆ شێوازی حوکمڕانیی تەبەننیی کـرا، بـەڵام بـە پێچـەوانەوە (ڕاوێـژ)ی ئیسـلامیی، هەر لەسەرەتاوە لە کەش و هەوایەکی ئیمانیی دا پەیـدابوو، پێشـتریش باسمان کرد، کە ئێمە سوورەتێکمان لە قورئان دا هەیە بە نـاوی سـوورەتی ڕاوێـژ (سورة الشورى) ،وە خوا (سبحانه وتعالى) ڕاوێژکردنی مسوڵمانانی خستۆتە نێـوان نوێژ بەرپاکردن و ماڵ بەخشینیانەوە، واتە: دوو پایەی گەورەی مسوڵمانەتیی، کە نوێژ و زەکاتن، مانای وایە ڕاوێژ هەر لـە بنـەڕەت دا، کـە هـاتوە، تـام و بۆیـەکی ئیمانیی و ئیسلامیی هەبووە، ڕاوێژ لە کەش و هەوایەکی دینداریی دا پەیـدابووە، بۆیە کاتێك باسی ڕاوێـژ دەکـرێ، یەکسـەر ئینسـان کـەش و هـەوای دینـداریی و مسوڵمانەتیی و تەبایی و برایەتیی لە کۆمەڵگادا دێتە زەینەوە، کـاتێکیش، کـە باسی دیموکراسیی دەکرێ، ئەو کەش و هەوایە تەداعی دەکات و دێتەوە نێو زەینـی ئینسان، کە باسمان کرد، هەڵبەتە مـەرجیش نیـە دیموکراسـیی هەمیشـە لـەگەڵ کوفر و بێ دینییدا بێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو کەش و هەوایەی، کە دیموکراسـیی سەری تێدا هەڵداوە، کە بەو شێوەیە بووە.

دووەم/ خاڵی دووەمی جیاوازیی نێوان ڕاوێژ و دیموکراسی، ئەوەیـە کـە دیموکراسـیی تـەنیا پەیوەستە بە سیاسەت و حوکمـەوەو لـەو بـوارەدا کـورت هـەڵاتوە، بـەڵام ڕاوێـژی ئیسلامیی کورت نەکراوەتەوە لە بواری سیاسەت و حوکمڕانییدا، بـەڵکو ڕاوێـژ لـە ئیسلام دا، لە بواری خێزانییدا هەیە، لە بواری کۆمەڵایەتییـدا هەیـە، لـە بـواری سیاسیی دا هەیە، لە بواری فیکرییدا هەیە، لەسـەر مسـوڵمانان پێویسـتە ڕاوێـژ بناغەی کاروباریان بێت، وەك خوا (سبحانه و تعـالى) لـە ئایـەتی ژمـارە (٣٨)ی

سووڕەتی (الشوری) كە دەفەرموێ: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾، ئەم ڕستە قورئانییە لە نێو ئایەتی ژمارە: (٣٨)ی سووڕەتی (الشوری)دا هاتوەو سووڕەتی (شوری)ش سووڕەتێكی مەككییەو سووڕەتەكە لە مەككە دابەزیوە، ئەو كاتەش مسوڵمانان تەنیا كۆمەڵێك بوونو قەوارەیەكی سیاسی نەبوونو دەوڵەتیان نەبوو، مانای وایە كارو بار بە ڕاوێژ بوون لە نێو مسوڵماناندا، بەس پەیوەست نیە بە سیاسەتو حوكمەوەو، مەرج نیە دەوڵەتیان هەبێ ئەوجار كاروباریان بە ڕاوێژ بێت، بەڵكو هەر كۆمەڵە مسوڵمانێك پێویستە كاروباریان بە ڕاوێژ بێ، لە چوارچێوەی خێزانو گەڕەك و شارو وڵاتدا.

سێیەم/ لە دیموكراسییدا مافی یاسا دانان بە ڕەهایی هی خەڵكەو، خەڵك دەستی كراوەیە چۆن یاسا دادەنێو هیچ قەید و بەندێكی لەسەر نیە، بەڵام لە سیستەمی حوكمڕانیی ئیسلامدا مسوڵمانان ، كە ڕاوێژ دەكەن بۆ یاسا دانان و بڕیاردان، لە چوارچێوەی شەریعەتدا دەتوانن ڕاوێژ بكەن، واتە: نابێ مسوڵمانان یاسایەك دابنێن لەسەر بناغەی ڕاوێژ پێكەوە كردنیانو بڕیارێك دەربكەن، كە لە گەڵ دەقێكی قورئان، یان سوننەتێكی پێغەمبەری خوادا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" تێك بگیرێ، پێشتریش باسمان كرد، كە یەكەمین بنەمای سیستەمی حوكمی ئیسلامیی سەروەریی باڵاو ڕەهای خوا (سبحانه و تعالی)، شەریعەتەكەیەتی بە واتایەكی دی: لە دیموكراسیدا خەڵك بەرهەڵدا كراوەو حەواڵەی خۆی كراوە، چۆن ئارەزوویان بووو ویستیان، بڕیار بۆ خۆیان دەردەكەن، با ئەو یاسا دانانو بڕیار دەركردنە، پێچەوانەی عەقڵ و فیترەت و بەرژەوەندیی دنیاو دوارۆژیشیان بێ، كە وەك دەبینین لەپەرلەمانەكانی ئەورووپادا بڕیاری وا دەردەكرێ، كە هی ئەوە نیە لە مەجلیسدا بگوترێ، مەگەر وەك ڕوونكردنەوەی مەبەست، بۆ وێنە: كە پیاو لەپیاو مارە دەكرێ، ئافرەت لە ئافرەت مارە دەكرێ، كە هەرگیز لە ئیسلام دا شتی وا ڕوو نادات، چونكە ڕاوێژی نێو مسوڵمانان بۆ دەركردنی بڕیارو دانانی یاسا، دەبێ لەبەر ڕۆشنایی شەریعەت دا بێو نابێت هیچ كاتێك مسوڵمانان یاسایەك دابنێنو

بڕیارێك دەربكەن، كــە پێچەوانەی شەریعەت بــێ، وەك زانـــایان گـــوتوویانە: (لا اجْتِهَادَ في مَوْضعِ النَّصِّ)[1] واتە كاتێك دەق هەیە، نابێ مســوڵمانان كۆشــش بكەنو ڕاوێژ بكەنو لەسەر بناغەی ڕاوێژ، یاسایەك دابنێنو بڕیارێك دەربكەن، كــە پێچەوانەی ئەو دەقە بێ، یان لەگەڵی تێكبگیرێ.

چوارەم/ جیاوازیی چوارەمی نێوان ڕاوێژ و دیموكراسیی بریتیە لەوە، كە دیموكراسی گوێ بە ئەخلاق نادات، هەركات خەڵك یاســاو بڕیارێكیــان دەركــرد، ئــەوەی تێــدا ڕەچــاو ناكرێ، كە ئایا لەگەڵ بەهابەرزەكانو ڕەوشت دا تێك دەگیرێ، یــان تێــك نــاگیرێ؟ گرنگ ئەوەیە ڕای خەڵكە، بەڵام لە ئیسلام دا، لە سیستەمی شــووڕای ئیســلام دا چوارچێوەی ئەخلاقیی دانراوە بۆ هەموو شتەكانو، شەریعەت چوارچێوەی داناوە بۆ ویستو عەقڵی خەڵك، بۆ ئەوەی بە هەڵەدا نەچێو بڕیارێك نەدا، كــە پێچــەوانەی ئەخلاقو بەها بەرزەكان بێو پێچەوانەی بەرژەوەندیی دنیاو قیامەتیان بێ.

ئنجا دەتوانین بۆ ڕوونكردنەوەی كەشو هەوای تێدا ڕسكانی دیموكڕاسیی‌و شــووڕا، دوو كتێب بەنموونە بێنینەوە:

یەكەمیان: كتێبی (ئــەمیر)ی میكیــاڤیلی، كــە لــە ســەدەی شــازدەیەم دا دایـنــاوەو (نیكۆلاَ میكیاڤیلی) لەو كتێبەیدا دەڵێ: حوكمڕان لەپێناوی گەیشتن بە ئامــانجی خۆیــدا، دەبێ گوێ نەداتە هیچ پڕەنسیپێكو هیچ بەهایەك.

دووەمیشیان كتێبی: (التبر المسبوك في نصيحة الملوك) كە هی (**أبو حامد الغزالي**)یـە بۆ یەكێك لە حوكمڕانان دایناوەو پێیدەڵێ: كە دەبێ بەڕەحمو دادگەر بــێو ڕازاوە بــێ بــە ڕەوشتە بــەرزەكانو ئاگــای لــە ستــەمو غــەدر بێــت، پێویستــە وەك چــۆن ئامانجــەكانی شەرعیین، شێوازەكانیو ئامڕازەكانیشی شەرعیی بن.

كەواتە: شووڕای ئیسلامیی چوارچێوەدارە بەئەخلاقو بەها بەرزەكان، بەڵام دیموكراســی ڕۆژئاوایی هیچ چوارچێوەیەكی نیە.

---

١ (المُـرادُ بــه الــنَّصُّ القطعــيُّ في ثُبوتِــه ودلالتِــهِ، لا مُطلَــقَ الــنَّصِّ)، تيســير علــم أصــول الفقــه، للجديع،ص٣٤٥،الطبعة الرابعة/١٤٢٦ -٢٠٠٥م

لە کۆتایی بەراوردمان لە نێوان ڕاوێژو دیموکراسیی دا دەڵێین: زۆر بەداخەوە کە دیموکراسیی کەش و هەوایەکی بۆ ڕەخسا، کە تێیدا گەشە بکاتو بەرەو پێش بچێتو دەوڵەمەند بێ (ئەگەرنا دیموکراسیی وەك ئێستا دەیبینین، هەر بەو شێوەیە نەبووە، وەك لە شوێنی دیکەش باسمان کردوە: لە سەرەتاوە ئافرەتان مافیان نەبووە بەشداریی هەڵبژاردن بکەن، نەك هەر کاندید بکرێن، بەڵکو هەر دەنگدەریش بن! لەسەردەمی کۆندا لەسەردەمی یۆنانییەکان دا، کە زۆربەی کۆمەڵگا کۆیلە بوو، کۆیلەش بۆیان نەبوو بەشداریی بکەن، هەتا ئەو دوا دواییانەش لە وڵاتانی ڕۆژئاواییدا کەسانێك بەشدار دەبوون بۆ دەنگدان، یان بۆ دەنگپێدران، کە ئەندازەیەك ماڵو سامانیان هەبێ، بەڵێ، دیموکراسیی وردە وردە گەشەی کرد، تا بەو حاڵەی ئێستای گەیشتوەو، هەر خوا دەزانێ لە دوای ئێستاشەوە بەرەو چی دەچێ!)، بەڵام بە داخەوە ئەو زەمینە لەبارە بۆ گەشەکردنی سیستەمی ڕاوێژ لە ئیسلام دا نەڕەخساو، هەر زوو سیستەمی ڕاوێژ لە ئیسلام دا پەرچ و کۆسپی هاتە بەرو، ئەوە بوو کە حوکمی ئیسلامیی لە شووڕاییەوە گۆڕا بۆ میراتیی، بەڵام بێگومان ئێمە ئەگەر بمانەوێ دوو بارە ڕاوێژ بخەینەوە سەر ڕەوڕەوەی خۆی، شەرع هیچ ڕێی لێ نەگرتووین، کە سوود ببینینو بەهرەمەند بین لە میکانیزمەکانی دیموکراسی، ئەوانەی کە لە گەڵ شەریعەت دا، نەك هیچ ناکۆکییەکیان نیە، بەڵکو شەریعەت پەسەندیان دەکات.

* * * * * *

دادو دادگەریی (عـدل و عدالـة)، بـە مانـای ڕێـكو پێكیـیو هاوسـەنگیی دێ، وەك (المعجم الوسیط) لەو بارەوە دەڵێت: (عَدَلَ في أمرِهِ عَدلاً وعَدالَـةً وَمَعدِلَـةً: إستَقامَ) واتـە: دەگوترێ: فلاَن كەس لە ئیشی خۆیدا عەدل بوو، دوایـی بـە عـەدالـەتو بـە مەعدیلـەش دەكرێتە چاوگ واتە: ڕێك ڕاوەستا، (وَعَدَّلَ الشَيءَ أقامَهُ وَ سَواهُ) ئەگەر بڵێی: ئەو شـتەی عـەدل كرد، واتە: ڕای وەستاند و ڕێكی خست (وَعَدَلَ شـيئاً بِشـيئاً: سـوّاهُ بِـهِ) واتـە: ئـەو شتەی وەك ئەو شتە لێ كردو لە گەڵیدا یەكسانی كرد ، (إعتَدَلَ: تَوَسَّطَ بـينَ حـالَينِ في كَـمٍ أَو كَيفٍ أَو تَناسُبٍ) (إعتَـدَلَ) واتە: مامنێوەندیی بووو، خەتی نێوە ڕاستی گرت لە نێـوان دوو حاڵ دا، لەچەندێتی دا، یان لە چۆنیەتی دا، یان لە گونجـان دا و، (مـاءٌ مُعتَـدِلٌ بَـينَ الحارِّ وَالبارِدِ) ئاوێكی موعتەدیل لە نێوان گەرمیی‌و ساردیی دا (شلەتێن) (وَجِسمٌ مُعتَـدِل بينَ طولٍ وَقِصَرِ) و دەگوترێ: جەستەیەكی موعتەدیل، واتە: لە نێوان درێژییو كورتیی دا، نەزۆر درێژو نەزۆر كورت، یاخود لە نێوان قەڵەوییو لاوازییدا، وشەی (عدل) بە ئینصـاف دەگوترێ: (الإنصاف هو إعطاءُ المرء مالَهُ وأَخْذُ ما عَليهِ) واتـە: ئینسـاف ئەوەیـە، كـە ئینسان ئەوەی مافیەتی وەری بگرێو ئەو حەقـەی كـە لەسەریشـیەتی بیـداتو بـەجێی بگەیەنێ.[١]

(راغب الأصفهاني)ش لـە (مفـردات ألفـاظ القـرآن)دا دەڵـێ: (العدالـةُ والمعادَلَـةُ لفـظ يَقتَضي مَعنى المساواة) واتە: عـەدالـەتو موعـادەلەت، وشـەیەكە مانایەكـەی یەكسـانیی دەگەیەنێ، ئنجا ئەگەر تەماشای وشەی (عدل)و (قسـط) بكـەین، دەبیـنین لـەمانادا زۆر لەیەكدییەوە نزیكن، چونكە لە قورئاندا وەك چۆن وشـەی (عـدل) بـەمانای دادگـەرییو یەكسـانیی بـەكارهاتوە، وشـەی (قسـط)یـش بـەكارهاتوە، كەئێمـە لـە كوردییـدا بـۆ هەردووكیان دەڵێین: داد، یان دادگەریی.

**(راغب الأصفهاني)** دەربارەی وشـەی (قسـط) دەڵـێ: **(القِسـطُ هـوَ النصـيبُ بالعَـدلِ كَالنَّصَفِ وَ النَّصَفَةِ)** واتە: (قسط) یانی: بـە شـێك بەدادگەرانـە، وەك **(نَصَـفْ و نَصَـفَة)**

---

١ مختار الصحاح، ص٣٦٨، لفظ: ع.د.ل.

(والقَسْطُ هوَ أخذُ قِسطَ غَيرِهِ وذلك جَورٌ) وشەی (قَسْط) ئەوەیە، کە بەشی غەیری خۆی بۆ خۆی بەرێ، کە ئەوەش ستەمە، بەڵام (إقساط) ئەوەیە کە بەشی غەیری خۆی بدات کە ئەوەش ئینصافەو دادوەرییە، بۆیە دەگوترێ: (قَسَطَ الرَجُلُ: إذا جارَ) واتە: پیاوەکە زوڵمی کرد، بەڵام ئەگەر بڵێی: (أقسَطَ الرَجُلُ: إذا عَدَلَ) بەڵام هەرکاتێك دادگەر بێ، دەڵێن: (أقسَطَ)، چونکە یانی بەشی غەیری دا. (وَالقِسطاصُ: الميزان ويَعَبّرُ بِهِ عن العَدالَةَ كَما يُعَبَرُ بِها عَنها بِالميزان قالَ الله:﴿ ...وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ...﴿٣٥﴾ ﴾ الإسراء، (قسطاس) تەرازوویە، وشەی (قسطاس) بەمانای دادگەرییش دێ، هەروەك كاتێك لەزمانی عەرەبیدا بیانەوێ باسی تەرازوو بکەن، باسی عەدالەت دەکەن، یانی تەرازوو ڕەمزی عەدالەتە ، عەدالەتیش بە مانای تەرازوو دێ، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ ...وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ...﴿٣٥﴾ ﴾ الإسراء، واتە بە تەرازووی ڕاست بکێشن. [1]

کورتەی واتای دادگەریی، یاخود داد بریتییە لە حەق پێدان و حەق لێوەرگیران، واتە: هەر کەسە هەقی خۆی پێ بدرێ، ئەو هەقەش، کە لەسەریەتی لێی وەربگیرێ، بێ ئەوەی جیاوازیی بکرێ لە نێوان مرۆڤەکاندا، بە هەر بیانوو پاساوێك، وەك ئەوە کە دینی جیایە، یان ڕەنگی جیایە، یان لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە جیایە، یان لەڕووی سیاسییەوە، یان لەڕووی ڕەگەزەوە (نێرو مێیایەتی)، یان لەڕووی نەتەوەو ڕەچەڵەکەوە، نابێ هیچ کام لەوانە بخوێندرێنەوە، دەبێ هەرکەسە هەقی خۆی پێ بدرێ، ئەو هەقەش کە دەکەوێتە سەری لێی وەربگیرێ، ئەوە مانای دادگەرییە، کە لە هەمان کاتیشدا، مانای یەکسانییش دەگەیەنێ، لەڕاستیدا یەکسانییو دادگەریی زۆر پێکەوە تێکەڵکێشن، بەبێ یەکسانیی، دادگەریی نایەتە دی، هەروەك بەبێ دادگەرییش، یەکسانیی نایەتە دی، بەڵام هەڵبەتە مەرج نیە هەمیشە دادگەریی لە یەکسانیی دا بێت، بەڵکو جاری وایە دادگەریی لە جیایی دا دەبێ، بۆ وێنە: ئەگەر کەسێك بە سێ نان نەبێ تێر نەخوات و یەکێکیشیان لەتکە نانێکی بەس بێ، ئایا دەبێ یەکسانیان بکەین؟!! بێگومان نەخێر، بەڵکو

---

[1] مفردات ألفاظ القرآن، ص٦٧٠.

دادگەریی ئەوەیە، کە هەرکەسە چەندی پێویستە ئەوەندەی پێ بدرێ، لەو حاڵەتەدا دادگەریی بەوە دێتە دی، بەڵام هەرچۆن بێت، یەکسانیی یەکێکە لە پایەکانی دادگەریی، جگە لە هەندێك حاڵەتی هەڵاوێردراو.

پێچەوانەی دادو دادگەریی (عدل و عدالة)، بریتییە لە ستەم (ظلم)و لادان (جَور) وشەی (ظلم) زۆر لەقورئان دا بەکارهاتوەو، لەئەسڵی زمانی عەرەبیدا ئاوا تەفسیر دەکرێ: (وَضعُ الشيء في غيرِ مَوضِعِهِ)[1] واتە: دانانی شتێك لە غەیری شوێنی خۆیدا، وشەی (جَور)یش بە مانای (إنحراف) [2] لادانو سنوورشکێنی دێ، کە هەردووکیشیان دیسان تێك دەکەنەوە، چونکە هەموو ستەمێك جۆرێك لە لادانی تێدایەو، هەموو لادانێکیش جۆرێك لە ستەمی تێدایە.

ئنجا ئەگەر بێت و سەرنجی ئایەتەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بدەین، بۆمان دەردەکەوێ، کە بەڕاستیی دادو دادگەریی پێگەو پلەیەکی زۆر گەورەی هەیە لە ئیسلام دا، بە پێچەوانەوەش جەورو ستەم و لادان، تاوانێکی یەکجار گەورەیە، وە ئەوەندە بەسە کە خوا (سبحانه وتعالى) لە ئایەتی ژمارە (٨ )ی (الممتحنة)دا دەفەرموێ: ﴿ ...إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾، واتە: بێگومان خوا دادگەرانی خۆش دەوێن، یان ئەوانەی، کەحەقی غەیری خۆیان دەدەن، خۆشی دەوێن، کە ئەوەش بەشێکە لە دادگەریی، ئەوەندە بەسە کە خوا (سبحانه وتعالى) لە سورەتی (هود) ئایەتی (١٨)دا دەفەرموێ: ﴿ ...أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ﴾، واتە: ئاگادار بن! نەفرینی خوا لە ستەمکاران، وەك دەبینین لەلایەکەوە خوا دادگەرانی خۆش دەوێنو لەو لاشەوە ستەمکاران نەفرین دەکات!

ئێستاش سەرنجی چەند ئایەتێکی قورئان دەدەین، بۆ ئەوەی هەم گشتگیریی دادگەرییمان بۆ دەرکەوێ، هەم لە بەرنامەی خوادا،گرنگیی‌و پایەی دادگەرییمان بۆ

---

[1] مختار الصحاح، ص٣٥٨، لفظ ظ ل م .

[2] مختار الصحاح، ص١١٤، لفظ: ج و ر .

دەرکەوێ، کە وەك گوتمان دادگەریی، یەکێکە لە بنەماکانی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی.

١- لە ئایەتی ژمارە (٩٠)ی سورەتی (النحل)دا خوا (سبحانه و تعالی) دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ وَإِيتَآئِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾﴾، واتە: بێگومان خوا فەرمان دەکا بە دادگەریی چاکەکارییو بە بەخشین بە خزمان (یان ئەوانەی نزیکن) ،وە هەموو کردەوەیەکی ناقۆلاو قسەیەکی ناشیرینو دەستدرێژیی قەدەغە دەکات. (...يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ...) خوا ئێوە ئامۆژگاری دەکات، بەڵکو پەند وەربگرن .

٢- لە سووڕەتی (النساء) ئایەتی (٥٨)دا خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٥٨﴾﴾، واتە: خوا فەرمانتان پێدەکات، کە سپاردەکان بە خەڵکی خۆیان (خەڵکی شایستەی خۆیان) بدەنەوە و، فەرمانتان پێدەکات، کە بە دادگەریی لەنێوان خەڵکدا حوکم بکەن، باشترین شتێك، کە خوا ئامۆژگاریی ئێوەی پێدەکات ئەوەیە، بێگومان خوا بیسەری بینەرە.

٣- هەر لە سووڕەتی(النساء)دا ئایەتی ( ١٣٥ )دا خوا ( سبحانة وتعالى) دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ...﴿١٣٥﴾﴾، واتە: ئەی ئەو کەسانەی، کە ئیمانتان هێناوە! زۆر بە چاکیی هەڵسن بە دادگەریی،شایەدیی بۆخوابدەن...

٤- لە ئایەتی ژمارە (١٥٢)ی سووڕەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿...وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُوا۟ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۖ وَبِعَهْدِ ٱللَّهِ أَوْفُوا۟ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ

تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٢﴾ ﴾، واتە: هەر كاتێك قسەتان كرد دادگەر بن، هەرچەندە (ئەوەی كە قسەكەی دەربارە دەكەن و حەقی دەكەوێتە سەر) نزیكیش بێ و، بە پەیمانی خواوە وەفاداربن، ئائەوەتان خوا ئامۆژگاریی ئێوەی پێدەكات، بەڵكو پەند وەربگرن و بیربكەنەوە.

٥- لە سوورەتی (المائدة) لە ئایەتی ژمارە (٨)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ ...وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ...﴿٨﴾ ﴾، واتە: با ڕقبوونەوەتان لەكەسانێك واتان لێ نەكات، كە دادگەر نەبن، دادگەربن، ئەوە لە پارێزكارییەوە نیزیكترە، {ئینسانی پارێزكار دەبێت لەگەڵ دۆست و دوژمنیدا دادگەربێ}.

كەواتە: دادگەریی تایبەت نیە بە نێوخۆی مسوڵمانانەوە، تەنیا تایبەت نیە بە كەسانێك، كە لە گەڵیان تەبای، بەڵكو ئەوەی، كە دوژمنیشتە، نابێ لەگەڵی بێ ئینصاف و نادادگەر بی.

٦- لە سوورەتی (المائدة) لە ئایەتی (٤٢)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ ...وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾، واتە: هەركاتێك دادوەرییت لە نێوانیاندا كرد، بەدادگەرانە دادوەریی بكە، بێگومان خوا دادگەرانی خۆش دەوێن.

٧- لە سوورەتی (الحدید) لە ئایەتی (٢٥)دا خوا (سبحانه و تعالی) ئامانج و حیكمەتی ڕەوانەكرانی سەرجەم پێغەمبەران (علیهم السلام)، لەوەدا كورت هەڵدێنێت، كە دادگەریی بچەسپێنن، دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَـٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَـٰفِعُ لِلنَّاسِ ...﴿٢٥﴾ ﴾، واتە: بێگومان

پێغەمبەرانی خۆمان بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکراوە ڕەوانە کردوە، کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونە خوار، تاکو خەڵك بەدادگەریی بەڕێوە بچن، ئاسنیشمان ناردۆتە خوار، هێزێکی زۆری تێدایەو، سوودو کەڵکی زۆری بۆ خەڵك هەیە. دوای ئەوەی کەباسی دادگەریی دەکات باسی ئاسن دەکات، واتە: دادگەریی‌و هەق، پێویستە هێزی لە پشتەوە بێ، ئەگەرنا ئەوانەی، کە ستەمکارن‌و چاویان لە زوڵم‌و خراپەیە، ملکەچ ناکەن بۆ دادگەریی هەق.

ئنجا پێویستە بزاندرێ، کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، کاتێك خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: هەموویانم بۆ ئەوە ڕەوانە کردوە، کە خەڵك بە دادگەریی بەڕێوە بچن، دەبێ بزانین ئەو دادگەرییەی، کە هەموو پێغەمبەرانی بۆ هاتوون، لە شتێك و دوو شتاندا نیە، بەڵکو وەك باسمان کردوە، گشتگیرە:

أ/ دادگەریی لەڕووی نەتەوەیی یەوە، دەبێ نەتەوەکان وەك یەك بن‌و هیچ کامیان چاوی لە زوڵم نەبێ لەوی دیکە.

ب/ دادگەریی لەڕووی سیاسی یەوە.

ج/ دادگەریی لەڕووی ئابووری یەوە.

د/ دادگەریی لەڕووی کۆمەڵایەتی یەوە.

لە هەموو ڕووەکانەوەو لەهەموو بوارەکانی ژیانداو لە هەموو ئاستەکاندا، پێویستە دادگەریی بچەسپێندرێ، هەر کاتێکیش شەریعەتی دەستکاری نەکراوو نەگۆڕدراوی خوا (کە لەقورئان‌و سوننەتدا بەرجەستەیەو بەشەر شەریعەت‌و بەرنامەیەکی دیکەی لەبەردەست دا نیە،کە دڵنیاو مسۆگەر بێ ئەوە هی خوایە، جگە لە شەریعەتی پێغەمبەری کۆتایی) هەرکاتێك ئەو شەریعەتە پیادە بکرێ، بەتەئکید ئەو دادگەرییە گشتگیرو ڕەهایە، دەستەبەر دەکرێ‌و دەچەسپێنرێ.

ئنجا یەکێك بۆی هەیە پرسیار بکات‌و بڵێ: باشە ئەو دادگەرییە گشتگیرە چۆن دەچەسپێ‌و بەڕێوە دەبردرێ؟ زانایان دەڵێن لەهەرڕێیەکەوە و، بە هەر شێوەیەك، کە عەقڵ و ئەزموونی بەشەر وەدی دێنێ، دادگەریی بچەسپێ، ئەوە شتێکی شەرعییە.

ئێمە دەتوانین لەو بارەوە سێ بەڵگە بێنینەوە، کە لە هەر ڕێیەکەوەو بەهەر شێوازێك دادگەریی بچەسپێ، شتێکی شەرعییە، واتە: شەریعەت تەماشای ئامانجو مەبەست دەکات، چۆن ئەو ئامانجو مەبەستە بهێندرێتە دیو لە هەر ڕێیەکەوە بێ، کە بریتییە لە چەسپاندنی دادگەریی:

١- بناغە لە هەڵسوکەوتەکاندا ڕەواییە (الأصل في المعاملات الإباحة) کەواتە: ئێمە مەگەر بە دەقێکی شەرعیی شتێکمان لێ قەدەغە کرابێ، ئەگەرنا لەئەسڵ دا دەستمان کراوەیەو بۆمان ڕەوایە لە ڕووی شێواز و ئامرازو ڕێبازەکانەوە بۆ گەیشتن بە ئامانجە شەرعییەکان.

٢ - هەر شتێك فەرزێك پەکی لەسەری بکەوێ، ئەویش فەرز دەبێ (**مَا لاَ يَتِمُّ الْوَاجِبُ إلاَ بِهِ، فَهُوَ وَاجِبٌ**) کەواتە: هەر کات دادگەریی لەسەر شێوازێك، ئامرازێك پەکی کەوت، مادام بەوە نەبێ نەیەتە دی، ئەوە ئەو کاتە ئەو شێواز و ئامرازەش پێویست دەبێ، پاشان گوتراوە: (**الْحِكْمَةُ ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ فَحَيْث ما وَجَدَها فَهوَ أحَقُّ بِها**) حیکمەت (واتە: زانیاریو کردەوەی بەسوودو بەکەڵك) شتێك، کە لە بڕوادار ون بووە، لەهەر شوێنێك بیدۆزێتەوە، لە هەموو کەس زیاتر حەقی پێیەوە هەیە.

٣- ئنجا بالە کۆتایی توێژینەووەمان دا دەربارەی دادگەریی، ئەو قسەیەی (إبن القيِّم) بێنینەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ ) لەکتێبی (الطرق الحكمية في سياسة الشرعية) لە لاپەڕە (٢٣)دا ، کە بەڕاستی قسەیەکی زۆر نەستەق و بە جێ دەکات، دەڵێت:

**(فإن الله سبحانه أرسل رسله وأنزل كتبه ليقوم الناس بالقسط وهو العدل الذي قامت به الأرض والسموات، فإذا ظهرت أمارات العدل وأسفر وجهه بأي طريق كان، فثم شرع الله ودينه والله سبحانه أعلم وأحكم وأعدل أن يخص طرق العدل وأماراته وأعلامه بشيء ثم ينفي ما هو أظهر منها وأقوى دلالة وأبين أمارة فلا يجعله منها ولا يحكم عند وجودها وقيامها بموجبها، بل قد بين سبحانه بما شرعه من الطرق أن مقصوده إقامة العدل بين عباده وقيام الناس بالقسط فأي طريق استخرج بها العدل والقسط فهي من الدين وليست مخالفة له)** .

واتە: خوای پاك، پێغەمبەرانی خۆی ناردوە(صەڵات وسەلامی خوایان لەسەر بێت)وکتێبەکانی خۆی ناردۆتە خوار، تاکو خەڵك بە دادگەریی بەڕێوە بچن، دادگەرییەك کە زەوی و ئاسمانەکان بەهۆی ئەوەوە ڕاوەستاون، (واتە: ئەو بوونەوەرەی، کە ئێمە دەیبینین بە هۆی ئەو تەرازووی دادگەرییەی، کە خوا لە نێویدا داناوە ڕاوەستاوە)، ئنجا لە هەر شوێنێك نیشانەکانی دادگەریی دەرکەوتن و ڕووی گەشی دادگەریی دەرکەوت، بەهەر ڕێبازو شێوازێك بێت، ئەوە شەرعی خوا و دینی خوا لەو ێیە، بەڵکو خوای پاك و بێگەرد بەوەی، کە دایناوە لە ڕێبازەکان ڕوونی کردۆتەوە، کە مەبەستییەتی بەندەکانی لەنێو خۆیاندا دادگەریی بچەسپێنن و، خەڵك بە دادگەریی بە ڕێوە بچن، بۆیە لە هەر ڕێیەکەوە دادگەریی‌و داد هێنرایە دی، ئەوە ئەو ڕێیە بەشێکە لە ئایین، پێچەوانەی ئایین نیە.

ئنجا دیارە زانایان بنچینەیەکی شەرعییان هەیە دەڵێ : (للوسائل حكم المقاصد) واتە: ئامرازەکان حوکمی ئامانجەکانیان هەیە، یانی ئەگەر ئامانجەکەت پێویستە - بۆ وێنە: بریتیە لە چەسپاندنی دادگەریی- بە هەر ڕێیەکدا ئەو دادگەرییە دەچەسپێ، بۆت هەیە بیگریە بەر، لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتبێ، یان لە ڕۆژئاواوە، مسوڵمان بە دەستی هێناوە، کافر وەدیهێناوە، وەك زانایان گوتوویانە: (أنظُر الى ما قيل ولا تَنظُرُ إلى مَن قال) تەماشا بکە چی گوتراوە، تەماشا مەکە کێ گوتوویەتی، قسەی باش، هەر کەسێك کردبێتی، پێویستە وەری بگری، ئامرازی باش‌و شێوازی باش،کە دەتگەیەنێتە ئامانجی چاك، لە هەرکەسێکەوە بێ، پێویستە وەری بگری، خوا (سبحانه و تعالى) بۆمان باسی بەندە هەڵبژێردراو عاقڵ مەندەکانی دەکات‌و دەفەرموێ: (فَبَشِّرۡ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٨﴾) الزمر:١٧-١٨، واتە: موژدە بدە بە بەندەکانم. ئەوانەی، کە گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن، بەڵام دوایی شوێن چاکترینی دەکەون، ئەوانە کەسانێکن خوا هیدایەتی داون ،وە ئەوانەن خاوەن عەقڵان.

کەواتە: مسوڵمان دەستی نەبەستراوەو هیچ ڕێی لێ نەگیراوە، کە بۆ چەسپاندنی دادگەریی، هەر ڕێبازێك‌و هەر شێوازێك بگرێتەبەرو هەر ئامرازێك بەکار بێنێ، لە هەر شوێنێکەوە هاتبێ، گرنگ ئەوەیە ئەو ئامانجە بەرز و گرنگە، کە هەموو پێغەمبەران

(علیهم الصلاة والسلام ) بۆ چەسپاندنی هاتوون، بێتە دی، کە دادگەریی هەمە لایەنەو گشتگیرە.

لێرەدا کۆتایی بە توێژینەووەمان دەربارەی بنەمای پێنجەمی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی دێنین و بۆمان دەرکەوت، کە لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا، دادگەریی گشتگیرو ڕەها دەچەسپێندرێ، لە کاتێکدا کە ئەو شەریعەتە،وەك خوا ویستوویەتیو ناردوویەتی، جێبەجێ بکرێ.

یەکسانیی ڕەها (المساواة المطلقة)، ئەمیش یەکێکی دیکەیە لە بنەما گەورەو گرنگەکانی سیستەمی حوکم لە ئیسلام دا .

ئنجا ئایا مەبەستمان لە یەکسانیی چیە؟، مەبەستمان لە یەکسانیی ئەوەیە، کە تاکەکانی کۆمەڵگایەك لە ماف و ئازادییەکانداو لە ئەرکەکانیاندا وەك یەك بن‌و، هیچ جیاوازییان نەخرێتە نێوانەوە ، بەهۆی ڕەنگ و ڕەگەز و ڕەچەڵەك و زمان و سامان و عەقیدە و بیرو ڕاو بۆچوون و...هتد، بەیەکسانیی مامەڵەیان لەگەڵ دا بکرێ.

دیارە لە بنەمای پێشوودا باسمان کرد، کە یەکسانیی‌و دادگەریی، زۆر تێکەڵکێشن‌و زۆر لێك نزیکن، هیچ کامیان بە بێ ئەوی دیکە ناگونجێ، جگە لە هەندێك حاڵەتی هەڵاوێردراو، کە دادگەریی لە یەکسان کردن دا نابێت.

(ڕاغبیی ئەصفەهانیی) لە (مفردات ألفاظ القرآن)دا بەم شێوەیە باسی (مساواة) دەکات، دەڵێ:

(المساواة: المعادلة المعتبرة بالذرع والوزن والكيل، يقال هذا ثوب مساو لذاك الثوب، وهذا الدرهم مساو لذلك الدرهم، وقد يعتبر بالكيفية نحو هذا السواد مساو لذلك السواد).[1]

واتە: یەکسانیی: وەك یەکبوون‌و، هاوسەنگبوون، ئەوەیش ڕەچاو دەکرێ لە پێوان دا، (شتێك کە دەپێوری بە باڵ، بە گەز، بە مەتر) و لە کێشان داو لە پێوانەدا (کە شتێك بە دەفرێك بە شتێك دەپێوری)، دەگوترێ: ئەو پۆشاکە وەك ئەو پۆشاکە وایە ، جاری وا هەیە لە ڕووی چۆنیەتیەوە دەگوترێ: ئەو ڕەشییە وەك ئەو ڕەشییە وایە، (واتە: لە ڕەشێتییدا وەك یەکن).

(المعجم الوسيط)یش دەربارەی (مساواة) دەڵێ: (ساواهُ اي ماثلَهُ وعادلَهُ واستوى الشيئان: تساويا)[2] واتە: ئەو شتەی وەك ئەو شتە لێکرد: لەگەڵیدا هاوسەنگیکردو وەك

---

[1] ص٤٣٩ .
[2] ص ٤٦٦ .

وی لیٚ کرد، ئەگەر بلیٚی: (استوی الشیئان) واتە: دوو شتەکان وەك یەکبوون لە هەموو ڕوویەکەوە، کەواتە: یەکسانیی، واتە: وەك یەك تەماشاکردنو وەك یەکدانانو وەك یەك مامەڵە لەگەڵداکردن، لەگەڵ دوو شت، یان دوو کەس، یان زیاتردا.

ئنجا پسپۆڕانی بواری یاسا دەڵیٚن: بۆ هاتنەدی یەکسانیی ڕەها، پیٚویستە سەرنجی چوار بوار بدریٚ، یان لە چوار بواردا وەك یەك مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا بکریٚ، لەگەڵ تاکەکانی کۆمەڵگایەکدا، ئەگەر بویستریٚ یەکسانیی بهیٚنریٚتە دی:

بواری یەکەم: یەکسانیی لە بەرانبەر یاسادا، هەموو خەڵك وەك یەك بیٚ، هەندیٚکی لە ژیٚر یاساوە نەبیٚت و، هەندیٚکی لەسەروو یاساوە بیٚ، وەك لە زۆرولاٚتی دونیادا وایە.

بواری دووەم : یەکسانیی لە بەرانبەر دادگادا، بڕیار و حوکمی دادگا بەسەر هەمواندا وەك یەك جیٚ بەجیٚ بیٚ.

بواری سیٚیەم: یەکسانیی لە بەرانبەر پلە وپایەکانی دەوڵەتدا، هەلی وەرگرتنی پلەو پایە بۆ هەمووکەس وەك یەك بیٚ، هەر کەسەو بە پیٚی شایستەیی خۆی .

بواری چوارەم: یەکسانیی لە بەرانبەر ئەرك و کارە گشتییەکان دا، هەر ئەرکیٚك و باریٚك دەخریٚتە سەر شانی هەرکامیٚك، بخریٚتەسەر ئەوی دیکەش، بە پیٚی ئەو مەرجانە، کە ڕەچاو دەکریٚن و دادەنریٚن.

جا ئیٚمە سەرەتا چەند ئایەتیٚك دیٚنینەوە دەربارەی یەکسانیی، پاشان چەند فەرمایشتیٚکی پیٚغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" دیٚنینەوە، کە چۆن باسی یەکسانیی و دادگەریی کراوە لە نیٚوان تاکەکانی کۆمەڵگادا، پاشان لەو چوار بوارەدا سەرنجی شەریعەت دەدەین، کە چۆن تاکەکانی ژیٚر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی ئەو یەکسانییەیان تیٚدا دیٚتە دی.

## یەکەم: چەند ئایەتیٚکی قوڕئان لەبارەی دادگەرییەوە:

پیٚشتر ئاماژەمان پیٚدا، کە وشەی (عدل وقسط) کە هەردووکیان بە واتای (دادگەریی) دیٚن، لەگەڵ وشەی (مساواة)دا، کە بنەمای یەکسانییە، زۆر لیٚك نزیکن،

وشەی (**عدل**) لە قورئان دا زیاتر لـە (٢٠) جـار هـاتوە، هـەروەها وشـەی (قسـط)یـش بەهەمـان شێوە زیاتر لە (٢٠) جار هاتوە،وە لەو صەحیفەیەدا، کە پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" وەك دەستووری مەدینە داینا، وشەی ( قسـط و عـدل) هـەردووکیان (٩) جار دووبارە بوونەتەوە.ئێستاش باتەماشای چەند ئایـەتێك بکـەین، کـە دیـارە مـن وەك نموونە هێناومنەوە، دەوری (٢٠) ئایەتم بە نموونە هێناوەتەوە، بۆ هاتنی هەر کام لەوشەی (عدل وقسط) کە وەك گوتم بە واتای یەکسانیی دێن، یان زۆر لە گەڵ یەکسـانیی نزیـكو تێکهەڵکێشن:

١- خوای کاربەجێ لە سوورەتی (**الأنعام**) لە ئایەتی ( ١١٥) دا دەفەرموێ: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ ﴾

واتە: وشەی پەروەدگارت لە ڕووی ڕاستیی‌و دادگەرییەوە تەواون، یانی لە ڕاستییدا تەواویان کردوەو، هیچ وشەیەك ناگاتە وشەی خوا لە ڕاستییدا، لە دادگەرییشدا تەواویان کردوە، چونکە شەریعەت دوو بەشە: یان هەواڵ پێدانە، یان بڕیاردان و حوکمکردنە، ئنجا هەواڵەکانی هەموویان ڕاستن، حوکمەکانیشی هەموویان دادگەرانەن.

٢- لەئایەتی (١٥٢)ی سوورەتی (**الأنعام**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ ... وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُوا۟ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ... ﴿١٥٢﴾ ﴾ واتە: هەرکاتێك قسەتان کرد بە دادگەرانە قسە بکەن، ئەگەر ئەو کەسەی قسەیشی لە بارەوە دەکەن، لێشتان نزیك بێـت، یان خزم بێت.

٣- لە سوورەتی (**الأعراف**) ئایەتی ( ١٥٩ )دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمِن قَوْمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ واتە: لە گەلی مووسا کۆمەڵێك هەبوون، کە بە پێی حەق ڕێیان دەکرد، بە هۆی حەقیشەوە دادگەرییان دەکرد.

٤- هەر لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی ( ١٨٥ )دا دەفەرموێ: ﴿ وَمِمَّنْ خَلَقْنَآ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ﴿١٨١﴾ ﴾ واتە: لەوانەی کە دروستمان کردوون (واتە: لە نێو بەشەریەت دا) کەسانێك هەر دەبن کە هەمیشە بە پێی حەق بەڕێوە بچن و بە پێی حەقیش دادگەریی بچەسپێنن .

٥- لە سوورەتی (النحل) ئایەتی (٩٠ )دا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ ... ﴿٩٠﴾ ﴾ واتە: بێگومان خوا فەرمان دەکات بە دادگەریی و چاکەکاریی و بەخشین بە نزیکان...

٦- لە سوورەتی (الشوری) ئایەتی ( ١٥ )دا خوا لەسەر زمانی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: ﴿ ... وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ... ﴿١٥﴾ ﴾ الشوری، واتە: فەرمانم پێکراوە،کە لەنێوانتاندا دادگەریی بچەسپێنم و دادگەرییتان لە نێواندا بەڕێوە بەرم.

٧- لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی ( ٢٨٢)دا خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ ... وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌۢ بِٱلْعَدْلِ ... ﴿٢٨٢﴾ ﴾ البقرة، واتە: با نووسەرێك بە دادگەرانە (ئەو قەرزو قۆڵە و مامەڵەیەی کە دەیکەن) بینووسێت.

٨- لە سوورەتی (النساء) ئایەتی ( ٥٨)دا دەفەرموێ: ﴿ ...وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ ... ﴿٥٨﴾ ﴾ النساء، واتە: هەرکاتێك دادوەرییتان لە نێوان خەڵکدا کرد، خوا فەرمانتان پێدەکات، کە دادگەرانە ئەو دادوەرییە بکەن.

٩- لە سوورەتی (النساء) ئایەتی ( ١٣٥) دا دەفەرموێ: ﴿ ... فَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُوا۟ .... ﴿١٣٥﴾ ﴾ النساء، واتە: بە دوای ئارەزوو مەکەون بۆ ئەوەی دادگەر

بن ، هەرکەسێك بە دوای ئارەزوو بکەوێ‌و چی پێ‌ خۆشە وا بکات، بە دڵنیاییەوە ناتوانێ‌ دادگەریی بکات، بەڵکو زۆر جار دەبێ‌ سەری نەفست شۆڕ بکەی بۆ داد، ئنجا دەتوانی دادگەر بی.

١٠- لە سوورەتی (الحجرات) ئایەتی (٩)دا دەفەرموێ: ﴿ ... فَأَصْلِحُواْ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ ...﴿٩﴾ ﴾ الحجرات، باسی دوو کۆمەڵ دەکات لە نێوان مسوڵمانانداا، ئەگەر تێککگیران و شەڕو ئاژاوەیەکیان بوو، دەفەرموێ: بە دادگەرانە صوڵحیان لە نێواندا بکەن ، چونکە هەر صوڵحێك لەسەر بناغەی دادگەریی نەبێت، دواتر تێك دەچێتەوە، یان لایەکیان خۆی بە مەغدوور دەزانێ.

ئەوە بەنسبەت وشەی (دادگەریی)یەوە، کە (١٠ ) نموونەمان بۆ هێنایەوە هەروەها وشەی (قسط)یش، کە هەر بە واتای دادگەریی دێ، ئەمیش ( ١٠) نموونەی بۆ دێنینەوە:

١١- لە سوورەتی (**الأنعام**) ئایەتی( ١٥٢)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ ... وَأَوْفُواْ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ...﴿١٥٢﴾ ﴾ الأنعام، واتە: پێوان و کێشان تەواو بکەن بە دادگەرانە ، واتە : بە تەواویی جێ‌ بەجێی بکەن، بۆ ئەوەی دادگەر بن.

١٢- لە سوورەتی (**الأعراف**) ئایەتی ( ٢٩)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِٱلْقِسْطِ ...﴿٢٩﴾ ﴾ الأعراف، واتە: بفەرموو پەروەردگارم فەرمانی بە دادگەریی کردوە.

١٣- لە سوورەتی (یونس) ئایەتی( ٤) دا دەفەرموێ:﴿ ...لِيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلْقِسْطِ ...﴿٤﴾ ﴾ یونس: ٤. واتە: بۆ ئەوەی ئەوانەی، کە ئیمانیان هێناوە و کردەوە باشەکانیان ئەنجامداوە، بە دادگەرانە پاداشتیان بداتەوە (لە دوا ڕۆژدا).

١٤- لە سوورەتی ( یونس) ئایەتی ( ٤٧)دا دەفەرموێ: ﴿ ... فَإِذَا جَآءَ رَسُولُهُمْ قُضِيَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ... ﴿٤٧﴾ ﴾ یونس: ٤٧ واتە: (لە ڕۆژی دواییدا) هەرکاتێك پێغەمبەرەکەیان ها بۆ مەیدانی مەحشەر، بە دادگەرانە دادوەرییان لە نێوان دا دەکرێ.

١٥- لە سوورەتی ( الأنبياء) ئایەتی ( ٤٧)دا دەفەرموێ: ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ... ﴿٤٧﴾ ﴾ الأنبياء: ٤٧ واتە: تەرازووە دادگەرییەکان (یان تەرازووەکانی دادگەریی) لە ڕۆژی دواییدا دادەنێین (وە کردەوە و بەرهەمو پەرێزی خەڵکیان پێ هەڵدەسەنگێنین).

١٦- لە سوورەتی ( المائدة) ئایەتی ( ٤٢)دا دەفەرموێ: ﴿ ... وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ... ﴿٤٢﴾ ﴾ المائدة: ٤٢ واتە: ئەگەر دادوەرییت لە نێواندا کردن (کە بە پێی سیاقی ئایەتەکە دیارە مەبەستی پێ خاوەن کتێبەکانە یانی: هەرکاتێك هاتن بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەیانو تۆیان کردە داوەر) بە دادگەرانە دادوەرییان لە نێواندا بکە.

١٧- لە سوورەتی (النساء) ئایەتی ( ١٣٥ ) دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ ... ﴿١٣٥﴾ ﴾ النساء: ١٣٥ واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! زۆر بە دادگەریی هەڵسن و مشووری لێ بخۆن و جێبەجێی بکەن.

١٨- هەر لە سوورەتی ( النساء) ئایەتی ( ١٢٧)دا دەفەرموێ: ﴿ ... وَأَن تَقُومُوا۟ لِلْيَتَٰمَىٰ بِٱلْقِسْطِ ... ﴿١٢٧﴾ ﴾ النساء: ١٢٧ واتە: بە کاروباری هەتیوان هەڵسن بە شێوەیەکی دادگەرانە.

١٩- لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (٨)دا دەفەرمویٚ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ ... ﴿٨﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لە بەر خوا ڕەفتار بکەن و، بە دادگەرانە شایەدیی بدەن.

٢٠- لە سوورەتی(الحديد) لەئایەتی( ٢٥)دا، کە پێشتریش باسمان کردوە فەرموویەتی: ﴿ ...وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ ... ﴿٢٥﴾ ﴾، خوا دەفەرمویٚ: ئێمە کتێب و تەرازوومان لە گەڵ پێغەمبەران دا (صەلاتو سەلامی خوایان لیٚ بێت) ناردۆتە خواریٚ، تاکو خەڵك بە دادگەریی بە ڕێوە بچن .

ئەمە چەند ئایەتێك بوو، هەر وەك نمونە هێنامانەوە لەو ئایەتانەی، کە هەرکام لە وشەی ( عدل – قسط) یان تێدا هاتبوون ، کە وەك گوتمان بە ڕاستی، بە بیٚ دادگەریی یەکسانی نایەتە دی .

ئنجا با سەرنجی ئایەتی ژمارە ( ١٣) ی سوورەتی ( الحجرات ) بدەین، کە خوای دادگەر باسی یەکسانیی دەکاتو دەفەرمویٚ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴿١٣﴾ ﴾، واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوەمان لە نێرو مێیەك دروست کردوە و، گێڕاومانن بەچەند گەل و تیرەیەك، تاکو یەکدی بناسن، بێگومان بەڕێزترتان لەلای خوا، پارێزکارترتانە، بەڕاستی خوا زانای شارەزایە.

لێرەدا خوای کاربەجیٚ بەیەك شێوەو بە یەك وشە، هەموو تاکەکانی مرۆڤ کۆ دەکاتەوە: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ) ئەی خەڵکینە ، کەواتە: هەموو مرۆڤایەتی لە بەرانبەر خوادا بە یەك وشە ناوهێنراون و بەیەك وشە بانگکراون (ئەی خەڵکینە)، (إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم) ئێمە ئێوومان دروست کردوە، کەواتە: هەموومان دروستکراوی خواین و کەس بە شێوەیەکی تایبەت دروست نەکراوە، هەمووی وەك یەك لە لایەن خواوە دروستکراوە، (مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ ) هەموویشی لە نێرو مێیەك دروستکراوە ، هیچ کەسێك نیە بلیٚ دایك و بابی

من جیایە ، هەموویان لەو ڕووەوە کە خەڵکن، هەموویان خەڵکن، لەو ڕووەوە، کە دروستکراوی خوان، هەموویان دروستکراوی خوان و لەو ڕووەوە، کە لە یەك دایك و بابن، هەموویان دەچنەوە سەر یەك دایك و باب، دەمێنێتەوە جیاوازیی تیرە و گەلەکان، لەو بارەشەوە خوا ڕایدەگەیەنێ، کە هەر خۆی مرۆڤـەکانی گێڕاون بەچەند گەل‌و هۆزێك: (وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ). کەواتە: گێڕدرانی مرۆڤـایەتی بە گەل‌و هۆزی جۆراو جۆریش، هەر لەلایەن خواوەیە، واتە: خوا کوردی کردۆتە کورد، عەرەبی کردۆتە عەرەب، هەروەها تورك‌و فارس و ئەفغان و ئەورووپی و هەموو گەلانی دیکەش، مانای وایە هیچ کەس بۆی نیە لەبەر ئەوەی، کە ئینتیمای هەیە بۆ نەتەوەکەی خۆی، بڵێ: نەتەوەکەی من چاکترە لە نەتەوەیەکی دیکە، یان بڵێ: دەبێ نەتـەوەی من سەردەست بێ‌و نەتەوەیەکی دیکە بندەست بێ، وەك وا مامەڵە لەگەڵ گەلی کورددا کراوەو دەکرێ، بەداخەوە، نەخێر، گەلەکان هەموویان وەك یەکن، بەڵکو تیرەو هۆزەکانیش وەك یەکن ، لەبەرئەوەی هەموویان خوا گێڕاونی بە گەل و تیرەی جیا جیا ، ئەویش بۆچی ؟ (لِتَعَارَفُوٓاْ) بۆئەوەی پێکەوە ئاشنا بن ، تاکو جۆراو جۆر بن ، ئەدی لەلای خوا کێ بەڕێزە ؟ (إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ) بەڕێزترتان لای خوا پارێزکارترتانە ، جا پیاوە یان ئافرەتە، پیرە، یان گەنجە ، عەرەبە، یان عەجەمە ، کوردە، یان غەیرە کوردە ، ڕەشە یان سپییە ، خەڵکی کوێیەو خەڵکی کوێ نیە ، چ ڕەگەزو ڕەچەڵەکێکی هەیە ، هیچی ڕۆڵ نابینێ ، کێ تەقوای زیاتر بێت، لەلای خوا حورمەتی زیاترە، ڕێز و پلەو پایەی لەلای خوا (سبحانە وتعالی) زیاترە، تەقواش شتێك نیە، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن : (ماست نیە بە لێوتەوە دیار بێ)، کەس بۆی نیە بڵێ: من بە تەقوا ترم ، چونکە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: **{التَّقْوَى هَا هُنَا وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ}** (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٧١٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥٦٤)) واتە: پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" سێ جاران ئاماژەی بۆ سینەی موبارەکی کردو فەرمووی: تەقوا لێرەدایە ، واتە ڕیشە و چاوگی تەقوا لە سینە و دڵ و دەروون و ناخی مرۆڤـدایە، بۆچی ئەوەی فەرمووە؟ بۆ ئەوەی هیچ کەس لە بەر ئەوەی، کە چوار ڕکات نوێژ لەوی

دیکە زیاتر دەکات، نەڵێ من لە تۆ بە تەقوا ترم ، بەس خــوای زانا بە تەقـــوا دەزانــێ ﴿ ... فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴿٣٢﴾ ﴾ النجم.

دیارە هەرکات مرۆڤـــ لە ناخیشیدا لە خوا ترساو هەستی بە چاودێریی خوا کرد، بە ڕاستی ڕواڵەتیشی ملکەچی شەرع دەبێت، واتە: مەبەستمان ئەوە نیە: کەسێك بڵـێ: مـن دڵم پڕە لەتەقوا، بەڵام نوێژ و ڕۆژوو نـەکات و گـوێی لـە حـەڵاڵو حـەرام نـەبێت!! ئـەوە قسەیەکی بۆشە. کەواتە: ئەم ئایەتە بەڕاستی یەکسانیی ڕەها لە نێـوان مرۆڤـــــەکاندا، لەسەر ئاستی گەلان و تیرە وهۆزەکان و تاکەکانیش، هەموویان ڕادەگەیەنێ.

## دووەم:دووفـەرموودەی پێغەمبـەر(صلى اللـه عليـه وسـلم)لـەبارەی دادگەرییەوە:

ئنجا بــا دوو فەرمایشــتی پێغەمبــەری خــوا "صَلَى الله عَلَيـهِ وَسَلَم" یــش بەنموونـە وەربگرین :

١ - پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: {**إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ قَـدْ أَذْهَـبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ وَالْفَخْرَ بِالآبَاءِ، مُؤْمِنٌ تَقِيٌّ وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ، النَّـاسُ بَنُـو آدَمَ وَآدَمُ خُلِقَ مِـنْ تُرَابٍ**} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٠٧٩١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥١١٦)، وَالبَيْهَقِيُّ برقم: (٢٠٨٥١) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ الله عَنْهُ. وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً: التِّرمِـذِيُّ بـرقم: (٣٩٥٦) عَـنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِـيَ الله عَنْـهُ، قَـالَ الشيخ الألبـاني: حـديث صـحيح)، واتــە: بێگومــان خــوا خۆهەڵکێشانی سەردەمی نەفامێتیی لە ئێوەدا لابردوە، (واتــە: ئەگـەر مسـوڵمان بن، نابێ وەك سەردەمی نەفامیی خۆ بەسـەر یەکدیـدا هەڵکێشـن، لەبـەر ئـەوەی دەوڵەمەنـدترن، یـان قـەدو قیافـەتان جـوانتر و ڕێکـترە، یـان هـۆزو حیزبەکـەتان بەدەستەڵاترە)، (خوا) شانازیی کردن بە بـاب و باپیرانتـانی لـە ئێـوەدا لابـردوە، (واتە: ئەگەر مسوڵمان بن، ئەو شتانەتان تێدا نامێنێ)، خـەڵك دەبێتـەوە بـە دوو بەش : پڕوادارێکی پارێزکار، یان گوناهبارێکی چارەڕەش ، ئێوە هەمـووتان وەچـەی ئادەمن، ئادەمیش لە گڵە.

٢ - هەروەها پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيـهِ وَسَلَم" لـە فەرموودەيـەكی ديكەيـدا دەفەرمویٚ: **{ أَيُّهَا النَّاسُ: أَلاَ إِنَّ رَبَّكُمْ وَاحِدٌ، أَلاَ وَإِنَّ أَبَـاكُمْ وَاحِـدٌ، أَلاَ لاَ فَضْـلَ لِعَرَبِى عَلَى عَجَمِيّ، وَلاَ لِعَجَمِيّ عَلَى عَرَبِيّ، وَلاَ لأَسْوَدَ عَلَى أَحْمَـرَ، وَلاَ لأَحْمَـرَ عَلَى أَسْوَدَ، إِلاَّ بِالتَّقْوَى أَلا هَلْ بَلَّغْتُ ؟ قَـالُوا: بَلَّـغَ رَسُـولُ اللهِ** "صَلَى الله عَلَيـهِ وَسَلَم"، **قَالَ: لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ}** (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: برقم: (٢٣٥٣٦)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح)، واتـە: ئاگـاداربن! پـەروەردگارتان يەكـە، ئاگـادار بـن! بابيشتان يەكە، ئاگاداريش بن، هيچ عەرەبێك لە هيچ غەيرە عەرەبێك چاكتر نيـە ، هيچ سپی پێستێك لە ڕەش پێستێك چـاكتر نيـە، مەگـە ربـە تـەقوا، (ئەگـەر تەقوای زياتر بیٚ، چاكترە، بە م ئەگەر ڕەشەكە، يـان غـەيرە عەرەبەكـە، تـەقوای زياتر بیٚ، ئەو چاكترە لە لای خوا)، ئايا گەياندم؟ (ئەوحەقيقەتەم پێتان گەيانـد؟ ) گوتيان: بەڵیٚ ، فەرمووی: دەجا با ئەوەی لێرەيە وئامادەيە گـوێی لـەم قسـانەيە بيگەيەنیٚ بەوەيش، كە لێرە نيە.

بەڵیٚ، ئەوە حوكمی ئيسلامـە، كە خوای دادگەر بە يەكچاو تەماشای بەندەكانی دەكـا، گرنگ ئەوەيە، كە كاميـان زيـاتر تێدەكۆشـێتو خـۆی لـە خـوا نزيـك دەكاتـەوە، نـەك يەكێكيان بڵیٚ: من نەجيب زادەم، يان بڵیٚ: بەچكە سۆنە فێرە مەلەيەو هەر لـە خـۆڕا لـە خەڵكی ديكە چاكترم !! نەخێر شتی وا نيە ، دەبـیٚ (چـاكيی) خـۆت وەدەسـتی بـێنیٚ، هەروەها (خراپيی)يش مرۆڤـــــ بۆ خۆی وەدەستی دێنیٚو، كـەس لـە ئەسـڵی سروشـتو دروستبوونيدا لەكەس چاكتر نيە، كەسيش لـە كـەس خـراپتر نيـە ، چـاكيی و خراپيـی مرۆڤـــــەكان خۆيان وەدەستی دێنن.

## سێيەم:مامەڵەی يەكسان لەگەڵ هاوولاٌتيان لەچوار بواردا

ئنجا دەبێت لەو چوار بوارەدا، كە لەخوارەوە باسيان دەكـەين، مامـەڵەيـەكی يەكسـان لەگەڵ هاوولاٌتيان و خەڵكدا بكریٚ، ئەوكاتە دەگونجیٚ بڵێين: ئەو دەوڵەتە، يان ئـەو قـەوارە سياسييە، يەكسانيی تێدا هاتوٌتە دی:

## یەکەم: یەکسانیی لە بەرانبەر یاسادا

یەکسانیی لە بەرانبەر یاسادا، (د.ثروت بدوي) لە (النظم السياسية)دا لەبارەیەوە گوتوویەتی: (**أن يكون جميع المواطنين طائفةً واحدة بلا تمييزٍ لأحدهم على الآخر في تطبيق القانون**)[1] واتە: یەکسانیی لە بەرانبەر یاسادا ئەوەیە کە: هەموو هاووڵاتییان وەك یەك کۆمەڵ بن ، لە جێبەجێ کرانی یاسا بەسەریاندا، بێ ئەوەی، کە هیچ کامیان بەسەر ئەوی دیکەدا ئیمتیازی هەبێ‌و دەبێ گشتیان لەبەرانبەر یاسادا وەك یەك بن. وەك ئەو شیعارەی ئێستا، کە دەڵێ: یاسا سەروەر بێت ، کە گەلێك جاریش وانیەو ئەوەی، کە زۆر باسی سەروەریی یاسا دەکات، لە هەموو کەس زیاتر یاسا پێشێل دەکات، بەڵام بەهەر حاڵ شیعارێکی خۆشە !!.

ئنجا با بزانین لە شەریعەتی ئیسلامییدا مەسەلەی سەروەریی یاسا بەسەر هەموانەوە چۆنە؟، خوای زاناو توانا، کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴿١٣﴾ ﴾ الحجرات. واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوەمان لە نێرو مێیەك دروست کردوەو گێڕاومانن بەچەند گەل و تیرەیەك، تاکو یەکدیی بناسن، بەڕێزترتان لەلای خوا پارێزکارترتانە، واتە: هەمووتان وەك یەکن، فەرموودەی پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ" کە پێشتر هێنامانو دەفەرموێ: (**أنتم بنو آدم، وآدمُ من تُراب**) واتە: ئێوە نەوەی ئادەمن ، ئادەمیش لە گڵە، واتە: هەمووتان وەك یەکنو، کەس لەکەس زیاتر نیە.

هەروەها فەرمودەکەی دیکەی پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ" کە دەفەرموێ: {**مَنْ أَبْطَأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ**}(أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٤٢١)، وَمُسْلِمْ برقم: (٢٦٩٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٩٤٦)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٤٥)، وَابْنُ مَاجَة برقم: (٢٢٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٣٤))، واتە: هەرکەسێك کردەوەکەی دوای بخات، ڕەچەڵەکەکەی پێشی ناخات، هەموو ئەوانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی، کە هاووڵاتیان، مرۆڤەکان لە بەرانبەردا شەریعەتی

---

[1] ) ص ٣٤٩.

خوادا وەك یەكن، ئنجا وەك جێبەجیٚ كردنی كردەییش بۆ ئـەم یاسـایە، باتەماشـای ئـەو فەرمایشـتەی پێغەمبـەری خـوا "صَلَى اللهُ عَلَيـِهِ وَسَلَم" بكـەین: جارێـك ئـافرەتێكی مەخزوومی- كە عەشیرەتێكی دیار و بەدەست بوون- دزیی دەكات، خزمـانی ئافرەتەكـە دەڵێن، كیٚ بنێرین بۆ لای پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيـِهِ وَسَلَم" تكـا بكـات بـۆ ئـەوەی سزای شەرعیی كە دەستبڕینە، بەسەریدا نەچەسپێنیٚ، دەڵێن: جا كیٚ هەیە لـە ئوسـامەی كوڕی زەیدزیاتر! كە كوڕی خۆشەویستی پێغەمبەری خوایە "صَلَى اللهُ عَلَيـِهِ وَسَلَم"، چـونكە پێغەمبـەری خـوا "صَلَى اللهُ عَلَيـِهِ وَسَلَم" زەیـدی كـوڕی حاریسـەی زۆر خۆشویسـتوە، ئوسامەیش كە كوڕی زەید بووە، زۆری خۆشویستوە هەتا گوتوویانە: (الحِبُّ بن الحِب) واتە: خۆشەویستی كوڕی خۆشەویست، ئەو دەنێرین ، ئوسامە دەچێت بۆ لای پێغەمبـەری خـوا "صَلَى اللهُ عَلَيـِهِ وَسَلَم"و تكای لێدەكات، كە ئەو ئافرەتە ببووریٚ و سزای شەرعیی بەسـەردا نەچەسپێنیٚ، پێغەمبەری خواش "صَلَى اللهُ عَلَيـِهِ وَسَلَم" تووڕە دەبیٚو دەفەرمویٚ: {**«أَتَشْفَعُ فِي حَدّ مِنْ حُدُودِ الله؟»**} ئایا تكا دەكەی، كـە یـەكێك لـە سـنوور و سـزایەكانی خـوا نەچەسپیٚ؟ ، دوایی دەرسێك دەداتە مسوڵمانانو دەفەرمویٚ: {**«أَيُّهَا النَّاسُ! إِنَّمَـا هَلَـكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ، أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّـعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ، وَأَيْمُ الله لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَـرَقَتْ لَقَطَعْـتُ يَـدَهَا»**} (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٣٢٨٨)، مُسْلِمٌ برقم: (١٦٨٨)، وَأَبُو دَاوُدَ بـرقم: (٤٣٧٣) وَأَخْرَجَـهُ أَيْضَـاً: التِّرمِـذِيُّ برقم: (١٤٣٠) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٨٩٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٥٤٧)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٤٠٢))، واتە: ئەی خەڵكینە! بێگومـان ئەوانەی پێش ئێوە بەوە فەوتان، كە ئەگـەر یەكێكی شەریف (واتە: كەسێكی ناسراو و خاوەن وەجاخ و دەوڵەمەند) دزیی كردبـا (یـان هەر كەتنێكی كردبا) وازیان لیٚ دەهێنا وە ئەگەر یەكێكی بـیٚ دەسـتەڵات و بـیٚ هێـز دزیی بكردایە (یان هـەر كـەتنێكی كردبـا) سـزایان دەدا، بـەڵام سـوێند بـەخوا، ئەگـەر فاتیمەی كچی موحەممەد دزیی بكات، دەستی دەبڕم.

پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيـِهِ وَسَلَم" ئەو وانەیەی دا بە مسوڵمانان، كە نـابیٚ هـیچ كەس لەسەرووی یاساوە بیٚ، ئنجا بۆچی پێغەمبەری خـوا "صَلَى اللهُ عَلَيـِهِ وَسَلَم" ئـەوەی كرد؟ چونكە جێبەجێكردنی ئەو سـزا شـەرعییانە بـە عیبـادەتو بـە تاعـەت دەزانـیٚو

پێغەمبەری خوا "صَلَى اللە عَلَيِهِ وَسَلَمْ" تێیدا سەرپشك نیە و ئازاد نیە، ئەو سنوورە جێبەجێ بكات، یان جێ بەجێی نەكات؟ چونكە ئەوە شەریعەتەوخوا دایناوەو، شەریعەتی خوا بۆ پێغەمبەری خوا"صَلَى اللە عَلَيِهِ وَسَلَمْ"یش بواری سەرپشك بوونی نەداوە!.

## دووەم : یەكسانیی لە بەرانبەر دادگادا

یەكسانبوونی خەڵك لە بەرانبەر دادگادا، وەك خاوەنی (النظم السياسية)[1] دەڵێ: (ئەوەیە كە لە دادگایی كردنی خەڵكدا جیاوازیی نەخرێتە نێوان تاكەكانەوە، لە كاتێكدا لەسەر تاوان و كێشەو مشتومڕەكان دادگایی دەكرێن، بەهۆی حاڵەتی كۆمەڵایەتییانەوە و دادگای جیاواز بۆ هیچ كەس نەبێ، هیچ كەس لەسەرووی بڕیاری دادگاوە نەبێ) دیارە یەكسانبوونی خەڵك لەبەرانبەر دادگادا لە ئیسلام دا، ڕاستییەكی زۆر دیارە ، تەنانەت سەرۆكی دەوڵەتیش هیچ پلە و ئیمتیازێكی نەبووە و نیە، لە مێژووی دەوڵەتی ئیسلامییدا چەندجار خەلیفەو سەرۆكی دەوڵەت پەلكێش كراوە بۆ بەردەم دادگاو حوكمیشی بەسەردا دراوە، لە كاتێكدا، كە كێشەو دەعوای هەبووە لەگەڵ كەسێكی سادەدا .

ئەوە كە خوا دەفەرموێ: ﴿ ...وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِٱلْعَدْلِ ... ﴿٥٨﴾ ﴾ النساء، خوا فەرمانتان پێدەكات كاتێك دادوەرییتان كرد لە نێوان خەڵكیدا، بەدادگەرانە دادوەریی بكەن، وەك ڕۆژی ڕوون دیارە، تەنانەت لەو كاتانەشدا، كە دەوڵەتی ئیسلامیی كەموكوڕی زۆری بووە، بەڵام مەسەلەی یەكسانیی خەڵك لە بەرانبەر دادگادا تاڕاددەیەكی زۆر هەبووەو بەڕاستی ئەو مەبدەئەی ئیسلام زۆر باش جێ بەجێ كراوە.

ئنجا ئەو نامەیەی عومەر خوا لێی ڕازی بێ - كە لە بەشەكانی داهاتوودا باسی دەكەین - كە ئەوكاتە خەلیفەی مسوڵمانان بووە، ئەبو موسای ئەشعەریی والی و دادوەر بوو لە كووفە، عومەر نامەیەكی بۆ دەنێرێ دەربارەی چۆنیەتی دادوەریی كردن، لە نامەكەدا ئەو بڕگەیەی تێدایە دەڵێ: (آس بين الناس في وجهك وعدلك ومجلسك{

١) ص ٤٤٠.

أي: سَوِّ بين المتقاضين في جميع هذه الأمور} حتى لا يطمع شريف في حيفك، ولا ييأس ضعيف من عدلك) وەك لە (الوثائق السياسية)دا هاتووە[1]، واتە: یەکسانیی لەنێوان خەڵکدا بکە لە ڕوو تێکردنتدا (کاتێك دوونەفەر، یان دوو کۆمەڵ، یان زیاتر کێشەو مشتومڕیان هەیەو دێن دادوەرییان لە نێواندا بکەی لە ڕووتێکردنیشدا، دەبێ وەك یەك ڕوویان تێ بکەی)، لە ئاستی یەکدا دایان بنێی، لە حوکمکردنت دا، دەبێ وەك یەك مامەڵەیان لەگەڵ دا بکەی، هەر کەسە و بە پێی حەقی خۆی، بۆ ئەوەی کە هیچ شەریفێك (واتە: خاوەن پلەو پایەیەك) تەماعی نەبێ لەوەدا، کە تۆ زوڵمی بۆ بکەی، هیچ بێ هێزێکیش نائومێد نەبێ لەوە، کە تۆ حەقی پێ بدەی و دادگەریی بۆ جێ بەجێ بکەی.

(الماوردي)یش لەکتێبی (الأحكام السلطانية) لە لاپەرە (١٢٠)دا دەڵێ: (**التَّسْوِيَةُ فِي الْحُكْمِ بَيْنَ الْقَوِيِّ وَالضَّعِيفِ وَالْعَدْلُ فِي الْقَضَاءِ بَيْنَ الْمَشْرُوفِ وَالشَّرِيفِ، وَلا يَتَّبِعْ هَوَاهُ فِي تَقْصِيرِ الْمُحِقِّ أَوْ مُمَايَلَةِ الْمُبْطِلِ**) واتە: دادوەر دەبێت لە حوکم دا لە نێوانی بەهێز و بێ هێزدا، بە یەکسانیی مامەڵەو حوکمیان لە نێوان دا بکات و، دادگەرانە لە نێوان پلەدارو بێ پلەدا دادوەریی بکات، (واتە: کەسێك کە پلەو پایەی نزمترە، لەگەڵ کەسێك کە پلەو پایەی کۆمەڵایەتیی بەرزترە) ، بە دوای ئارەزووی خۆی ناکەوێ لەوەدا ، کەسێك کە لەسەر حەقە، کەمتەرخەمیی ناکات، کە حەقەکەی بۆ ڕەت بکاتەوەو کەسێك کە لەسەر ناحەقە بە هیچ شێوەیەك مەیلی بەلادا ناکات) .

## سێیەم: یەکسانیی لە بەرانبەر پلەو پایەکانی دەوڵەتدا [المساواة أمام وظائف الدولة]

دەبێ خەڵك یەکسان بن بۆ چۆنیەتی کارکردنو کار پێسپێردرانیانو وەرگرتنی پلەو پایەو ئەرکەکانی دەوڵەتدا، پسپۆڕانی بواری دەستوورو یاسا، ئاوا پێناسەی ئەو بنەمایەیان کردوە وەك (د.ثروت بدوي) لە (النظم السياسية)دا هێناویەتی دەڵێ: (**أَنْ**

---
١) ص ٤٢٥- ٤٣٦، الوثيقة: ٣٢٧.

**يتساوى جميعُ المـواطنين في تـولّى الوظـائف العامـة وان يُعامـلُ نَفسُ المعاملـة منحيـث المؤهلاتُ والشروطُ المطلوبةُ قانوناً لكُلّ وظيفـةِ، ومـن حيـث المزايـا والحقـوق والواجبـاتُ والمتطلّباتُ والمكافئاتُ المحَدَّدةُ لَها)**[1] واتـە: يەکسانیی خەڵك لە بەرانبـەر پلـەو پایـەکانی دەوڵەتدا ئەوەیە: کە هەموو هاووڵاتیان لە وەرگرتنی پلەو پایەی دەوڵەتدا وەك یـەك بـن‌و وەك یەك مامەڵەیان لەگەڵـدا بکـرێ لـە ڕووی شایسـتەییان و ئـەو مەرجانـەی کـە داوا دەکرێن بۆ هەرکەسێك، کە کارێکی پێ بسپێردرێ بە پێی یاسا بـۆ هـەر ئـەرکێك، لـەو ڕووەوە، کە چ پلـەو پایـەو ئیمتیـازێکی پـێ دەدرێ‌و ئـەرکێکی دەخرێتـە سـەر، ئەنجامێك دێتە سەر ئـەو ئەرکانـە، چ پاداشـتێك دەدرێتـەوە، کـە دیـاریکراوە بـۆ ئـەو ئەرکانە، لەهەموو ئەو ڕوانەوە، وەك یەك مامـەڵە لەگەڵ هاووڵاتیان دا بکرێ.

ئەگـەر لـەو بـوارەدا تەماشـای شـەریعەت بکـەین ، دەبیـنین بەیەکچـاو تەماشـای هاووڵاتیان دەکات، بەڵام لەگەڵ یەك جیاوازیی گرنگدا، لە نێوان ئیسلام و غـەیری ئیسـلام دا، ئەویش ئەوەیە کە ئیسلام پلـە و پایـە و بەرپرسـیارێتییەکان بـەر لـەوەی بـە مـە فی هاووڵاتیانی بزانێ، بەسپاردەیان دەزانێ، ئەویش پێویستە بە خەڵکی شایستە بسـپێردرێ، واتە: خەڵکێك کە وەزیفەی دەوڵەتی پێ دەسپێردرێ، هەر مافی خەڵك نیە، بـەڵکو ئـەوە سپاردەیەو، سپاردەش دەبێت بە خەڵکی شایستەی خۆی بسپێردرێ، وەك خوا دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ...﴿٥٨﴾ ﴾ النســاء، خــوا فــەرمانتان پێدەکات، کە سپاردەکان بە خەڵکی شایستەی خۆیان بسپێرن.

پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفـەرموێ: **{إِنَّـا وَالله لاَ نُـوَلِّى عَلَـى هَـذَا الْعَمَلِ أَحَداً سَأَلَهُ ولاَ أَحَداً حَرِصَ عَلَيْهِ}**(أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٧٣٣)، وَابْـنُ أَبِـي شَـيْبَة بـرقم: (٣٢٥٤١)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٧٣٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٤٨١))، واتە: سوێند بـە خـوا، ئێمـە ئەم کارە بە کەسێك ناسپێرین داوای بکات هەروا بە کەسێکی ناسپێرین، کە سوور بێت لەسـەری. لەکاتێکـدا پێغەمبـەری خـوا "صَلَى الله عَلَيـهِ وَسَلَم" ئـەوەی فـەرمووە، کـە ئەبوموسای ئەشعەریی وەك خۆی دەڵێ: **{دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ** "صَلَى الله عَلَيـهِ وَسَلَم" **أَنَـا**

---

[1]) ص ٤٤٠.

وَرَجُلانِ مِنْ بَنِي عَمِّي فَقَالَ أَحَدُ الرَّجُلَيْنِ: يَا رَسُولَ الله أَمِّرْنَا عَلَى بَعْضِ مَا وَلاَّكَ الله عَزَّ وَجَلَّ وَقَالَ الآخَرُ مِثْلَ ذَلِكَ، فَقَالَ إِنَّا وَالله لاَ نُوَلِّي عَلَى هَذَا الْعَمَلِ أَحَدًا سَأَلَهُ وَلا أَحَدًا حَرَصَ عَلَيْهِ}، ئەبو موسا (خوای لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من و دووکەس لە بەرەی مامم چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" یەکێکیان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لەوەی کە خوا پێی سپاردووی، بەرپەرسیارێتییەکمان پێ بسپێرە، ئەوی دیکەیش هەر وای گوت، پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئاوا وەڵامی دانەوەو فەرمووی: سوێند بە خوا، ئێمە ئەو کارە بە کەسێك ناسپێرین، کە داوای بکات، یان سوور بێت لەسەری. چونکە کەسێك خۆی داوای بەرپرسیارێتی بکات و، بە دوایدا عەوداڵ بێو هەڵپەی بۆ بکات، دیارە قەدری نازانێو بە ئەمانەتی نازانێ، دیارە بە دەستکەوتی دەزانێ، نەك بە ئەرك و باری قورس، بۆیە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئاوای فەرمووە ، دیارە ئەو دووکەسە، دەبێت شایستەش نەبووبن، ئەگەرنا زانایان دەڵێن: ئەگەر کەسێك شایستە بێ، ئەوە دیارە، ئەگەر جۆرێك لە داواکردنیشی پێوە ببینرێ، بە مەرجێك هاندەرەکەی ئەوە بێ، کە خوا لە خۆی ڕازی بکات و خزمەت بە خەڵك بکات و، تێی ڕا ببینرێ، کە شایستەیی ئەوەی هەیە، ئەوە ڕێی لێ نەگیراوە، بە تایبەت ئەگەر لە شوێنێك بێ کە خەڵکەکە نەیناسێ، بەڵام بەهەر حاڵ ، وا پەسەندە کە مرۆڤ بۆ خۆی هەڵپە نەکات ، خەڵك داوای لێ بکات.

بەڵام بە نیسبەت نامسوڵمانانەوە، کە لەژێر سایەی دەوڵەتی ئسلامییدا دەژین، هەندێك کار هەن کە مۆرکێکی دینییان هەیە، ئەوە دیارە بە نامسوڵمانان ناسپێردرێن، وەك: سەرۆکی دەوڵەت، فەرماندەی سوپا، ئیمامەتی نوێژ، کە ئەوانە ئەگەر هی ئەوانیش بن هەمان حوکمی هەیە، واتە: مسوڵمانێك بۆی نیە ببێ بە پاپاو قەشەو سەرۆکی شوێنە ئاینییەکانی ئەوان، بەڵام غەیری ئەوە، وەك لە تەوەری چوارەم دا باسی نامسوڵمانان لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا دەکەین، ئەوە دەرگا ئاوەڵایە لەبەردەم نامسوڵماناندا، کە کارو ئەرکەکانی دەوڵەتیان پێ بسپێردرێن، مادام شایستەییان هەبێ.

## چوارەم : یەکسانیی لە بەرانبەر ئەرك و كارە گشتییەكان دا

وەك چۆن دەبێ لە بەرانبەر وەرگرتنی وەزیفە و پلەوپایەکاندا خەڵك یەکسان بن، دەبێ لە بەرانبەر ئەرك و كارە گشتییەكانیشدا، واتە : ئەو كارەی دەخرێتە سەر كەسێك و ئەو مافەی لێی داوا دەكرێ، دەبێ لەوەشدا خەڵك یەكسان بن ، دیارە ئەو بوارەیش وەك پسپۆڕانی یاسا دەڵێن : دەبێتە دوو بواری سەرەكی :

١ - **یەکسانیی لەبەرانبەر باج دان دا (الضريبة)دا**. واتە: هاوكاریی كردنی دارایی دەوڵەت.

**٢ - یەکسانیی لە بەرانبەر خزمەتی سەربازیی و بەرگریی كردن لەو قەوارە سیاسییەدا.**

**١- یەکسانیی لەبەرانبەر باج دان دا:** وەك خاوەنی ( النظم السياسية ) دەڵێت: (أن تكون مساهمةُ الأفراد في أداءِ الضرائبِ وِفقاً لأقدارِ دخولِهم أو ثرواتهم)[1] واتە: ئەوەیە كە هاوبشكیی تاكەكان، یان بەشداریی كردنی تاكەكان لە دانی باج دا، بە ئەندازەی دەستكەوتیانو سامانیان بێت، لەكەم كەمو لە زۆر زۆر.

٢ - **یەکسانیی لە بەرانبەر خزمەتی سەربازیی و بەرگریی كردن لە وڵات دا**،خاوەنی (النظم السياسية ) دەڵێت: (جێ بەجێ كردنی خزمەتی سەربازیی، ئەركێكی نشتمانییە، هەموو هاووڵاتیان لە بەرانبەریدا یەكسانن، (واتە: لەسەر هەموان پێویستە) هاووڵاتیان وەك چۆن لەوەدا، كە لە ڕووی خزمەتە كۆمەڵایەتییەكانەوە، كە دەوڵەت پێشكەشیان دەكات یەكسانن، بە هەمان شێوە دەبێ ئەوانیش لە بواری بەرگریی كردن لەو دەڵەت و كۆمەڵگایەدا، هەست بە بەرپرسیارێتیی بكەنو، نابێ هیچ كەس ببووردرێ لە بەرگریی كردن لەوڵات و نیشتمان، مەگەر بە هۆی نەتوانین، یان بە هۆی نەبوونی شایستەیی جەستەیی یەوە، بەڵام ئەوە كە خۆیان دەرباز بكەن لەو ئەركە پیرۆزە لە بەرانبەر دانی ئەندازەیەك لە ماڵ دا، یان بەهۆی ئەوەوە كە سەر بە كۆمەڵێكی دیاریی كراو، یان

---

[1] ص٤٤١

چینێکی دیاری کراون، لە خەڵك و کۆمەڵگا، ئەوە لە ڕاستیدا پێچەوانەی پرەنسیبی یەکسانیی هاوڵاتییانە، لەو ئەرك و ئەو کارانەدا، کە دەکەوێتە سەرشانیان)[1].

ئنجا شەریعەتی ئیسلامییش بەهەمان شێوە لەو بوارەدا، یەکسانیی و دادگەریی لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگادا دەچەسپێنێ، جارێ لەڕووی هاوکاریی ماددییەوە، دیارە ئیسلام زەکات و هاوکاریی ماددیی، تەنیا لەسەر دەوڵەمەندان فەرز دەکات، کە ئەویش پێویستە دەوڵەت کۆیبکاتەوەو لەو بازنەیەدا کە شەریعەت دیاریی کردوە، تەصەڕروفی تێدا بکات، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا ...﴿١٠٣﴾﴾ التوبة، خوا بەپێغەمبەری خۆی (صلى الله عَلَيهِ وَسَلَم) دەفەرموێ: لە ماڵ و سامانەکانیان زەکاتێك وەربگرە، پاکیان بکەرەوە پێی و گەشەیان پێ بدە.

هەروەها لە هەمان سووڕەتدا لە ئایەتی (٦٠)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَٰرِمِينَ وَفِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦٠﴾﴾

التوبة، واتە: بێگومان صەدەقات (زەکاتەکان) بۆ هەژاران و نەداران و ئەوانەی، کە کۆیدەکەنەوەو دڵڕاگیراوان و کۆیلەکان و قەرزداران و جەنگاوەران و ڕێبوارانە، ئەوە فەرزێکە لە لایەن خواوە، بێگومان خوا زانای کاربەجێیە.

بەنسبەت مسوڵمانانەوە زەکات دانراوەو، بەنسبەت نامسوڵمانانیشەوە سەرانە دانراوە ، کە لە بەرانبەر زەکاتی مسوڵمانان دایە، بەڵام لە کاتی نائاساییدا کاتێك، کە دەوڵەت و کۆمەڵگا، پێویستییان بە سەروەت و سامانی دەوڵەمەندان دەبێ، ئەوە دەوڵەت بۆی هەیە هەر کەسە و بە پێی خۆی، لە سەر سامانداره‌کان ئەرك دابنێ و هاوکاریی ماددییان لێ وەربگرێ.

لە بارەی خزمەتی سەربازیی کردنەوە، ئەویش دیسان دەقەکانی قورئان وسوننەت بە گشتی لەسەر مسوڵمانانی پێویست کردوەو، هیچ کەس لەو حوکمە هەڵنەوێردراوە، جگە

---

[1] ص٤٤٣

لە کەسانێك، کە توانای جەستەییان نەبێ، وەك خوای بەرز دەربارەی ئەوە، کە لە سەر هەموان جەنگ و جیهادی فەرز کردوە، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ ...﴿١١١﴾﴾ التوبة، واتە: بێگومان خوا لە بڕواداران، گیان و سامانی کڕیوە کە بەهەشتیان بداتێ، لە پێناوی خوادا جەنگ دەکەن، دەکوژن و دەکوژرێن .

دەربارەی ئەوە کە کەسانێ توانایان نەبێت هەڵاوێردراون، دەفەرمەرموێ: ﴿ لَّيۡسَ عَلَى ٱلۡأَعۡمَىٰ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡأَعۡرَجِ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞۗ ...﴿١٧﴾﴾ الفتح، واتە : کوێرو شەل و نەخۆش سەغڵەت ناکرێن، (کە لەسەریان پێویست بکرێت بچن بۆ جەنگ و جیهاد لە حاڵێکدا لەتوانایان دا نیە).

**بەڵام دیارە جەنگ و جیهاد لە ئیسلام دا دوو حاڵەتی هەیە :**

یەکەم: حاڵەتی ئەسڵیی ئەوەیە، کە فەرزی کیفایەیەو، ئەگەر ئامانج بە ژمارەیەك لە مسوڵمانانی جەنگاوەر بێتە دی، ئەوە هەرچەندە لە ئەسڵدا لەسەر هەموان پێویستە، بەڵام مادام ئەو ئامانجە، ئەو جەنگ و جیهادە بە کۆمەڵێکی دیاریی کراو هاتە دی، ئەوە لەسەر کۆی خەڵکەکە لادەچێ، لەو حاڵەتەشدا دەگونجێ ، کە مسوڵمانان بە سەرە بچن، وەك ئێستا چۆن خزمەتی سەربازیی هەیە.

دووەم: حاڵەتەکەی دیکە، کە دەبێتە فەرزی عەین، ئەویش کاتێکە، کە دوژمن بەسەر وڵات دا دەداو، پێویست بەوە دەکات مسوڵمانان هەموویان بەرگریی بکەن، ئەوە لەو حاڵەتەدا، لەسەر هەموویان پێویستە بە پیاو و ئافرەتەوە، بە ساغ و نەخۆشو بە پیر و گەنجەوە بەرگریی بکەن.

بەنسبەت نامسوڵمانانیشەوە، لە ئەسڵدا جەنگ و جیهادیان لەسەر پێویست نیە، چونکە جیهاد عیبادەتێکە و بریتیە لە بەرگریی کردن لەو قەوارە سیاسییەی، کە ئەوان بڕوایان بە بناغە فیکرییەکەی نیە، کە ئیسلامە ، لە بەر ئەوە لەسەریان فەرز ناکرێ، بەڵام زۆر لە زانایانی هاوچەرخ دەڵێن : هەرکاتێك نامسوڵمانانی ژێر سایەی دەوڵەتی

ئیسلامیی ئامادەبن خزمەتی سەربازیی بکەن و بەشداریی جەنگ و جیهاد بکەن، ئەوە ئەو سەرانەیە، کە لەسەریان دانراوە، لەسەریان لادەچێ، چونکە دەڵێن: ئەو سەرانەیان بۆیە لەسەر دانراوە، که بەشداریی جەنگ و جیهاد ناکەن،لەتەوەری چوارەمیش زیاتر ئەم بابەتە ڕوون دەکەینەوە .

کەواتە : دەرکەوت کە لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا یەکسانیی ڕەها لە نێوان تاکەکان دا بەرقەرار دەبێ و دەچەسپێ.

❊❊❊❊❊❊❊

بۆیە (دابینکردنی ئازادیی و مافەکان)مان بەیەکێك لە بنەما گرنگەکانی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلام داناوە، چونکە یەکێك لە سیما و نیشانەکانی دەوڵەتی یاسایی (الدولة القانونية) بریتیە لەوە، کە هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا، مافەکانیان و ئازادییەکانیان بۆ دابین دەکرێن و لەسەر دەوڵەت پێویست دەکرێ، کە وەك ئەرکی سەرشانی خۆی ئازادییو مافەکان بۆ هەموو تاکەکان و تێکڕای هاووڵاتییان دابین بکات، نەك پێشێلیان بکات بەڵکو لەسەری پێویستە، کە ئازادییو مافەکانیان بۆ دەستەبەر بکات، بنەمای سێیەمی سیستەمی حوکمڕانیی بریتی بوو لە: (ملکەچکردنی هەموو لایەك بۆ دەستوور و یاسا)، کە دیارە کاتێك هەموولایەك بۆ دەستوور و یاسا ملکەچ دەکەن، ئازادییو مافەکانی هەموولایەك دابینو دەستەبەر دەکرێن.

ئیسلام هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی یەوە، واتە: بەر لەوەی دەوڵەتیش بنیات بنێ، خوای کاربەجێ لە قورئاندا، لە چەندان ئایەتدا جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە، کە مرۆڤەکان دەبێت ئازاد و ڕیزلێگیراو بنو هەموو مافەکانیان بۆ دابین بکرێن، ئەوە پەیوەندیی هەیە بە خودی بوونناسیی ئیسلامیی و عەقیدەی ئیسلامیی و چۆنیەتی تەماشاکردنی ئیسلامەوە بۆ مرۆڤ و ژیان و بوونو دەوروبەر، ئەو بابەتە لەوێوە هەڵدەقوڵێ، لە ڕاستیدا مرۆڤ بە بێ ئازادیی، لە نێوەرۆکی خۆی خاڵی دەبێتەوەو ئیمتیازی هەرە گەورەی مرۆڤ لە بووندا ئەوەیە، کە ئازاد بێت ، بۆیەش خوای کاربەجێ لە نێو هەموو دروستکراوەکانیدا مرۆڤی هەڵبژاردوە بۆ جێنشینایەتیی خۆی و هەڵگرتنی سپاردەی خۆی ، کە نە ئاسمانەکان و نە زەوی و نە چیاکان و نەهیچ کائین و دروستکراوێکی دیکە، شایستەی ئەوە نەبوو خوا بیکاتە جێ نشینی خۆی لەسەر زەوی و، ئەمانەتی خۆی پێ بسپێرێو، تەنها مرۆڤ ئەو شایستەیی یەی هەبوو، ئەویش بە هۆی ئەوەوە، کە خوا ( سبحانه وتعالى ) وای درووست کردوە، ئازاد بێو بتوانێ بەرەو سەر بڕواتو بەرەو خواریش بڕوات، بەهەر لایەك دا بجووڵێ، خوای توانا دەستی مرۆڤی ئاوەڵاکردوە، کە ئەوەش تایبەتمەندترین خەسڵەتی مرۆڤەو وای لە

مرۆڤـــ کردوە، کە شایستەی ئـەوەبێ، جێنشـینی خـوا بـێ لەسـەر زەوی و هـەڵگری ئەمانەتەکەی بێ.

ئێستاش بـەر لـەوەی بێینـە سـەر پـۆلێن کـردن‌و سـەرژمێرکردنی ئـەو ئـازادیی و مافانەی، کە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا دەستەبەر دەکرێن بۆ هەموو تاکەکان، بە پێویستی دەزانم، کە ئیمتیاز و تایبەتمەندییەکانی ئیسلام، لە بـواری دابینکـردن و دەسـتەبەرکردنی ماف و ئازادییەکان دا بخەمەڕوو:

## تایبەتمەندییەکانی ئیسلام

## لـە بـواری دابیـنکردنـی مـاف و ئـازادیـیەکـان دا

ئیسـلام چـەند تایبەتمەندییـەکی خـۆی هـەن، چـەند ئیمتیـازێکی هـەن بەسـەر سیسـتەمەکانی دیکـەی حوکمڕانییـداو بەسـەر بەرنامـەکانی دیکـەدا، لـە بـواری دەستەبەرکردن و دابینکردنـی مـاف و ئازادییەکانـدا، کـە دەتـوانین لـە شـەش خاڵانـدا بیانخەینە ڕوو:

### یەکەم: لە ڕووی بناغەی فیکرییەوە:

لە ڕووی بناغـەی فیکرییـەوە، ئـازادیی‌و مافـەکانی مرۆڤـــەکان لـە ئیسـلام دا، ڕاسـتەوخۆ پەیوەنـدییان هەیـە بـە بوونناسـیی ئیسـلامیی و بـە ئیمـان و عەقیـدەی ئیسلامییەوە، کە لەباسەکانی ڕابردوودا باسی بوونناسیی ئیسـلامی‌و ئیمـان‌و عەقیـدەی ئیسلامییشمان کرد، چۆنیەتی پەیوەستبوونی مـاف و ئازادییـەکانیش، بـە بوونناسـیی ئیسلامی‌و ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییەوە بەم شێوەیە:

١- مـادام خـوا (سـبحانە و تعـالی) تاکـە بەدیهێنـەر و پـەروەردگار و پەرسـتراوی مرۆڤـــەکانە ، وەك خـــوا دەفـــەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ ...﴿١٠٢﴾﴾ ، خوای زانا لە پێشدا باسی چـەند سـیفەتێکی خۆی دەکات و دوایی دەفەرموێ: ئا ئەوە (کەبۆمان وەسف کردن) پەروەردگارتانـە، جگە لەو پەرستراوێکی دیکە نیە، بەدیهێنەری هەموو شتێکە، ئنجا مـادام خـوای

بێ هاوەڵ، تاکە پەروەردگارو بەدیهێنەر و پەرستراو بێت.

٢- مرۆڤیشی کردبێتە جێنشینی خۆی، وەك دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً...﴿٣٠﴾﴾ البقرة، واتە: کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو: من جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێم.

٣- مادام خوا ( سبحانه وتعالى) ڕێزی لە مرۆڤەکان گرتبێ بە گشتیی، وەك لەئایەتی ژمارە (٧٠) سوورەتی ( الاسراء)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ...﴿٧٠﴾﴾ الإسراء، واتە: بێگومان ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرتوە.

٤- مادام خوای گەورە ئاوادانکردنەوەی زەوی بە مرۆڤان سپاردبێ، وەك لە سوورەتی (هود) لە ئایەتی ( ٦١ )دا دەفەرموێ: ﴿...هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا...﴿٦١﴾﴾ هود، واتە: ئەو (خوا) ئێوەی لە زەویدا پێکهێناوە و ئاوەدانکردنەوەیشی بە خۆتان سپاردوە.

لەبەر هەموو ئەوانە ناکرێ مرۆڤەکان ئازاد نەبن، ناگونجێ مافەکانیان مافی ڕێزلێگیرانیان، مافی ژیانیان، مافی سیاسییان مافی ئابوورییان، مافی کۆمەڵایەتییان بۆ دابین و دەستەبەر نەکرێن، چونکە مادام مرۆڤ بۆ تاقیکردنەوە دروستکرابێ‌و جێنشینی خوا بێ‌و، ئاوەدانکردنەوەی سەرزەوی پێ سپێردرا بێ،ئەگەرئازادیی ومافەکانی بۆ دابین‌و مسۆگەر نەکرێن، ئایا چ ڕێزێك بۆ مرۆڤێك دەمێنێتەوە، کە ئازاد نەبێت، ئایا چ ڕێزو گرنگییەکی بۆ دەمێنێتەوە، کە سەربەست نەبێ‌و دەستی کراوە نەبێ؟ ئایا چۆن مرۆڤ جێنشینایەتی خوای بۆ دەکرێ لەسەر زەوی، ئەگەر ئازاد نەبێ‌و دەستی کراوە نەبێت‌و سەربەست نەبێت؟ چۆن تاقی دەکرێتەوە، ئەگەر ئازاد و سەربەست نەبێ کە بەرەو کوێ بیەوێ بڕوات؟ کەواتە: بناغە فکرییەکەی ئازادیی‌و مافەکان، ڕاستەوخۆ دەگەڕێتەوە بۆ بوونناسیی و ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی‌و لەوێوە ئازادیی تاکەکان‌و مافەکانیان دەستەبەر دەکرێن.

## دووەم: لە ڕووی سەرچاوەی هەڵقولاًنیانەوە:

ئیمتیازو تایبەتمەندیی دووەمی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی، لە بواری دەستەبەرکردنی ماف و ئازادییەکانی تاکەکاندا، ئەوەیە کە لە ڕووی سەرچاوەی هەڵقولاًنیانەوە، دیسان ماف و ئازادییەکان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، جیادەبنەوە لەو ماف و ئازادییانەی، کە لە ڕوانگەی سیستەم و بەرنامەکانی دیکەوە دابین دەکرێن.

سەرچاوەی هەڵقولاًن و هاتنی هەمو ماف و ئازادییەکانی تاکەکان لە ئیسلام دا ئەوەیە، کە خوای کاربەجێ، خۆی ئەو ماف و ئازادییانەی بە مرۆڤ داون. وەك خوا (سبحانة وتعالى) کە لە ئایەتی ژمارە (٧٠) سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ... ﴿٧٠﴾﴾ الإسراء، واتە: بێگومان ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوە،

کەواتە: خوا ڕێزی لە مرۆڤ گرتوەو بێگومان، هیچ ڕێزێکیش بۆ مرۆڤ نامێنێتەوە، کاتێك دەکرێتە ژێر دەستو کۆیلەو، مافەکانی پێشێل دەکرێنو زەبوون دەکرێ!

هەروەها خوای مەزن لە سوورەتی (یس) ئایەتەکانی: (٧١- ٧٣)دا وەك نیعمەت و چاکەی خۆی بەسەر هەموو مرۆڤەکانەوە، دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَآ أَنْعَٰمًا فَهُمْ لَهَا مَٰلِكُونَ ﴿٧١﴾ وَذَلَّلْنَٰهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَهُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَمَشَارِبُ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾﴾، واتە: ئایا نابینن کە ئێمە لەوەی، کە

بەدەستی خۆمان بۆمان دروست کردوون، چەندان جۆرە ئاژەڵمان بۆ دەستەمۆ کردوون، کە ئەوانە خاوەنینی (واتە مرۆڤەکانمان کردۆتە خاوەنی ئاژەڵەکان) و بۆمان دەستەمۆو ملکەچ کردوون (ئەگەرنا بەچەندان کەس حوشترێکی بچووکیش ناتوانرێ مەرزەم بکرێ، ئەگەر یاخی بێ، بەڵام خوا ئاژەڵەکانی بۆ دەستەمۆ کردوون) کە هەم بۆ بارو سوارییی بەکاریان دێنن، هەم لەگۆشتیشیان دەخۆن و، چەندان سوود و کەڵکیان لێ وەردەگرن و لەبەرهەمەکانیان دەخۆنەوە، ئنجا ئایا سوپاسگوزار نابن؟، کەواتە خوای بەرزو مەزن

بوونەوەر و ئەوەی لە بوونەوەردایە، بۆ مرۆڤــــی خولڤاندوەو ڕێزی لە مرۆڤــــ گرتــوە، کە هەموو شتەکانی بۆ مرۆڤــــ دەستەمۆو گەردن کەچ کردوون.

## سێیەم: لەڕووی گشتگیر بوونیانەوە:

ئیمتیازی سێیەمی ئیسلام لەو بوارەدا، ئەوەیە کە لە ڕووی گشتگیر بوونیانەوە، مــاف و ئازادییەکان کە ئیسلام دابینیان دەکات، گشتگیرن، بەدوو واتایان:

١ – هەموو ئازادییەکان بەهــەموو جۆرەکانیانــەوە (وەك دواتــر باسـیان دەکـەین) وە مافەکان، هیچیان لێی هــەڵناوێردریٚ و لــیٚ جیاناکرێتــەوەو هــەموویان دەستــەبەر دەکرێن.

٢– بۆ هەموو کەسیش دەستەبەر دەکـرێن، مــادام خـوای بەبــەزەیی وەك نیعمــەتێك باسی ئەوە دەکات کە ئەوەی لە بوونەوەردا هەیە بـۆ مرۆڤــــــەکانی خولڤانــدوە، وەك دەفـــەرمویٚ: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَكُمُ ٱلْبَحْرَ لِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾﴾ الجاثية، واتە: هەرچی لــە ئاسمانــەکان و زەویــدا هەیــە لــە لایەن خۆیەوە هەمووی بۆ ئێوە دەستەمۆ کردوەو بۆی ڕام کــردوون و، لێــرەدا خــوا (عز وجل) بەگشتی ڕووی لە مرۆڤــــ کردوە، کەواتە: نیعمەتەکان بۆ هــەموانن، بۆیە ئەو ئازادیی و مافانەش نابیٚ هیچــیان لــیٚ هــەڵبوێردریٚو جیابکرێتــەوە، بــە بیانووی جۆرا و جــۆر، دەبــیٚ مافــە تاکییــەکانو مافــە کۆمەڵایەتییــەکانو مافــە ئابوورییەکان و مافە سیاسییەکان بۆ هەموان دەستەبەر بکرێن، کەواتــە: مــاف و ئازادییەکان لە ئیسلام دا بە گشتگیریی دەستەبەرو دابین دەکرێن.

## چوارەم: لە ڕووی تێرو تەواوییانەوە:

هەر لە سەرەتاوە شەریعەتی خوای پەروەردگار ماف و ئازادییەکان بەتەواویی بۆ خەڵك دابین دەکات، نەك بە نیوە چڵیی هەتا دوایی خەڵك خۆپێشاندان بکەنو نارەزایی دەربــڕنو داواکاریی بکــەن، ئینجــا مــاف و ئازادییــەکانیان بــۆ تــەواو بکــرێن، وەك لــە مێــژووی ئەورووپاو زۆرێك لە وڵاتانی دنیادا دیارە، ئیسلام هەر لە سەرەتاوە بیٚ ئەوەی هیچ کــەس داوا بکاتو، بیٚ ئەوەی هیچ کەس نارەزایی دەربڕیٚو، خۆپیشان دا بکــات و پــەنا بەرێتــە بەر هەر هۆکارێکی دیکە، هەر لە ڕێوە خوای کاربەجیٚ هەموو ماف و ئازادییــەکانی بــۆ

تێکڕای تاکەکان دەستەبەر کردوون، دیارە لە دین و بەرنامەی تێر و تەواو و کاملّی خواش شتی نیوە چلّو کرچ و کالّ ناوەشێتەوە، خوا دەربارەی ئاینەکەی خۆی دەفەرموێ: ﴿... ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ... ﴿٣﴾﴾ المائدة، واتە: ئەمڕۆ ئایینەکەتانم بۆ تەواو کردوون، وە چاکەی خۆم بە تەواویی لەگەلّ ئێوەدا کردوە ، وە ئیسلامم بە بەرنامە بۆ پەسەند کردوون، کەواتە: ئیسلامێك کە خوا بە بەرنامەی ژیانی مرۆڤەکان پەسەندی بکاتو بەکاملّو تێرو تەواو وەسفی بکات، وە بە گەورەترین و نیعمەتی تیروتەواوی خۆی پێناسەی بکات، دەبێ ئەو مافو ئازادییانەی کە لە ژێر سایەی سستەمی حوکمڕانی ئیسلامییدا دابین دەکرێن، تێروتەواو بن و نیوەچلّ نەبن.

### پێنجەم: لە ڕووی بەردەوامبوونیانەوە:

مافو ئازادییەکان لە ئیسلام دا بە بەردەوامیی دابین دەکرێن، واتە: کاتیی نین، وە بەستراوە نین بە کات و شیوێنێکی دیاریی کراوەوەو بە کۆمەلّگا وژینگەیەکی دیاریی کراوەوە، چونکە خوای بێ وێنە بە ڕەهایی باسی مافی ژیان و ئازدیی بیروڕا دەربڕینی کردوە، وە باسی مافی هاتنو چوونی کردوەو باسی مافە کۆمەلاّیەتییەکانی کردوەو...هتد، بە ڕەهایی خوا باسی کردوونو، نەیبەستوونەوە بە هیچ کاتو شوێن و ژینگەیەکەوە، بۆیە هیچ کەسێك بۆی نیە سنووریان بۆ دابنێو تایبەتیان بکات بە کاتو شوێنێکی دیاریی کراوەوە.

### شەشەم: لە ڕووی پەیوەستبوونیانەوە بە بەرژەوەندیی گشتییەوە:

لەمڕووەشەوە دیسان ماف و ئازادییەکان لەسیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامییدا لە غەیری خۆیان جیا دەکرێنەوە، ئیسلام بە پێچەوانەی سیستەمی ( لبڕالیزم و سۆسیالیزم)ەوە خەتێکی نێوەڕاستی گرتوە، وەك خوا (سبحانه و تعالى) دەفەرموێ: ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴿٦﴾﴾ الفاتحة، ڕێی ڕاستمان پێشان بدە، بمانخە سەر ڕێی ڕاست.

یان دەفەرمویٚ: ﴿ ... وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢﴾ ﴾ الفتح، ڕێیەکی ڕاستت پێشان دەدات، بەڵکو ئیسلام نەك هەر لەو بوارەدا، لە هەموو بوارەکان دا ڕێیەکی ڕاستی گرتوە، بە بیٚ تێپەڕاندن و بەزایەدان، وە بەبیٚ داشکان بەلای ڕاست و چەپ دا، وەك خوای زاناو توانا ئۆممەتی ئیسلامیی بەوە پێناسە کردوە: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا ... ﴿١٤٣﴾ ﴾ البقرة، وەئاوا ئێووەمان کردوە بەکۆمەڵێکی میانجییو خەتی نێوەڕاست گرتوو، لانەدەر بەملاولادا .

لە سیستەمی (کاپیتالیزم و لیبڕالیزم)دا بەرژەوەندیی گشتی دەکرێتە فیدای بەرژەوەندیی تاکیی، بە پێچەوانەوە لەسیستەمی (سۆسیالیزم)دا بەرژەوەندیی تاك لە ژێر پێی بەرژەوەندیی گشتی دا دەپلیشێنرێتەوە، لە ئیسلام دا هاوسەنگیی (توازن) ڕەچاوکراوە لە نێوان بەرژەوەندیی گشتی کۆمەڵگاو، ماف و بەرژەوەندیی تایبەتیی تاکەکانیش دا ، کە دیارە ئەوەش وردەکاریی زۆری دەویٚ، وە ئیسلام بەوە ماف و ئازادییەکانی تاکەکانی پاراستوە کە کۆمەڵگا بیانپلیشێنێتەوە، هەروەها بەرژەوەندیی گشتی پاراستوە لە کاتێك دا کە تاکەکان مومارەسەی ئازادییەکانی خۆیان دەکەن، زیان لە بەرژەوەندیی گشتی نەدەن، ئەویش بەوە هەندێك بەند و مەرجی لەسەر ماف و ئازادییە تاکییەکان داناوە، کە کارێك نەکریٚ بەرژەوەندیی گشتیی زیانی پیٚ بگات، دیارە ئەو خەتی نێوەڕاست (الصراط المستقيم)ەش بەڕاستی هەر لە بەرنامەی خوای پەروەردگاردا هەیە ، وە ئەوەش وردەکاریی زۆری دەویٚو ئەگەر لەڕووی سیاسییەوەو لە ڕووی ئابووریی و کۆمەلآیەتیی یەوە، سەرنج بدەین، ئەوکاتە زۆر بە ڕوون و جوانیی ئەو ڕاستییە دەبینین.

ئەوانە ئیمتیازو تایبەتمەندییەکانی ماف و ئازادییەکانی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی بوون.

# پۆلێنكردنی جۆرەكانی ئازادیی و مافەكان لە شەریعەتی ئیسلامییدا

## پێناسەی ( ئازادیی و ماف ) – ( الحــرية و الحــق ):

زانایــان هەنــدێكیان بــۆ مافــەكان، تــەنها وشــەی مافــەكان (الحقــوق) بــەكار دێــنن، هەندێكیان تەنها وشەی ئازادییەكان (الــحريات) بەكار دێنن، هەندێكیان هەردوو وشەكە بەكار دێنن، مافــەكان و ئازادییــەكان (الحقــوق والــحريات) كــە ئێمــە ئــەوەی ســێیەمان هەڵبژاردوە ، چونكە كاتێك كە ورد دەبینەوە لە ماف و ئازادییەكان، دەبینین هەنــدێكیان وشەی مافیان زیاتر لێ دەوەشێتەوە، هەندێكیشیان وشەی ئازادیی، بۆ وێنە: ڕێزلێگرتنی هەموو تاكێك و پاراستنی حورمەت و ڕێــزی وشــەی (مــاف)ی لــێ دەوەشــێتەوە، بــەڵام ئازادیی هەڵبژاردنی ئایین و دەربڕینی بــیروڕا و كۆبوونــەوە، زیــاتر وشــەی (ئــازادیی) لــێ دەوەشێتەوە، بەهەرحاڵ ئێمە هەردووك وشەی (ماف و ئازادییەكان) بەكار دێنین.

ئنجا با تۆزێك چەمكی وشەكانی: (ئازادیی)و (ماف) ڕوون بكەینەوە، هەرچەندە لە ڕاستیدا وەك زانایان دەڵێن: ڕوونكردنەوەی شتی ڕوون، زۆر بە زەحمەتە، وشەی (ئــازادیی) مــاناكەی ڕوونە ئەگەر بتەوێ ڕوونی بكەیتەوە ئاسان نیــە، زۆر جــار وشــەی مانــا ڕوون بتەوێ ڕوونی بكەیتەوە، لێڵ دەبێ!! هەروەها وشەی ماف (حــق)، دیسان ماناكەی ڕوونە، بەڵام بە هەرحاڵ ئێمە هەر سەرنجێكیان لێ دەدەین.

دیارە وشەی (ئازادیی) مانای وشەی ( حريــة)و، وشەی ( ماف)یش مــانــای وشــەی ( حق)ە، ئنجا ئەگەر سەرنج بدەینە زمانی عەرەبی وشەی ( الحرية) لــە زمــانی عەرەبیــدا بەم شێوەیە پێناسە كراوە: (الحريــةُ الخُلُــوصُ مــن الشــوائب او الــرِّقِ أو اللؤم ) وەك لــــە (المعجم الوسيط)[1] دا هاتوە، واتە: دەربازبوون لە خڵتە، یــان لــە كۆیلایــەتیی، یــان لــە

---

[1] ص١٦٥.

ناکەس بەچەیی و لە سیفەت نزمیی، کەواتە ( حُـــرّ) کەسێکە کە خڵتـەی کۆیلایــەتیی و ژێر دەستەیی پێوە نەبێ و، خڵتەی سیفەتە نزم و ناپەسەندەکانی پێوە نەبێ.

وشەی (الــحق)یش لە زمانی عـەرەبیدا بەم شێوەیە پێناسە کـراوە: (**الثابت بـلا شَـكٍ والنصيبُ الواجبٌ للفردِ أو الجماعة**)[1] واتە: شتێك کـە چەسـپیبێت بـە بێگومـان، یـان بەشێکی، کە پێویست بێت بۆ تاکێك، یان بۆ کۆمــەڵێك ، ئـەوە پێـی دەگـوترێ (**حـق**)، بەکوردیی دەڵێین (ماف)، ئەوە لە ڕووی زمانەوانییەوە.

لە ڕووی زاراوەییەوە، پێناسەکردنی هەر کام لە ئازادیی و ماف (الحرية و الحق) بـە پێی ئەو پاشخانە فیکرییەی، ئەو کەسەی ئەو وشانە پێناسە دەکا، واتاکەیان دەگۆڕێ، بۆ وێنە: ڕۆژئاواییەکان هەندێکیان ئاوا وشەی ئازادییان پێناسە کردوە، وەك کتێبـی (**حقـوق الإنسان السياسية في الإسلام و والنظم العالمية**)[2] هێناویەتی دەڵێت: (**الإنطلاق والتحلـل من القيود الإجتماعيةِ و الأخلاقيةِ وعدم الإلتزامِ بأ ي قيدٍ أو مبـدأ**) واتــە: دەرچـوون و خۆڕزگارکردن لە هەموو بەندە کۆمـەڵایەتیی و ئەخلاقییەکان و، پابەند نـەبوون بـە هـیچ کۆت و بەندو مەبدەئێکەوە.

کە ئەوە تـەعبیر دەکات لە فەلســەفەی بوونایـەتیی (ئەگزیستانسـیالیزم- الوجوديـة)، هەندێکیشیان بەم شێوەیە پێناسەی ئازادیی دەکـەن، وەك لـە (جاڕنامــەی فەڕەنسـی بـۆ مـافەکانی مرۆڤـــــ و هاووڵاتیی) لە ساڵی ١٧٨٩دا هاتوە، دەڵێت: (**قدرة الإنسـان علـى إتيانِ أي عـملٍ لايضـرُّ بـالآخرين**) واتــە: توانـا هــەبوونی مرۆڤـــــ لەسـەر ئەنجامـدانی هەرکارێك، کە زیان بە وانی دیکە نەگەیەنێ.

بەڵام بێگومـان هەرکام لەم دوو پێناسەیە، بەڕاستی هەم لە ڕووی عــەقڵیی و، هـەم لـە ڕووی شەریعەتەوە، لاسەنگ و ناتەواون، جارێ هی یەکەم: کە بریتیە لەوەی مرۆڤـــــ بە هیچ شتێکەوە پابەند نەبێ، ئەوە لە ڕاستیدا ناتوانین بڵـێین ئازادییـە، ئـەوە کۆیلـەبوونی مرۆڤــــە بۆ ئارەزووەکانی خۆی ، کە ئارەزووی لەچی بوو ئاوا بکات، بـێ ئـەوەی گـوێ

[1] ) هەمان سەرچاوە ، ص ١٨٨.
[2] ) ص ٦١

بداتە ئەوەی کە ئایا خەڵك قازانج دەکات یان زیان، بەڵێ لە ڕاستی دا ئەوە ئازادیی نیە، بەڵکو کۆیلایەتیی مرۆڤە بۆ هەواو ئارەزووەکانی خۆی ، ئەوەی دووەمیشیان : کە مرۆڤ هەر شتێکی بویٚ بیکات، مادام زیانی خەڵکی دیکەی نەبیٚ، کەواتە: مرۆڤ دەتوانیٚ خۆی بکوژیٚ، یان خۆی بسووتێنیٚ، یان ئەندامەکانی خۆی بفرۆشیٚ، ئەوەش بە ڕاستی بە ئازادیی لەقەڵەم نادریٚ، ئەگەر ئازادییش بیٚ، ئازادییەکی نەخۆشانەیە.

وشەی ماف (حق)یش دیسان بە پێی ئەو پاشخانە فکرییەی ئەو کەسە، کە پێناسەی دەکات ماناکەی دەگۆڕیٚ، زۆر لە ڕۆژئاواییەکان پێیان وا بووە، کە وشەی (**حق - ماف**) پێناسەی نیە، یەکێك لەوانە (دیگی) ئەڵمانیی گوتوویەتی: وشەی (**حق - ماف**) پێناسە ناکریٚ واتە: لە بەر ڕوونیی مانای وشەکە، زانایانی ئیسلام و شەرعزانان بەچەند شێوەیەك پێناسەی ئازادییان کردوە، یەکێك لە پێناسەکان دەڵیٚ: ( ئازادیی بریتیە لە دەربازبوونی مرۆڤ لە ئارەزووەکانی) یانی: مرۆڤ خۆی کۆنترۆڵ بکاتو ببێتە خاوەنی غەریزەکانی خۆی، بەو شێوەیە ڕەفتار بکات، کە عەقڵ لێی دەخوازیٚو دین لێی دەخوازیٚو بەرژەوەندیی گشتی لێی دەخوازیٚ.

هەندێکی دیکە ئاوا پێناسەیان کردوە، وەك (محمد أبو زهرة) لە کتێبی ( المُجتمع الإنساني في ظِل الإسلام)دا دەڵیٚ: (**الشخصُ الحرُّ هوَ الشخصُ الذي تتَجلّى فيه معاني الانسانيةُ العالية ويَضْبطُ نفسَهُ**)[1] واتە: مرۆڤی ئازاد ئەو مرۆڤەیە کە بەها مرۆڤایەتییە بەرزەکانی تێدا دەدرەوشێنەوە، وە خۆی کۆنترۆڵ دەکات.

وشەی (الحق)یش بە چەند شێوەیەك لە لایەن زانایانی ئیسلامەوە پێناسە کراوە ، یەکێك لەوانە : (الَحق مَصلَحَةٌ مُستَحقةٌ شرعاً)[2] ، (حەق — ماف ) بەرژەوەندییەکە، کە پێویستە لە ڕووی شەرعییەوە دابین بکریٚ.

یەکی دیکەشیان دەڵیٚ: (**الحَقُ اختصاص يُقرُّ بِهِ الشرع سُلطَةً على شيءٍ أو اقتضاءَ أداء من آخَرَ تحقيقَاً لمصلحةٍ مُعَينة**)[3] واتە: ماف بریتیە لە تایبەتمەندییەك کە شەریعەت

---

[1] ص ١٨٦.

[2] الحق ومدى سلطان الدولة في تقييده، ص١٩١، لفتحي الدريني.

[3] هەمان سەرچاوە، ص ١٩٣.

دانی پێدا دێنیٚ وەك خاوەن بوونی شتێك، یان وەك داواكردنی مافێك لە یەكێكی دیكە، بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەكی تایبەت دابین و دەستەبەر بكریٚ.

ئەوە بە كورتیی پێناسەی ئازادییو ماف بوو.

## پۆلێنكردنی ئازادیی و مافەكان

ئازادیی و مافەكان، ئەگەر بمانەویٚ پۆلێنیان بكەین، بە گشتیی دەبنە شەش جۆر:

جۆری یەكەم : مافی ڕێزو حورمەتی مرۆڤـــــایەتی .

جۆری دووەم : مافە كەسێتییەكان.

جۆری سێیەم : ئازادییە فیكرییەكان .

جۆری چوارەم : ماف و ئازادییە ئابورییەكان .

جۆری پێنجەم : مافە كۆمەڵایەتییەكان .

جۆری شەشەم : مافە سیاسییەكان.

دوای ئەوەی زۆر سەرنجی گەلێك كتێب و سەرچاووەم دا ، دیارە پاش سەرنجدانی ئایەتەكانی قورئان و فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خوا "صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ" ،گەیشتمە ئەو ئەنجامەی، كە دەگونجیٚ هەموو ماف وئازادییەكان، لەم شەش جۆرەدا كۆبكرێنەوەو پۆلێن بكرێن، دیارە هەركام لەوانەش، جگە لە یەكەمیان: (مافی ڕێزو حورمەتی مرۆڤـــایەتیی)، كە هەر یەكێكە، ئەوانی دیكە دابەش دەبن بۆ چەند بەشێك، ئنجا ئێمە دەمانەویٚ بەڕیز بەسەرژمێركردن و توێژینەوەی ئەو ماف و ئازادییانەدا بچینە خوار، بەڵام لە سەرەتاوە دەڵێم: هەموو ئەو ماف و ئازادییانە، كە لەم شەش جۆرەدا كۆدەبنەوە، نێرو میٚ، مسوڵمان و نامسوڵمان تێیاندا یەكسانن، بۆیە پێویست ناكات لەكاتی توێژینەوەی تاك تاكی مافو ئازادییەكاندا هەمیشە باسی پیاوو ئافرەت بكەین، یان باسی مسوڵمان و نامسوڵمان دووبارە بكەینەوەو، هەر لە سەرەتاوە دەڵێین: هەموو ئەو ماف و ئازادییانە، خوای كاربەجیٚ بۆ تێكڕای مرۆڤـــایەتیی، چ نێر بن چ میٚ ، چ

مسوڵمان بن، یان نامسوڵمان  هەر ڕەنگ و زمانێکیان هەبێ‌و، هـەر بیرکردنەوەیـەکیان هەبێت ، بۆ هەموویان وەك یەك دەستەبەر کراون، لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسـلامییدا و لە چوار چێوەی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامییدا، بۆ هەموولایەك دابین دەکرێن.

## جۆری یەکەم : "مافی ڕێز و حورمەتی مرۆڤـــایەتیی "

یەکەمین و سەرەکییترین مافی مرۆڤـــ ئەوەیـە، کـە وەك مرۆڤـــ و هـەر لەبـەر ئەوەی، کە مرۆڤـــە، بە بێ لە بەرچـاو گرتنـی هـیچ ئیعتیبـارێکی دیکـە، ڕێـزی لـێ بگیرێ‌و حورمەتی بپارێزرێ، شایانی باسیشە ڕۆژئاوایی یەکان، ئەم مەسەلەیە بە یـەکێك لە مافەکان دانانێن، بەلاّم لە ڕاستیدا سەرەکییترین مافی مرۆڤـــ ڕێزلێگیرانیـەتی بە مردوویی، چ بە زیندوویی  ئنجا ئایا ئێمە ئەوە لە چییەوە وەردەگـرین؟ لـەم ئایەتـە بەهێزو پیرۆزەی خوای دادگەرەوە ئایەتی (٧٠) ی سووڕەتی ( الإسراء) دەفـەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ كَثِيرٖ مِّمَّنۡ خَلَقۡنَا تَفۡضِيلٗا ﴿٧٠﴾ ﴾ ، خوای کاربەجێ لەم سووڕەتەدا، کـە مەککییـەو هێشـتا دەوڵـەت و قـەوارەی سیاسـی ئیسـلامیی دروسـت نـەبووە، ڕای دەگەیـەنێ و دەفـەرموێ: بێگومـان ڕێزمـان لەوەچـەی ئـادەم گرتـوە و لـە دەریـــاو وشـکانییدا هەڵمانگرتوون ، (واتە: هۆکارو ئامرازی وامان بۆ ڕەخساندوون‌و یارمەتیمان داون، کە لـە دەریاو وشکانییدا هەڵیان بگرن‌و و هاتووچۆیان پێ بکەن)،وە لە ڕۆزییە بـەتام و چـێژەکان پێمان داون (هەموو ئەوەی کە لاشـەیان پێویسـتی پێیـەتی، بۆمـان دابـین کـردوون)، وە هەڵمانبژاردوون بەسەر زۆر لەوانەدا، کە دروستمان کردوون ( زۆر لە زانایان دەڵێن : وشەی — کثیر — واتە: هەموو دروسـتکراوان، دیـارە مرۆڤـــیش دروسـتکراوێکی تاقانەیـەو هەڵبژێردراوە لە لایەن خـواوە لـە هـەموو بـوون دا، چـونکە هـەر ئـەو شایسـتەیە، کـە ئەمانەتی خوا هەڵبگرێ و، ببێتە جێنشینی خوا لەسەر زەوی) .

ئەگەر سەرنجی ئەم ئایەتە بدەین، دەزانین وشەی (تکریم) ، (وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ) بۆ هەموو نەوەی ئادەم دەچێتەوە، هەم هەڵگیرانیان لە وشکانیی و دەریاداو، هەم پێدانیان لە

ڕۆژییە بەتام و چێژەکانو هەم هەڵبژاردنیان بەسەر دروستکراوان دا بۆ هەموان دەچنەوە، بەبێ تایبەتکردن بە کۆمەڵ و تاقمێکیانەوە ، کەواتە: مرۆڤ وەك مرۆڤ لە لایەن خواوە ڕێز لێگیراوە و، حورمەتی تایبەتی بۆ دانراوە.

بەڵێ،دەبێ بە زیندوویی و مردوویيش ڕێز لە مرۆڤەکان بگیرێ، بەڵگەمان لەسەر ئەوە چییە؟ :

١ – ئایەتەکە بەگشتی فەرموویەتی: (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ) دیارە مرۆڤ کاتێك دەشمرێ، هەر لە نەوەی ئادەمە، کەواتە: بە مردوویيش هەمان ڕێزی هەیە .

٢- چەندان فەرمایشتی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لەوبارەوە هەن ، کە زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی ئەوە دەگەیەنن، کە دەبێ مرۆڤ بەمردوویش ڕێزی لێ بگیرێ.

وەك پاش کەمێکی دیکە ئاماژەیان پێ دەکەین، بەڵێ لە شەریعەتی ئیسلامییدا زۆر گرنگیی بە مرۆڤ دراوە ، هەر لە کاتی شۆردنیەوە بە مردوویی، پاشان کفنکردنی و نوێژ لەسەر کردنیو، دواتر بەخاك سپاردنی، هەموو ئەوانە بە مەڕاسیم و ڕێزەوە ، وە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" باسی بەڕێکردنی جەنازەی کردوە بۆ سەر گۆڕستان، کە خێر و پاداشتی ئەوەندە و ئەوەندە زۆرە، واتە: وەك چۆن کاتێك مرۆڤ لە دایك دەبێت و ئاهەنگی بۆ ساز دەکرێ بە ناوی حەوتم (**عقيقة**) کاتێکیش، کە دنیا بەجێ دێڵێو سەفەری مەرگ دەکات، دیسان بەهەرەوەزییو ڕێز و مەراسیمێك ئەو تەرم و جەنازەیە بەخاك دەسپێرن .

ئنجا با تەماشای چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لەوبارەوە بکەین:

١/ لە یەکێك لە فەرمایشتەکان دا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: **{إِذَا رَأَيْتُمُ الْجَنَازَةَ فَقُومُوا ، فَمَنْ تَبِعَهَا فَلاَ يَقْعُدْ حَتَّى تُوضَعَ}** (أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (١١٢١١)، وَالبُخَارِيُّ بـرقم: (١٢٤٨)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٩٥٩)، وَأَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (٣١٧٣)، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (١٠٤٣) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَالنَّسَائِيُّ بـرقم: (١٩١٧) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، واتە: هەرکاتێك جەنازەتان بینی، هەڵسن، ئنجا هەرکەسێك

شوێن جەنازەکە کەوت، یا دانەنیشیٚ، هەتا ئەو جەنازەیە دادەنریٚ.

٢/ هەر لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە: {إِنَّ النَّبِيَّ "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" مَرَّتْ بِهِ جَنَازَةٌ فَقَامَ، فَقِيلَ لَهُ إِنَّهَا جَنَازَةُ يَهُودِيٍّ، فَقَالَ: أَلَيْسَتْ نَفْساً} (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٢٥٠)) واتە: پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کاتێك جەنازەیەکیان بەلادا برد، ئەویش لەبەری هەڵسا، گوتیان: ئەوە تەرمی جوولەکەیەکە ، فەرمووی : ئایا نەفس نیە؟ (واتە: ئایا مرۆڤ نیە؟ مادام مرۆڤە، پێویستە ڕێزی لیٚ بگیریٚ، بۆیە لەبەری هەڵسام).

کەواتە : وەك چۆن مرۆڤەکان بە زیندوویی ڕێز لەهەموویان دەگیریٚ، بە بیٚ لەبەرچاوگرتنی دین و عەقیدە و ڕەنگ ورەگەزو زمانیان، بە مردووییش بەهەمان شێوە .

٣/ لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرمویٚ: {كَسْرُ عَظْمِ الْمُسْلِمِ مَيْتًا كَكَسْرِهِ وَهُوَ حَيٌّ، تَعْنِي فِي الْإِثْمِ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٤٧٣٠)، وَأَبُو دَاوُد برقم: (٣٢٠٧) قال الشيخ الألباني: صحيح، ومالك برقم: (٨١٤) واللفظ لَهُ)، واتە: شکاندنی ئێسقانی مردوو، وەك شکاندنی ئێسقانیەتی بە زیندوویی لە گوناهدا.

٤/ هەروەها پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" نەك هەر شێواندنی جەستە، بەڵکو **نابیٚ قسەش بە مردوو** بگووتریٚ، جا چ مسوڵمان، چ نامسوڵمان، بە تایبەت، کە قسە پێگوتنەکە ببێتە هۆی ئازاردانی دڵی زیندوان، وەك پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرمویٚ: {لاَ تَسُبُّوا الأَمْوَاتَ فَتُؤْذُوا الأَحْيَاءَ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٢٣٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٩٨٢)، وَالطَّبَرَانِيُّ برقم: (١٠١٣) قال الشيخ الألباني: صحيح)، واتە: جنێو بە مردوان مەدەن، زیندوەکان ئازار بدەن، پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کاتێك ئەوەی فەرموو، کە کەسێك قسەی بە ئەبوجەهل گوت، عیکرەمەی کوڕیشی (خوا لێی رازی بێت) لەویٚ بوو، دڵی ئێشا ، پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" فەرمووی: قسە بە مردوان مەڵێن، کە زیندوەکان دڵیان ئازار بدریٚ، ئەگەرنا ئەبوجەهل ئەوە دیارە لە دۆزەخ دایە، فیرعەون هەر فیرعەونە،

نەمروود هەر نەمرووده، لەعنەتی خوایان لێ بێت، بەڵام مردوویەك كە ڕۆیشتوەو كەسێكی نزیكی لەوێ بێ، نابێت قسە بەو مردوە بڵێی، با شایستەی قسە پێ گوتنیش بێ، لە بەر دڵی ئەو زیندوە .

٥/ بە نسبەت دانیشتن لەسەر گۆڕیش، ئەویش دیسان پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ڕێنمایی تایبەتی بۆی هەیە بۆ نموونە دەفەرموێ: {«**لأَنْ يَجْلِسَ أَحَدُكُمْ عَلَى جَمْرَةٍ فَتَحْرِقَ ثِيَابَهُ حَتَّى تَخْلُصَ إِلَى جِلْدِهِ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَجْلِسَ عَلَى قَبْرٍ**»}(أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٠٩٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٩٧١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٢٢٨)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٠٤٤)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٥٦٦) قال الشيخ الألباني: صحيح)، واتە: ئەگەر یەكێ لە ئێوە لەسەر پشكۆیەك لە ئاگر دابنیشێت، بەرگی بسووتێنێ‌و پێستیشی بسووتێنێ، باشترە لەوەی، كە لەسەر گۆڕێك دابنیشێ، دیارە لێرەدا واتە: بزانێ كە ئەوە گۆڕەو لەسەری دابنیشێ بە ئەنقەست.

٦/ بە نسبەت خۆپاراستن لە بێڕێزیی كردن بەتەرمیش، ئەم دەقە هەیە وەك (**سَمُرَةَ بْنَ جُنْدَبٍ**) خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: {**كَانَ نَبِيُّ اللهِ** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" **يَحُثُّنَا عَلَى الصَّدَقَةِ وَيَنْهَانَا عَنِ الْمُثْلَةِ**}(أخرجه أبو داود برقم: (٢٦٦٩)، وابن خُزَيمَة برقم: (٢٠٨٣)، قال الشيخ الألباني: صحيح)، واتە: پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئێمەی هان دەدا بۆ خێر و چاكەكردن و ماڵ بەخشین و لێی قەدەغەدەكردین، كە ئەتكی تەرم بكەین (واتە: ئەندامێكی ببڕدرێ، یان بشێوێنرێ‌و بە شێوەیەك مامەڵەی لەگەڵ دا بكرێ، كە بە بێڕێزیی لە قەڵەم بدرێ).

ئەوەی باسمان كرد جۆری یەكەم بوو لە ماف و ئازادییەكان، كە سەرەكیترین و بنەڕەتیترین مافی مرۆڤە، چونكە مرۆڤ ئەگەر ڕێزی لێ گیراو حورمەتی پارێزرا بە زیندوویی و بە مردوویی، مانای وایە هەموو مافەكانی دیكە دێنە نێو ئەم مافەوە.

## جۆری دووەم: مافە کەسێتییەکان (الحقوق الشخصية):

مرۆڤ وەك كەسێك پێویستە كۆمەڵێك مافی بۆ دابین بكرێن بۆ ئەوەی، كە كەسێتیی ئەو مرۆڤە ڕێزی لێ بگیرێ، چونكە وەك گوتمان: هەموو مافەكانو ئازادییەكان دێنەوە نێو جۆری یەكەمی ئەو مافانە، كە بریتی بوو لە پاراستنی ڕێزو حورمەتی مرۆڤ، ئنجا با بزانین، مافە كەسێتییەكان، مەبەستمان پێیان چییە؟

مەبەستمان لە مافە كەسێتییەكان و ئازادییە تاكییەكان، هەموو ئەو ماف و ئازادییانەیە، كە بە بێ ئەوان، مرۆڤ وەك تاكێك خاوەنی كەسایەتییەكی ڕێز لێگیراوو سەنگین و حورمەت پارێزراو نابێت . ئێمە مافە كەسێتییەكان لە پێنج خاڵ دا دەخەینە ڕوو:

### ١ - مافی ژیان:

یەكەمین و گرنگترین مافی كەسێتی، بریتیە لە پاراستنی ژیانی مرۆڤ نەك هەر پاراستنی، بەڵكو دابینكردنی هەل و مەرجێك، كە مرۆڤ تێیدا ژیانێكی مرۆڤانە بگوزەرێنێ.

سەرەتا با تەماشای ئەم دەقانەی قورئان و سوننەت بكەین، كە جەخت دەكەنەوە لەسەر پاراستن و بەرگریی لێكردن و بەسەلامەتیی هێشتنەوەی مرۆڤ لە ڕووی ژیانەوە و، فەراهەمهێنانی هەل و مەرجی ژیانێكی شایستە:

١/ خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی ( الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿...وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ ...﴿١٥١﴾﴾ ، واتە: ئەو نەفسەی، كە خوا قەدەغەی كردوە، مەیكوژن، مەگەر بە حەق، واتە: بە حەق نەبێ، كەس بۆی نیە كەسێكی دیكە بكوژێ، مەگەر ئەو نەفسە موستەحەقی كوشتن بێت، ئەویش دیارە بە پێی شەریعەت، كە دیاریی كردوە لە چ كاتێكدا مرۆڤ شایستەی ئەوە دەبێ، كە بكوژرێ و مافی ژیانی لێ بسەنرێتەوە.

٢/ لە سوورەتی ( المائدة) ئایەتی (٣٢)دا خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿...مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ

جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ﴿٣٢﴾ ﴾، واتـــــە: هەرکەسێك، کەسێك بکوژێ بە بێ حەقو، بێ ئەوەی کە خراپـەی لـە زەویـدا کردبێ، وەك هەمووخەڵکی سەر زەوی کوشـتبێ وایـە و، کەسـێك، کەسـێك زیندوو بکاتەوە، (واتە: نەهێڵێ بکوژرێو ژیانی سەلامەت بکات) وەك ئـەوە وایە، کە هەموو خەڵکی سەر زەوی زیندوو کردبێتـەوە و ژیـانی بەهـەموویان بەخشیبێتەوە.

٣/ لە سوورەتی (النسـاء) ئایـەتی ( ٢٩)دا خـوا دەفـەرموێ: ﴿...وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾، نەك هەر دروست نیە مرۆڤـــــ ژیانی خەڵك لە نێو ببات و بیانکوژێ، بـەڵکو دروسـت نیـە ژیـانی خۆیشـی بەهـەدەر بـداو، نـابێ ژیـانی خۆیشـی بفـەوتێنێ، وەك دەفـەرموێ: خۆتـان مەکوژن، بێگومان خوا لەگەڵتان بەبەزەیی یە.

٤/ هەروەها لە سوورەتی (البقـرة) ئایەتی (١٩٥)دا دەفـەرموێ: ﴿...وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ... ﴿١٩٥﴾ ﴾، واتە: بەدەسـتی خۆتـان، خۆتـان مەوفـەوتێنن، خۆتان دووچاری فەوتان و مەرگ مەکەن .

٥/ لە سـوورەتی (البقـرة) ئایـەتی (١٧٩)دا دەفـەرموێ: ﴿ وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَٰٓأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾، واتە: لە تۆڵەدا ژیان هەیە بۆ ئێوە، ئەی عاقڵمەندەکان! بەڵکو خۆتان بپارێزن، واتە: خوا ئەو ڕاستییەتان بۆ دەخاتە ڕوو، تاکو خـۆ بپـارێزن لـەوەی ژیـانی خـەڵك و خۆیشـتان بخەنـە مەترسییەوە، بە هۆی خوێنرێژیی و یەکدی کوژی یەوە.

٦/ لە سوورەتی (المائـدة) لە ئایەتی (٤٥)دا دەفەرموێ: ﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌۚ... ﴿٤٥﴾ ﴾، واتـــە: لەســـەر

جوولەكەكان لـە تـەوڕات دا نووسـیبوومـان ، {دیـارە ئـەو نووسـینە لەسـەر جوولەكەكان لە تەوڕات دا، مسوڵمانانیش هەر دەگرێتەوە، چـونكە هـەم ئـەم ئایەتە لە سیاقێك دا هاتوە، كە بۆ مسوڵمانانیش بەرنامەیە و یاسایەو، هـەم لە ئایەت و فەرمایشتەكانی دیكەش وەردەگیرێ، بەتایبەت ئایـەتی: ﴿ وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَٰٓأُو۟لِي ٱلْأَلْبَٰبِ ...﴿١٧٩﴾ ﴾ البقرة، تۆڵـە (قصـاص)یش لێرەدا، چ تۆڵـەی كوشـتنەوە بێـت، یـان هـەر تۆڵەیـەكی دیكـە، هـەمووی دەگرێتــەوە} كــە نــەفس بــە نــەفس، (واتــە: كەسـێك كەسـێكی كوشـت دەكوژرێتەوە)، چاو بەچاو، (كەسێك چاوی كەسێكی كـوێر كـرد، بـۆی هەیـە چاوی كوێر بكاتەوە)، لووت بە لووت، (كەسێك لووتی كەسـێكی بـڕی، بـۆی هەیە لووتی ببڕێتەوە)، گوێ بە گوێ و، ددان بە ددان، برینەكانیش بـە تۆڵـە (واتە: كەسـێك برینـی لەكەسـێك كـرد، جـا چ ئێسـكی شـكاند، یـان هـەر گۆشتەكەی بڕی، ئەویش بە هەمان شێوە).

٧/ پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" لە فەرمایشتێكیدا، كە بوخاریی لـە (عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرو بْنِ الْعَاصِ)ەوە هێناویەتی، دەفـەرموێ: {**فَـإِنَّ لِجَسَـدِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وَإِنَّ لِعَيْنِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وَإِنَّ لِزَوْجِـكَ عَلَيْـكَ حَقّـاً، وَإِنَّ لِـزَوْرِكَ عَلَيْكَ حَقّاً**}(أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٩٧٥)) واتــە: بێگومـان جەسـتەت مـافی لەسەرتە، بێگومـان چـاوت مـافی لەسـەرتە، بێگومـان هاوسـەرت مـافی لەسەرتە، بێگومان میوانیشت مافی لەسەرتە .

٨/ لە فەرمایشتێكی دیكەدا،كە (بخاري) هێناویەتی، هـاتوە: {**فَـأَعْطِ كُـلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ**}[1] واتە: هەر خاوەن مافە، مـافی خۆی پێ بدە.

[1] {عن أبي جُحَيْفَةَ وَهْب بن عبد الله رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: آخَى النَّبِيّ ﷺ بَيْنَ سَلْمَانَ وَأَبِـي الـدَّرْداءِ، فَزارَ سَلْمَانُ أَبَا الدَّرداءِ فَرَأَى أُمَّ الدَّرداءِ مُتَبَذِّلَةً، فَقَالَ: مَا شَأْنُكِ؟ قَالَتْ: أَخُوكَ أَبُـو الـدَّرداءِ لَـيْسَ لَـهُ حَاجَةٌ فِي الدُّنْيَا، فَجاءَ أَبُو الدَّرْداءِ فَصَنَعَ لَهُ طَعَاماً، فَقَالَ لَهُ: كُلْ فَإِنِّي صَائِمٌ، قَالَ: مَا أَنـا بِآكِـلٍ حَتَّـى تَأْكُلَ فأكل، فَلَمَّا كَانَ اللَّيلُ ذَهَبَ أَبُو الدَّرداءِ يَقُومُ فَقَالَ لَهُ: نَمْ، فنام، ثُمَّ ذَهَبَ يَقُومُ فَقَالَ لَهُ: نَـمْ. فَلَمَّـا كَانَ من آخِرِ اللَّيلِ قَالَ سَلْمَانُ: قُم الآن، فَصَلَّيَا جَمِيعاً فَقَالَ لَهُ سَلْمَانُ: إنَّ لِرَبِّكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وَإِنَّ لِنَفْسِـكَ

کەواتە: مرۆڤ لەسەری فەرزە جەستەی خۆی بپارێزێ، چاوی بپارێزێ، هەروەها سەرجەم ئەندامەکانی دیکەشی، بەڵام لە فەرمایشتەکەدا لەبەر بۆنە (مناسبة)یەك باسی (چاو) کراوە، کە بریتی بووە لەکەم خەویی (عبدالله)، بەهۆی زێدەڕۆیی کردنی لەشەو نوێژ کردن دا.

## ٢ - مافی هاتن و چوون و گواستنەوە (حق السفر والنقل والإنتقال):

ئەم مافەیش زانایان بەم شێوەیە پێناسەیان کردوە: (**حَقُّ الإنتقالِ من مكانٍ الى مكانٍ آخَر والخروجُ من البلادِ والعَودَةُ اليها دون تقييدٍ أو منعٍ الا وفقاً للقانون**)[1]

واتە: مافی هاتن و چوون و گواستنەوە، مافی گواستنەوەیە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك و، دەرچوون لە وڵات و گەڕانەوە بۆی، بە بێ ئەوەی هیچ کۆت و بەندێکی بخرێتە سەر، یان قەدەغە بکرێ، مەگەر بە پێی یاسا.

ئەم مافەیش یەکێکە لەو مافانەی، کە شەریعەتی ئیسلامیی بۆ هەموو تاکەکان دەستەبەری کردوون، بۆ وێنە: خوا (سبحانه و تعالى) لە سوورەتی (**یوسف**) ئایەتی (١٠٩)دا دەفەرموێ: ﴿... أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ... ﴿١٠٩﴾﴾ یوسف، واتە: ئایا ئەوانە بە زەویدا نەڕۆیشتوون، تاکو سەرنج بدەن، کە سەرەنجامی ئەوانەی پێش خۆیان چۆن بووە؟! کەواتە: با بە زەویدا بڕۆن ، هاتن و چوون بکەن ، بۆ ئەوەی شوێنەواری ڕابردوان ببینن.

لە سوورەتی (الملك) ئایەتی ( ١٥)دا خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِ ۖ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ ﴿١٥﴾﴾ واتە: خوا ئەو کەسەیە، کە زەوی بۆ ڕام و دەستەمۆ کردوون، دەجا بەقەدپاڵ و شێوەکانیدا

---

عَلَيكَ حَقّاً، وَلأَهْلِكَ عَلَيكَ حَقّاً، فَأعْطِ كُلَّ ذِي حقٍّ حَقَّهُ، فَأتى النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرَ ذلكَ لَهُ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: (صَدَقَ سَلْمَانُ) } (أخرجه البخاري برقم: (٦١٣٩)، والترمذي برقم: (٢٤١٣)).

[1] النظم السياسية، للدكتور ثروت بدوي، ص ٤٢٠.

بڕۆن و لەڕۆزیی خوا بخۆن و هەر بۆلای خوایش دەگەڕێنەوە، كەواتە : مرۆڤ فەرمانی پێكراوە، كە بە زەویدا بیۆ بچیۆ، بیۆ ئەوەی، كە هیچ بەربەستێكی لە بەردەم دا هەبیۆ.

لە (الوثیقة - الصحیفة)دا، كە پێغەمبەری خوا "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَم" بۆ ڕێكخستنی چۆنیەتی پێكەوەژیانی پێكهاتەكانی شاری مەدینە نووسیبووی، لە بەندی (٤٧)دا دەفەرمویۆ: (**وَمَن خَرَجَ آمن وَمَن قَعَدَ آمِنٌ في المَدينَة**) واتە: هەركەسێك لە شاری مەدینە بچێتە دەر، پێویستە هێمنیی ئاسایشی بپارێزریۆ، وە هەر كەسێك نیشتەجیۆ بیۆ لەمەدینەدا، دیسان پێویستە هێمنییو ئاسایشی بپارێزریۆ، كەواتە : هاتن و چوون و سەفەر و گواستنەوە، لە ئیسلام دا مافێكە بۆ هەموو لایەك دابین كراوە .

## ٣ - مافی هێمنییو ئاساییش:

ئەم مافەیش بەم شێوەیە پێناسەكراوە: (**عَدَمُ جوازِ القبضِ على أحَد الأشخاصِ أو إعتقالهِ أو حبسهِ الاَّفي الحالاتِ المنصوص عليها فى القانون، بعد اتخاذِ جميع اجرائاتِ والضماناتِ التى حدَّدهاالقانون)**[1] واتە: ڕێگا نەدان بە گرتنی هیچ تاكێك، یان بەند كردنی، یان زیندانیی كردنی، مەگەر لەو حاڵەتەدا، كە یاسا دەقی لەسەر داناوە، دوای جێبەجیۆ كردنی تێكڕای ئەو كارو گرەنتیانەی، كە بۆ پاراستنی مرۆڤو بەناهەق سزانەدانی یاسا دیاریی كردوون، ئەم مافەیش لە شەریعەتی ئیسلامییدا بۆ هەموو لایەك دەستەبەر كراوە، وەك لەسەرەتاوە گوتمان، بە بیۆ لەبەر چاوگرتنی دین وعەقیدە و ڕەنگ و ڕەگەزو هتد .. .

بۆ نموونە: خوای دادگەر لە سوورەتی (**المائدة**) لە ئایەتی ( ٤٥)دا دەفەرمویۆ:
﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ... ﴾ المائدة، كەواتە:

[1] **النظم السياسية، ص ٤٢١.**

دەبێت هەمووکەس سەلامەت و پارێزراو بێ‌و ئاسایشی جەستەیی بۆ دەستەبەر بکرێ.

هەر لە سوورەتی (المائدة) لەئایەتی ( ٣٣)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾ ﴾ المائدة، واتە:

بێگومان سزای ئەو کەسانەی، کە دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن و، ئاشووب و ئاڵۆزیی لە زەویدا بڵاو دەکەنەوە، ئەوەیە کە بکوژرێن، یان هەڵبواسرێن، یان دەست وپێی ڕاست و چەپیان ببڕدرێ، یان دەر بکرێن ، چوار سزا بۆ چوار حاڵەت ،کە شەرعزانان بە درێژیی باسیان کردوە، ئەگەر خەڵکیان کوشت و ماڵیان ستاند، دەشکوژرێن و هەڵیشدەواسرێن ، ئەگەر تەنها خەڵکیان کوشتبوو، ئەوە هەر دەکوژرێن، ئەگەر تەنها ماڵیان لەخەڵك ستاندبوو دەست و پێی ڕاست وچەپیان دەبڕدرێ، ئەگەر تەنها خەڵکیان ترساندبوو، دەردەکرێن، شەرعزانان بە تەفصیلێ باسیان کردوە.

ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە، کە خوای دادگەر هەرکەسێك کە هێمنیی و ئاساییشی خەڵك بخاتە مەترسییەوە، بە جەنگکەر لە دژی خوا و پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" پێناسەی کردوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ... ﴿٣٣﴾ ﴾ المائدة، سزای ئەوانەی کە دژایەتی خواو پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەکەن، کەواتە : هەرکەسێك هێمنیی و ئاساییشی خەڵك تێك بدات‌و خەڵك بخاتە بەر هەڕەشەی مەترسیی خۆی، چ لە ڕووی گیانیانەوە، چ لە ڕووی سامانیانەوە، چ لە ڕووی ترساندنیانەوە، ئەوە بە دوژمنی خوا و پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لەقەڵەم دەدرێ، بۆیەش سزای زۆر سەختی بۆ دیاریی کراوە.

ئینجا نەك هەر لە ڕووی جەستەیی و لە ڕووی سەلامەتیی ژیانەوە، پێویستە سەلامەتیی خەڵك مسۆگەر بكرێ، بەڵكو پێویستە لە ڕووی مەعنەوییشەوە، ئەو مافە دەستەبەر بكرێ، لە سووڕەتی (الحجرات) لە ئایەتەكانی (١١- ١٢ ) خوای تاكو پاك ڕوو لە ئیمانداران دەكاتو دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ ٱلۡفُسُوقُ بَعۡدَ ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ١١ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ ... ١٢﴾ الحجرات، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! با كۆمەڵێكتان گاڵتە بە كۆمەڵێكتان نەكات (چونكە زۆر جاران گاڵتە بەیەكدی كردن بەحاڵەتی كۆمەڵ ڕوو دەدات)، كۆمەڵێك لە ئافرەتانیش با گاڵتەو لاقرتێ بە كۆمەڵێك لە ئافرەتانی دیكە نەكەن، نزیكە ئەوانەی گاڵتەپێكراون، چاكتربن لەوانەی گاڵتەیان پێدەكەن،وە عەیب لە خۆتان مەگرن و، ناووناتۆرە لەیەكدی مەنێن، خراپترین ناو بریتییە لە ناوی فاسقبوون دوای ئیمان هێنان، (كەواتە: بەهەركامێك لەوانە: گاڵتە بەخەڵك كردن، عەیب لێ دیتنەوە، ناو ناتۆرە بەدواخستن، مرۆڤ فاسق دەبێو شاهێدیی لێ وەرناگیرێو بە لەرێ دەرچوو لەقەڵەم دەدرێ)، لەئایەتی دواتردا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ ... ١٢﴾ الحجرات، واتە: نەك هەر نابێت گاڵتە بەخەڵك بكەیو عەیبی لێ بگری و ناوو ناتۆرەی بەدوا بخەی، بەڵكو دەبێ ئاگات لە دڵ و دەروونیشت بێو بەدڵیش گومانی خراپی پێ نەبەی، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! خۆتان لە زۆر گومان بپارێزن، چونكە هەندێك گومان گوناهە (واتە: هەندێكی نیشانە ناپێكێ، ئنجا لەبەر ئەوەی، كە تووشی هەندێك لە گومانی خراپ نەبی، خۆت لە زۆری بپارێزە، نەشیفەرمووە: خۆت لە هەموو گومانێك بپارێزە، چونكە هەندێك لە گومانەكان لە جێی خۆیاندان، ئەوانەی بەڵگەو نیشانەیەكیان هەیە).

پاشان دەفەرموێ: (وَلَا تَجَسَّسُواْ ) جاسووسیی مەکەن ، جاسووسیی بریتیە لـەوە کە تۆ بگەڕێی بۆ عەیبی خەڵك بە شێوەیەکی پەنهان ، بخەفتیێ بۆ ئەوەی ، کـەم و کوڕییان تیّدا بدۆزیتەوە (وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا) بەپاشملە هەندێکتان بـە خراپـە باسی هەندێکی دیکەتان مەکەن .

لە سوورەتی (**الأحزاب**) لە ئایەتی (٥٨)دا بە گشتی خـوا ( سـبحانه وتعـالی) دەفـــەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُواْ فَقَدِ ٱحْتَمَلُواْ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٨﴾ ﴾ الأحزاب، واتـە: وە ئەوانـەی کـە ئـازاری پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار دەدەن، بێ ئەوەی کە شتێکیان کردبـێ، (واتـە: تۆمەتێکیان خراوەتە پاڵو شتێکیان پێگوتراوە، کە ئـەوان لـەو تۆمـەتو گوناهـە بەریین) ئەوە بوختانێك و گوناهێکی ئاشکرایان هەڵگرتوە. (بوختان واتە : تۆمەتی ناڕەوا بۆ خەڵك هەڵبەستن، دیارە لە زمانی کوردییدا بوختـان: زیـاتر بـۆ تۆمـەتی داوێنپیسیی بەکاردێ، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا تۆمەتی داوێنپیسـیی وشـەیەکی تایبەتی هەیە، کە بریتیـە لـە (**قـذف**)، واتـە تۆمـەتی داوێنپیسـیی پاڵدانـە لای کەسێك ، بەڵام تۆمەت بە گشتی پێی دەگوترێ: (بهتان).

پێغەمبـەری خـوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لـە وتارەکـەی حـەجی ماڵئاواییـدا فەرمووی: {**أَيُّها النَّاس إنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَـكُمْ حـرامٌ علـيكم الى ان تَلقوا رَبَكُم كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا فِي بَلَدِكُمْ هَذَا ، ألاَ هَلْ بَلَّغْتُ؟ اللهمَّ فاشهَد**}[1]

واتـە: ئـەی خەڵکینـە! بێگومـان خوێنتـان و مـاڵ و سـامانتان و کەرامـەت و سومعەتان لەسەرتان قەدەغەکراوە، هـەتا دەگەنـە پـەروەردگارتان، (واتـە : هـیچ کەس بۆی نیە، دەستدرێژیی بکات بۆ نەفسی کەسێكو خوێنی بڕێـژێ، هـەروەهابۆ ماڵو سامانی، یان بۆ سەر کەسایەتییو سومعەی، چـونکە وشـەی (**عِـرض**) کـە کۆی (أعراض)ە، تەنها پەیوەندیی بەناموسەوە نیە، بـەڵکو هـەر جـۆرە لەکـەدار

---

[1] **الوثائق السياسية، رقم: ٢٧٨ ، ورواه مسلم وإبن ماجه وإبن سعد بلفظ قريب منه.**

کردنێکــی کەســایەتیی کەسـێك، کــە بەئــەتکی کەڕامــەت لــە قەڵــەم دەدرێ، دەگرێتەوە) وەك قەدەغەبوونی ئەمڕۆتان، لەم مانگەتان دا، لەم وڵاتەتان دا ، ئایـا پێم گەیاندن؟ (ئەوانیش گوتیان: بەڵێ) فەرمووی: خوایە! تۆ شـاهید بـە، کـە پـێم گەیاندن.

بەڵێ، مسوڵمانان نابێ لە نێو خۆیاندا دەسـتدرێژیی بکـەن بـۆ خـوێن و مـاڵ و کەڕامەت و کەسێتی یەکدی، بەڵکو وشەکەی بەگشـتی فـەرمووەو فەرموویـەتی : ئەی خەڵکینە! چونکە مسـوڵمان وەك چـۆن دەبـێ دەسـت و زمـان و دڵـی خـۆی لەبەرامبەر مسوڵماناندا بپارێزێ، لەبەرانبـەر نامسوڵمانانیشـدا بەهـەمان شـێوە، بەڵکو هەندێك لـە شـەرعزانان دەڵـێن: پاراسـتنی حورمـەت و ڕێـز و مافـەکانی نامسوڵمانان لە نێو دەوڵەتی ئیسـلامییدا، دەبـێ زیـاتر جـەختی لـێ بکرێتـەوە، بۆچی؟ دەڵێین: چونکە ئەوان لەبەر ئەوەی کەمینەن، دەسـتەڵات بەدەسـتی ئـەهلی ئیسلامـەوەیە، دەبێ زیاتر ڕەچاوی پاراستنی مافەکانیان بکرێو دووریی بکـرێ لـە زیان پێگەیاندنیان.

## ٤- مافی پارێزرانی حورمەتی جێگا و شوێن:

ئەم مافەیش بەم شێوەیە پێناسە کـراوە: (**تحريم اقتحـامِ مَسـكَنٍ أحَـد الأفـرادِ أو تفتيشِهِ الاّ في حالاتٍ وفقاً للإجرائاتِ التي حَدّدها القـانون**)[1] واتە: قەدەغەکرانی چوونە ماڵی هەر یەك لە تاکەکان، یان پشکنینی، مەگـەر لـەو حاڵاتانـەدا، بـەو پێیەی کە یاسا دیاریی کردوە.

ئەم مافەش لەشەریعەتی ئیسـلامییدا مـافێکی دەسـتەبەر کـراوە، زۆر بەجـەخت لەسەرکردنەوە فەرمان کراوە، کە پێویستە حورمەتی ماڵ و حاڵ و جێگـاو ڕێگـای مرۆڤـــەکان پارێزراو بێ.

خوای زانـاو شـارەزا لـەوبارەوە لـە سـوورەتی (النـور)دا لـە ئایـەتی (١٢٨)دا دەفـــــــەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ

---

[1] النظم السياسية، ص ٤٢٢.

تَسْتَأْنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ ۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُواْ فَٱرْجِعُواْ ۖ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨﴾ ﴾ النور، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتـان هێنـاوە!

مەچنە هیچ ماڵێك، جگە لە ماڵەکانی خۆتان، هەتا مۆڵەت وەردەگرن و سڵاو لـە خەڵکەکەی دەکەن، ئا ئەوەتان بۆ ئێـوە چـاکترە، بـەڵکو پەنـد وەربگـرن ، ئەگـەر کەستان لەو ماڵەدا نەبینی، مەچنە نێوی، هەتا مۆڵەت نەدرێن، وە ئەگـەر پێتـان گوترا: بگەڕێنەوە، بگەڕێنەوە، ئەوە بـۆ ئێـوە پـاك و چـاکترە، خـوا بـەوەی کـە دەیکەن زانایە، کەواتە: نابێ لە خۆوە بچیتە ماڵی خەڵك، ئەگەر کەسی لـێ بـێ دەبـێ مۆڵـەت وەربگـریو سـڵاویان لـێ بکـەی، بـەڵکو زانایـان دەڵـێن: وشـەی (**إستئناس**) ئەوەیـە کـە دەبێـت هێنـدە بەسـەلیقەبی، ئەگـەر بزانـی کـە دەبیـە بارگرانیی، بۆ وێنە: کاتی حەوانەوەیە، یان کاتێکە دەزانی پێیان خـۆش نیـە بچـی بۆلایان، نابێ بچی، با بە مۆڵـەت وەرگـرتنیش بـێ، بـەڵکو دەبـێ کاتەکـە وابـێ دڵنیابی لەوەی، کە نابیتە مایەی بارگرانیی و ئازارو تووشی سـەغڵەتییان ناکـەی، ئەوکاتە بچی، کاتێك پێشت دەگوترێ: بگەڕێوە، نابێ لەسەر دڵت گـران و قـورس بێ (وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُواْ فَٱرْجِعُواْ) کە دیارە ئەوە ئەدەبێکی بەرزی ئیسـلامـەتییە، چونکە جاری وا هەیە تۆ دەچیتە ماڵی کەسێك، کاتیان گونجاو نیـە، ئەگـەر پێـت بگوترێ: بگەڕێوە، شتێکی شەرعییەو نابێ لەسەر دڵت قورس بێ.

لە سوورەتی (الحجرات) ئایەتی ( ١٢)دا خوا دەفـەرموێ: (وَلَا تَجَسَّسُواْ) کەواتـە: بۆت نیە بە شێوەیەکی پەنهان چـاودێریی مـاڵی خـەڵك و جێگـاو ڕێگـای خـەڵك بکەی.

پێغەمبـەری خـوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" لـە فەرمایشـتێکدا، کـە بوخـاریی لـە ئـەبوهورەیرەوە هێنـاویـەتی، شـتێکی زۆر گـرنگ دەفـەرموێ: {لَوْ أَنَّ امْرَأً اطَّلَعَ

عَلَيْكَ بِغَيْرِ إِذْنٍ، فَحَذَفْتَهُ بِحَصَاةٍ، فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ، لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ جُنَاحٌ}[1] واتە: ئەگەر کەسێك بە بێ مۆڵەت چاودێریی ماڵەکەی تۆ بکات (لە دەرگاوە لە کەلێنێکەوە بۆتان بڕوانێ) تۆیش شتێك بگریە چاوی‌و، چاوی کوێر بکەی، گوناهت ناگاتێ، بۆچی؟ چونکە ئەو حورمەتی ماڵی تۆی شکاندوە، تۆش بۆت هەیە سزای بدەی.

## ٥- مافی پارێزرانی نامەو قسەو نووسین و تەلەفۆن و هتد:

ئەم مافەیش لە لایەنی شارەزایانی یاساو دەستوورەوە، بەم جۆرە پێناسە کراوە: **(عَدَمُ جوازِ مُصادَرَةٍ أو اختيارِ سريَةِ مراسلات الأفرادِ لِما يتَضمَّنُهُ ذلك من إعتداءٍ على مُلكيةِ خطاباتِ المُتضمَّنةِ في هذه المراسلات ولما في ذلك من انتهاكِ الحرية الفكرية)**[2] واتە: ڕێگا نەدان بە دەست بەسەرداگرتن و دزینی نهێنی نامەناردن لە نێوان تاکەکاندا، چونکە ئەمە دەبێتە مایەی دەستدرێژیی بۆ سەر خاوەنێتی ئەو نامەونووسین و قسانە، کە نامەکان دەیگرنە خۆیان ، ئەوەیش جۆرێکە لە شکاندن‌و پێشێلکردنی ئازادیی فیکریی.

ئەم مافەیش یەکێکە لەو مافانەی، کە ئیسلام دەستەبەریی کردوون بۆ هەمووتاکەکان، واتە: یەکێکە لەو مافە تاکیی و کەسییانەی، کە ئیسلام دەستەبەری کردوون بۆ تاکتاکی ئەندامانی کۆمەڵگاکەی ، ئەویش لەبەر دووهۆکار:

یەکەم : نامە قسە ، تەلەفۆن ، فاکس ، ئەوانە مولکی تایبەتی خاوەنەکانیان‌و دروست نیە بەبێ مۆڵەتی خۆیان دەستکاریی بکرێن، چونکە مولکی تایبەتی، هیچ کەسێك بۆی نیە بە بێ مۆڵەتی خاوەنەکەی، دەستکاریی بکات .

دووەم : ئەو نامە و تەلەفۆن و فاکس و ئەوانە، کە خاوەنەکەیان پێی ناخۆشە خەڵك

---

[1] مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ رواه البخاري (٦٩٠٢)، ومسلم (٢١٥٨). وَفِي لَفْظٍ لِأَحْمَدَ، وَالنَّسَائِيِّ، وَصَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّانَ: - فَلا دِيَةَ لَهُ وَلا قِصَاصَ.

[2] ) النظم السياسية، ص ٤٢٢.

پێیان بزانێ، بە ئەمانەت دادەنرێن و ، ئەمانەتیش دەبێت بپارێزرێ و نابێ بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەیان، دەستیان بگەیەنرێتێ.

پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ" لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەی هەیە، کە دەفەرموێ: {مَنِ اطَّلَعَ فِي كِتَابِ أَخِيهِ بِغَيْرِ أَمْرِهِ فَكَأَنَّمَا اطَّلَعَ فِي النَّارِ} (أَخْرَجَهُ الطبراني في مسند الشاميين وَحَسَّنَهُ السيوطي، قال الشيخ الألباني: (ضعيف جداً) انظر حديث رقم: ٥٤٤٤ في ضعيف الجامع )، واتە: هەرکەسێك تەماشای نامەی براکەی بکات بە بێ ئاگاداریی ئەو، وەك ئەوەیە تەماشای ئاگری کردبێ. دیارە لێرەدا مەبەست ئەوەیە مرۆڤ ،کە تەماشای ئاگر دەکات دەم وچاوی دەسووتێنێ، واتە: سزایەکی بۆ هەیە وەك ئەوە، کە دەموچاوی بسووتێ.

ئنجا ئەم پێنج مافەی کەلەسەرەوە باسمان کردن، کە بریتی بوون ( لە مافە کەسییەکان) دیسان بۆ هەموو هاوولاتییانی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دابین دەکرێن، بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوە، بە نێر و مێ وە، بە گەورە و بچووکەوە.

## جۆری سێیەم: مافە فیکرییەکان ( الحريات الفكرية ):

خوای زاناو توانا، بە عەقڵ و ئیرادەی ئازادەوە، مرۆڤی بەسەر دروستکراوەکانی دیکەدا هەڵبژاردوەو، کردوویەتی بە شایستەی ئەوە، کە ببێتە جێنشینی خواو ببێتە هەڵگری ئەمانەت و سپاردەی خوا (سبحانه وتعالى) ، بەڕای زۆربەی توێژەرەوان، وەك لە واقیعیش دا دیارە.

بۆیە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، ئازادییە فیکرییەکان نەك هەر دەستەبەر دەکرێن، بەڵکو بیرکردنەوەو بەکارهێنانی عەقڵ و دەربڕینی ئەوەی، کە مرۆڤ بەچاکی دەزانێ، پێش ئەوەی ماف بێ، ئەرکە، واتە مرۆڤ: لەسەری پێویستە عەقڵی بەکار بێنێ بۆ بیرکردنەوەو، دڵی بەکاربێنێ بۆ بڕواهێنان بە شتی ڕاست، زمانی بەکار بێنێ بۆ دەربڕینی شتی چاك ، ئا ئەوە نەك هەر حەقە، بەڵکو فەرزەو ئەرکیشە.

خوای بێ هاوەڵ لە سوورەتی (الملك) ئایەتەکانی: ژمارە (١٠ – ١١)دا کە باسی

دۆزەخییەكان دەكات، ئەوكافر و بێ بڕوایانەی، كە شایستەی ئەوە بوون بچنە دۆزەخەوە، چۆنیان باس دەكات ؟ دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَٱعْتَرَفُواْ بِذَنۢبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١١﴾﴾، بێ بڕوایەكان گوتیان: ئەگەر ئێمە بیستبامانو بیرمان كردبایەتەوە، نەدەبووینە هاوەڵی دۆزەخ، دانیان بە گوناهی خۆیان دا نا، خاوەنانی كڵپەی دۆزەخ، ب هەر دوور بن لە ڕەحمەتی خوا، كەواتە: بە كارنەهێنانی عەقڵو بەكارنەهێنانی بیستن و دیتن، وەك لەئایەتی دیكەدا هاتوە، تاوانێكە مرۆڤ لەسەری تووشی چوونە دۆزەخ دەبێ.

لە ئایەتی ( ١٧٩) ی سووڕەتی (الاعراف)دا خوا عز وجل دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾﴾ واتە: ئێمە زۆرێك لە جنۆكە و مرۆڤمان بۆدۆزەخ داناوە، (بۆچی خوا داناون بۆ دۆزەخ؟ یاسای خوا وایە ئەو كەسانەی لە جنۆكە و مرۆڤ، كە ئەو سیفەتانەیان تێدان بچنە دۆزەخ ، نەك خوا هەر لە ڕێوە بڕیاری دابێ، كە ئەوانە بچنە دۆزەخ). بۆچی خوای پەروەردگار بڕیاری داوە ئەو جنۆكە و مرۆڤانە بچنە دۆزەخ؟ هۆكارەكەی ڕوون دەكاتەوە: (لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ ) دڵیان هەیە، عەقڵیان هەیە بەڵام پێی تێناگەن، (وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا ) چاویان هەیە، بەڵام پێیان نابینن، (وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ) گوێیان هەیە بەڵام پێیان نابیستن، (أُو۟لَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ ) ئا ئەوانە وەك ئاژەڵان وان (بَلْ هُمْ أَضَلُّ ) بەڵكو لە ئاژەڵ خراپترن، چونكە ئاژەڵ ناتوانێ ئاژەڵ نەبێ، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ ئاژەڵ نەبێ، بۆیە مرۆڤ كاتێك وەك ئاژەڵ دەبێو عەقڵو هەستەوەرەكانی بەكار ناهێنێ، دەچێتە پلەی نزمتر لە ئاژەڵ، لەبەر ئەوەی مرۆڤێك، كە دەتوانێ ئاژەڵ نەبێ و خۆی بكاتە ئاژەڵ، لە ئاژەڵ خراپترە، بۆیە دەفەرموێ: (أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ) ئا ئەوانە لەبێ ئاگایانن ، كەواتە : بەهەشت بۆ كێ دانراوە ؟ بۆ هۆشیاران، بۆ بێداران ، بۆ

عـاقڵمەندان، ئەدی دۆزەخ بۆ کێ دانراوە؟ بۆ ئەوانەی کە عـەقڵ و هۆشیان بەکار ناهێنن و، هەستەوەرەکانیان بەکار ناهێنن .

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ، کە ئازادییە فیکرییەکان لە ئیسلام دا، نەك هـەر مـافن، بەڵکو ئەرکیشن،کەسێك کە عـەقڵی خۆی بەکار نـاهێنێ و هەسـتەوەرەکانی خـۆی بـەکار ناهێنێ، لەسەری تووشی سزاو چوونە دۆزەخ دەبـێ، کـە ئـەوەیش یـەکێکی دیکەیـە لـە ئیمتیـاز و تایبەتمەندییـەکانی ئیسـلام و شـەریعەتی ئیسـلامیی، لـە بـواری مـاف و ئازادییەکان دا، کە لە جاڕنامـەی گـەردوونیی مافـەکانی مرۆڤـــ دا، هـەروەك مـاف باسیان دەکات، بەڵام ئیسلام زۆربەی مافەکان بە ئەرکیش دادەنێ.

ئنجا ئازادییە فیکرییەکان بە شێوەیەکی گشتی دەبنەوە بە چوار جۆر:

١-ئازادیی بڕواهێنان و هەڵبژاردنی ئایین .

٤٨- ئازادیی فێربوون و فێرکردن .

٣-ئازادیی دەربڕین و خستنەڕووی بیروڕا .

٤- ئازادیی کۆبوونەوە.

## ا) ئازادیی بڕواهێنان و هەڵبژاردنی ئایین ( بەرنامەی ژیان ):

مـەبەستمان لە ئایین ،بەرنامـەی ژیانە ، چ ئەوەی کە خوای کاربـەجێ ناردوویـەتی لـە ڕێی پێغەمبەرانەوە، کە هەموو بەرنامە ئاسمانییەکانن و، لە ئـەسڵدا هەموویان ڕاسـت بوون ، بەڵام بە هۆی دەستکاریی مرۆڤـــەوە، شێوێنراون و هەڵـەو پەڵـەیان تێکـەوتوە، جگە لە یەکێکیان، کە لە دەسـتکاریی کـران پـارێزراوە، ئـەویش ئیسـلامە ، ئیسـلامی بەرجەستە لـە قورئـان و سـوننەتی پێغەمبـەری خـوادا (صلى الله عَلَيهِ وَسَلَم)، چ ئـەو بەرنامانەی کە لە ئەسڵدا مرۆڤـــ داینـابن، واتـە: سـەرجەم ئـەو بەرنامانـەی زادەی بیروهۆشی مرۆڤـــن.

شارەزایانی ئەو بوارەش بەم شێوەیە پێناسەی ئەم جـۆرە ئازادییـەیان کـردوە: (حُريـةُ الشخصِ في أن يعتنقَ الدينَ او المبدأ الذي يريدهُ وَ حُريَّتُه في أن يمارسَ شعائر ذلـك الـدين سواء في خفاء، أو علانيةً وحريتُهُ في أن لا يعتقد بأي دينٍ وحريّتهُ فـى أن لا يفـرضَ عليـهِ دينٌ مُعيَّنٌ، أو أن يُجبَرَ على مباشـرةِ المظـاهر الخارجيـةِ او الإشـتراك في الطقـوس المختلفـة

لدينٍ وحريتُـهُ في تَغـيّرِ دينـهِ، كـل ذلـك في حـدودِ النظـام العـام وضـمنِ الآداب)[1] واتـە: ئازادیی بڕواهێنان و هەڵبژاردنی ئایین مەبەست پێی ئازادیی تاکەکانە، لەوەدا کە بڕوا بەو دینە یان ئەو مەبدەئە بێنن، کەخۆیان دەیانەوێ، هـەر کامیـان ئـازاد بـێ لـەوەدا کـە دروشمەکانی ئەو دینە بەرکابێنێ، چ بە ئاشکرا، چ بە پـەنهان ، ئـازاد بـێ لـەوەدا، کـە بڕوای بە هیچ دینێك و بەرنامەیەك نەبێ، ئازاد بێ لەوەدا کە هیچ دینێکی دیاریی کراوی لەسەر پێویست نەکرێ و، تۆبزیی لێ نەکرێ بۆ بەشداری کردن لە ڕواڵەتە دەرەکییەکانیو دروشمە جۆراوجۆرەکانیدا، ئازاد بێ لەوەدا، کە ئایین و دینی خۆی بگۆڕێ، هەموو ئەوانـە لە سنووری سیستەمی گشتیی و سنووری ئەدەبە گشتییەکان دا.

ئێمە لەسەرەتاوە دەڵێین: لە شەریعەتی ئیسلامدا، ئـازادیی بڕواهێنـان و هەڵبـژاردنی ئایین (**حريةُ العقيدة واختيارُ الدين**) بە چاکترین شێوە بۆ هـەمووتاکێك دەسـتەبەرکراوە، لە ڕاستیدا بە بێ هەبوونی ئەو مافەو، بـە بـێ هـەبوونی ئـەو ئازادییـە، مرۆڤـــــ لـە مرۆڤـــ دەشۆرێ و ئەو حیکمەت و ئامانجەی، کـە بـۆی دروسـتکراوە، کـە بریتیـە لـە جێنشینایەتیی کردنی خوا لەسەر زەوی و، هـەڵگرتنی سـپاردەی خـواو، تاقیکرانـەوەی، بـەبێ هـەبوونی ئـەو ئازادییـە، هـەموو ئەوانـە لەبـەین دەچـنو ئـەو حیکمەتـەی، کـە مرۆڤـــی بۆ دروستکراوە نایەتە دی، چـونکە مرۆڤـــ چـۆن تـاقی بکرێتـەوە، لـــە حاڵێکدا، کە لەسەری فەڕزکراوە هەر ئاوا بیر بکاتـەوەو دەبـێ حەتمـەن بـڕوای بـــەفلاّن جۆرەبێ؟ بگرە ئەوە هەر پێچەوانەی واقیعیشە ، چونکە ئەو کەسـە، کـە لەسـەری فـەڕز دەکرێ، کە دەبێ عەقیدەی وابێ، بێ ئەوەی کە خۆی بیەوێ، لە ڕاستیدا ئەو عەقیدەیە لە دڵیدا ناچەسپێ، بۆنموونە: کەسێك بیەوێ ئیسلام لەسەر کەسێکی دیکە فەڕز بکـات، کـە دەبێ مسوڵمان بێ بەزۆر، ئەوە لـە ڕاسـتیدا نایکاتـە مسـوڵمان ، بـەڵکو لـە کـوفرێکی ئاشکراوە دەیگوازێتەوە بۆ کوفرێکی پەنهان ، لە حاڵەتی کافرییەوە دەیگۆڕێ بۆ حاڵـەتی مونافیقیی، کە بێگومان حاڵەتی نیفاق خراپترە لە حاڵەتی کوفری ئاشکرا.

کەواتە: ئازادیی هەڵبژاردنی ئایین و بەرنامەو تۆبزیی نەکردن لە مرۆڤـــ، لە بواری

---

[1] ) النظم السياسية، ص ٤٢٢- ٤٢٣.

دیندارییدا و پابەندیی بە بەرنامەیەكی دیاریی كراوەوە، بە چاكترین شێوە لە ئیسلام دا دەستەبەر كراوە، چونكە بەبێ ئەوە، مرۆڤ ناتوانێ جێنشینی خوا بێ، بەبێ ئەوە مرۆڤ ناتوانێ هەڵگری سپاردەی خوابێ، ناگونجێ تاقی بكرێتەوە، ئەوە وەك بناغە فیكریی یەكەی، ئنجا دیارە ئەم بابەتە بابەتێكی گرنگە، بۆیە دەمانەوێ لە داهاتوودا بە وردی لە دوو بڕگەدا باسی بكەین:

## بڕگەی یەكەم: ئازادیی مرۆڤ لە بڕواهێنان و هەڵبژاردنی ئاییندا

دیارە مەبەستمان لە بڕواهێنان، بڕواهێنانە بە هەر شتێك كە ئینسان وەك عەقیدە هەڵیدەبژێرێ، مەبەستیشمان لە ئایین، هەر بەرنامەیەكە، كە ئینسان بۆ ژیانو گوزەرانی تاكییو خێزانییو كۆمەڵایەتییو سیاسیی خۆی پەسەندی دەكات، واتە مەبەستمان لە بڕواهێنان، تەنیا بڕواهێنان نیە بەوە، كە لە ئیسلام دا دەبێ بڕوای پێ بهێنرێ، واتە: تەنیا مەبەستمان عەقیدەی ئیسلامیی نیە، مەبەستیشمان لە ئایین، تەنیا ئایینو بەرنامەو ڕێبازی خوای پەروەردگار نیە، كە ئیسلامە، بەڵكو مەبەستمان گشتییە، ئینسان هەر عەقیدەیەك هەڵبژێرێ، هەر بەرنامەیەك هەڵبژێرێ، ئازادە، با سەرنجی چەند ئایەتێكی قورئان بدەین، كە خوا (سبحانە وتعالى) لە قورئانی بەهێزو پیرۆزی خۆیدا زۆر بەڕوونو ڕاشكاویی ڕایگەیاندوە، كە مرۆڤی ئازاد كردوە لە هەڵبژاردنی هەر جۆرە ئیمانو عەقیدەیەك و لە هەڵبژاردنی هەر جۆرە بەرنامەو ڕێبازێكدا، كە پەسەندی دەكات، بۆ وێنە:

یەكەم: لە ئایەتی ژمارە (٢٩)ی سوورەتی (الكهف)دا خوا (سبحانة وتعالى) دەفەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ ...﴿٢٩﴾ ﴾،

دیارە ڕووی دواندنی لە پێغەمبەری كۆتایی (موحەممەد)ە "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ" واتە: بڵێ حەق لە پەروەردگارتانەوەیە، جا كێ حەزدەكا، با بڕوا بێنێ، كێش حەزدەكا، با بڕوا نەهێنێ، كەواتە: خوا (سبحانە وتعالى) مرۆڤی سەرپشك كردوە لە نێوان بڕواهێنانو

بڕوانەهێناندا، لە نێوان بوون بە بڕوادار (**مـؤمن**) بـە زاراوە ئیسـلامییەكەی‌و، بـوون بـە بێبڕوا (كافر)دا.

دوووەم: لە ئایەتی ژمارە (٢٥٦)ی (البقرة)دا خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرمـوێ: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ ...﴿٢٥٦﴾ ﴾، واتە: ناچاریی كردن‌و زۆرلێكردن لە ئاییندا نیە، ڕێی ڕاست‌و ڕێی چەوت لێك جیابوونەتەوە، واتە: لە سۆنگەی ئـەوەوە كـە ڕێی ڕاست دیارەو ڕێی چەوت دیارە، لەبەر ئەوە پێویست ناكات هیچ كەس ناچـار بكـرێ، كە ڕێی ڕاست بگرێ، ڕێی ڕاست، كە لە ئیسلامی بەرجەستە لە قورئان‌و سـوننەتدا خـۆی دەنوێنێ‌و، ڕێی چەوتیش بریتیە لە غـەیری ئیسلام.

سـێیەم: لـە ئایـەتی ژمـارە (٩٩)ی سـوڕەتی (یـونس)دا خـوا (سـبحانه وتعالـى) دەفـــەرمویت: ﴿ وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٩٩﴾ ﴾، واتە: ئەگەر پـەروەردگارت ویسـتبای، هەرچـی لەسـەر زەوییە تێكڕا بڕوایان دێنا، جا ئایا تۆ زۆر لە خەڵك دەكەی، تاكو بیانكەیە بڕوادار!! واتە: خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی مرۆڤـــەكانە، بە م نەیویستوە بەزۆر ئیمانیان پـێ بێنێ، ئایا تۆ (ئەی موحەممەد "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" كـــە ڕەوانەكـــراوو پێغەمبـەری خوای،تۆش بەندەیەكی خوای) دەتەوێ بەزۆر بیانكەی بە بڕوادار، لـە حاڵێكـدا، كـە خـوا خاوەن‌و پەروەردگاریانەو زۆری لێنەكردوون؟! واتە: بۆت نیە.

چوارەم: لە ئایەتی ژمارە (١٢٥)ی (النحل)دا خوا (سبحانه وتعالى) دەفـەرمـوێ: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ... ﴿١٢٥﴾ ﴾، واتە: بە حیكمەت، بانگـەواز بكـە بـۆ لای ڕێبـازی پـەروەردگارت (واتـە: بـە لێزانیی‌و بە كارامـەیی)و بە ئامۆژگاریی چاك‌و بە چاكترین شێوە وتووێژیان لەگەڵدا بكـە، كەواتە: خەڵك هێنان بەرەو خواو بەرەو ڕێبازی خـوا، تاكـە شـێوازو ڕێبـازی بریتیـە لـە بانگەوازكردنیان بە حیكمەت‌و بە ئامۆژگاریی چاك‌و بە چاكترین شێوازی وتووێژ.

پێنجەم: لەسووڕەتی (الكافرون)دا، خوا (سبحانه وتعالـى) دیسان پێغەمبـەری كۆتـایی

خۆی (موحەممەد) (عليه الصلاة والسلام) دەدوێنیو دەفەرموێ: بسم اللهالرحمن الرحيم ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ (١) لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ (٢) وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ (٣) وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ (٤) وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ (٥) لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ (٦) ﴾، واتە: بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، بڵێ ئەی بێ بڕوایەکان! ئەوەی ئێوە دەیپەرستن، من نایپەرستم، ئەوەی منیش دەیپەرستم، ئێوە نایپەرستن، ئەوەی ئێوە پەرستووتانە من نەمپەرستوە، ئەوەی منیش پەرستوومە، ئێوە نەتانپەرستوە، بەرنامەی خۆتان بۆ خۆتانو، بەرنامەی خۆشم بۆ خۆم.

کەواتە: ئیسلام زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی کەسانێك، کە بە بێ بڕواو کافریان لەقەڵەم دەدا، مافی ئەوەی پێداون، کە ئایینی خۆیان بۆ خۆیان بێ، بەرنامەی خۆیان، کە هەڵیدەبژێرن، هی خۆیان بێ، زۆریان لێنەکرێ لە گۆڕینی ئەو ئایینو بەرنامەیەدا، کە هەڵیانبژاردوە.

شەشەم: هەر لە سوورەتی (یونس) لە ئایەتی ژمارە (١٠٨)دا، خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ (١٠٨) ﴾ واتە: بڵێ: ئەی خەڵکینە! لە پەروەردگارتانەوە حەقتان بۆ هاتوە، جا هەرکەسێك ڕێی ڕاست بگرێ، بۆ خۆی ڕێی ڕاستی گرتوەو قازانجەکەی بۆ خۆیەتی، هەرکەسێ گومڕا بێ، ئەوە بۆ خۆی گومڕابووەو زەرەری گومڕابوونەکەی بۆ خۆیەتی و من بەسەر ئێوەوە، وەکیلو چاودێر نیم (تاکو نەهێڵم لا بدەن و بە زۆر ڕووتان پێ وەرسووڕێنم بەرەو ڕاستە شەقامی خوا، بەڵکو خوا سەرپشکی کردوون، منیش بۆم نیە ئەو مافی سەرپشك بوونەتان لێ زەوت بکەم).

حەوتەم: لە بڕگەی (٢٥)ی (الصحيفة)دا، واتە ئەو (وثيقة)یەی کە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) پاش نیشتەجێبوونی لە مەدینەو دامەزراندنی دەوڵەتو قەوارەی ئیسلامییدا، لە نێوانی خۆیو مسوڵمانان لە لایەكو جوولەکەکاندا لە لایەکی دیکەو هاوبەشدانەرەکان لە لایەکی دیکەوە، نووسی، لە بڕگەی (٢٥)دا هاتوە: " **لليهود دينهم**

**وللمسلمين دينهم مواليهم وأنفسهم**"، واتە: جوولەكەكان دینی خۆیان بۆخۆیان مسوڵمانانیش دینی خۆیان بۆخۆیان، هەم ئەوانەی كە پێیانەوە پەیوەستنو لایەنگرایانن، هەم خۆشیان، كەواتە: لەم ئایەتانەداو لەو دەقەی (**الصحيفة**)دا كە لەجێی دەستوور بووە، زۆر بە ڕوونو ڕاشكاویی ڕاگەیەنراوە، كە لە دەوڵەتی ئیسلامییداو لە شەریعەتی ئیسلامدا، دان هێنراوە بەوەدا، كە ئینسانەكان ئازادن لە بڕوا هێنانو لە هەڵبژاردنی ئەو ئایینو بەرنامەیەدا كە خۆیان پەسەندی دەكەن.

## بڕگەی دووەم: ئازادیی مرۆڤ لە وازلێهێنان و گۆڕینی ئاییندا

ئەمەیان زانایان لە كۆنو هاوچەرخ، لە پێشینو پاشین، مشتومڕو وتووێژی زۆریان لەسەری هەیە، واتە: ئایا مرۆڤی مسوڵمان پاش ئەوەی ئیعلانی مسوڵمانەتیی خۆی دەكا، بۆی هەیە بەهەر هۆیەكەوە بێ، واز لە ئیسلام بێنێو ئایینو فیكرەیەكی دیكە هەڵبژێرێ؟ دیارە زۆربەی هەرە زۆری زانایان ڕایان وابووە، كە مسوڵمان بۆی نیە لە ئیسلام هەڵگەڕێتەوە، هەر كاتێكیش لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە، سزای هەڵگەڕانەوە (عقوبة الإرتداد)ی بەسەردا دەچەسپێنرێ، كە بریتیە لە كوشتن، ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" بە بەڵگە دێننەوە، كە دەفەرموێ: {«**مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ**»} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٥٥٢)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٨٥٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٣٥١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٥٨) وَقَالَ: صَحِيح حَسَن، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٠٥٩)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٤٧٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٥٣٥))، واتە: هەركەسێك ئایینی خۆی گۆڕی بیكوژن.

بەم هەندێك لە زانایان هەم لە پێشینو هەم لە هی هاوچەرخیش، بەڵكو زۆرێك لە زانایانی هاوچەرخ، پێیان وایە، كە تەنیا بە لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە مرۆڤ ناكوژرێ، واتە: تەنیا مرۆڤ بەهۆی ئەوەوە، كە لە ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوەو وازی لێهێناوە، ناكوژرێ، چونكە ئەوە پێچەوانەی ئازادیی بڕواپێهێنانو دینداریییە، وەك لە بڕگەی پێشوودا خستمانەڕوو، چەندان ئایەتمان لەسەر هێنانەوە، جا ئێمە سەرەتا بەڵگەكانی ئەوانە كە زۆربەی زانایان بوون لە ڕابردووداو زۆرێك لە زانایانیشن لە ئێستادا، بەڵگەكانی ئەوان دێنینەوە، كە دەڵێن: ئینسان دوای ئەوەی ئیعلانی مسوڵمانەتی خۆی

دەکا، بۆی نیە لە ئیسلام هەڵگەڕێتەوە، هەر کاتێکیش هەڵگەڕایەوە، هەڵگەڕانەوەکەی بە تاوانێك دادەنرێ، کە لەسەری دووچاری سزای کوشتن دەبێتەوە، سەرەتا بەڵگەکانی ئەوان دێنینەوە، پاشان بەڵگەکانی ئەوانەی، کە ڕایان پێچەوانەیەو دەڵێن: نەخێر، تەنیا بە لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، ئینسان شایستەی ئەوە نابێ بکوژرێ، وەڵامی ئەوانیش بۆ بەڵگەکانی ئەمان دەخەینەڕوو:

## یەکەم: بەڵگەی ئەوانەی کە ڕایان وایە سزای هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام کوشتنە:

ئەوانە چەند شتێك بە بەڵگە دێننەوە:

یەکەم: ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەرە "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" کە دەفەرموێ: {«**مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ**»}، واتە: هەرکەسێك ئایینەکەی خۆی گۆڕی بیکوژن، کە هەر کام لە بوخاریی‌و نەسائیی‌و ئەبوداوودو ترمیزیی‌و ئیبن ماجەو ئەحمەد گێڕاویانەتەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ).

دووەم: بەڵگەیەکی دیکەیان فەرمایشتێکی دیکەی پێغەمبەرە "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" کە دەفەرموێ: {**لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ" يَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ، إِلا بِإِحْدَى ثَلاَثٍ: اَلثَّيِّبُ اَلزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ" اَلْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ**}(أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٦٢١)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٤٨٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٦٧٦)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٣٥٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٠٢)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٠١٦)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٥٣٤))، واتە: خوێنی هیچ ئینسانێکی مسوڵمان بە یەکێك لە سێ شتان نەبێ حەڵاڵ نابێ، (واتە: دروست نیە بکوژرێ، مەگەر یەکێك لەو سێیانە بکات)، (**اَلثَّيِّبُ اَلزَّانِي**) کەسێك هاوسەری هەبووبێت‌و زینای کردبێ، (وشەی –ثیب- لە عەرەبییدا بێوەژن‌و بێوە پیاو دەگرێتەوە) (**وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ**) کەسێك کەسێکی بە ئانقەست و بەناحەق کوشتبێ (**وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ" اَلْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ**) وازهێنەر لە ئاینەکەی‌و جیابووەوە لە کۆمەڵی مسڵمانان.

سێیەم: بەڵگەیەکی دیکەیان فەرمایشتێکی دیکەی پێغەمبەرە "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" کە بەم شێوەیەیە: {**عَنْ أَبِي مُوسَى** رَضِيَ اللهُ عَنْهُ **أَنَّ النَّبِيَّ** "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" **قَالَ لَهُ اذْهَب إِلَى الْيَمَنِ ثُمَّ أَتْبَعَهُ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ فَلَمَّا قَدِمَ عَلَيْهِ أَلْقَى لَهُ وِسَادَةً وَقَالَ: انْزِلْ**

**فَإِذَا عِنْدَهُ رَجُلٌ مُوثَقٌ قَالَ: مَا هَذَا؟ قَالَ هَذَا كَانَ يَهُودِيّاً فَأَسْلَمَ ثُمَّ رَاجَعَ دِينَهُ دِينَ السَّوْءِ فَتَهَوَّدَ. فَقَالَ: لاَ أَجْلِسُ حَتَّى يُقْتَلَ قَضَاءُ اللهِ وَرَسُولِهِ "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ثَلاَثَ مَرَّاتٍ قَالَ: فَأَمَرَ بِهِ فَقُتِلَ}** (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٥٢٥)) واتە: لە ئەبوو مووسای ئەشعەریی ڕەزای خوای لێبێ- گێڕراوەتەوە، کە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" پێی فەرمووە بڕۆ بۆ یەمەن، پاش ئەوەی کە ئەبو مووسا بەڕێکەوت، بە دوای ئەودا موعازی کوڕی جەبەلیشی نارد -خوا لێی ڕازی بێ-، جا دوای ئەوەی کە موعازی کوڕی جەبەل چوو بۆ لای ئەبو مووسا، ئەبوو مووسا دۆشەکەڵەیەك بەڕەیەکی پێدا، کە لەسەری دابنیشێ (وەك ڕێزلێگرتن)، گوتی: دابەزە، موعاز سەرنجیدا پیاوێك بەسترابۆوە (کەلەبچە کرابوو) لەلای ئەبو موسا، گوتی: ئەوە چییە؟! گوتی: ئەوە جوولەکەیەکە مسوڵمان بوو، دوایی بۆتەوە بە جوولەکە، موعاز گوتی دانانیشم، هەتاکو نەکوژرێ، ئەوە بڕیاری خواو پێغەمبەرەکەیەتی، سێ جاران ئەم قسەی دووبارە کردەوە، ئنجا فەرمانی کردو کوشتیان.

بەڵێ ئەوان ئەم سێ فەرموودەیە بە بەڵگە دەهێننەوە، لەسەر ئەوە، کە سزای لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، بریتییە لە کوشتن، یانی: ئینسان دوای ئەوەی دێتە نێو ئیسلامەوە، بۆی نیە لێی هەڵبگەڕێتەوەو، هەر کاتێك هەڵگەڕایەوە دووچاری سزای کوشتن دەبێتەوە.

**دووەم: بەڵگەکانی ئەوانە، کە ڕایان وایە تەنیا بە لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە مرۆڤ ناکوژرێ:**

ئێستاش دێینە سەر باسی بەڵگەکانی ئەوانەی، کە پێیان وایە تەنیا بە لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە مرۆڤ ناکوژرێ، واتە: واز لە ئیسلام هێنان پاش بڕوا پێهێنانی، تاوانێك نیە کە سزای کوشتنی لەسەربێ، تاوانە، بەڵام سزایەکەی دنیایی نیە، کە بریتی بێ لە کوشتن، بەڵکو سزاکەی قیامەتییە، جا دیارە من خۆم ئەم ڕای دووەمەم پێ پەسەندەو بەهێزە، پاش توێژینەوەو لێکۆڵینەوەو تێوەڕامانی زۆر لە ئایەتەکانی خوای پەروەردگارو لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"و لە قسەی زانایان، ئەم بەڵگانەم کەوتوونە بەرچاو، کە پشتگیریی ئەو ڕایە دەکەن کە دەڵێ: تەنیا بەوە کە ئینسان لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە، سزای کوشتن ڕوی تێناکات، بەڵگەکانیش سێ بەڵگەی سەرەکیین:

**بەڵگەی یەکەم:** هەبوونی چەندان ئایەت لەوبارەوە، کە خوا (سبحانە وتعالی) بەندەکانی خۆی ئازادو سەرپشك کردوە لەنێوان ئیمانو کوفر، یان سوپاسگوزاریی‌و سپڵەییدا،بەڵێ چەندان ئایەتمان هەن، کە خوا (سبحانە وتعالی) مرۆڤەکانی ئازاد کردوەو سەرپشکی کردوونو مافی هەڵبژاردنی پێداون، کافر دەبن، یاخود مسوڵمان دەبن، هەڵبەتە خوا (سبحانە و تعالی) ڕایگەیاندوە، کە ئیمانی پێخۆشەو ڕقی لە کوفرە، سوپاسگوزاریی پێخۆشەو ڕقی لە سپڵەییە، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنكُمْ ۖ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ ...﴿٧﴾ ﴾ الزمر، واتە: خوا کوفر بۆ بەندەکانی پەسەند ناکا، (یانی: پێی خۆش نیەو رازی نیە)، بەڵام ئەگەر سوپاسگوزار بن (ئیمان بێنن)، لێتانی پەسند دەکات، بەڵام ئەوە مەسەلەیەکەو، سەرپشککرانی مرۆڤ لەلایەن خواوە بە مەبەستی ئەوە، کە تاقی بکاتەوە، مەسەلەیەکی دیکەیە، واتە کە دەڵێین: خوا (سبحانە وتعالی) مرۆڤەکانی سەرپشك کردوە، ئیمان بێنن یان نەهێنن، مانای وا نیە کە خوا جیاوازیی نەختستۆتە نێوان ئیمانو کوفرەوە! نەخێر، بەڵکو خوا فەرمانی بە ئیمان کردوەو ڕایگەیاندوە، کە ئیمانی خۆش دەوێو ئیماندارانی خۆش دەوێ و، ڕقی لە کوفرەو ڕقی لە کافرانە، بەڵام بە مەبەستی تاقیکردنەوە، مرۆڤەکانی ئازاد کردوەو سەرپشکی کردوون، لە نێوان ئیمانو کوفرداو زۆری لێنەکردوون، ئەو ئیمانە بێنن، کە لەلای پەسەندو خۆشەویستە و، واز لەو کوفرە بێنن، کە لەلای بوغزێنراوو ناپەسەندە، با سەرنجی ئەم چەند ئایەتە بدەین:

١- ئایەتی ژمارە (٢٩) سوورەتی (الکهف) کە پێشتریش هێنامانو دەفەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ...﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: بڵێ: حەق لە پەروەردگارتانەوەیە، جا کێ حەزدەکا با ئیمان بێنێ، کێ حەزدەکا با ئیمان نەهێنێ، واتە: با بێبڕوا بێ، یانی: وەنەبێ خوا (سبحانە و تعالی) ئیمانو کوفری پێ وەك یەك بن، بەڵام بەندەکانی ئازاد کردوونو ناچاریی نەکردوون، کە ئیمان بێنن.

٢- ئایەتی ژمارە (٩٩)ی سوورەتی (یونس) کە ئەویش پێشتر هێنامانو دەفەرموێ:

﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾﴾ واتە: ئەگەر پەروەردگارت ویستبای، تێکڕای ئەوانەی لەسەر زەویین، ئیمانیان دەهێنا، جا ئایا تۆ زۆریان لێدەکەی‌و ناچاریان دەکەی تاکو بیانکەیتە بڕوادار؟! واتە خوا ناچاری نەکردوون‌و زۆری لێنەکردوون، کە بەدیهێنەرو پەروەردگارو ڕۆزیدەرو ژیێنەرو مرێنەریانە، ئایا تۆ زۆریان لێ دەکەی؟ کە بەندەیەکی وەك ئەوانی؟ دیارە بۆت نیە.

٣- لە سوورەتی (الإنسان) لە ئایەتەکانی (٢و٣)دا، خوا (سبحانه و تعالى) دەفەرموێ: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾﴾ الإنسان، واتە: ئێمە مرۆڤمان لە نوتفەیەکی ئاوێتە دروست کردوە، تاقی دەکەینەوە، گێڕاومانە بە بیسەرو بینەر، ئێمە ڕێمان پیشان داوە، یان سوپاسگوزار دەبێ، یاخود سپڵە دەبێ، واتە: سەرپشکمان کردوە لە هەڵبژاردنی سوپاسگوزاریی‌و سپڵەییدا.

٤- ئایەتی (٢٥٦)ی سوورەتی (البقرة) کە تێیدا دەفەرموێ: ﴿لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ... ﴿٢٥٦﴾﴾، واتە: تۆپزیی کردن لە ئاییندا نیە ، واتە لە وەرگرتنی ئاییندا تۆپزیی کردن‌و ناچارکردن نیە.

دیارە ئەم ئایەتانە زۆر ڕوون‌و ڕاشکاون، لەوبارەوە کە خوا (سبحانه وتعالى) بە تەواویی مرۆڤی ئازادو سەرپشك کردوە، لەنێوان هەڵبژاردنی ئیمان‌و سوپاسگوزاریی یان کوفرو سپڵەییداو، هیچ مەرج‌و بەند (شرط وقید)ێکیشی نەخستۆتە سەر، کە مەبەست تەنیا پێش بڕواهێنان‌و ئیعلانی مسوڵمانەتییە، واتە ئەو ئازادکردنەی ئینسان لەنێوان ئەوەدا، کە ئیمان بێنێ یا نەهێنێ، هیچ قەیدو بەندێك لەسەر ئایەتەکان نیە، کە تەنیا مەبەست ئەو کاتەیە پێش ئەوەی ئیعلانی مسوڵمانەتیی بکا، ئازادە، بەڵام دوای ئەوەی ئیعلانی مسوڵمانەتیی کرد، ئەو ئازادییەی لێبسەنرێتەوە، بەڵکو پێش ئیعلانی مسوڵمانەتیی‌و دوای ئیعلانی مسوڵمانەتییش، ئایەتەکان موتڵەقن‌و بە ڕەهایی هاتوون‌و

هیچ بەندو مەرج (شرط و قید)ێکیان لەسەر نیەو، هیچ کەسێ بۆی نیە بڵێ: مەبەست ئەوەیە کە هەتا دێتە نێو ئیسلامەوە ئازادە، بەڵام کە هاتە نێو ئیسلامەوە ئازادییەکەی لێدەسەنرێتەوەو، لەمەودوا بەناچاریی دەبێ هەر مسوڵمان بێ!!

لە ڕاستییدا هیچ کام لە ئایەتەکان ئەو واتایە ناگەیەنن، ئنجا بێگومان کوژران لەسەر هەڵگەڕانەوە لە ئایین، لەگەڵ ئەو ئازادییەو ئەو سەرپشکرانەدا دژ دەوەستێ، واتە: کەسێك پاش ئەوەی کە مسوڵمان بوو، قەناعەتی گۆڕا، ئەوە بە پێی ئایەتەکان سەرپشکە، کافر دەبێ یاخود لەسەر ئیسلام دەمێنێتەوە، ئنجا ئەگەر تۆ سزای بدەیو بڵێی ئەگەربێتو ئیعلانی ئەو قەناعەتەی خۆت بکەی (لە حاڵێکدا کە دڵی گۆڕاوەو بڕوای بە ئیسلام نەماوە) ئەوە تۆ دووچاری کوشتن دەبیتەوە! مانای وایە پێچەوانەی ئایەتی خوا هاتەدی، کە بریتیە لە ناچارکردنو زۆرلێکردن **(الإكراه والإجبار)** لەحاڵێکدا، کە خوا هەردووکیانی قەدەغەکردوەو فەرموویەتی: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ...(٢٥٦) ﴾ البقرة، وە فەرموویەتی: ﴿ ... وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِجَبَّارٖۖ ...(٤٥) ﴾ ق، بەڵام تۆ زۆری لێدەکەیو دەڵێی دەبێ بە ناچاریی هەرچەندە بڕواشت بە ئیسلام نەماوەو مسوڵمانیش نەماوی، بەڵام هەر دەبێ خۆت بە مسوڵمان پیشان بدەی، کە دیارە لەو حاڵەتەدا ئەو ئینسانە، ئەوە هیچ کە مسوڵمانو بڕوادار نەماوە، چونکە کوفر هاتۆتە نێو دڵو دەروونو قەناعەتییەوە، بەڵام تۆ ناچاری دەکەی، کە هەرخۆی بە مسوڵمان پیشان بدات، واتە: ببێتە مونافیق، واتە: وەنەبێ بەو زۆریی لێکردنە، تۆ لەنێو ئیسلامدا بیهێڵییەوە، تازە لە بازنەی ئیمان چووەتە دەرێو بۆتە مسوڵمانێکی ڕووکەشییو ڕواڵەتیی، بۆتە دەغەڵو مونافیق لە ئەنجامی ئەو ناچارکردنەی تۆدا، واتە جەبر لێکردنو ناچارکردنەکە نایگێڕێتەوە بۆ ئیسلام، بەڵکو دەیکا بە شتێك لە کافر خراپتر، کە بریتیە لە مونافیق.

ئەوە بەڵگەی یەکەمی ئەوانەی کە پێیانوایە تەنیا بە لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، ئینسان سزای کوشتنی بەسەردا ناچەسپێ، بۆیەش هەموو جارێ دەڵێین: تەنیا بە لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، مرۆڤ بە کوشتن سزا نادرێ، چونکە وێڕای هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، دەبێ شتێکی دیکەشی بێتە پاڵ، ئەوجار موستەحەقی سزای کوشتن دەبێ، وەك دوایی باسی دەکەین.

**بەڵگـــەی دووەم:** ئەوەیە کە لە ئایەتەکانی قورئاندا، تەنیا باسی سزای ڕۆژی دوایـی کراوە، بۆ تاوانی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە و باسی سزای دنیایی نەکراوە، با تەماشای ئـەم ئایەتانە بکەین کە هەموویان ئایەتی مـەدەنیین، هەڵبەتـە لـە ئایەتـە مەککییەکانیشـدا باسی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام کراوە، بەڵام من تـەنیا ئایەتـە مەدەنییـەکانم هێناوەتـەوە، چونکە یەکێك بۆی هەیە بڵێ: جا خۆ سزای هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام لە قۆناغی مەدینـەدا فەرز کراوە !

١- لـە سـوورەتی (البقـرة) ئایـەتی (٢١٧)دا، خـوا (سـبحانه وتعـالى) دەفـەرموێ: ﴿...وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾﴾، واتە: هەرکەسێك لە ئێوە لە ئاینـەکەی هەڵگەڕێتەوەو، بـە کافریی بمرێ، ئەوە کردەوەکانیان لـە دنیـاو دوا ڕۆژدا هەڵوەشـــاونەوە و، ئەوانـە هاوەڵی ئاگرن، بە هەمیشەیی لـەنێو دۆزەخـدا دەمێننـەوە، وەك دەبیـنین: تـەنیا باسی سزای قیامەت کراوە.

٢- هەروەها لە سوورەتی (محمـد) ئایەتی (٢٥)دا دەفەرمـــوێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ۙ ٱلشَّيْطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٥﴾﴾، واتە: بێگومـان ئەوانەی پاشەوپاش هەڵگەڕانەوە، دوای ئەوەی هیدایـەتیان بۆ ڕۆشن بوو بۆوە، ئەوانە شەیتان ئەو هەڵگەڕانەوەی بۆ جوانکردوون و، ڕستەی بۆ درێژکردوون و هانی داون.

٣- لە ئایەتەکانی (٨٦ و٨٧ و٨٨)ی سوورەتی (آل عـمران)دا، خـوا (سـبحانة وتعـالى) لەوبارەوە دەفـەرموێ: ﴿كَيْفَ يَهْدِى ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓاْ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾﴾، واتە: خـوا چـۆن ڕێنمایی کۆمـەڵێك دەکات، کە پاش ئیمان هێنان کـافر بوونەتـەوە، دوای ئـەوەی

شایەتییان داوە،کە پێغەمبەری خوا حەقە، دوای ئەوەی کە بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هاتوون، بێگومان خوا ڕێنمایی کۆمەڵی ستەمکاران ناکات، ئائەوانە سزایان ئەوەیە، کە نەفرینی خواو فریشتەکانو تێکڕای خەڵکییان لەسەرە، لە دۆزەخدا بە هەمیشەیی دەمێننەوەو، سزایان لەسەر سووك ناکرێ، مۆڵەتیش نادرێن. دیسان تەماشا دەکەین تەنیا باسی سزای دوارۆژ کراوە.

٤- لە ئایەتی ژمارە (٩٠)ی سوورەتی (آل عمران)دا، دیسان خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ ثُمَّ ٱزْدَادُواْ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ﴿٩٠﴾ ﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی، کە پاش ئیمانیان هەڵگەڕاونەتەوەو کافر بوون، دوایی لە کوفردا زیاتر ڕۆچوونو زیادیان کردوە، ئەوانە پەشێمان بوونەوەیان لێقبووڵ ناکرێت، ئەوانە گومڕاو سەرگەردانن.

٥- لە ئایەتی ژمارە (٧٤)ی سوورەتی (التوبة)دا دەفەرموێ: ﴿ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ وَلَقَدْ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُواْ بَعْدَ إِسْلَٰمِهِمْ وَهَمُّواْ بِمَا لَمْ يَنَالُواْ ۚ وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنْ أَغْنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضْلِهِۦ ۚ فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيْرًا لَّهُمْ ۖ وَإِن يَتَوَلَّوْاْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَمَا لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٧٤﴾ ﴾، کە دەربارەی دڵ نەخۆشەکان، کۆمەڵێك، کە هەڵگەڕاونەتەوە لە ئیسلام دەدوێو، دەفەرموێ: ( يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ )، واتە: سوێند دەخۆن بە خوا، کە ئەو قسەیان نەکردوە، بەڵام بە تەئکید وشەی کوفریان گوتوە (وَلَقَدْ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ ) دوای ئەوەی کە هاتوونە نێو ئیسلامەوە کافربوونەتەوە، (واتە: دوای ئەوەی هاتوونەتە نێو ئیسلام بە ڕواڵەتیی، شتی وایان گوتوەو لەسەریان چەسپیوە، کە لە بازنەی ئیسلام چوونەتە دەرێ)، (وَهَمُّواْ بِمَا لَمْ يَنَالُواْ ) مەبەستێکیشیان هەبوو دەستیان پێی نەگەیشت (کە زۆر لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: بریتیی بوو لە کوشتنی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيه وَسَلَم") (وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنْ أَغْنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضْلِهِۦ ) هیچ ڕەخنەشیان نەبوو، هیچ عەیبیشیان نەدۆزییەوە، ئەوەنەبێ کە خواو پێغەمبەری

خوا بە چاکەی خۆیان بێ نیازیان کردبوون، (واتە: ئەوەبوو کە لە سایەی ئیسلامدا دەوڵەمەند بوو بوونو، خوا بە بەخششی خۆی سامانداری کردبوون و پاداشتی چاکەیان بە خراپە دایەوە)، (فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيْرًا لَّهُمْ) ئەگەر بگەڕێنەوەو پەشیمان ببنەوەو واز لەو کوفرە بێنن، ئەوە بۆ ئەوان باشترە، (وَإِن يَتَوَلَّوْاْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْآخِرَةِ) ئەگەر پشت هەڵکەن، خوا ئازارێکی بەئێشیان دەدا، لە دونیا لە دواڕۆژدا (وَمَا لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ) لەسەر زەوی هیچ پشتیوانو هیچ یارمەتیدەرێکیان نیە، دیارە لێرەدا باسی سزای بە ئێشی دنیای کردوە، بەڵام سزا بەئێشە دونیاییەکە، وەك توێژەرەوانی قورئان دەڵێن، شتێکی دیار کراو نیە، تاکو سزایەکی دنیایی بێ، بەڵکو ئەوەبووە کە هەمیشە لە حاڵەتی دڵەڕاوکەدا بوون، نهێنییەکانیان کەشف دەبن، بۆیە خوای پەروەدگار پێغەمبەری خۆی (علیه الصلاة والسلام) ئاگادار کردۆتەوە کە ئەوان هەمیشە لە ئازارو ئێشێکی دەروونییدا ژیاون.

ئینجا ئێمە تەنیا ئایەتە مەدەنییەکانمان هێنا، ئەگەرنا لە ئایەتە مەکییەکانیشدا هەروایە، وەك لە ئایەتی ژمارە (١٠٦)ی سووڕەتی (النحل)دا و ئایەتی (١١)ی سووڕەتی (الحج)دا و ئایەتی (٦٥)ی سووڕەتی (الزمر)دا، دیسان باسی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام کراوە، بەبێ ئەوەی کە باسی سزای دونیایی بکرێ، بەڵام وەك پێشتریش گوتمان، ئێمە بۆیە تەنیا ئایەتە مەدەنییەکانمان هێنان، چونکە یەکێ بۆی هەیە بڵێ: سزا شەرعییەکان هەموویان لە قۆناغی مەدینەدا فەرز کراون.

ئینجا لێرەدا دەپرسین: باشە بۆچی سزای دنیایی لە ئایین هەڵگەڕانەوە لە قورئاندا باس نەکراوە؟ کە بە حیساب دەبێ بریتی بێ لە کوشتن، کە قورسترین سزایەو هیچ سزایەك بە قەدەر کوشتن قورس نیە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەموو ئایەتانە باسی لە ئایین هەڵگەڕانەوە دەکەن، بەڵام بێجگە لە سزای قیامەتیی، باسی سزای دنیایی نەکراوە؟! بێگومان ئەوە جێی پرسیارە، لە حاڵێکدا کە ئێمە دەبینین سزای تۆمەتی داوێن پیسیی (قذف) باسکراوە، واتە: کەسێك تۆمەتی داوێن پیسیی بۆ پیاوێ، یان ئافرەتێ بکات، بێئەوەی

بتوانێ چوار شاهیدان بێنێ، دەبێ (٨٠) قامچی لێبدرێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ ﴾ النور، واتە: ئەوانەی کە ئافرەتانی داوێن پاك تۆمەتبار دەکەن بە داوێن پیسیی، پاشان چوار شایەد ناهێنن (٨٠) قەمچییان لێ بدەن، لە یەك ئایەتدا باسی سزای تۆمەتی داوێن پیسیی کراوە، کە (٨٠) قەمچییە، لە یەك ئایەتیشدا باسی سزای دزیی کردن کراوە، کە دەست بڕانە: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾ ﴾ المائدة، واتە: پیاوی دزو ئافرەتی دز دەستیان ببڕن.

تەماشا دەکەین ئەم دوو سزایە کە دوو سزای سووکن، بێگومان (٨٠) قەمچی لێدران، لەگەڵ دەست بڕڕان، لەچاو کوشتن، دوو سزای سووکن و، تەنیا یەکی لە یەك ئایەتیشدا باسکراون، بەڵام لە چەندان ئایەتدا باسی لەئایین هەڵگەڕانەوە کراوە، بێئەوەی کە ئاماژە بە سزای دنیایی بکرێ! کەواتە: لە ئەسڵدا لە ئایین هەڵگەڕانەوە، سزایەکی دنیایی لەسەر نیە، کە بریتی بێ لە کوشتن، لە هەموو حاڵاندا، بۆیەش دەڵێم لە هەموو حاڵاندا، چونکە وەك دوایی باسی دەکەین، تەنیا لە یەك حاڵەتدا سزای کوشتن ڕوو لە کەسێك دەکات، کە لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە ئەو کەسە وێڕای لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، بچێتە ڕیزی دوژمنانیشەوەو دوژمنایەتیی ئەهلی ئیسلام بکا، لەو کاتەدا خوێنی خۆی حەڵاڵ دەکات، بەڵام نەك لەبەر هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، بەڵکو لەبەر دژایەتییکردنی بۆ ئیسلام، واتە: نەك لەبەر دەرچوونی لە ئیسلام، بەڵکو لەبەر دەرچوونی لە دژی ئیسلام، بە عەرەبی دەگوترێ: (لیس لخروجه من الإسلام، بل لخروجه علی الإسلام).

**بەڵگەی سێیەم**: هەڵوەشاندنەوەی بەڵگەکانیان: ئەمجار با بێینە سەر هەڵسەنگاندنی ئەو بەڵگانەی، کە ئەوانەی پێیان وایە سزای لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە لە هەموو حاڵاندا بریتیە لە کوشتن، بۆ ئیسپاتی ڕایەکەیان دەیانهێننەوە.

دیارە وەك پێشتر باسمان کرد، ئەوانە هیچ بەڵگەیەکی قورئانییان بەدەستەوە نیەو، تەنیا بە دەقەکانی سوننەت بەڵگە دێننەوەو، ئەو دەقانەی سوننەتیش، کە لەوبارەوە پشتیان پێ دەبەستن، سەرجەم سێ دەقن، کە لە بڕگەی یەکەمدا خستماننە ڕوو.

جا هەرچەندە ئێمە پاش تۆزێکی دیکە پێنج بەڵگە لەسەر ئەوە دێنینەوە، کە ناگونجێ ئەو دەقانەی سوننەتو هاوێنەکانیان بکرێنە بەڵگەی ئیسپاتی ئەوە، کە بابای هەڵگەڕاوە سزایەکەی بریتیە لە کوشتن لە هەموو حاڵاندا، بەڵام سەرەتا بە گشتی لەبارەی ئەو دەقانەی سوننەتەوە دەڵێین: دەقەکانی سوننەت بە گشتی لە ڕووی (سَنَدَ)ەوە دوو جۆرن:

موتەواتیر[1] (متواتر)و ئاحاد (آحاد)، موتەواتیر ئەوەیە، کە ژمارەیەکی زۆر لە پێغەمبەری خواوەیان گێڕابێتەوە، تا کۆتایی[2].

ئاحادیش[3] ئەوەیە یەکێك، یان ژمارەیەکی کەم لە پێغەمبەری خوایان گێڕابێتەوە، کە هێندە نەبن هەواڵدانەکەیان بگەیەنێتە دڵنیایی[4].

هەڵبەتە تێکڕای زانایانیش لەسەر ئەوە کۆکن، کە هەواڵی تەواتور دڵنیایی (یقین) دەبەخشێ، بەڵام هەواڵی ئاحاد، تەنیا گومانی زاڵ (الظن الراجح) دەگەیەنێ.

هەربۆیەش زانایان لەبارەی ئەو دەقانەی سوننەتەوە کە ئاحادن، ڕاجیاییان هەیە لەو بارەوە، کە ئایا چۆن چۆنی بۆ بەڵگەهێنانەوە، لەسەر ئیسپاتی حوکمە شەرعییەکان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ، بۆ وێنە: مالیکییەکان بۆ وەرگرتنی سوننەتی ئاحاد مەرجیان ئەوەیە کە پێچەوانەی کردەوەی خەڵکی مەدینە (عمل أهل المدينة) نەبێ، وەحەنەفییەکان دوو مەرجیان بۆ کارپێکردنی سوننەتی ئاحاد هەن :

---

١) السنة المتواترة: هي التي رواها جمع كثير تُحيل العادة تواطئوهم على الكذب، أو وقوعه منهم من غير قصد التواطوء عن جمع مثلهم حتى يصل المنقول الى النبي عليه الصلاة والسلام، ويكون مستند عملهم بالأمر المنقول عن النبي ﷺ المشاهدة أو السماع. (الوجيز في أصول الفقه، د. عبدالكريم زيدان، ص١٦٨).

٢) تيسير علم اصول الفقه، ص١٣٧، عبدالله بن يوسف الجديع.

٣) الآحاد: هي ما رواها عن النبي ﷺ عددٌ لم يبلغ حد التواتر. هەمان سەرچاوە، ص١٧١.

٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١٤٠.

یەکەم: نابێ ئەو مەسەلەیە لەوانەبێ کە خەڵکی بە گشتی پێیانەوە گرفتارن (أن لا تکون في أمر تعم به البلوی) واتە: ئەگەر لەو جۆرە بێ، عەقڵو مەنتیق وادەخوازێ کە بە تەواتور پێمان بگات، مادام وا پێماننەگەیشتبێ، جێی گومانە.

دووەم: نابێ ئەوەی کە گێڕاویەتەوە لە پێغەمبەرەوە، کاری پێنەکردبێ[1].

ئنجا ئاشکراشە، کە هەرکام لەو سێ دەقەی سوننەت لە جۆری ئاحادن، دوایش ڕوونی دەکەینەوە کە ئایا ئەو مەرجانەیان تێدا هاتوونەتە دی، یان نا؟

ئەوە لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە دەڵێین:

بنچینەیەکی (أصول الفقه)ە کە هەرکات لە بارەی مەسەلەیەکەوە دوو دەق (نص) مان هەبوون، کە یەکیان گشتی (عام)ەو یەکیان تایبەت (خاص)ە، یان یەکیان ڕەها (مطلق)ەو یەکیان بەنددار (مقیّد)ە، یان یەکیان کورت (مجمل)ەو یەکیان درێژ (مفصّلَ)ە، ئەوە پێویستە دەقە گشتی، یان ڕەها، یان کورتەکە لەبەر ڕۆشنایی دەقە تایبەتو بەنددارو درێژەکەدا حاڵی بین، وەك گوتوویانە:

(یحمل العام علی الخاص، والمطلق علی المقید، والمجمل علی المفصل)[2].

ئنجا بینا لەسەر ئەوەی، کە ڕابرد دەڵێین:

لەبەرئەوەی فەرموودەی: {«**مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ**»} دەقێکی گشتیی (عام)ەو دەقی {**لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ" يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَ اللهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ، إِلاَ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ: اَلثَّيِّبُ اَلزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ" اَلْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ**}دەقێکی تایبەتی (**خاص**)ە، چونکە لە دەقی {«**مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ ...**»}دا، هەر کەسێك ئاینی خۆی بگۆڕێ، حوکمی کوژرانی بەسەردا دراوە، بەڵام دەقی {« **وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ" اَلْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ**»}حوکمی کوژرانی تایبەت کردوە بە کەسێکەوە کە ئایینەکەی خۆی دەگۆڕێو، دەشچێتە ڕیزی دوژمنانیشەوەو لە کۆمەڵی مسوڵمانان جیا دەبێتەوە.

---

١) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٤ـ ١٤٦.

٢) بڕوانە: الوجیز في أصول الفقه، ص٢٨٦و٣١٠ و٣٥٢.

دەشتوانیـــن بڵێیـــن:

لە دەقی یەکەمدا {«مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ ...»}دا خودی ئایین گـۆڕین بـە ڕەهـایی کراوەتـە پاساو (مبـرِّر)ی کوژران، بەڵام لە دەقی دووەم: {«وَالتَّارِكُ لِدِينِه...»}دا بەند (قيد)ێـك خراوەتە سەر ئەو ئاییـن گۆڕینە ڕەهایە، کە بریتیە لە ئاییـــن گۆڕینێـك، کـە ئینتیمـاو سەنگەرگۆڕینیشی بە دوادا دێتو، ئەو هەڵگەڕاوەیـە وێـڕای واز لـە ئیسـلام هێنـان بـە یەکجاریی واز لە ڕیزی مسوڵمانانیش دێنیو، دەچێتە ڕیزی دوژمنانیشەوەو سـەنگەر لـە مسوڵمانان دەگرێ!

کەواتە:

بە حوکمی بنچینەی: (**يحمل العام على الخاص**)و بنچینەی (**يحمل المطلق على المقيد**)، ناچارین بڵێیـن: مەبەست لەو هەڵگەڕاوەیەی کە خـوێنی حـەڵاڵ دەبـێ، هـەموو هەڵگـەڕاوە (مُرتَـد)ێك نیـە بـە گشـتی و بـە هـەموو جـۆرە هەڵگەڕانەوەیـەك خـوێنی خاوەنەکەی حەڵاڵ نابێو، سـزای کوشـتنی لـە بەرانبـەردا نـابێ بـەڕەهایی، بـەڵکو ئـەو هەڵگەڕاوەیـەی سـزای کوشـتن دەیگرێتـەوە، هەڵگەڕاوەیـەکی تایبـەت (خـاص)ەو، ئـەو هەڵگەڕانەوەیەی سزایەکەی کوشتنە، هەڵگەڕانەوەیەکی بەنددار (مقيد)ە، کە بریتین لە:

کەسێك کە لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوەو پاشان دەچێتە ریزی دوژمنانەوەو، سەنگەر لـە ئیسلامو موسڵمانان دەگـرێ، هەڵگەڕانەوەیـەك کـە هاوڕێیـە لەگـەڵ بەرەنگاربوونـەوەی ئیسلامو مسوڵمانانو بە هێز دژایەتیی کردنیان.

لە ڕاستییدا سزایەکە لەسەر خودی لە ئایین هەڵگەڕانەوەکە نیـە، کـە ئـەوە مافێکـە خوای کاربەجێ بـە هـەموو مرۆڤـــــێکی داوە، وەك لـە چـەندان ئایـەتی قورئانـدا بـە ڕاشکاویی ڕاگەیەنراوە، بەڵکو لەسەر ڕووبەڕوو بوونەوەو دژایەتییکردنەکەیە.

ئینجا ئەگەر یەکێك بپرســێ:

ئایا بەڵگە لەسەر ئەوە چییە، کە هـەر کەسـێك دژی ئیسـلامو مسـوڵمانان جـەنگیو سەنگەری لێگرتن، سزایەکەی کوشتنە؟

لـە وەڵامـدا دەڵێیـــن: بەڵگـەمان دەیـان ئایـەتی قورئـانی بـەپێزو دەقـی سـوننەتی پێغەمبەری بەڕێزە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمْ"، بۆ نـموونە:﴿...فَإِن قَتَلُوكُمْ فَٱقْتُلُوهُمْ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ

ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩١﴾﴾ البقـرة، واتـه: جا هەرکات لەگەڵتان جەنگینو بەشەڕهاتن، ئەوە بیـانکوژن، سزای کافران ئاوایە، (واتە: کافرانێك کە ڕووبەڕووی مسوڵمانان دەبنەوە).

کەواتـــە:

فەرمـوودەی: {«مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ»} دەقێکی کورت (مـجمل)ە، چـونکە وێـڕای مسوڵمانان، نامسوڵمانانیش دەگرێتەوە، کە بێگومـان ئـەوان مەبەسـت نیـــن، چـونکە: ئەگەر بابایەکی جوولەکە، یان نەصرانیی، یان بوزایی، یـان مەجووسـیی، ئاییینەکـەی بـە ئیسلام بگۆڕێ، ئەوە ئیسلام پێشوازیی لێدەکات، ئەگەر لە کوفرێکیشەوە بـۆ کـوفرێکی دیکە بگوازێتەوە، ئەوە بۆ ئیـســلام هیچ فەرق ناکات!

هەروەها ئەم دەقە هەر مسوڵمانێکیش دەگرێتەوە، کـە بـە هـەر شـێوەیەك بـووە لـە ئیسلام پاشگەزبووەتەوە، کە ئەمەش ڕاست نیە، چونکە خوا (سبحانە وتعالى) لە چەندان ئایەتدا ڕایگەیاندوە، کە مرۆڤـــەکانی لە نێوان کوفرو ئیماندا سەرپشكو ئازاد کـردوە، کەواتە: مەبەست لەو کەسـەی کـە ئاییینەکـەی دەگـۆڕێو بـە کـوژران سـزا دەدرێ، ئـەو مسوڵمانەیە کە وێڕای هەڵگەڕانەوە لە ئیســلام -کـە ئـەوە مـافـی خۆیـەتی- لـە ڕیـزی مسوڵمانانیش جیا دەبێتەوەو دەچێتە بەرە (جَبْهَة)ی کافرانی دژایەتییکـەرەوەو سـەرەنجام فەرمودەی: {«وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ" اَلْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ»} دەبێتە ڕوونکەرەوەی فـەرموودەی پێشووو درێژە (مفصل)ەکەی.

ئێستاش ئێمـە پێـنج (٥) بەڵگـە دێنینـەوە لەسـەر ئـەوە، کـە ئـەو فەرمایشـتانەی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کە بە بەڵگە دەهێنرێنەوە، (دیارە لەوبارەوە هیچ ئایەتێك نیـەو پێشتــر باســمان کـرد، کـە سـزادانی هەڵگەڕانـەوە لـە ئاییــن لەبـەر خـودی هەڵگەڕانەوەکە، لە قورئاندا باس نەکراوەو، بەس لە فەرمایشتەکانی پێغەمبـەردا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" هاتوە)، ناگونجێ مەبەسـت پێیان سزادانی دنیایی بێ، لە هەموو حاڵاندا:

بەڵگەی یەکەم: لە ڕێیەکی ڕاستو درووستەوە نەزانراوە، کە پێغەمبـەری خـوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کەسانێکی کوشتبـێ لە ڕۆژگاری خۆیدا، کـە پـاش مسـوڵمان بـوون، لـە ئیسلام هەڵگەڕاونەتەوە، وەك لەم ئایەتانەوە بە ڕوونیی دیارە، کـە لـە سـەردەمی خۆیـدا

کەسانێك هەبوون کە لە ئیسلام هەڵگەڕاونەتەوەو لە بازنەی ئیسلام چوونەدەر، بەڵام هیچ کەسی لەسەر ئەوە سزا نەداوە، وەك ئەم ئایەتانە بە ڕوونو ڕاشکاویی ئەوە دەگەیەنن:

١- لە سووڕەتی (التوبة) ئایەتی (٦٥، ٦٦)دا، خوا (سبحانه و تعالی) دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾. دەربارەی مونافیقو دڵ نەخۆشەکان دەدوێو دەفەرموێ: ئەگەر پرسیاریان لێبکەی بە تەئکید لەسەرکردنەوە دەڵێن: ئێمە لەو قسانەماندا (واتە: ئەو قسانەی کە کوفریان تێدابووە) هەروا ڕێگەمان دەبڕیو دەمانویست دووریی ڕێ کەم بکەینەوە، گاڵتەمان دەکرد، (خوا دەفەرموێ) بفەرموو: ئایا بە خواو ئایەتەکانیو پێغەمبەری خوا گاڵتەتان دەکرد؟ ( لَا تَعْتَذِرُوا ) عوزرو بیانوو مەهێننەوە (قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ) لە دوای ئەوەی کە ئیمانتان هێنابوو کافر بوونەتەوە، هەندێك لە زانایان دەڵێن: لێرەدا مەبەست لە ئیمان، مسوڵمان بوونی ڕووکەشییە، واتە:دوای ئەوەی بەڕواڵەت هاتبوونە نێو ئیسلامەوە، ئەوەشتان هەڵوەشاندۆتەوە، یاخود دوای ئەوەی کە ئیمانتان هێنا بوو بەڕاستیی، بەو قسانەتانو بەو گاڵتە کردنەتان بە خواو ئایەتەکانی خواو پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"، ئیمانەکەتان هەڵوەشاندۆتەوە.

وەك دەبینین لە حاڵێکدا کە ئیسلامو ئیمانیشیان هەڵوەشاوەتەوە، بەڵام نابینین نە خوا (سبحانه و تعالی) باسی هیچ سزایەکی کردبێ، نە پێغەمبەریش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" سزای دابن، کە دیارە ئەوانە کەسانێکی ناسراویش بوون، چونکە دەفەرموێ: ( وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ ) ئاشکراشە کە پرسیارو وەڵام لەگەڵ کەسانێکی دیارو ناسراودا نابێ ناکرێ، لێرەشدا خوای کاربەجێ بەڕاشکاویی کافربوونو کوفرکردنی کۆمەڵێکی دیاریکراو ڕادەگەیەنێ، بێئەوەی هیچ باسو خواسی سزا (**عقوبة**) لە ئارادا هەبێ، لە هۆی هاتنەخوارەوەشدا، دیسان دیارە کە کەسانێکی دیاری کراوبوونو، دوایی هاتوون بۆ لای پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"و سوێندیان بۆ خواردوە، کە مەبەستیان

ڕێگابڕین‌و گاڵتەکردن‌و کات بەسەربردن بووە، نەك بە جیددیی مەبەستیان ئیعلانی کوفر بووبێ.[1]

٢- ئایەتێکی دیکە، ئایەتی ژمارە (٧٤)ی هەر سوورەتی (التوبة)یە کە دەفەرموێ: ﴿ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلۡكُفۡرِ وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْۚ وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦۚ فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرٗا لَّهُمۡۖ وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَا لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ﴿٧٤﴾ ﴾، واتە: سوێندت بۆ بە خوا دەخۆن، کە نەیانگوتوە ( يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ )، بەڵام بە تەئکید وشەی کوفریان گوتوە (وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ ) وە دوای ئیسلامەتییەکەیان کوفریان کردوە (وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْۚ ) ویستیشیان شتێ بکەن کە دەستیان پێی نەگەیشت، کە پێشتر ئاماژەمان پێدا، مەبەستیان ئەوەبوو، کە پیلانێك لە دژی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بگێڕن‌و بیکوژن،کە لە ڕێی جەنگی تەبوك، لە پێچێك لە دەروویەك هەڵیدێرن،[2] کەواتە: لێرەشدا خوا بە ڕوون‌و ڕاشکاویی دەفەرموێ: لە دوای ئیسلام کوفریان کردوە، بەڵام هیچ سزاش دیار نیە بەسەریاندا چەسپێنرابێ.

٣- هەروەها لە سووڕەتی (التوبة) ئایەتی (٨٠)دا دەفەرموێ: ﴿ٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ أَوۡ لَا تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ إِن تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ سَبۡعِينَ مَرَّةٗ فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٨٠﴾ ﴾ ، دەفەرموێ: تۆ داوای لێبوردنیان بۆ بکەی، یان داوای لێبوردنیان بۆ نەکەی، ئەگەر حەفتا (٧٠) جار داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکەی، خوا لێیان خۆش نابێ، ئەویش لەبەر ئەوەی کە کوفریان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی کردوە، خوا ڕێنمایی کەسانی لەڕێ دەرچوو ناکات.

ئەوە بەڵگەی یەکەم لەسەر ئەوە، کە ناگونجێ مەبەست لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر

---

[1] بڕوانە: زاد المسير في علم التفسير، لابن الجوزي، ص٥٩٣.
وە بڕوانە: أسباب النزول للواحدي: ١٤٣-١٤٤، وە (الدر المنثور) للسيوطي، ٣/٢٥٤.

[2] بڕوانە: زاد المسير في علم التفسير، لابن الجوزي، ص٥٩٥.

"صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" كە دەفەرموێ: {«مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ ...»} كە دەفەرموێ: {«وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ" اَلْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ»}مەبەست ئەوەبێ، كە هەركەسێك لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە بكوژرێ، چونكە نابینین پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" ئەوانە كە لە ئیسلامیش هەڵگەڕاونەتەوە كوشتبنی، كەواتە: نابێ قسەی پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم"و فەرمایشتی پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" پێچەوانەی ڕەفتاری پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" بێ، لە ژیانی كردەیی پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم"دا، نابینی هیچ كەسێكی لەسەر ئەوە كە كوفری كردوەو لە ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە، سزا دابێ، كەواتە: نابێ فەرمایشتەكەشی پێچەوانەی كردەوەكەی بێ، بۆیە فەرمایشتەكە دەبێ مەبەستێكی دیكەی هەبێ، كە لەگەڵ كردەوەكەیدا تێكنەگیرێ[1].

بەڵگەی دووەم: سزا شەرعییە دیارییكراوەكان (الحدود) وەك: ﴿تۆڵە (قصاص)، سزای زینا، سزای ڕێگریی، سزای دزیی، سزای بوختانی زینا (القذف)﴾ سەرجەم هاوەڵانو زانایانیش لەسەریان كۆكو یەكدەنگ، هەموو زانایان لەسەر ئەو سزایانە یەكدەگن، كە سزای كوشتنی ئەنقەست، كوشتنەوەیەو، سزای داوێن پیسیی، سەد قەمچییەو، سزای دزیی، دەستبڕینەو، سزای ڕێگریی، ئەو چوار جۆرە سزایەیە، كە لە ئایەتی (٣٣)ی سوورەتی (المائدة)دا باسكراون، سزای بوختانی داوێنپیسیی، هەشتا قەمچییە، ئەوە زانایان لەسەری یەكدەنگن، چونكە بە دەقی قورئانی دەلالەت ڕوون (قطعية الدلالة) باسكراون، بەڵام سزای لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، هاوەڵانیشو زانایانی دوای ئەوانیش، لەبارەیەوە ڕاجیاییان هەیە، بەڵێ، زانایان لەسەر ئەو سزایانەی دیكە یەكدەنگن، بە م لەسەر ئەوە، كە كەسێك لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە، ئایا دەبێ سزایەكەی چی بێو، چۆن بێ؟ زانایان بە هاوەڵانو غەیری هاوەڵانیشەوە ڕاجیاییان هەیە.

ئەمەش چەند بەڵگەیەك لەوبارەوە، كە هاوەڵانی پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" (خوا لێیان ڕازی بێ)، زانایانیش ڕاجیاییان هەیە دەربارەی سزای لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، كە

---

١) ئەگەر بشگوترێ: ئەو ئایەتە لەبارەی مونافیقەكانەوە دەدوێو حوكمی ئەوانیش جیایە لە هی هەڵگەڕاوەكان ! دەڵێین: مونافیقێك كە خوا عزوجل لەبارەیانەوە دەفەرموێ: كوفری ئاشكرایان كردوەو پاش ئیمانو ئیسلام كافر بوونەتەوە، دیارە كە هەڵگەڕاوە (مرتد)نو پێناسەی (مرتد) دەیانگرێتەوە.

دیارە ئەگەر فەرمایشتەکانی پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" روونو ڕاشکاویان لەوبارەوە، وەك هەندێك ئیددیعا دەکەن، نەدەگونجا هاوەڵان و زانایان ڕاجیاییان هەبێت:

١/ یەکێ لەو بەڵگانە ئەوەیە، کە عومەری کوڕی خەتتـــاب -خوا لێی رازی بێ-، ڕای وانەبووە، کە هەڵگەڕاوە (مرتد) بکوژرێت، بەڵکو ڕای وابــووە حـەپس بکرێـت، وەك لـەم دەقەوە دیارە: **{أَنَّ أَنَساً عَادَ مِن "تُـسْتَـرُ" فَقَدِم عَلَى عُمَر، فَسَأَلَهُ: مَا فَعَلَ الـرَّهْطُ السِّتَّةُ مِنْ بَكْرِ بْنِ وَائِلٍ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَنِ الإِسْلاَمِ فَلَحِقُـوا بِالْمُشْـرِكِينَ؟ قَـالَ يَـا أَمِـيرَ الْمُؤْمِنِينَ، قوم ارْتَدُّوا عَنِ الإِسْلاَمِ، فَلَحِقُوا بِالْمُشْرِكِينَ، قُتِلُوا فِـي الْمَعْرَكَـةِ، فاسترجع عمر (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ) قال أنس: وَهَلْ كَانَ سَبِيلُهُمْ إِلاَّ الْقَتْلَ؟ قال: نَعَمْ، كُنْتُ أَعرِضُ عَلَيْهِمْ أَنْ يَدْخُلُوا الإِسْلاَمِ، فَإِنْ أَبَـوُا اسْـتَوْدَعْتُهُمُ السِّجْنَ}** (رَوَاهُ عَبْدُالرَّزَاق فـي الـمصنف: ١٦٥/١٠، ١٦٦، الأثر (١٨٦٩٦)، والبيهقي في السنن: ٨/٢٠٧، وسعيد بن منصور ص٣ رقم (٢٥٧٣)، وابن حزم فـي المحلى: ١١/٢٢١)

واتە: هەرکام لە عـەبدوڕڕەززاقو ئیبن حەزمو بەیهەقیی، دەگێڕنەوە کە ئەنەسـی کـوڕی مـالیك لە **(توستور)** دەگەڕێتەوە، دەچێ بـۆ لای عومــەر، خـوا لــە هــەردووکیان رازی بـێ، عـومەر پرسیاری لـێدەکات: ئەو شەش کەسە لە هـۆزی (بــەکری کــوڕی وائیــل) کــە لــە ئیسلام هەڵگەڕابوونەوەو پەیوەست بووبوون بە هاوبەشدانەرو کافرەکانــەوە، ســەرەنجامیان چی لێهات؟ گوتی: ئەی گەورەی بڕواداران! کۆمەڵێك بوون لــە ئیســلام هەڵگەڕابوونــەوەو چووبوونە گەڵ هاوبەشدانەرەکان، لە جەنگدا کوژران (واتە: دوای ئەوەی کە بە دیل گیــران کوژران)، عومەر گوتی: **(إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ)** (واتــە: پێــی نـاخۆش بــوو)، ئەنــەس گــوتی: ئایـا جگـە لــە کوشــتن هــیچ ڕێیــەکی دیکــەیان هــەبوو؟ گـوتی: بــەڵێ، ئەگــەر گەیانباتاننە لای من، ئیسلامم لەسەر ڕادەنواندن (واتە: ئیسلامم بۆ پێشنیار دەکردن کــە بگەڕێنەوە بۆ ئیسلام)، جا ئەگــەر مســوڵمان بووبانــەوە باشــە، بــەڵام ئەگــەر مســوڵمان نەبووبانەوە، سجنم دەکردن. کەواتــە: عومــەر-خــوا لێــی رازی بــێ-، ڕای وانــەبووە کــە کەسێك لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوەو دەچێتە نێو کافرەکانیش، مادام دوایــی کــە بــە دیــل دەگیرێ لەسەر ئەوە، کە لە ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە، لەسەر ئەوەندە بکوژرێ.

دیارە هەندێك لە زانایان ئەو هەڵوێستەی عومەریان (خوا لێی ڕازی بێ)، بەوە پاساو داوەتەوە، کە عومەر لەبەر بارودۆخی جەنگ گوتوویەتی، با نەکوژرێن، یان لەبەر ئەوەی کە سزادانی هەڵگەڕاوە سزایەکی دیاریی کراوی شەرعیی نیەو، لە نێو بازنەی سیاسەتی شەرعیی‌و سنووری دەسەڵاتی حوکمڕان‌و سەرۆکی دەوڵەتدایە، وەك دکتۆر (یوسف القرضاوي) لە کتێبی: (نحن والغرب أسئلة شائكة وأجوبة حاسمة) لاپەڕە (٦١ـ ٦٢)دا هێناویەتی، بەڵام لە ڕاستییدا پاساوی یەکەم بێهێزەو لەبەرئەوە نەبووە، چونکە پاش بەدیل گیرانیان، هیچ مەترسییان نەماوە کە بەملاولادا بچن، پاساوی دووەمیشیان کە دەڵێ: لەبەرئەوە کە سزای لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، سزایەکی دیاریکراو نیە، ئەوە هەر قسەی ئێمەیەو ئێمەش دەڵێین: لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە سزایەکی دیاریکراوی نیە، واتە: سزایەکی شەرعیی دیاریکراو، کە لە هەموو حاڵاندا جێبەجێ بکرێ.

٢/ دووەمین بەڵگە: لەسەر ئەوە کە هاوەڵانی بەڕێزو زانایان دەربارەی سزای لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، ڕاجیاییان هەیە، ئەو فەرموودەیەیە کە پێشتر هێنامان، کە ئەبو مووسای ئەشعەریی (خوا لێی ڕازی بێ)، پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەینێرێ بۆ یەمەن‌و دوایی موعازی کوڕی جەبەلیشی بەدوادا دەنێرێ و، دوای ئەوەی کە موعاز دەچێ بۆ لای‌و ئەویش فەرمووی لێدەکا دابنیشێ، دەبینێ کابرایەك کەلەبچە کراوە، دەڵێ: ئەوە چییە؟! دەڵا ئەوە جوولەکەیەکە مسوڵمان بووەو، دوایی بووەتەوە جوولەکە، موعاز دەڵێ: داناناییشم هەتاکو نەکوژرێ، ئەوە بڕیاری خواو پێغەمبەری خوایە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم". ئەو فەرموودەیە ئەبوو داوود بەمجۆرەی هێناوە، دەڵێ: {**عَنْ أَبِي بُرْدَةَ فَأُتِيَ أَبُو مُوسَى بِرَجُلٍ قَدِ ارْتَدَّ عَنِ الإِسْلاَمِ فَدَعَاهُ عِشْرِينَ لَيْلَةً أَوْ قَرِيبًا مِنْهَا فَجَاءَ مُعَاذٌ فَدَعَاهُ فَأَبَى فَضُرِبَ عُنُقُهُ**} (أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٣٥٥) وَقَالَ الشيخ الألباني: صحيح الإسناد)

واتە: ئەبو بورەیدە دەڵێ: پیاوێکیان هێنایە لە لای ئەبو مووسا، کە لە ئیسلام هەڵگەڕابۆوە، ئەبو مووسا بیست شەو، یاخود ئەو دەورووبەرە، هەموو شەوێ بانگی دەکرد کە مسوڵمان بێتەوە، (دیارە ئەویش مسوڵمان نەبۆتەوە)، کاتێ موعاز هات بانگی کرد کە مسوڵمان بێتەوە، ئەویش ڕازی نەبوو، لە گەردنیدا.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەبو مووساو موعازیش لەوبارەوە ڕاجیاییان هەبووە، ئەوەتا

ئەبو مووسا (بیست شەو) ئیسلامی بۆ پێشنیار کردوە، کە مسـولْمان بێتـەوەو مۆڵـەتی داوە، بەڵام موعاز دوای ئەوەی، کە بانگی کردوە بۆ ئیسلام و،ئەویش مسـولْمان نـەبووە، کوشتوویەتی، کەواتە: ئەبو مووسای ئەشعەریی و موعازی کوڕی جەبەل، - خوا لێیـان رازی بێ- هەردووکیان ، سەبارەت بە سزادانی هەڵگەڕاوە لە ئیسلام، یەکڕا نەبوون.

٣/ سێیەمین بەڵگە: هەرکام لە (إبراهیم النخعي)و (سفیان الثوري) رەحمـەتی خوایـان لێبـێ، وەك لە (المصنف)ی (عبـدالرزاق) بە ژمارە (١٧٦٩٧)دا هاتوە، ڕایـان وایـە، کـە بابای هەڵگەڕاوە (**مرتد**) ناکوژرێ‌و پێویستە بەردەوام داوای پەشـیمانبوونەوەی لێبکـرێ، وەك (ابن قدامة) لە کتێبی نـاوداری خـۆی (الـمغني) بـەرگی هەشـت لاپـەڕە (١٢٤)دا هێناویەتی، کە (النخعي) گوتوویەتی: (يُستَتابُ المرتدُّ أبداً) واتـە: هەڵگـەڕاوە بـەردەوام داوای گەڕانەوەی لێدەکرێ، واتە: هەتاکو دەمرێ هەر داوای پەشیمانبوونەوەی لێـدەکرێ‌و ناکوژرێ.

کەواتە دەعوای هەبوونی یەکدەنگیی (اجماع) لەسەر ئـەوە، کـە سـزای هەڵگەڕانـەوە بریتیە لە کوشتن لە هەموو حاڵاندا، قسەیەکی بێ بنەماو بێ بناغەیە.

بەڵـگـەی سێیەم: لەسەر ئەوە کە فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئەوە ناگەیەنن، کە دەبێت لە ئیسلام هەڵگەڕاوە لە هـەموو حاڵانـدا بکـوژرێ‌و سـزایەکی شەرعیی دیاریکراوی نیە، ئەوەیە کە سزای شەرعیی دیارییکراو کە (**حَـدّ**)ی پێـدەگوترێ، لە هەموو حاڵاندا دەبێ جێبەجێ بکرێ، وەك لەم فەرمایشتەدا دیارە:

**{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا ، أَنَّ قُرَيْشًا أَهَمَّهُمْ شَأْنُ الْمَرْأَةِ الْمَخْزُومِيَّةِ الَّتِي سَرَقَتْ فِي عَهْدِ النَّبِـي** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" **فِي غَزْوَةِ الفَتْحِ ، فَقَالُوا: مَنْ يُكَلِّـم فيهـا رسـولَ الله** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"؟ **فقالوا: وَمَنْ يَجْتَرِي عَلَيْهِ إِلاَّ أُسَامَةُ بْـنُ زَيْـدٍ ، حِـبُّ رَسُـولِ الله** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"، **فأتي بها رسول الله** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"، **فكلّمه فيها أُسَامَةُ بْـنُ زَيْدٍ ، فتلوَّنَ وَجْـهُ رَسُول الله** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" **فقـال: أَتَشْـفَعُ فِـي حَـدّ مِـنْ حُـدُودِ الله؟!) }** (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٤٧٥)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (١٦٨٨)) واتە: دایکمان عـائیشـە -خوا لێی رازی بێ- دەگێڕێتەوە کە قوڕەیشییەکان دەربارەی ئەو ئافرەتەمەخزوومییەی، کە دزیی کردبوو لەسەردەمی پێغەمبەردا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە جەنگی ئـازادکردنی مەککـەدا،

زۆر خەفەتیان پێخوارد، گوتیان: كێ لەبارەی ئەو ئافرەتەوە كە سزای دەستبڕینی بەسەردا نەچەسپێ، قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەكات؟، ئەوانیش گوتیان: جا كێ دەوێرێ قسە بكات لەوبارەوە، مەگەر ئوسامەی كوڕی زەید، كە خۆشەویستی پێغەمبەری خوایە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"، ئیدی ئەو ئافرەتەیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" كە سزای دەستبڕینی بەسەردا بسەپێنرێ، ئوسامەی كوڕی زەید لەبارەی ئافرەتەكەوە قسەی كردو بەرگریی لێكردو تكای بۆ كرد، پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"یش دەموچاوی موبارەكی گۆڕاو فەرمووی: ئایا تكا دەكەی بۆ جێبەجێنەكردنی سزایەك لە سزایەكانی خوای بەرزو باڵادەست؟!، واتە: پێی ناخۆش بوو، ئەوەبوو سزایەكەیان بەسەردا چەسپاند.

لێرەدا لەبەرئەوەی سزای دەستبڕین، سزایەكی شەرعییە، پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە ئوسامەی كوڕی زەید كە خۆیشیو بابیشی زۆر زۆر لەلای خۆشەویست بوون، قبووڵی نەكردوە، كە تكا بكات بۆ جێبەجێنەكردنی ئەو سزا شەرعییە، بەڵام دەبینین پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" تكاكردنی عوسمانی كوڕی عەففان -خوا لێی رازی بێ-، بۆ عەبدوڵڵای ئیبن ئەبی سسەرح، كە برای شیریی بووە، قبووڵ دەكا، هەرچەندە (عبدالله بن أبي السَّرح) كاتی خۆی نووسەری وەحی بووەو دوایی هەڵگەڕاوەتەوە، وەك لە (السيرة النبوية لإبن هشام) بەرگی (٤) لاپەڕە (٢٣١ـ ٢٣٢) وە (السيرة الحلبية للحَلَبِي) بەرگی (٣) لاپەڕە (٣٣٦)دا هاتووەو بەسەرهاتەكەیان هێناوە، كە عەبدوڵڵای ئیبن ئەبی سسەرح لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوەو دەچێتەوە نێو كافرەكانی مەككە، بەڵام لە رۆژی ئازادكرانی مەككەدا، عەبدوڵڵا دەچێتە لای عوسمان -خوا لێی رازی بێ-، عوسمانیش پەنای دەدا، لەلای پێغەمبەری خوا تكای بۆ دەكا، پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە سەرەتاوە بێدەنگ دەبێ، پاشان لێی دەبووری، دواتریش عەبدوڵڵا مسوڵمان دەبێ.

جا دیارە ئەگەر هاتباو سزای كوشتنی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلامدا، سزایەكی دیاری كراوبوایە، وەك هی قەتڵو زیناو دزییو بوختانی داوێن پیسییو ڕێگریی، ئەوە بێگومان پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" نەك هەر تكای عوسمانی قبووڵ نەدەكرد، بەڵكو وەك چۆن لە ئوسامەی كوڕی زەید تووڕە بوو، لە عوسمانیش بە تەئكید تووڕە دەبوو،

چونکە سزا دیاریکراوەکان (الحدود)، تەنانەت پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" بۆی نیە قسەیان تێدا بکا، لە سۆنگەی ئەوەوە، کە لە لایەن خواوە دیاریکراون، هەربۆیەش پێغەمبەری خوا وشەی سنوورەکانی خوا، یا سزا دیاریکراوەکانی خوا (**حدود الله**)ی بۆ بەکارهێناون.

<u>بەڵگەی چوارەم</u>، لەوبارەوە کە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" ئەوە ناگەیەنن کە سزای هەڵگەڕاوە لە ئیسلام هەمیشە بریتی بێ لە کوشتن، ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" کاتێك کە عومەری کوڕی خەتتاب -خوای لێی رازی بێ-، بۆی پێشنیار دەکات کە (عبدالله بن أبي بن سلول) بکوژێ و پێی دەڵێ: (دعني أضرب عنق هذا المنافق) لێمگەڕێ، با لە گەردنی ئەو مونافیقە بدەم، لە هەڵوێستێکدا کە عەبدوڵلا لێی دەپشکوێتەوە، پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" پێی دەفەرموێ: {**«دَعْهُ، لاَ يَتَحَدَّثُ النَّاسُ أَنَّ مُحَمَّداً يَقْتُلُ أَصْحَابَهُ»**} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٥٢٦٠)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٤٦٢٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥٨٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٣١٥) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح)، واتە: وازی لێبێنە، با خەڵك نەڵێن موحەممەد هاوەڵەکانی خۆی دەکوژێ، پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" نەیوت کوشتنی ناڕەوایە، وەك سزادانێکی سنووری دەستەڵاتی شەرعیی، بەڵام فەرمووی: با خەڵك نەڵێ موحەممەد هاوەڵەکانی خۆی دەکوژێ، لێرەدا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" نەورووژێنرانی ڕای گشتی لە دژی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ"و، مسوڵمانانی کردوە بە پاساوی جێبەجێ نەکردنی ئەو سزایە، بەڵام دیارە سزا شەرعییەکان، ئەوە نابێتە پاساوی جێبەجێنەکردنیان، کەواتە: دیارە کوشتنی ئینسان لەسەر هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، سزایەکی شەرعیی نیە، ئەگەرنا پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" ئەوەی نەدەکردە پاساوی.

<u>بەڵگەی پێنجەمو</u> کۆتایی لەوبارەوە ئەوەیە، کە تەنانەت ئەو زانایانەش، کە ڕایان وایە بابای هەڵگەڕاوە سزایەکەی کوشتنە، ڕاجیاییان هەیە لەوبارەوە کە ئایا ئەو سزایە، یەکێکە لە سزا دیاریکراوەکان (**الحدود الشرعية**)، یاخود سزایەکی سیاسییەو حوکمڕان دیاری دەکات، هەندێکیان دەڵێن: سزایەکی دیاریکراوی شەرعییە، هەندێکیشیان دەڵێن: نەخێر، بەڵکو سزایەکی سیاسییە، بەو واتایە کە لە سنووری سەڵاحیەتو دەسەڵاتی

حوکمڕاندایە، کەواتە: ئەگەر کوشتنی هەڵگەڕاوە، سزایەکی دیاریکراوی شەرعیی بوایە، ئەو ڕاجیاییە نەدەبوو.

کەواتە ئێستا بۆمان دەرکەوت کە ناگونجێ مەبەست لە فەرمایشتی پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ" کە دەفەرموێ: {«مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ»}(أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٥٥٢)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٨٥٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٣٥١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٥٨) وَقَالَ: صَحِيح حَسَن، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٠٥٩)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٤٧٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٥٣٥))، کوشتنی هەر بابایەکی هەڵگەڕاوە بێ لە ئیسلام، بەڵکو ناچارین بڵێین: مەبەست لەو کەسە کە سزای کوشتنی بەسەردا دەچەسپێ، کەسێکە ئەوە نەبێ تەنیا وازی لە ئیسلام هێنابێ‌و کافر بوویێتەوە، بەڵکو وێڕای کافربوونەوەو وازهێنان لە ئیسلام، چۆتە ڕیزی دوژمنانی ئیسلامیشەوەو بەهێزو چەك بەرەنگاری مسوڵمانان بۆتەوە، واتە، وێڕای (الخروج من الإسلام)، (الخروج على الإسلام)یشی کردۆتە پیشە، کە سزای کوشتنی بۆ دانراوە، لەسەر لە دژی ئیسلام دەرچوونیەتی، نەك لە ئیسلام دەرچوونی، بە تەعبیری فەرموودەی پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ"، لەسەر سیفەتی: (المفارق للجماعة) دەکوژرێ، نەك لەسەر سیفەتی (**التارك لدينه**)، چونکە پێشتر باسمان کرد کە پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ" بۆ هەڵگەڕاوە لە ئیسلام، دوو سیفەتی باس کردوون (التارك لدينه)و (المفارق للجماعة) (وازهێنەر لە ئاینەکەی) و (جیابووەوە لە کۆمەڵی موسڵمانان)، جا بابای هەڵگەڕاوە لە ئیسلام تەنیا لەبەرئەوە، کە وازی لە ئاینەکەی هێناوە، ناکوژرێ، بەڵکو لەسەر ئەوەی وازی لە کۆمەڵی مسوڵمانان هێناوەو، چووەتە ڕیزی دوژمنانەوەو ڕووبەڕووی ئیسلام‌و مسوڵمانان بۆتەوە، لەسەر ئەوە دەکوژرێ.

هەر لەوبارەوە دەگونجێ ئەوەش بە بەڵگە بهێنرێتەوە، کە زانایان دیسان، ئەوانەی کە ڕایان وایە هەڵگەڕاوە لە ئیسلام بکوژرێ، ڕاجیاییان هەیە لەو بارەوە ،کە ئایا ئافرەتی مسوڵمان کاتێك لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە، ئەویش وەك پیاو سزای هەڵگەڕانەوە لە ئیسلامی بەسەردا دەچەسپێ یان نا؟!! دیارە ڕاجیاییەکەشیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە ئافرەت ناتوانێ جەنگاوەر بێ، بە عادەت وایە ئافرەت جەنگاوەر نابێ‌و مەترسی جەنگ‌و دژایەتی لێناکرێ لە بەرامبەر ئیسلام‌و مسوڵماناندا، ئەگەرنا، خۆ لە کافربوونەکەدا وەك

پیاو چۆن کافر دەبێ، ئافرەتیش کافر دەبێ، بەڵام وەك چۆن پیاو دەتوانێ ببێتە جەنگاوەرو سەنگەر لە دژی ئیسلامو مسوڵمانان بگرێ، ئافرەت ئەو توانایەی نیە، بۆیە زانایان کەوتوونە ڕاجیاییەوە، کەواتە: هەڵگەڕاوەش لە ئیسلام، لەسەر عەینی کافربوونو هەڵگەڕانەوەکەی ناکوژرێ، بەڵکو لەسەر دژایەتییکردنەکەیو لەسەر سەنگەرگرتنەکەی لە ئیسلامو مسوڵمانان دەکوژرێ، ئەگەرنا ئەگەر هەر لەسەر کوفرەکەی کوژرابایە، ئەوە زانایان لە بارەی کوشتنی ئافرەتی هەڵگەڕاوەوە یەکڕاو یەکدەنگ دەبوون، چونکە کوفری پیاوو ژن وەك یەکە، بەڵام دژایەتییکردنو سەنگەرگرتنیان، وەك یەك نیە، کەواتە: هۆکارو پاساوی کوشتنی هەڵگەڕاوە، کوفرەکەی نیەو سەنگەرگرتنەکەیەتی.

خاوەنی (بدائع الصنائع) لە بەرگی (٧) لاپەڕە (١٣٥)دا، هەروەها (ابن قدامة) لە (المغني) بەرگی (٨) لاپەڕە (١٣٣)دا ئەم قسەیەیان لە حەنەفییەکانەوە هێناوە، کە ئافرەتی هەڵگەڕاوە لە ئیسلام ناکوژرێو گوتوویانە: {فَلِقَوْلِ النبي صلّى الله عليه وسلم لاَ تَقْتُلُوا امْرَأَةً} واتە: لەبەرئەوەی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" (تەوجیهاتی داوە لە جەنگدا) فەرموویەتی: هیچ ئافرەتێك مەکوژن، لەبەرئەوەی بە کوفری ئەسڵیی، ئافرەت ناکوژرێ، (واتە: ئافرەتێك کە لە ئەسڵدا کافرە ناکوژرێ)، بۆیە کاتێکیش لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوەو کوفرێکی تازەی بەسەردا دێ، دیسان ناکوژرێ.

بەڵام پێویستە بزانرێ کە کوفرگوتنو دەربڕینی کافرێتی شتێکەو، قسەگوتنو جنێودانو سووکایەتی کردن بە خواو قورئانو پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" و پیرۆزییەکانی دیکە، شتێکی دیکەیەو حوکمەکەیان جیاوازە. هەر بۆیەش خوا (سبحانه وتعالى) لە مسوڵمانانیشی قەدەغە کردوە، کە جنێو بە پەرستراوەکانی بێبڕوایان بدەن، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٠٨﴾ ﴾الأنعام: دیارە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو حاڵەتەشدا دەکەوێتە جوغزی دەستەڵاتی شەرعییەوە بە ئیجرائاتو سزادان.

ئنجا لە کۆتایی توێژینەووەماندا دەربارەی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، سێ خاڵی گرنگی دیکەش دەخەینە ڕوو:

خاڵی یەكەم: لە ڕاستییدا مامەڵە كردن لەگەڵ حاڵەتو دیاردەی هەڵگەڕانەوە لە ئایین (الإرتداد عن الدین) لەسەر ڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایان، لە بازنەی فراوانی هەڵسوكەوتەكانو لە جوغزی سیاسەتی شەرعییو قەڵەمڕەوی حوكمڕان (صلاحیة الحاكم) دایە، هەربۆیەش هەم هاوەڵان -خوا لێیان ڕازی بێ-و هەم زانایانی دوای ئەوانیش لەوبارەوە، ڕاو هەڵوێستی جیاجیایان هەبووەو، ئەگەر هاتباو سنوورو سزایەكی شەرعیی دیاریكراو بوایە، هەموویان لەسەری یەكدەنگ دەبوون، وەك چۆن لەسەر سزا شەرعییەكانی دیكە یەكدەنگ بوون، ئینجا حیكمەتی ئەوەش كە شەریعەت سزایەكی دیاریكراوی بۆ گوناهی لە ئایین هەڵگەڕانەوە دانەناوەو، بۆ قەڵەمڕەوی حوكمڕانانی وازلێهێناوە، بەپێچەوانەی گوناحو تاوانەكانی دیكەوە، وەك: قەتلو زیناو دزییو ڕێگرییو بوختان، حیكمەتەكەی ئەوەیە كە:

١- گوناحو تاوانەكانی دیكە، كردەوەی دیارییكراون، دەگونجێ سزای دیاریكراویشیان هەبێ.

٢- هەركام لەو گوناحو تاوانانە زیانیان بۆ كەسانێك، كە لە بەرامبەریاندا دەكرێ مسۆگەرە، قەتڵ زیانەكەی مسۆگەرە، هەروەها: دزیی، ڕێگریی، بوختان كردن، زینا.

٣- ئەو ئازادییەی كە مرۆڤ پێویستیەتی بۆ تاقیكردنەوە، هیچ پەكی لەسەریان نەكەوتوە، واتە: پەكی لەسەر ئەو گوناحانە نەكەوتوە، پەكی لەسەر ئەوە نەكەوتوە، كە دەبێ دزیی بكا، بۆ ئەوەی ئازادیی خۆی بچەسپێنێ، یاخود زینا بكا، یاخود قەتڵ بكا، یاخود ڕێگریی بكا، یا بوختان بۆ خەڵك بكا.

بەڵام لە ئایین هەڵگەڕانەوە:

١/ كردەوەیەكی دیارییكراو نیەو یەك شتی دیارییكراو نیە، بەڵكو چەندان جۆری هەیە، بۆ نموونە:

أ- دەگونجێ خاوەنەكەی ئیشكالی فیكریی هەبێ.

ب- دەگونجێ مەبەستی فێڵو فەرەج بێ، وەك هەڵویستی هەندێ لە جوولەکەکان، کە خوا لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿ وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ ءَامِنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓا۟ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٧٢﴾ ﴾ آل عمران، واتە: کۆمەڵێك لە خاوەن کتێبەکان گوتیان: پێش نیوەڕۆ بڕوا بێنن بەوەی کە بۆ سەر بڕواداران دابەزێنراوە، دوای نیوەڕۆش کافر ببنەوە، بەڵکو هەڵگەڕێنەوە، واتە: بۆ ئەوەی تووشی بەلبەلەی فیکرییان بکەن، دەگونجێ هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام جۆرە فێڵو پیلانێکی ئاوابێ.

ج- دەگونجێ وێڕای هەڵگەڕانەوەی فیکریی، جەنگو دژایەتیشی لەگەڵ بێ، وەك پێشتر باسمان کرد.

د- دەشگونجێ هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، لەژێر فشاردا بێ بە ناچاریی، وەك خوا دەفەرموێ:﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ إِيمَـٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَـٰنِ وَلَـٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾ النحل، واتە: هەرکەسێك دوای ئەوە کە ئیمانی هێناوە، کوفر بە خوا بکا، مەگەر کەسێك زۆری لێبکریو دڵیشی ئارامگرتووبێ بە ئیمان، بەڵام هەرکەسێك بە سینەی گوشادو واڵاوە کافربێ، ئەوانە تووڕەیی خوایان لەسەرەو سزایەکی مەزنیان بۆ هەیە.

بێگومان هەرکام لەم چوار جۆرەش، کە دەگونجێ جۆری دیکەش هەبن لە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، حوکمی تایبەتی خۆی هەیەو، ناگونجێ یەك حوکم بۆ هەموویان دیاری بکرێ، بۆیە سزای هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام سزایەکی دیاریکراو نیە، چونکە چەند جۆرێك هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام هەیە، ئایا کەسێك کە ناچاردەکرێ لە ئیسلام هەڵگەڕێتەوە، دەبێ بکوژرێ؟! بە دەقی ئایەت دەڵێ ناکوژرێ، یاخود کەسێ کە هەڵدەگەڕێتەوە بە مەبەستی ئەوە

کە مسوڵمانان تووشی بەلبەلەی فیکریی بکات، وەك ئەو کەسە وایە کە قەناعەتێکی بۆ دروست بووە، لە ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە؟ بێگومان نەخێر، یان کەسێك کە وێڕای هەڵگەڕانەوە وەك حاڵەتی فیکریی، دەچێ دژایەتی ئیسلامو مسوڵمانان دەکا بە هێز، وەك ئەوە وایە بە قەناعەتی فیکریی هەڵوێستی گۆڕاوە؟ بێگومان نەخێر، بۆیە هەرکام لەوانە پێویستە هەڵوێستێکی تایبەتی لە بەرامبەردا بنوێنرێ.

٢/ مەگەر لە حاڵەتی دژایەتییکردنو جەنگ بەرپاکردندا، ئەگەرنا هەڵگەڕانەوە بەس زیانی بۆ خاوەنی هەیەو وەك گوناهو تاوانەکانی دیکە نیە کە هەمیشە زیانی بۆ خەڵك مسۆگەر بێ.

٣/ ئەو ئازادییەی کە مرۆڤ پێویستی پێیەتی بۆ تاقیکرانەوە، پەکی لەسەر ئازادیی بیروڕا کەوتوە، واتە: پەکی لەسەر ئەوە کەوتوە کە هەرکاتێك ویستی بڕوا بە شتێك بێنێ، وە هەرکاتێك ویستی واز لەو قەناعەتو عەقیدەیە بێنێ، بەڵکو ئازادیی فیکریی بنەڕەتییترین جۆری ئازادیی پێویستە بۆ مرۆڤێك، ئەگەر بیەوێت مرۆڤ بمێنێ.

خاڵی دووەم: بۆیە زۆرێك لە زانایان بەبێ تێوەڕامانی زۆر، یەکسەر ڕایانگەیاندوە کە سزای لە ئاییــن هەڵگەڕانەوە کوشتنە، چونکە لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا "صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ"و خەلیفە ڕاشیدەکانیدا، حاڵەتی لە ئاییــن هەڵگەڕانەوەی فیکریی، یان هەر نەبووە، یان دەگمەن بووەو ئەو کاتە حاڵەتی هەڵگەڕانەوە، یەکسەر لە چوونە ڕیزی کافرانو پێوە پەیوەستبوونیاندا بەرجەستەبووە، واتە: ئەو کاتە کەمتر وابووە بە هۆی ئیشکالی فیکرییەوە خەڵك لە ئیسلام هەڵگەڕێتەوە، بەڵکو وابووە کە بۆ دژایەتییکردنی ئیسلامو مسوڵمانان قۆڵی هەڵماڵیوەو، یەکسەر ئەو کەسە کە لە ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە، چۆتە نێو ڕیزی کافرانو بەرەی کافرانەوەو پێیانەوە پەیوەست بووەو بەچەك بە هێز لەگەڵ ئیسلامو مسوڵماناندا ڕووبەڕووبۆتەوە، جا لەبەرئەوەی حاڵەتەکە بەگشتی وابووە، زانایان گوتوویانە: لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، سزایەکەی کوشتنە، چونکە ئەوکاتە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام یەکسان بووە بە

دژایەتییکردنی ئیسلامو مسوڵمانانو ڕووبەڕووبوونەوەیان بە چەك، بۆیە زانایان بە گشتی، حوکمی ئەو حاڵەتو هەلومەرجە تایبەتییەیان بەسەر ئەو مەسەلەیەدا گشتاندوەو، دوایی وا هاتۆتە بەرچاو کە سزای لە ئایین هەڵگەڕانەوە، هەر چۆن بێ هەر کوشتنە، بەڵام لە ڕاستییدا وانیە، وەك ڕوونمان کردەوە، هەروەها لە ڕۆژگاری سەرەتای خیلافەتی (ابوبکر الصدیق)دا - خوا لێی رازی بێ-، جەنگی مسوڵمانان لەگەڵ زەکات نەدەران (مانعوا الزكاة)و لە ئایین هەڵگەڕاواندا، ئەو مۆرکەی بە حاڵەتی هەڵگەڕانەوە نووساند، کە هەمیشە جەنگ کردنو سەنگەرگرتنی لەگەڵدایەو، دیارە حوکمی ئەوەش ئاشکرایە کە چۆنە، واتە: لە سەردەمی ئەبوبەکردا -خوا لێی رازی بێت-، کەسانێك هەبوون لە ئیسلام هەڵگەڕابوونەوەو هەڵگەڕانەوەکەیان لە زەکات نەداندا بەرجەستە بووو، لەبەرئەوەش بە کافر لەقەڵەم دران‌و ئەبوبەکر -خوا لێی رازی بێ-، جەنگی لەگەڵدا کردن لەبەرئەوەی سەنگەریان گرتبوو لە ئیسلامو مسوڵمانانو بە چەك لەگەڵ ئیسلامو موسڵمانان رووبەڕووبووبوونەوە، ئیدی لەو کاتە بەدواوە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، ئەو مۆرکەی پێوە نووسێنرا کە سزایەکەی کوشتنە، بەڵام لە ڕاستییدا ئەوانە هەڵگەڕاوانێکی تایبەت بوون، کە بریتیبوون لە کەسانێك کە دژایەتی ئیسلامو مسوڵمانانیان دەکرد، یاخود مسوڵمان بوونو دەیانگوت زەکات نادەین، هەڵبەتە کەسێك کە ئیعلانی مسوڵمانەتی خۆی دەکات، بەڵام دوایی پابەند نابێ بە ئەرکی سەرشانییەوە، ئیسلامو مسوڵمانان، یاخود دەوڵەتی ئیسلامیی بۆی هەیە سزای بدات لەسەر ئەو پابەندنەبوونە، بەتایبەت کە ئەو ئەرکە پەیوەندیی بە مافی خەڵکەوە هەبێ کە زەکاتە، چونکە وەك چۆن نوێژ حەقی خوایە، زەکاتیش حەقی خەڵکە، لەو حاڵەتەدا دەسەڵاتی ئیسلامیی بۆی هەیە سزای بدات، لەسەر کەمتەرخەمیی کردنی لە جێبەجێ کردنی ئەرکی سەرشانیدا.

خاڵی سێیەم: بێگومان لە ئایین هەڵگەڕانەوە، گەورەترین خراپەو تاوانە، بەتایبەت کە ئیسلام بڕوای بە ئایینی تەقلیدییو بە ئیمان هێنانی تەقلیدییو کوێرانە نیە، بڕوای بە زۆرلێکردن نیە، هیچ خاوەن عەقڵو ویژدانێکی ساغیش ناتوانێ

ڕەخنەیەکی بەجێ لە ئیسلام بگرێ، بەڵام ناگونجێ ئیسلامێك کە بەراشکاویی ڕایگەیاندوە، کە خوا (عزوجل) بەندەکانی خۆی ئازادو سەرپشك کردوە، بۆ هەڵبژاردنی ئیمانو کوفر، ئیسلامێکی وا ناگونجێ دوایی لەسەر هەڵبژاردنی کوفرێك کە خوا ڕێی پێداوە، مرۆڤ سزا بدات، چونکە ڕێپێدانی لە چیو سزادانی لەچی؟! پاشان دەڵێین: ئایا ئەو کەسەی کە بۆئەوەی بە سزای هەڵگەڕانەوە نەکوژرێ، کوفرەکەی پەنهان دەکاو دەبێتە مونافیق، ئیسلامو مسوڵمانان خێرێکی لێدەبینن، ئێمە ئەگەر بڵێین: نەخێر دەبێ هەر کەس گوتی: من لە ئیسلام هەڵدەگەڕێمەوە، حەتمەن بکوژرێ، لەو حاڵەتەدا ئەوانەی کە قەناعەتیان بە ئیسلام نامێنێ، دیارە ئەوەی کە لە ڕیزی مسوڵمانان دەچێتە دەرو پەیوەست دەبێ بە ڕیزی کافرانەوەو دژایەتی ئیسلامو مسوڵمانان دەکات، ئەوە سزایەکەی دیارە.

بەڵام کەسێك کە وەك فیکر قەناعەتی بە ئیسلام نامێنێو، لەولاشەوە دەسەڵاتی ئیسلامیی دەڵێ: ئەگەر ئیعلانی کوفرەکەت بکەی، واتە: ئیعلانی ئەو قەناعەتە بکەی کە بۆت دروست بووە، کە بڕوات بە ئیسلام نەماوە، دەکوژرێی، ئایا ئەو کەسە چی دەکات؟! بێگومان لە هەزار یەك کەس ناتوانێ کوفرەکەی خۆی ئیعلان بکاو پەنهانی دەکات، جا ئایا کاتێ کە کوفرەکەی پەنهان دەکات، ئایا ئەو ئینسانە دەبێتە چی؟ بێگومان لە کافرێکی ئاشکراوە تۆ ناچاری دەکەی ببێتە کافرێکی پەنهان، کافری پەنهان کێیە؟! مونافیقە، جا ئایا بۆ ئیسلامو مسوڵمانان کافرێکی ئاشکرا زەرەری کەمترە، یاخود کافرێکی پەنهان؟! بە تەئکید کافری ئاشکرا زەرەری کەمترە، واتە: ئەگەر وەك بەرژەوەندیی ئیسلامو مسوڵمانانیش لێك بدرێتەوە، دیسان مەسەلەی سزادانی خەڵك لەسەر هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، هیچ بەرژەوەندییەکی تێدا نیە، چونکە مونافیقو دەغەڵەکان زۆر زەرەرو زیانیان زۆرترە بۆ ئیسلامو مسوڵمانان لە کافرە ئاشکرایەکان، بۆیە خوا (سبحانه وتعالى) سزای مونافیقەکانی لە قورئاندا بە سەختتر داناوە لە سزای کافرەکان، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ ﴾ النساء، واتە: بێگومان مونافیقەکان لە پلەی ژێرەوەی ئاگردان، هیچ

یارمەتیدەرێکیشیان بۆ پەیدا ناکەی، هەڵبەت بۆیەش لە بنی بنەوەدان، چونکە لە هەموو کافرەکان خراپترن،بەڵێ ،کوفری نیفاق لە هەموو جۆرە کوفرەکانی دیکە خراپترە، بۆیە سزایەکەشی توندترە، کەواتە: کاتێك کە خەڵك ناچار دەکرێ ئەو کوفرەی، کە لە دڵیدا جێگیر بووەو ئەو قەناعەت گۆڕانەی کە بۆی پەیدابووە، کە بریتیە لە بڕوانەمانی بە ئیسلام، پەنهانی بکات، ئەوە لە ڕاستییدا حاڵەتی نیفاق پەرەی پێدەدرێ.

## لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەشدا دەڵێین:

ئەو بەڵگانەی خستماننە ڕوو بایی ئەوە دەکەن، کە بە ڕوونو ڕاشکاویی بڵێین: سزای هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام بەپێچەوانەی ئەوەوە، کە زۆر باوە لە نێو مسوڵماناندا، بریتی نیە لە کوشتن و بریتی نیە لە سزایەك کە یەکدەنگیی زانایانی لەسەربێ‌و، بریتی نیە لە سزایەك وەك سزا شەرعییە دیاریکراوەکانی دیکە: سزای قەتڵو زیناو ڕێگریی‌و دزیی‌و بوختان کردن، بەڵکو مامەڵەکردن لەگەڵ دیاردەو حاڵەتی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام دا، شێوازی جۆراوجۆری پێویستەو، لە سنووری سەلاحیەتی حوکمڕانی مسوڵماناندایە، بۆ ئەوەی هەر حاڵەتە بەپێی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، ئەگەر کابرا ئیشکالی فیکریی هەیە، موناقەشەو وتووێژی لەگەڵدا بکرێ‌و، ئەگەر بە پیلانو فێڵ وادەکات، بۆ ئەوەی بەلبەلە دروست بکات، وەك خۆی‌و لە قەدەر خۆی سزا بدرێ، ئەگەر وێڕای هەڵگەڕانەوە پیلان گێڕانیشی تێدایەو، پەیوەستبوونی تێدایە بە ئەهلی کوفرەوە و دژایەتی‌و سەنگەرگرتنی لە بەرانبەر مسوڵمانان تێدایە، ئەوە با سزای پڕ بە پێست بدرێ.

هەڵبەتە من دەزانم، کە ئەم مەسەلەیە مشتومڕی زۆری لەسەر بووە، مشتومڕیشی لەسەر دەمێنێ، بەڵام هەرکەسێك بە وردی سەرنجی ئەو بەڵگانە بدات کە ئێمە خستماننە ڕوو، پێموایە دڵنیا دەبێت کە مەسەلەی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، لە بازنەی ئازادیی فیکرییدایەو، ناگونجێ خوا (سبحانه وتعالى) وە ئایینی ڕاستو حەقی خوا، ئەو مافەی مرۆڤبوونی پەکی لەسەری کەوتوە، کە بریتیە لە ئازادیی بیروڕا دەربڕینو ئازادیی هەڵبژاردنی ئایین، ئەو مافەیان لێ زەوت بکات.

## ٢) ئازادیی فێربوون و فێرکردن (حريه التعلّم والتعليم):

جۆری دووەم لە ئازادییە فیکرییەکان بریتیە لە: ئازادیی فێربوون و فێرکردن (حرية التعلم والتعليم) ئەم جۆرە ئازادییە لەلای شارەزایانی بواری یاساو دەستوور، بەم جۆرە پێناسە کراوە: (**حق الفرد في أن يُلَقِّن العلم لآخرين وحقُّه في ان يتلقي قدرًا من التعليم و حقه في أن يختار من المعلِّمين من يشاء**)[1] واتە: مەبەست لە ئازادیی فێربوون و فێر کردن، بریتیە لە مافی تاك لەو بارەوە کە زانیاری فێری ئەوانی دیکە بکات و، مافی لەوە دا، کە هەر ئەندازەیەك لە فێربوون (زانست) وەربگرێ و مافی لەوەدا، کە هەرکام لە مامۆستایان و فێرکەران، کە ئارەزوویەتی هەڵبژێرێ.

ئەم جۆرە لە ئازادییە فیکرییەکان لە شەریعەتی ئیسلامییدا، نەك هەر بۆ تێکڕای تاکەکان دەستەبەر کراوە، بەڵکو لەسەریشیان فەرز کراوە بەگشتی، ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی خوای موتەعال بکەین و تەماشای فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بکەین، ئەوە زۆر بەڕوون و ئاشکرایی دەردەکەوێ کە فێربوونی زانست و، خەڵك فێری زانست کردن بە گشتی، نەك هەر مافەو مرۆڤ تێیدا ئازادە، بەڵکو ئەرکێکەو مرۆڤ بە کەمتەرخەمیی تێدا کردنی گوناهبار دەبێت، بۆ وێنە:

١/ لە ئایەتی ژمارە (١٨٥)ی سوورەتی (الأعراف)دا خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيْءٍ وَأَنْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ ۖ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٥﴾ ﴾، واتە: ئایا سەرنجیان نەداوەتە موڵکی فراوانی ئاسمانەکان و زەویو هەرشتێك کە خوا دروستی کردوە؟! (واتە: دەبێ سەرنج لە موڵکی فراوان و پان و بەرینی ئاسمانەکان و زەوی بدەن و، هەر شتێك کە خوا دروستی کردوە، لێی ورد ببنەوە، وە تێوەی ڕامێنن ،

[1] ) النظم السياسية، ص٤٢٣.

کە دیارە لە ئەنجامی ئەوەشدا ئینسان زانیاری دەربارەی دروستکراوەکانی خوا وەدەست دێنێ.

٢/ لە (آل عمران) ئایەتەکانی: (١٩٠ و١٩١) دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ (١٩٠) الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ (١٩١) ﴾، لێرەدا خوا (سبحانه وتعالى) مەدح و ستایشی ئەوانە دەکات کە لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی‌و دیاردە سروشتییەکان ورد دەبنەوە،هاوکات لەگەڵ وردبوونەوەدا یادی خوای پەروەردگاریش دەکەن، واتە: بێگومان لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی و جێگۆڕکەی شەوو ڕۆژان دا، نیشانەی زۆر هەن بۆ خاوەن عەقڵان، ئەوانەی کە یادی خوا دەکەن بەپێوەو بە دانیشتنیانەوەو لەسەر تەنیشتیان، بیر لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی دەکەنەوە و سەرەنجام دەڵێن: پەروەردگارمان! ئا ئەمەت بە باتیڵ (بێ حیکمەت) دروست نەکردوە، پاکیی بۆ تۆ، لە سزا و ئازاری ئاگر چەپاڵەمان بدە .

٣/ هەروەها لە سووڕەتی (التوبة) ئایەتی (١٢٢)دا خوای عز وجل دەفەرموێ: ﴿...فَلَوْلَا نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنْذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ (١٢٢) ﴾، واتە: دەبوایە لە هەر کۆمەڵێکی زۆر (لە مسوڵمانان) دەستەیەکیان دەربچن بۆ بەدوای زانست دا گەڕان، تاکو لە دین دا شارەزا بن و بۆ ئەوەی کە گەڕانەوە بۆلای خەڵکەکەیان، ئاگاداریان بکەنەوە، بەڵکو ئەوانیش وریایی خۆیان وەر بگرن و، بەرچاو ڕوون بن ، کەواتە: لەسەرهەر کۆمەڵێکی زۆری مسوڵمانانان فەرزە کە کەمێك لەو کۆمەڵە زۆرە خۆیان تەرخان بکەن بۆ وەرگرتنی زانستی دینیی (واتە: شارەزابوون لە قورئان وسوننەت).

٤/ لە ئایەتەکانی: (١٥٩ و ١٦٠)ی سوورەتی (البقرة)دا خوا (سبحانه وتعالى) هەڕەشەی زۆر گەورە دەکات لە و کەسانەی کە ئەو زانستەی کە خوا پێیان دەدات دەیشارنەوەو بە خەڵکی دیکەی ڕاناگەیەنن بە ئەمانەتەوە، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ ﴾، ئایەتەکانی پێشێ دەربارەی وەرگرتنی زانست و بەدوای زانست دا گەڕان، چ زانیاری دەربارەی دروستکراوەکانی خوا، دەربارەی ئایین و بەرنامەی خوا دەدوێن، بە م ئەم دوو ئایەتە موبارەکە دەربارەی فێرکردنی زانستو زانستفێرکردنی خەڵکی، دەدوێن: دەفەرموێ: بێگومان ئەوانەی کە ئەو بەڵگە ڕۆشنانە ورێنماییەی کە ناردوومانەتە خوارەوە دوای ئەوەی لە کتێب دا بۆ خەڵکمان ڕۆشن کردۆتەوە، دەیشارنەوە، ئا ئەوانە خوا نەفرینیان لێ دەکات، هەموو نەفرینکەران نەفرینیان لێ دەکەن، (دوایی هەندێك خەڵك هەڵداوێرێ لەو حوکمە واتە: ئەوانەی لە پێشدا شاردوویانەتەوە، بەڵام دوایی دەگەڕێنەوە) جگە لەوانەی کە دەگەڕێنەوە و چاکەکاریی دەکەن و لەمەودوا ئایەتەکانی خوا،(یان ئەو زانیارییەی کە پێیانە) بۆ خەڵکی ڕوون دەکەنەوە، ئ ئەوانە گەڕانەوەیان لێوەردەگرم من زۆر تۆبە قبوڵکەرو زۆر میهرەبانم .

پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" یش لە فەرمایشتێکی دا دەفەرموێ: {**طَلَبُ الْعِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ**}(أَخْرَجَهُ ابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٢٤) قَالَ الشيخ الألباني: صحيح) واتە: بەدوای زانستگەڕان (پەیداکردنی زانیاریی) لەسەر هەموو مسوڵمانێك - (واتە نێرو مێو وردو درشت پیر و گەنج خوێندەوارو نەخوێندەوار) فەرزە، تەنیا لەسەر خوێندەواران فەرز نیە بە دوایی زانست دا بگەڕێن، بەڵکو لەسەر نەخوێندەواران فەرزە، کە بایی ئەوەندەی دینداررییەکی ڕاست بکەن، لە زانستی دینی شارەزا بن، بایی ئەوەندەی دنیادارییەکی ڕێك و پێك بکەن، لەو زانیارییانەیش ئاگادرا بن کە پەیوەندییان بە دنیادارییەوە هەیە.

زانایانی ئیسلام و شەرعزانان لە بارەی حوکمی فێربوونی زانستەوە لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە هەر زانیارییەك فەرزێکی تاکیی یان فەرزێکی عەینی یەکی لەسەری بکەوێ، دەبێتە فەرزی عەین لەسەر ئەو کەسە، بۆ وێنە: پێنج نوێژە فەرزەکان لەسەر هەموو تاك تاکی مسوڵمانان فەرزن، بۆیە بایی ئەوەندە کە مرۆڤ پێنج فەرزە نوێژەکانی بکات، بەو شێوەیەی کە شەریعەت لێی داوا کردوە، لەسەری پێویستە کە زانیاری ڕاست و دروستی شەرعیی پەیدا بکات لە بارەی پێنج نوێژە فەرزەکانەوە، هەروەها کاتێك کەسێك زەکاتی لەسەر فەرز دەبێت، لەسەری پێویستە زانیاری لە بارەی زەکاتدانەوە هەبێ، چۆن زەکات فەرز دەبێ؟ بەکێ دەدرێ؟ لە چەندی چەند دەدرێ؟ لە چی دەدرێ؟ پێویستە زانیاری تەواو پەیدا بکات ، هەروەها دەربارەی هەمو ئەرکە شەرعییەکانی دیکە .

بەڵێ ئەو شتانە کە لەسەر ئینسان فەرز دەبن، ئەگەر فەرزی عەین (فرض العين) بن، واتە: پەیوەندییان بە خودی ئینسانەوە هەبێ، بە تاکتاکی مسوڵمانانەوە هەبێ، ئەوە ئەو زانیارییە کە بەبێ وی ئەو فەرزە جێ بەجێ نابێ، دەبێتە فەرزی عەین، بەلاّم ئەگەر ئەرکەکان فەرزی کیفایە بن، واتە: فەرزێکی گشتی بن، ئەوە پەیداکردنی ئەو زانیارییە، چ زانیاریی دینداریی بێ، چ دنیاداریی، لەسەر کۆی مسوڵمانان دەبێتە فەرزی کیفایە، واتە: ئەگەر کۆمەڵێکیان پێی هەڵسان، گوناه لە سەر ئەوانی دیکە لادەچێ، بۆ وێنە: ئێستا مسوڵمانان، ئوممەتی پێغەمبەری خوا "صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ" هەزاران جۆرە شت هەیە، کە ناتوانن بۆ خۆیان دروستیان بکەن و پەیوەندییان بەژیانیانەوە هەیە، تەکنۆلۆژیای مەدەنیی، تەکنۆلۆژیای عەسکەریی، کەلوپەلەکانی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ، کە پێویستی پێیانە، مسوڵمانان لە غەیری خۆیانەوە وەریان دەگرن، لەسەر هەموو ئەوانە، مسوڵمانان گوناهبارن، دیارە بە ئەندازەی ئەوە کە کەمتەرخەمییان تێدا کردوە، هەر کەسە بە قەدەر ئەوە کە کەمتەرخەمیی تێدا کردوە، گوناهبارە ، ئەوەی کە گوتم هەرکام لە: (أبو حامد الغزالي) ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە (إحياء عُلوم الدين)[1]

---

[1]) ج١ ص١٦.

داو (الشـاطبِي)یـش لـه كتێبـی (الموافقـات)[1]دا ئـەو ڕاسـتییەیان ڕوون كردۆتـەوە، زانایانی دیكەش باسـیان كـردوە، كـە مەسـەلەی پەیـداكردنی زانیـاریی، چ زانیـاریی دینداریی بێ، چ هی دنیاداریی، حوكمەكەی بە پێـی ئـەو شـتە كـە پـەكی لەسـەر ئـەو زانیارییە كەوتوە، دەگۆڕێ، ئەگەر كارەكە فەرز بێ، ئەو زانیارییەش كـە پـەكی لەسـەری كەوتوە، فەرز دەبێت، ئنجا ئەگەر فەرزی عەین بێ، دەبێتە فەرزی عەینو ئەگـەر فـەرزی كیفایەش بێ، دەبێتە فەرزی كیفایە، ئەگەر سوننەت بێ، ئەویش دەبێتە سوننەت، ئەگـەر تەنیا ڕەوا بێت، ئەو جۆرە زانیارییەش حوكمی پەیداكردنی دەبێتە ڕەوا (مباح).

### ٣) ئـازادیـی دەربـڕینـی بیـروڕا:

جۆری سێیەمی ئازادییە فیكرییەكان: بریتیە لە: ئازادیی دەربڕینـی بـیروڕا، ئـەمیش وەك سەرجەم مافەكانی دیكە لە ڕوانگەی شەریعەتەوە، بەر لەوەی ماف (حق) بـێ ئـەرك (واجب)ە، ئینسانی مسوڵمان لەسەر كەمتەرخەمیی تێدا كردنی گوناهبار دەبـێ، واتـە: هەر كەسێك ڕاستییەك دەزانێ، بیرۆكە و قەناعـەتێكی هەیـە، كـە بـە هـەق و ڕاسـتی دەزانێو پێی وایە كە بۆ مسوڵمانان، بۆ كۆمەڵگا پێویستە بخرێتە ڕوو، ئـەوە نـەك هـەر ئازادە بیرو ڕایەكەی بخاتە ڕوو، بەڵكو لەسەریشی فەرزە، مادام پێی وا بێ ئـەو بـیرو ڕاو بۆچوونە پێویستە بۆ مسوڵمانان بخرێتە ڕوو.

ئنجا ئازادیی دەربڕینی بیرو ڕا، دوو بنەمای سەرەكی هەن:

یەكەم: بنەمای ڕاوێژكردن: كە وەك پێشتر باسمان كرد ڕاوێژكردن بناغەی بەڕێوە بردنی كاروباری كۆمەڵگای مسوڵمانە، بناغەو سەرچاوەی وەرگرتنی بڕیـارە، وەك خـوای زانا دەفەرموێ:﴿... وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾﴾ الشـوری: واتـە: كاروباریان لە نێو خۆیان دا بە ڕاوێژە ، دیارە لە ئەنجامی ڕاوێژكردنیش دا، بـیروڕا گۆڕینەوە و بیرو بۆچوون و دەربڕین، پێویست دەبێ، ئەگـەرنا خـەڵك چـۆن بتـوانێ بزانێ داخۆ فـلان كـەس لـەو بـارەوە هەڵوێسـتی چـۆنەو بـیروڕای چییە؟ ئەگـەر بیروڕایەكەی خۆی دەرنەبڕێ!.

---

[1]) ج٢ ص ١٠و ١١.

دووەم: بنەمای دووەم، کە ئازادیی دەربڕینو خستنە ڕووی بیروڕای پێوە پەیوەستە، فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپەیە (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر) کە ئەویش ئەرکی سەرشانی سەرجەم مسوڵمانانە، وەك خوا (سبحانه وتعالى) لەئایەتی ژمارە (٧١)ی سوورەتی (التوبة)دا فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ...﴿٧١﴾ ﴾، واتە: پیاوانی بڕوادار و ئافرەتانی بڕوادار هەندێکیان دۆست و پشتیوانی هەندێکیانن، فەرمان بە هەرچی شتی پەسەندە دەکەن، ڕێگریی لە هەرچی شتی ناپەسەندە دەکەن، ئنجا ئایا مرۆڤ چۆن فەرمان بە چاکە دەکاو ڕێگریی لە خراپە دەکا، ئەگەر ئازاد نەبێ لە دەربڕینی بیروڕا و بیرو بۆچوونەکانیدا ؟!.

شایانی باسیشە شارەزایانی بواری ماف و ئازادییەکان، لێرەدا بە جیا باسی ئازادیی ڕۆژنامەگەریی (حرية الصحافة)یان کردوە، بەڵام من بە پێویستم نەزانی، چونکە لە ڕاستیدا دەربڕینی بیرو ڕا، پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بەلایەنی صەحافەوە هەیە، واتە: بە هەموو جۆرەکانی ڕاگەیاندن، چ ڕۆژنامەو گۆڤار، چ فاکس، چ ئەنتەرنێت، چ کەناڵەکانی تەلەفزیۆن و ڕادیۆ، چونکە کە دەڵێین: ئازادیی بیرو ڕاو بیروبۆچوون خستنە ڕوو، مافێکە بۆ هەمووکەس دەستەبەر دەکرێ، کەواتە: هەر شێوازو هۆکارو ئامرازێك ئەو دەربڕینە پەکی لەسەری کەوت، مانای وایە ئەویش هەمان حوکمی هەیە، چونکە بنچینەیەکی شەرعییە (مَا لاَ يَتِمُّ الْوَاجِبُ إلاَ بِهِ فَهُوَ وَاجِبٌ)، هەر شتێك فەرزێك پەکی لەسەری کەوتبێ ئەویش فەرز دەبێ، واتە: ئەگەر ئێمە بۆ خستنە ڕووی بیرو ڕاو بۆچوونەکانی خۆمان پەکمان لەسەر تەلەفزیۆن کەوت، لەسەرمان پێویست دەبێ ئەویش پەیدا بکەین، ئەگەر پەکمان لەسەر ڕادیۆ کەوت، یان لەسەر ڕۆژنامەو گۆڤار، یان ئەنتەرنێت کەوت، یان شانۆو سینەما پەکمان لەسەر هەر ئامرازو هۆکارێگ کەوت، دابینکردن و دەستەبەر کردنیو بەکارهێنانی ویش، نەك هەر دەبێتە ماف، بەڵکو دەبێتە فەرزو ئەرکیش.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە لە داهاتووشدا لە کاتی توێژینەوەی بنەمای نۆیەمی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامییدا، جارێکی دیکە دێینەوە سەر ئەم بابەتە، بۆیە لێرەدا کۆتایی باسی: ئازادیی دەربڕینی بیروڕا، بەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم) دێنین، کە دەفەرموێ: **{لاَ تَكُونُوا إِمَّعَةً، تَقُولُونَ: إِنْ أَحْسَنَ النَّاسُ أَحْسَنَّا، وَإِنْ أَسَاءُوا أَسَأْنَا، وَلَكِنْ وَطِّنُوا أَنْفُسَكُمْ إِنْ أَحْسَنُوا أَنْ تُحْسِنُوا، وَإِنْ أَسَاءُوا أَلا تَظْلِمُوا}** (أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٢٠٠٧) وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيب، وَضَعَّفَهُ الشيخ الألباني، وَالبَزَّار برقم: (٢٨٠٢)، عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ عَنْ حُذَيْفَةَ رَضِيَ الله عَنْهُ)، پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەرسێکی زۆر گەورە دەداتە ئێمەی مسوڵمانو ئامۆژگارییەکی چاکمان دەکات ،بە تایبەت لەمڕۆژگارەدا زۆر پێویستە لە گوێ بگیرێ، دەفەرموێ: ئێوە لەگەڵ لەگەڵ مەبن! (واتە: هەروا لەڕەشڕا بە بێ بەرچاو ڕوونیی ڕەگەڵ خەڵك مەکەون، (إمَّعة) لە زمانی عەرەبیدا کەسێکە هەروا لەگەڵ خەڵك دەڕواتو بەدوای خەڵك دا دەچێ، بێ ئەوەی ورد بێتەوە)، دوایی دەفەرموێ: بڵێن ئەگەر خەڵك چاکەی کرد ئێمەش چاکە دەکەین، ئەگەر ستەمیشیان کرد، ئێمەش ستەم دەکەین، بەڵکو دڵی خۆتان لەسەر ئەوە بچەسپێنن ئەگەر خەڵك چاکەیان کرد، ئێوە هەر چاکە بکەن، ئەگەر خراپەیان کرد، ئێوە ستەم نەکەن (و لەسەر چاکەی خۆتان بەردەوام بن).

## ٤) ئـازادیی کـۆبـوونـەوە:

ئەم جۆرەیان لە ئازادییە فیکرییەکان، کە بریتیە لە ئازادیی کۆبوونەوە جۆری چوارەم و کۆتاییە، مەبەست لە ئازادیی کۆبوونەوەش ئەوەیە کە تاکەکانی کۆمەڵگای ئیسلامیی، بۆیان هەیەو ئازادن لە خڕبوونەوە و کۆبونەوە (التجمّع والإجتماع)، خڕبوونەوە (تجمع)یش مەبەستم پێی ئەوەیە، کە خەڵك هەر لە خۆوە کۆدەبێتەوە بەبێ ڕێکخستنو بەرنامە، شێوەیەکی هەڕەمەکیی کۆدەبنەوە، بەڵام بۆ مەبەستێکی ڕەوا، ئەوە دەبێ ڕێ پێدراو بێ، جاری واهەیە بە شێوەیەکی بەرنامە بۆ داڕێژارو کۆدەبنەوە، کە ئەوە پێی دەگوترێ: کۆبوونەوە (اجتماع)، لە هەردوو حاڵن دا: خڕبوونەوە و کۆبونەوە بۆ تاکەکان، مافێکی ڕەوایە، ئایا خەڵك بۆچی کۆدەبنەوە؟ بێگومان بۆ وتوویژ کردنو بیرو ڕا گۆڕینەوەو کۆڕ و

سیمناربەستن ، بەڵکو جاری وا هەیە بۆ پێکهێنانی کۆمەڵەی جۆراو جۆر، چ کۆمەڵەی مەدەنیی بێت، یان ڕێکخراوی سیاسیی، بەمەرجێك ئەوانە هەموویان بۆ هێنانە دی ئامانجێکی دیاریکراوو ڕەوا بن، بەڵکو جاری وا هەیە خڕبوونەوەو کۆبوونەوە بۆ بیروڕاگۆڕینەوە نیە، بەڵکو تەنیا بۆ پێشاندانی نارەزاییە، کە لەشێوەی ڕێپێوان و خۆپێشانداندا بەرجەستە دەبێ.

دیارە ئەم مافە ئەوەش دەگرێتەوە، کە دەبێ هەموو تاکێك ئازاد بێ لە پەیوەندییکردن، یاخود پەیوەستبوون بەهەر ڕێکخراوێکی مەدەنیی، یان سیاسی یەوە، کە ئامانجەکانیان ئاشتییانەن، شێوازی توندو تیژو زۆر لێکردن لە گرتنە خۆی، ئەندامانـدا بەکارناهێنن. وەك خاوەنی (النظم السیاسیة) گوتوویەتی[1]: ئنجا ئەم ماف و ئازادییەش لەڕوانگەی شەریعەتەوە، دیسان نەك هەر دەستەبەر (مکفول)کراوە، بەڵکو جاری وا هەیە پێویستیش کراوە .

وە لە ڕاستیدا دەتوانین بڵێین ئەم مافی: ئازادیی خڕبوونەوەو کۆبوونەوە، مادام بۆ مەبەستێکی ڕاست و ڕەوا بێت، حوکمەکەی لە نێوان چوار حاڵەت دایە:

١) فەرزە (فەرزی عەین) ئەگەر ئەو مەبەستە پێیوست بێ و پەکیشی لەسەر تاکتاکی ئەو خەڵکە کەوتبێت، ئەو کاتە لەسەر تاکتاکیان دەبێتە فەرزی عەین کە کۆببنەوە، یان خڕببنەوە، یان خۆپێشاندان، یان ڕێپێوان بکەن.
٢) فەرزی کیفایەیە، ئەگەر ئەو ئامانجە کە بۆی گرد یان کۆدەبنەوە، پێویست بێ و بە هەندێك لە کۆمەڵگا و خەڵکەکە جێ بەجێ بکرێ، ئەو کاتە دەبێتە فەرزی کیفایە.
٣) وە پەسەند (مەندوب) دەبێ ئەگەر ئامانجی کۆبوونەوە یان گردبونەوەکە شتێکی باش و پەسەند بێ.
٤) وە ڕەوا (مباح) دەبێ، ئەگەر ئامانجەکە شتێکی ڕەواو بێ زیان بێ.

---

[1]) ص ٤٢٦.

ئنجا بەڵگەمان لەسەر ئەوە چیە ؟ بەڵگەمان ئەو دوو بنچینە شەرعییەن کە پێشتریش چەند جارێك ئاماژەمان پێداون:

یەکەم: (للوسائل حكم المقاصد) ئامرازەکـان حـوکمی ئامانجـەکانیان هەیـە، ئەگـەر ئامانجەکە فەڕز بوو، بەکارهێنانی ئەو ئامرازەش فەڕزەو، ئەگەر سوننەت بوو سوننەتەو، ئەگەر ڕەوا بوو ڕەوایە، وە ئەگەر ئامانجەکە شتێکی قەدەغــەو خـراپ بێـت، دیـارە ئـەو ئامراز و هۆکارەش، هەمان حوکم وەردەگریّو قەدەغە دەبێت.

دووەم: (مَا لاَ يَتِمُّ الْوَاجِبُ إلاّ بِهِ فَهُوَ وَاجِبٌ) هەر شتێك پێویستییەك پـەکی لەسـەری بکەویّ، ئەویش پێویست دەبیّ.

هەڵبەتە لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا پێویستیمان بەوە نیە، کە بـۆ هـەر مەسـەلەیەك ئایەتی خوای پەروەردگار وفەرمایشتی پێغەمبەری خـوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ"ی لەسـەر بێنینــەوە، چـونکە پێشــتر باسمــان کـرد ، کـە لــە بــواری هەڵســوکەوتەکاندا ئەسـڵ ڕەواییەو،دوایی دەبیّ سەرنج بدریّ، کە ئایا ئەو ڕەوابوونە هۆکاری دیکە وای لێکردوە کـە بیباتە قۆناغی سوننەت بوون،یان فەڕز بوون، یان بە پێچەوانەوە، هۆکارێك وای لێکـردوە کە بیکاتە شتێکی ناپەسەند، یان قەدەغە، ئەگەرنا، بواری هەڵسوکەوتەکان، ئەسڵ تێیـدا ڕەوایی و ڕێپێدرانە.

بەڵام وێڕای ئەوەش، خوای کاربـەجیّ لەئایـەتی ژمـارە (٦٢)ی سـووڕەتی (النـور)دا بۆمـان ڕووندەکاتەوە، کە کۆمـەڵبوونی مسوڵمانان بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی شەرعیی فەڕزە و،بەجێهێشتنی ئەو کۆمـەڵبوونە، یان ئەو خڕبوونەوە و گردبونەوەیە، بەبێ مۆڵەتو ئیزنی بەرپرس، شتێکی قەدەغە و ڕێلێگیراوە، وەك خوا (سبحانه و تعالى) دەفـەرمویّ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾﴾النـور، واتــە: بێگومــان بـڕواداران ئـەو کەسـانەن ( تـەنیا ئـەو کەسـانە بـڕواداری ڕاستەقینەن )کە بڕوایان بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی هێنـاوە، کاتێـك ،کـە لـە خزمـەت

پێغەمبەری خوادا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمْ"دەبن بۆ کارێکی کۆکەرەوە ( واتە: کارێك و ئەرکێك کە پێویست بکات هەموویانی بۆ کۆببنەوەو داخوازیی ئەوە دەکات کە هەموویان کۆبکاتەوە) ناڕۆن تاکو مۆڵەتی لێوەرنەگرن (واتە: ئەو کۆبوونەوەو کۆمەڵبوونە واز لێناهێنن، تاکو مۆڵەت وەرنەگرن) بێگومان ئەوانەی کە مۆڵەتت لێوەردەگرن، ئا ئەوانە بڕوایان بەخواو بە پێغەمبەرەکەی هێناوەو ، ئنجا هەرکات بۆ هەندێك لە کاروباریان مۆڵەتیان لە تۆ وەرگرت، هەرکامێکیانت ویست مۆڵەتی بدەو داوای لێبوردنیشیان بۆ لە خوا بکە، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە خوای بێ نیاز، وێڕای ئیمان و عەقیدەو بڕوابوون بەخواو پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمْ"،مەرجێکی دیکەشی داناوە (کە لێرەدا جەوو سیاق دەیخوازێ) ئەو مەرجەش ئەوەیە، کە دەبێ هەرکاتێك پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمْ"فەرمانی پێکردن، کۆببنەوە،هەتاکو ئەویش مۆڵەت نەدا، ئەو کۆمەڵبوونەو ئەو کارە هەرەوەزییە بەجێ نەهێڵن.

جا ئەمە دیارە تەنیا تایبەت نیە بە پێغەمبەری خواوە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمْ"،چونکە زانایان هەموو لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە هەموو ئەو ئەرکە شەرعییانەی خوای بەرز لە قورئاندا ئاڕاستەی پێغەمبەری خۆی "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمْ"ی کردوون، وێڕای وی، هەموو ئەو بەرپرسانەش، کە لە جێی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمْ" دادەنیشن (واتە: ئەوانەی کە ئەرکی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمْ" لە نێوان خۆیاندا جیبەجێ دەکەن، کە بریتیە لە جێبەجێکردنی شەریعەت و لەسەرپەرشتی کردنی کۆمەڵگا) هەموو ئەو ئەرکانە دەچنە ئەستۆی ئەو بەرپرسانەشەوە، کە لە شوێنی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمْ" دانیشتوون و بە ڕێی ئەودا دەڕۆن، مەگەر بەبەڵگەیەکی دیاری کراوو ڕوون، بێ چەند و چوون ئەو شتە تایبەت کرابێ بە پێغەمبەری خواوە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمْ"، کە بێگومان لێرەدا هیچ نیشانە (قرینة)و بەڵگەیەك نیە لەو بارەوە.

ئنجا شایانی باسە کە ئێمە لە باسی مافە سیاسییەکاندا ،کە جۆری شەشەم و کۆتایی ماف و ئازادییەکانە، جارێکی دیکە باسی ئەم مەسەلەیەی ئازادیی کۆبوونەوە دەکەین، بەڵام لێرەدا تەنها بەو بۆنەیەوە قسەمان لێکرد، کە زۆر جار لە ڕێی کۆڕ و

كۆبوونەوەكانەوە، بیروڕاو بۆچوونەكان دەخرێنە ڕوو ، لێرەدا كۆتایی بە توێژینەوەی خۆمان لە بارەی ئازادییە بیرییەكان دێنین و دەچینە سەر جۆری چوارەمی ماف و ئازادییەكان، كە بریتیە لەماف‌و ئازادییە ئابوورییەكان.

## جۆری چوارەم: ماف و ئازادییە ئابوورییەكان:

ئەمە جۆری چوارەمی ماف و ئازادییەكانە، كە لە شەریعەتی ئیسلامییداو لە دەوڵەتی ئیسلامییدا بۆ هەموو تاكێك دەستەبەر دەكرێن .

ئەمیش شارەزایانی یاسا بەمجۆرە پێناسەیان كردوە: (حرية التملّك أو حق الملكية الفردية وحرية التجارة والصناعة)[1] واتە: ئازادیی شت هەبوون، یان مافی خاوەنداریّتی تاكی‌و ئازادیی بازرگانیی‌و ئازادیی پیشەسازیی.

ئەمە یەكێكی دیكەیە لەو ماف و ئازادییە بنەڕەتییانەی، كە شەریعەتی ئیسلام بۆ هەموولایەكیان دەستەبەر دەكات، ئنجا ئێمە لە چەند خاڵێكدا ڕوونی دەكەینەوە، كە هەڵوێستی شەریعەت دەربارەی ماف و ئازادییە ئابوورییەكان چۆنە؟

هەڵبەتە ئێمە لێرەدا نامانەوێ باسی سیستەمی ئابووریی ئیسلامیی بكەین، بەڵكو تەنها لەو گۆشە نیگایەوە تەماشای ئەو مەسەلەیە دەكەین، كە لە شەریعەتی ئیسلامییدا، لە ڕووی ئابوورییەوە چۆن تەماشای ئازادیی مرۆڤ دەكرێ و، مافە ئابوورییەكان، كە ئیسلام دەستەبەریان دەكات بۆ تاكتاكی كۆمەڵگا، چین و چۆنن؟.

**یەكەم: خاوەنداریّتی (الملكية) مافێكی ڕەواو دانپێداهێنراوە بۆ هەمووتاكێك، ئەم ڕاستییەش لە چەندان ئایەتی قورئاندا ڕاگەیاندراوە:**

١/ بۆ وێنە خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٧٩)دا دەفەرموێ:

﴿... وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾﴾،

لە بارەی سوود خۆرییەوە، خوا دەفەرموێ: ئەگەر وازتان لە سوود خواردن هێنا، ئەوە سەرمایەكانی خۆتان بۆ خۆتان،نە ستەم بكەن‌و نە ستەمیشتان لێ بكرێ، نەزوڵم بكەن ڕیبا و زیادە لە خەڵك وەربگرن، نەزوڵمیشتان لێ بكرێ، بەوە كە

---

[1] ) النظم السياسية، ص ٣٧٧.

دەستمایەکەشتان بفەوتێ‌و خەڵك سەرمایەکەتان کە بەقەرز داوتانە، نەتانداتەوە. دەبینین لێرەدا خوای دادگەر، زۆر بە ڕوونیی دەفەرموێ: سەرمایەکانی خۆتان بۆ خۆتان.

٢/ هەر لە سووڕەتی (البقرة) ئایەتی (٢٧٤)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٤﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی ماڵ و سامانەکانی خۆیان بە شەوو بە ڕۆژ، بەئاشکراو بەنهێنی خەرج دەکەن (لە پێناوی خوادا) ئائەوانە پاداشتی خۆیان لە لای پەروەردگاریان هەیەو، نەترسیان لەسەرەو نەپەژارە دادەگرن . لێرەشدا خوای کاربەجێ ماڵ و سامانەکانی پاڵ داوەتە لای مرۆڤەکان، دەفەرموێ: ماڵ و سامانەکانی خۆیان (أموالهم).

٣/ هەر لەسووڕەتی (البقرة)لە ئایەتی (١٨٨)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ ...﴿١٨٨﴾ ﴾، واتە: ماڵو سامانەکانی خۆتان لە نێوخۆتاندا بە ناحەق مەخۆن، واتە: شێوازێك لە کڕینو فرۆشتن ومامەڵە بەکار مەهێنن، کە لە شەریعەت دا قەدەغە بێ، کە دیارە شەریعەت هەموو ئەو شێوازانەی کە زیان بە هەردووك لا، یان بەلایەکیان دەگەیەنن، قەدەغەی کردوون، وەك قومارو دزییو داگیرکردنو...هتد.

٤/ هەروەها خوا (سبحانه وتعالى) لە سووڕەتی (آل عمران) لە ئایەتی (١٨٦)دا دەفەرموێ: ﴿لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ...﴿١٨٦﴾ ﴾، واتە: بە تەئکید تاقی دەکرێنەوە لە ماڵو سامانتاندا و، لە نەفسی خۆشتان دا. وەك دەبینین لێرەشدا خوای پەروەردگار ماڵ وسامانەکانی پاڵداوەتە لای مرۆڤەکان خۆیان.

کەواتە: خاوەندارێتیی موڵکایەتیی، لە شەریعەتی ئیسلامییدا ، مافێکی ڕەوا و دانپیداهێنراوە.

**دووەم: مرۆڤــ خــاوەنێکی کــاتیی و زوو تێپــەڕەو، خــاوەنی ڕاســتەقینەو هەمیشەیی، بەس خوایە:**

بەڵێ، لەگەڵ ئەو ڕاستییەشدا لە شەریعەتی ئیسلامییدا و لــە ڕوانگــەی ئیســلامەوە، مرۆڤــ تەنیا خاوەنێکی کاتیی و زوو تێپەڕی مــاڵ و ســامانەکەی خۆیــەتی، خــاوەنی ڕاستەقینەی هەمیشەیی، تەنها خوای پەروەردگارە ، ئەمەش ڕاستییەکی دیکەیە کە خــوا لەگەلێك لە ئایەتەکاندا ڕایگەیاندوە، تــاکو هــیچ کەســێك وا نــەزانێ، کــە تــاکو قــامی قیامەت ئەو ماڵ و سامانەی بە دەســتەوە دەمــێنێ و، دەوڵەمەنــدیی یــاخی نــەکات و، لەخۆی بایی نەکاتو، بزانێ ئەو ماڵ و سامانە، سپاردەیەکە بۆ ماوەیەکی کــەم و کــاتیی بەدەستیەوەیە، با لەو بارەوە سەرنجی ئەم چەند ئایەتە بدەین:

١- لە ســووڕەتی (الحدیــد) ئایــەتی (٧)دا خــوا دەفــەرموێ: ﴿ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِ ...﴿٧﴾﴾، واتـــــە: بـــــڕوا بـــــەخواو پێغــەمبەرەکــەی بێنن و لەوەدا ببەخشن، کە خوا ئێوەی تێدا کردۆتە جێنشــین، واتە: لە ئەسڵدا هی خۆتان نیەو هــی خوایــە، بــەڵام ئێــوەی لــەوماڵ وســامانە دا کردۆتە جێنشینی خۆی، بزانێ چی پێ دەکەن.

٢- لە سووڕەتی (النــور) ئایــەتی (٣٣) دا دەفــەرموێ: ﴿ ...وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ ءَاتَىٰكُمۡۚ ...﴿٣٣﴾﴾، واتە: لەو مــاڵ و ســامانەی خوا، کــە بــە ئێــوەی داوە، پێیــان ببەخشــن (بەوانــەی کــە لــە ئایەتەکــەدا فــەرمانیان پێکــراوە)، کەواتــە: سامانەکەتان هی خۆتان نیەو لە ئەسڵدا خاوەنەکەی خوایە .

٣- هەروەها لە سووڕەتی (الطــلاق) ئایەتی (٧)دا دەفــەرموێ: ﴿ لِيُنفِقۡ ذُو سَعَةٖ مِّن سَعَتِهِۦۖ وَمَن قُدِرَ عَلَيۡهِ رِزۡقُهُۥ فَلۡيُنفِقۡ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُۚ...﴿٧﴾﴾، واتە: با بابای هەبوو، کە ماڵ و سامانی فراوانی هەیە لە قــەدەر مــاڵ و ســامانی فراوانــی خــۆی خــەرج بکات، هەرکەسێکیش ڕۆزییەکەی لێ تەنگکرایەو لێی کەمکرایەوە، با لەوەی کــە خوا پێی داوە (لە کەمی کەم لە زۆری زۆر) ببەخشێت.

**سێیەم: خاوەنداریێتی، حورمەتی تەواوی هەیەو هیچ کەس بۆی نیە لەبارەی ماڵو سامانی خەڵکەوە، سنوورشکێنیی بکات:**

بنەمایەکی دیکە دەربارەی تێڕوانینی شەریعەت بۆ لایەنی ئابووریی و ئازادیی مرۆڤـ لە بواری ئابوورییدا، ئەوەیە کە خاوەنداریێتیی، حورمەتێکی تەواوی هەیە لە شەریعەتدا، هیچ کەس بۆی نیە لە بارەی ماڵ و سامانی خەڵکەوە، خەت خوار بکاو سنوور شکێنیی بکات، لەوبارەوەش هەم دەقی قورئانی بەڕێز زۆرنو، هەم فەرمایشتی پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم". بۆ وێنە:

١/ خوای بەرزو مەزن لە سوورەتی (النساء) ئایەتی ژمارە (٢٩)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡۚ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا ٢٩ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ماڵ و سامانی خۆتان لە نێو خۆتان دا بە ناحەق مەخۆن، مەگەر بازرگانییەك بێ لە ڕووی ڕەزامەندیی هەردوولاوە (یان هەموو لایەکانەوە ئەگەر لە دوو لا زیاتر بوون) ،خۆتان مەکوژن. بێگومان خوا لەگەڵتان دا بەبەزەییە، لێرەدا توێژەرەوانی قورئانو زانایان دەڵێن: خوای کاربەجێ ماڵی یەکدی بە ناحەق خواردنی، لەگەڵ یەکدی کوشتن، خستۆتە دوو تـ ی تەرازوویەکەوە ، کەواتە: خاوەنداریێتی لە ئیسلامدا، ئەوە کە مرۆڤـ خاوەنی فلاَن شتەیە، لە ئیسلام دا زۆر جێگەی ڕێز و حورمەتە، ئەوەتا خوای دادگەر وەك چۆن خوێنڕژاندنی مسوڵمانانی لەسەر مسوڵمانان قەدەغە کردوە، بە هەمـ ن شێوەیش ماڵخواردنیشیانی قەدەغەکردوە.

٢/ پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" یش لەوەبارەوە ئەم فەرموودەیەی هەیە، کە بوخاریی و موسلیم لە (عبدالله بن عمر و جابر بن عبدالله)وە (خوا لە هەموویان ڕازی بێ)، هێناویانە، فەرموویەتی: **{إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ إِلَى أَنْ تَلْقَوْا رَبَّكُمْ}**(أَخْرَجَهُ أحمد برقم: (٢٠٤٣٥)، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح) واتە: بێگومان خوێنتانو ماڵ وسامانتان لەسەرتان قەدەغەیە، هەتا ئەوکاتەی دەگەنە پەروەردگارتان، لێرەدا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دیسان خوێنو ماڵ و

سامانی بە یەکەوە باس کردوون، کە لەسەریان قەدەغەیە، واتە: نابێ بە ناحەق خوێنی یەکدی بڕێژن، نابێ بە ناحەق ماڵ و سامانی یەکدیی بخۆن.

٣/ هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەدا، کە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: {كُلُّ اَلْمُسْلِمِ عَلَى اَلْمُسْلِمِ حَرَامٌ، دَمُهُ، وَمَالُهُ، وَعِرْضُهُ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٧١٣)، ومُسْلِمٌ برقم: (٢٥٦٤))، واتە: هەموو شتێکی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان قەدەغەیە: خوێنیو ماڵی و کەرامەت و ئابڕووی، واتە: بۆی نیە دەستدرێژیی بکاتە سەر خوێنیو بیکوژێ و، بۆی نیە دەستدرێژیی بکاتە سەر ماڵو سامانی لێی بدزێ، یان لێی بستێنێ، بۆی نیە دەستدرێژیی بکاتە سەر کەسایەتیی و ئابڕوویو بیڕووشێنێ، یان ناشیرینی بکات، ئنجا هەموولایەك دەزانین کە خوای دادگەر سزای ڕێگرییو سزای دەستبڕینی بۆ کەسانێك داناوە، کە هەڕەشە لە ماڵ وسامانی خەڵکی دەکەن.

**چوارەم: شەریعەت هەوڵیداوە ماڵو سامانی خەڵکی سەلامەتو پارێزراو بێ:**

هەرچەندە مافی موڵکایەتیی و ئازادیی ئابووریی حەقێکی سەلمێنراوە لە شەریعەت دا، بۆ هەموو کەسێك، بەڵام شەریعەت بۆ ئەوەی ڕێگا بگرێ لە زیانگەیاندنی تاکی ساماندار بە کۆمەڵگا لەبواری ئابووریدا، لە هەر چوار بواری: پەیداکردن و گەشەپێدان وبەکارهێنان و خەرجکردندا (الإيجاد والتنمية والإستهلاك والإنفاق) چەند بەند و مەرجێکی داناوە بۆ ڕێ لێگرتنی تاك لە زیانگەیاندن بە بەرژەوەندیی گشتی، کە بۆ نموونە لەم دەقانەی قورئان و سوننەت دا بە ئاشکرا ئەو مەرج و بەندانە دەبینین:

١/ خوا لە سوورەتی (البقرة) لە ئایەتی (٢٧٥) دا دەفەرموێ: ﴿... وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ ... ﴿٢٧٥﴾﴾ واتە: خوا کڕینو فرۆشتنی حەڵاڵ کردوە، بەڵام سوود خۆریی قەدەغە کردوە.

٢/ لە سوورەتی (البقرة) لە ئایەتی (٢٦٧)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ ... ﴿٢٦٧﴾﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! لەو ڕۆزییە پاكو چاکەی، کە بە حەڵاڵیی پەیداتان کردوە ببەخشن.

٣/ لەسوورەتی (النساء) لە ئایەتی (٢٩)دا کە پێشتریش هێناومانە، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ ﴿٢٩﴾ ﴾، کەواتە: ماڵی یەکدی بە ناحەقخواردن قەدەغەیە.

٤/ لە سوورەتی (الفرقان) لە ئایەتی (٦٧)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمْ يُسْرِفُواْ وَلَمْ يَقْتُرُواْ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی کە کاتێك ماڵی خۆیان خەرج دەکەن، نە زێدەڕۆیی دەکەن، نە ڕژدیی‌و چرووکیی دەکەن، لەو نێوەڕاستەدا بە شێوەیەکی هاوسەنگانە ڕەفتار دەکەن.

٥/ لە سوورەتی (البقرة) لە ئایەتی (٢١٥)دا دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ۖ قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ۗ وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢١٥﴾ ﴾، واتە: لێت دەپرسن: چی خەرج بکەن، چ جۆرە ماڵێك؟ بڵێ: هەرماڵ و سامانێکی خەرجتان کرد، با بۆ دایك و بابتان بێت، ئنجا بۆ خزم و نزیکانتان، ئنجا بۆ هەتیوان، ئنجا بۆ هەژاران، ئنجا بۆ ڕێبواران .

٦/ پێغەمبەری خوا "صَلَی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَم" لە فەرمایشتێکدا کە بوخاریی‌و موسلیم هێناویانە دەفەرموێ: **{الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وابدأ بمن تعول}** (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٠٧٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٤٣٣)) واتە: دەستی بەرز چاکترە لە دەستی نزم (واتە: دەستی بەخشەر لە دەستی وەرگر باشترە)، بەوەش دەست پێبکە، کە بەڕێوەبردنی و ژیان گوزەرانی لەسەر تۆیە.

**ئینجا شەریعەت چوار بنەمای گرنگی داناون، بۆ ڕێگرتن لە دەرهاویشتە خراپەكانی موڵكایەتیی وسامانداریێتیی:**

١/ كورتهەڵنەهاتنی سامان و دارایی لە دەستی دەوڵەمەنداندا، شەریعەت ڕێی لەوە گرتوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ ...كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡۚ ... ﴿٧﴾ ﴾ الحشر، واتە: با ماڵ و سامان لە دەستی دەوڵەمەندانتاندا كورتهەڵنەیەت.

٢/ دەبێ سەرچاوە سروشتییەكان، موڵكی هاوبەش و گشتی هەموو لایەك بن و نەكرێنە موڵكی تایبەت، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ﴿١٠﴾ ﴾ الرحمن، واتە: خوا سەرزەوی داناوە بۆ تێكڕای خەڵكی ، واتە: بۆ هەموو خەڵكی، نەك بۆ هەندێكیان دەستی بەسەردا بگرن و، ئەوانی دیكەی لێ بێبەش بكەن. پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: {**«الْمُسْلِمُونَ شُرَكَاءُ فِي ثَلَاثٍ فِي الْكَلَإِ وَالْمَاءِ وَالنَّارِ»**}(أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٣١٣٢)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٤٧٧)، وَقَالَ الشيخ الألباني: صحيح)، واتە: مسوڵمانان لە سێ شتاندا هاوبەشن: ئاوو ئاگر و لەوەڕگا، لە ڕیوایەتێكدا: خوێ، كەواتە: سەرچاوە سروشتیەكان موڵكی هاوبەشی هەموو كۆمەڵگان و، هیچ كەسێك بۆی نیە بیانكات بە موڵكی تایبەتی خۆی .

٣/ شەریعەت بنچینەیەكی داناوە، نە ستەم كردن نە ستەملێكران، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿...لَا تَظۡلِمُونَ وَلَا تُظۡلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ ﴾البقرة، واتە: نە زوڵم بكەن و، نەزوڵمیشتان لێ بكرێ.

٤/ ڕێگرتن لە زێدەڕۆیی و خراپ بەكارهێنانی ماڵ و سامان (الإسراف والإفساد)، وەك خوا دەفەرموێ:﴿ وَلَا تُطِيعُوٓاْ أَمۡرَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا يُصۡلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ ﴾الشعراء، واتە: بە قسەی زێدەڕۆیی كەران مەكەن، ئەوانەی خراپەكاریی لەزەویدا دەكەن و چاكەكاریی ناكەن.

ئەم چوار بنەمایە ئیسلام دایناون، بۆ ڕێگرتن لەوەی کە سامانداران و دەوڵەمەندان، بەهۆی ماڵ و سامانەکانیانەوە زیان لە بەرژەوەندیی گشتی بدەن ، دیارە بەرجەستە کردنی ئەم چوار بنەمایەش لە دنیای واقیع دا، پێویستی بە میکانیزم و شێواز و ڕێباز و ئامرازی گونجاوە، کە ئەوەش شەریعەت بە جێی هێشتوە بۆ بیرکردنەوەو کۆششکردنو ئەزموونی مرۆڤ، چونکە خوای زاناو شارەزا زانیویەتی، کە لەوبارەوە ژیانی مرۆڤ زۆر گەشە دەکات و بەرەو پێش دەچێ، بۆیە لە هەر کات و شێوێنێکدا، دەبێ خەڵك میکانیزم و شێواز و ئامرازی تایبەتو پێویست بۆ خۆیان پەیدا بکەن ، کە کارێك نەکرێ، ساماندار و دەوڵەمەندان وە خاوەن موڵکەکان، زیان بە بەرژەوەندی گشتی بگەیەنن.

## جۆری پێنجەم: مافە کۆمەڵایەتییەکان:

ئێستاش باسی جۆری پێنجەمی ماف و ئازادییەکان دەکەین، کە لە کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامییدا، پێویستە بۆ تاکتاکی ئەندامان دەستەبەر بکرێن، ئەویش بریتیە لە مافە کۆمەڵایەتیی یەکان.

مەبەستیشمان لە مافە کۆمەڵایەتییەکان ئەوەیە، کە هەمووتاکێك لە کۆمەڵگادا مافی خۆیەتی، ژیانێکی سەربەرزانەی هەبێو وەك تاکێکی بەڕێز، نە زیاتر، نەکەمتر لە تاکەکانی دیکە حیسابی بۆ بکرێ، هەل و دەرفەتی ژیان و گوزەرانی لە بەردەمدا، ئاچووغ بێ، لە حاڵێکیشدا، کە نەیتوانی ژیانێکی شەرافەت مەندانە، ژیانێکی ئینسانانە، کە شایستەی ئینسانە بۆ خۆی دابین بکات، لەبەر هەر هۆیەك بێ، ئەوە پێویستە لە لایەن کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامییەوە، ئەو مافەی بۆ دابین بکرێ.

مافە کۆمەڵایەتییەکان لەبەرنامە و دەستووری کۆمەڵگا نائیسلامییەکاندا، لەم ڕۆژگارەدا بەتایبەت لە ڕۆژئاوادا، تارادەیەکی باش دەستەبەر کراون، بە تایبەت بۆ چینی کرێکارو هەژارو نەدارو نەخۆشو پەککەوتە، بەلاّم دوای خەبات و تێکۆشانێکی زۆر، لە دژی چینی دەوڵەمەندو سەرمایەدارو فشار خستنە سەر دەوڵەت، یانی زەحمەتی زۆری ویستوە، تاکو ئەو مافانە بۆ ئەو چینە کەمدەستو بێ دەرەتانانە دابینکراون، نەك

هەروا هەر لە ڕێوە ئەو ماف و ئازادییانە دابینكرا بن، یاخود دەوڵەمەندو خاوەن كارخانەو سەرمایەدارەكان هەروا بەخێری خۆیان ئەو مافانەیان دابێ، بەڵكو خەبات و تێكۆشانی زۆر كراوە - كە ئێستا دەرفەت نیە بە دوای بكەوین - تاكو سەرەنجام:

١) ئاسانكاریی كراوە بۆ ئەوەی خەڵك هەلی كاری دەست بكەوێ.

٢) مەسەلەی كرێ بەرز كراوەتەوە، تا ئەندازەیەك لە قەدەر ئەو ماندوو بوونەبێ، كە ئەو كرێكارە، یاخود ئەو جوتیارە، یان ئەو خاوەن ئیش‌و پیشەیە صەرفی دەكات.

٣) سەعاتەكانی كار زەبت كراون.

٤) كاتی حەسانەوە و پشوو دانراوە لە ڕۆژو هەفتەدا، یان لە مانگ‌و ساڵ دا.

پاشان دەستەبەریی كۆمەڵایەتیی (الضمان الإجتماعي) بۆ خەڵكی پیر و پەككەوتە و نەخۆش و بێ توانا دانراوە، هەتا ئەو مافانە دابینكراون، زۆری ویستوە، بەڵام لە شەریعەتی ئیسلامدا، خوای دادگەر، كە خاوەنی هەموو بەندەكانە بە فەقیر و دەوڵەمەندو بە ساغ و نەخۆش‌و پلە دارو بێ پلەوە، هەر لە سەرەتاوە بە بێ داواكاریی هیچ كەس، تێكڕای ئەو مافانەی، كە بە مافە كۆمەڵاتییەكان ناسراون، بۆ هەموو چین و توێژەكان دابین و دەستەبەركردوون، بە تایبەت بۆ ئەوانەی، كە كەمدەستن و ئاتاج و ناچارن.

جا ئێمەدەتوانین مافە كۆمەڵایەتییەكان، لە ڕوانگەی شەریعەتەوە بكەینە سێ مافی سەرەكی:

یەكەم : مافی یەكسانیی كۆمەڵایەتیی.

دووەم : مافی كارو ڕەخساندنی هەلی كار.

سێیەم : مافی دابینكردنی پێداویستییەكان (تأمين الضروريات).

## یەكەم: مافی یەكسانیی كۆمەڵایەتی:

ئەمە لەڕاستیدا گرنگترین مافە، مادام بویسترێ كە مرۆڤ وەك ئینسان بهێڵدرێتەوەو ئەو ڕێزو حورمەتەی، كە خوا لێیناوە پارێزراو بێ و سەلامەت بێ، پێویستە بەر لە هەر شتێك بیر لەوە بكرێتەوە، كە لە ڕووی كۆمەڵایەتییەوە یەكسانیی دابین بكرێ، ئنجا ئێمە پێشتر باسی یەكسانییمان كردوە كە لە شەریعەتی ئیسلامییدا

مرۆڤـــەکان لە بەرانبەر خوادا (سبحان وتعالى ) وەك یەکن، لە نێو خۆیاندا وەك یەکن‌وکەس لە کەس گەورەترو بەرزتر و چاکتر نیە.

یەکسانیی کۆمەڵایەتیش ئەوەیە، کە هیچ کەس بەهۆی ڕەچەڵەك‌و بەهۆی بنەماڵەیەوە، بەهۆی تیرە و هۆزییەوە، بەهۆی نەتەوەیەوە، بەهۆی ڕەنگ و زمانیەوە، بەهۆی پارە و سامانیەوە، بەهۆی بڕوانامەیەکەوە، کە پێیەتی، بەهۆی پیشە و کارێکەوە کە هەیەتی، بەهۆی هیچ شتێکەوە خۆی لە خەڵکی دیکە بە زیاتر نەزانێ، چونکە لە ڕاستیدا، هیچ کام لەو شتانە مایەی ئیمتیاز و زیادیی مرۆڤـــەکان نین بەسەر یەکدیدا، وەك پێشتر باسمان کرد، ئەوەی کە لە لای خوا، خەڵکی پێ بەرز دەبێتەوە و نزمدەبێتەوە، زۆریی‌و کەمیی تەقوایە، تەقوایش بۆ هەموان وەك یەکە، چونکە تەقوا، واتە: وریا لەخۆ بوون، ئینسان شتێك نەکات خوای پەنهان زان پێی ناخۆش بێ‌و بەهۆیەوە لێی توورەبێ، ئێستاش با تەماشای ئەم چەند ئایەتەی قورئان‌و فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بکەین، کە چۆن خواو پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" یەکسانیی کۆمەڵایەتیی، بۆهەموو تاکەکان بڕیار دەدەن :

١/ خوا لە سوورەتی (الحجرات) ئایەتی (١٣)دا دەفەرموێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ ... ١٣﴾ الحجرات، واتە: ئەی خەڵکینە! ئێووەمان لە نێر و مێیەك خولقاندوە، واتە: هەمووتان دایك و بابتان یەکە، کەواتە: کەس بۆی نیە بڵێ: من نەسەب‌و بنەماڵەم ئاواو ئاوایە!! نەخێر، مرۆڤـــ هەمووی وەك یەکەو هەمووی لەیەك باب و دایکەوە هاتوەو، هەموویشی یەك پەروەردگار خولقاندوویەتی.

٢/ لە ئایەتی ژمارە (٧٠)ی سوورەتی (الإسراء) خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ... ٧٠﴾ الإسراء، واتە: بێگومان ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوە، کەواتە: ڕۆڵەی ئادەم وەچەکانی ئادەم بە نێر و مێ وە، بە هەموو تیرە و هۆزەکانیانەوە، هەموویان ڕێزلێگیراون، هەمووشیان ، لەلایەن پەروەردگاریانەوە، وەك یەك ڕێز لێگیراون.

٣/ پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" یش لەو بارەوە فەرمایشتی زۆرن بۆ وێنە: یەکێك لەو فەرمایشتانەی، کە لەوتاری حەجی مالئاوایی (حجة الوداع)دا فەرموویەتی، وەك (د.محمد حميدالله) لە (الوثائق السياسية)دا[1] هێناویەتی ئەمەیە: أَيُّهَا النَّاسُ، أَلاَ إِنَّ رَبَّكُمْ وَاحِدٌ، أَلاَ وَإِنَّ أَبَاكُمْ وَاحِدٌ، أَلاَ لاَ فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلَى عَجَمِيٍّ، وَلاَ لِعَجَمِيٍّ عَلَى عَرَبِيٍّ، وَلاَ أَسْوَدَ عَلَى أَحْمَرَ، وَلاَ أَحْمَرَ عَلَى أَسْوَدَ، إِلاَّ بِالتَّقْوَى ألا هَلْ بَلَّغْتُ ؟ قَالُوا: بَلَّغَ رَسُولُ اللهِ "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"، قَالَ: لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: برقم: (٢٣٥٣٦)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح)، پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە حەجی مالئاواییدا کە مێژوونووسان دەڵێن: زیاتر لە صەد هەزار (١٠٠٠٠٠) هاوەڵی بەڕێز لە خزمەتی دابوون، فەرمووی: ئەی خەڵکینە! بێگومان پەروەردگارتان یەکێکە،وە بێگومان بابیشتان یەکێکە، بەڕێزترتان لەلای خوا، پارێزکارترتانە، عەرەب لە عەجەم گەورەتر نیە،وە عەجەم لەعەرەب گەورەترنیە،هەروەها سپی پێست لە ڕەش پێست و ڕەش پێست لە سپی پێست چاکترنیە، مەگەر بە تەقوا، ئایا پێمگەیاندن؟ ئەی خوایە! تۆ شاهیدو ئاگادار بە، (کە ئاگادارم کردن: کەس لە کەس گەورەتر نیەو، کەس بۆی نیە خۆی بەسەر کەس دا هەڵبکێشێ)، ئەوانیش گوتیان: بەڵێ پێت ڕاگەیاندین، ئەویش فەرمووی: (لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ) با ئەوەی ئامادەیە، با بەوە بگەیەنێ کەلێرە نیە. واتە: ئێوە ئەم ڕاستییە بە غەیری خۆتان بگەیەنن، دیارە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" (خوا لێیان ڕازی بێ) زۆر چاك ئەو ڕاستییەو هەموو ئەو ڕاستییانەی دیکە، کە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" فەرمونی، گەیاندوویانن بە مسوڵمانانی دوای خۆیان.

٤/ لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: {الْخَلْقُ كُلُّهُمْ عِيَالُ اللهِ وَأَحَبُّهُمْ إِلَى اللهِ أَنْفَعُهُمْ لِعِيَالِهِ} (أَخْرَجَهُ الطبراني في (الكبير)

---

[1] ) ص ٣٦٢، رقم الوثيقة: ٢٨٧/ ألف.

برقم: (١٠٠٣٣) وقال الشيخ الألباني: (ضَعِيف جداً))[١] واتە: خەڵك هەموویان بەخێوكراوانی خوان، (واتە: هەموویان وەك خێزانێكن، كە وەك چۆن سەرۆك خێزان سەرپەرشتی ئەو خێزانە دەكات، خەڵكیش وەك یەك خێزان وان، كە سەرپەرشتیاریان خوایە) خۆشەویستترینیان لە لای خوا، سوود بەخشترینیانە بۆ ئەو خەڵكە، كە سەرپەرشتیكراوی خوای پەروەردگارن.

٥/ لە فەرمایشتێكی دیكەدا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: {يَا مَعْشَرَ بَنِي هَاشِمٍ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ أَنْقِذِي نَفْسَكِ مِنَ النَّارِ فَإِنِّي وَاللهِ مَا أَمْلِكُ لَكُمْ مِنَ اللهِ شَيْئًا}(أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٧١١) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين). پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ڕووی كردۆتە (بەنی هاشم) لە خزمەكانی خۆیو فەرموویەتی: ئەی بەنی هاشم! خۆتان ڕزگار بكەن لە ئاگر، ئەی بەنی عەبدولموتتەلیب! خۆتان ڕزگار بكەن لە ئاگر، ئەی فاتیمەی كچی موحەممەد! خۆت ڕزگار بكە لە ئاگر، بە خوا من هیچ شتێكم بۆ هیچ كەس پێناكرێ لە لای خوا! وەك هەندێك لە سەید و شێخەكانی خۆمان پێیان وایە هەر لەبەر ئەوەی كە بە ڕەچەڵەك دەچنەوە سەر پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە خەڵكی دیكە باشترن، ئەگەر تەقواشیان وەك ئەوان نەبێت!! نەخێر لە ڕاستیدا ئەوە خەیاڵ پلاوە ئەوەتا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: ئەی خزمەكانم! ئەی هۆزی بەنی هاشم! خەڵك بەكردەوەی چاكەوە نەیەت و، ئێوەیش بە نەسەب و بە ڕەچەڵەكەوە، لەبەر ئەوەی كە خزمی منن كەمتەرخەمیی بكەن لە كردەوەدا،

---

[١] ) أخرجه أبو يعلى في "مسنده" (١٦٣/ ٢) ، والمخلص في "الفوائد المنتقاة" (٨/ ١٨/ ٢) ، والحارث في "مسنده" (٢٢١ من زوائده) ، والطبراني في "مكارم الأخلاق" (ورقة ١٦٧ وجه ٢) وأبو عمر بن منده في "أحاديثه" (٢٢/ ١) ، وأبو الحسن القزويني في "الأمالي" (١٨٥/ ٢) ، وأبو بكر الخبائري في "الأمالي" (١٦/ ١) من طريق يوسف بن عطية الصفار ، عن ثابت ، عن أنس، وهكذا رواه ابن النقور في "القراءة على الوزير أبي القاسم" (٢/ ٢٠/ ١) ، والباطرقاني في "مجلس من الأمالي" (رقم٤- من نسختي) ، وكذا المخلص في "المجلس الأول من المجالس السبعة" (٤٨/ ٢) ، وأبو القاسم بن الوزير في "الأمالي" (١٥/ ١). أنظر السلسلة الضعيفة ج٨، ص٨٥.

چونکە ڕەچەڵەك بۆ قیامەتیێ بە قەدەر نووکی دەرزی سوودتان پێ ناگەینێ، چونکە خوا لە سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿١٠١﴾ ﴾، واتە: هەرکاتێك فوو بە کەڕەنادا کرا، لەو ڕۆژەدا نە ڕەچەڵەکیان لە بەیندا دەمێنێ‌و، نە کەسیش داوای هیچ شتێك لە کەس دەکات.

٦/ هەروەها پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە فەرمایشتێکی دیکەدا، کە موسلیم هێناویەتی دەفەرموێ: {مَنْ أبْطَأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ}(أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٤٢١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦٩٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٩٤٦)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٤٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٢٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٣٤))، واتە: هەرکەسێك کردەوەکەی دوای بخات، ڕەچەڵەکی پێشی ناخات.

پەندی پێشینانیشە دەڵێ: (کە خۆت کۆسەی، ڕیشی بابت بە تۆ چی!!) پەندێکی دیکەش دەڵێ: (کەس بە مەڵەی بابی ناپەڕێتەوە)، جا من لێرەوە ئامۆژگاریی زۆر لەخزمانی سەیید و شێخ دەکەم ،کە وەك کوردەوایی دەڵێ: (بەتەمای نیسکێ لە ئیمانێ نەگەڕێن!!) با بۆ خۆیان کردەوەی باش بکەن، چونکە ئەوەتا هەم ئایەتەکانی خوا، هەم فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بە یەکچاو تەماشای خەڵك دەکەن ، خەڵك بە کردەوەی باش بەرەو پێش دەچێ‌و مرۆڤـــ تەنیا بە کردەوەی باش لەخوا نزیك دەبێتەوە و بە کردەوەی خراپ دوور دەکەوێتەوە، ئیدی ڕەچەڵەك و حەسەب و بنەماڵە و وەجاغ و ڕەگەز و ڕەنگ، ئەوانە هەموویان هیچ دادی ئینسان نادەن، بەڵێ، بەپێی عورف و ئیعتیباری دنیایی: ئەوە کوڕی فلان کەسە، ئەوە بابی فلان کەس بووە، ئەوە لە فلان وەجاغ و بنەماڵەیە، ئەوە بۆ نێو خەڵکە. بەڵام بۆ لای خوا پەروەردگارو بۆ قیامەت، لە ڕاستیدا جگە لە تەقواو کردەوەی خۆت، نابێ بەتەمای هیچ شتێکی دیکە بی.

## دووەم: مافی کارو ڕەخساندنی هەلی کار:

مافی کار .. واتە: دابینکردنی ئیش و کار ، شارەزایانی دەستوور بەجۆرە پێناسەی ئەم مافەیان کردوە: (**أهم الحقوق الإجتماعية هوحق العمل و ما يتفرع عنه من حقوق فالحق الأساسي للعامل هو حقه في الأمن المادي أو الإقتصادي الذي يفرض على الدولة واجب توفير العمل المنتج و المُجزي له، وبوجود العمل يأمل العامل على مستقبله ويطمئن الى حاضرهِ، وبتوفير العمل الملائم تحفظ الدولة للعامل كرامته، اذ تجعله يشعر أنه يجني ثمار جهده دون ان ينتظر احساناً، وبتوفير العمل المجزي تَضْمَنُ للعامل عيشاً كريماً ومستوى لائقاً للحياة)**[1]، واتە: مافی کارو ئەوەی لێیەوە پەیدا دەبێ، گرنگترینی مافە کۆمەڵایەتییەکانە، مافی بنەڕەتیی بۆ کەسێك کار دەکات، ئەوەیە کە لە ڕووی ماددییەوە، یان لە ڕووی ئابووریەوە ژیانی دابین بکرێ، ئەو مافە لەسەر دەوڵەت پێویست دەکات، کە کارێکی بەرهەمهێن و کارێك کە کەڵێنی بۆ بگرێ و ژیانی پێ بسووڕێ بۆ ئەو ئیشکەرو کرێکارە دابین بکات، بە هۆی ئەو ئیش و کارەوە، بابای کرێکار و ئیشکەر دڵنیا دەبێ لە ئاییندەی خۆی،بە نسبەت ئێستای خۆیشیەوە دڵی خۆش‌و دڵئارامگرتوو دەبێت، بە هۆی دابینکردنی کارێکی گونجاوەو، دەوڵەت کەرامەت و ڕێزی ئەو کرێکارو ئیشکەرە دەپارێزێ، چونکە وای لێدەکات، کە هەست بکات بەری ڕەنجی خۆی دەخوات، بێئەوەی چاوەڕێی چاکە و ئیحسانی لە خەڵك بێ ، بە هۆی کارێکەوە کە کەڵێنێکی بۆ دەگرێ، دەوڵەت ژیانێکی بەڕێزو ئاستێکی شایستە بۆ ئەو کرێکار و ئیشکەرە دابین دەکات.

ئنجا ئێمە ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا "صَلَى اللہ عَلَيِهِ وَسَلَمَ" بکەین، دەبینین خوای کاربەجێ (سبحانه و تعالى) و پێغەمبەری خوا "صَلَى اللہ عَلَيِهِ وَسَلَمَ" خەڵکیان هانداوە بۆ کاروکاسبی، لەشەریعەتدا زۆر خەڵك ئاگادارکراوەتەوە، کە خۆیان بپارێزن لە تەنبەڵیی‌و چاو لەدەستی ئەم و ئەو بوون‌و لە سواڵکردن، کەبەڕاستی سواڵکردن دیاردەیەکی ناشیرین‌و شتێکی زۆر خراپەو، ئێستاش

---

[1]) النظم السياسية، ص ١٢٩.

بەداخەوە لە هەرێمی كوردستانی ئێمەدا، لەگەڵ ئەوەشدا كە ئاستی ژیان بەرز بۆتەوەو پارە و سامانی زۆر هەیە، بە تایبەت بە دەست حكوومەت و هەردووك حیزبی حوكمڕان و بەدەستی دەوڵەمەندەكانەوە، كەچی تەماشا دەكەین ڕۆژ بە ڕۆژ دیاردەی سواڵكردن پەرە دەستێنێ، ئەركی هەموو لایەكە، كە ڕێگا لەو دیاردەیە بگیرێ، ئەویش بەوە كە خەڵك ئەوەی كە موستحەقەو لە ناچارییدا سواڵ دەكات، ژیانی دابین بكرێ، ئەوەی دیكەیش كە بە ناحەق سواڵ دەكات، ڕێگای لێ بگیرێ، بە هەرحاڵ با سەرنجی ئەم چەند ئایەت و فەرموودانەی پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" بدەین لەو بارەوە:

١- خوا (سبحانة وتعالى) لە سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتی (١٠)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ مَكَّنَّاكُمْ فِي الْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ... (١٠) ﴾ الأعراف، واتە: بێگومان ئێمە ئێووەمان لە زەویدا نیشتەجێ كردوەو ژیان و گوزەرانمان بۆ لە زەویدا داناون. كەواتە: هەركەسێك نەتوانێ ژیانی خۆی دابین بكات، بەمەرجێك خاوەن عوزر نەبێ‌و نەخۆش و پەككەوتە نەبێ، ئەوە دیارە خۆی كەمتەرخەمیی كردوە، بەمەرجێك كە ڕێی لێ نەگیرابێ، یان هەل و فرسەتی ژیان و كاری لێ زەوت نەكرابێ، بەهۆی ناعەدالەتیی ئەو حكوومەت و دەستەلاتەوە، كە حوكمڕانە بەسەر خەڵكەوە. بەلاّم كەسانی خاوەن عوزرو پەككەوتەو نەخۆش، لەسەر دەوڵەت پێویستە ژیان‌و گوزەرانیان دابین بكات.

٢- لە سوورەتی (الملك) لە ئایەتی (١٥دا خوا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِ ۖ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ (١٥) ﴾ الملك، واتە: خوا ئەو زاتەیە، كە زەوی بۆ ڕامكردوون‌و بۆی دەستەمۆ كردوون، دەجا بە كەلێن و قەدپاڵەكانیدا بڕۆن و لە ڕۆزیی خوا داوا بكەن، واتە: بەهۆی گەڕان‌و سووڕانتانەوە لەسەر زەوی‌و جموجۆڵتان لەسەر زەوی، بژێوێك كە خوا (سبحانه وتعالى) بۆی لە زەویدا داناون، وەدەستی بێنن.

٣- پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" لە فەرمایشتێكی دا كە بوخاریی دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: { **مَا أَكَلَ أَحَدٌ طَعَاماً قَطُّ خَيْراً مِنْ أَنْ يَأكُلَ مِنْ عَمَلِ**

يَدِهِ، وَإِنَّ نَبِيَّ اللهِ دَاوُدَ "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" كَانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ}(أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧٢٢٩)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١٩٦٦)، وَالبَيْهَقِيُّ في شعب الإيمان برقم: (١٢٢٤))، واته: هیچ کەسێك هەرگیز خواردنێکی نەخواردوە چاکتر بێ لەوەی، کە بەری ڕەنجی خۆی بخوات (کردەی دەستی خۆی بخوات) ،داوود پێغەمبەر لە کردەی دەستی خۆی دەیخوارد، (داوود مەشهوورە کە ئاسنگەر بووە و زرێی دروست کردوە).

٤- پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە فەرمایشتێکی دیکەدا، کە بوخاریی‌و نەسائیی دەیگێڕنەوە دەفەرموێ: {لأَنْ يَأْخُذَ أَحَدُكُمْ حَبْلَهُ فَيَذْهَبَ إِلَى الْجَبَلِ فَيَحْتَطِبَ ثُمَّ يَأْتِيَ بِهِ يَحْمِلُهُ عَلَى ظَهْرِهِ فَيَبِيعَهُ فَيَأْكُلَ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ النَّاسَ }( أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٤١٠)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٥٨٩)، وَأَحْمَد برقم: (١٧٢٢٩) واللفظ له)، واته: ئەگەر یەکێك لە ئێوە گوریسێك هەڵگرێ‌و بچێ بۆ چیا دار بێنێ بە کۆڵ‌و بیفرۆشێ و بیخوات، باشترە لەوەی کە لە خەڵکی داوا بکات ، واته: ئەگەر ئینسان کۆڵکێشیی بکات باشترە لە سواڵ کردن. ئەوە تێڕوانینی ئیسلامە بۆ ئیش و کار.

٥- پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە فەرمایشتێکی دیکەدا دەفەرموێ: {إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الْعَبْدَ الْمُؤْمِنَ المحترف}[1] واته: بێگومان خوا بەندەی بڕواداری خاوەن پیشەی خۆش دەوێ، یانی: خاوەن ئیش‌و پیشەیەك کە بەهۆی ئەو ئیش و پیشەیەوە، چاوی لەدەستی خەڵك نەبێ، وە خۆی‌و ماڵ و منداڵی پێ بژێنێ.

٦- لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کەبوخاریی و موسلیم دەیگێڕنەوە دەفەرموێ: {«لاَ تَزَالُ الْمَسْأَلَةُ بِأَحَدِكُمْ حَتَّى يَلْقَى اللهَ وَلَيْسَ فِي وَجْهِهِ مُزْعَةُ لَحْمٍ»}(أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٤٠٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٠٤٠) واللفظ

---

[1]) أخرجه الطبراني برقم: (١٣٢٠٠) ، وابن عدى (٣٧٦/١ ، ترجمة ٢٠٠ أشعث بن سعيد أبو الربيع السمان) وقال: مع ضعفه يكتب حديثه. والبيهقي في شعب الإيمان (٨٨/٢ ، رقم ١٢٣٧) وقال: تفرد به أبو الربيع عن عاصم وليسا بالقويين. وأخرجه أيضًا: الطبراني في الأوسط برقم: (٨٩٣٤) قال الهيثمي (٦٢/٤): رواه الطبراني في الكبير والأوسط وفيه عاصم بن عبيد الله وهو ضعيف. وأخرجه القضاعي برقم: (١٠٧٢)، والديلمي برقم: (٥٦٧)، وابن الجوزي في العلل (٥٨٩/٢ ، رقم ٩٦٨) وقال: لا يصح . وأورده ابن أبي حاتم في العلل برقم: (١٨٧٧) وقال قال أبي: هذا حديث منكر.

لَهُ)، واتە: سواڵ لەگەڵ یەكێكتاندا بەردەوام دەبێ، هەتا كاتێك كە دەگاتە خوا (لە قیامەت) یەك تۆز گۆشتی بە دەمو چاوەوە نەماوە، وەك لە كوردەواریی خۆمان دا دەڵێین: (ئاوی ڕوانی چووە!!).

یەكێك لێرەدا بۆی هەیە بپرسێ و باشە ئاخر دۆزینەوەی ئیش و كار بۆ خەڵك چۆن دەبێ؟ لەوەڵامدا دەڵێین: لە ڕاستیدا دەوڵەتی ئیسلامیی بەرپرسیارە، كە كەسانی بێكار وەكار بخاتو ئیشیان بۆ بدۆزێتەوە، دیارە ئەوەش پێویستی بەوە نیە، كە ئایەتی تایبەتی لە سەر بێنینو فەرمایشتی پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" ی لەسەر بێنین، چونكە ئەوە، كە نابێ خەڵك بێ ئیشو بێكار بێو (عاتڵ و باتڵ) دانیشێ، ئەوە شتێكی ئاشكرایەو عەقڵ دەلالەتی لەسەر دەكات، لە بازنەی هەڵسوكەوتەكاندایەو بازنەی هەڵسوكەوتەكانیش ئەسڵ تێیاندا، دەستكراوەییو ڕێپێدرانە، بۆیە دەوڵەتی ئیسلامیی چی بەچاكو بەرژەوەندیی زانی، بۆی هەیە بیخاتە بەرنامەی كاروباریەوە، بۆ ئەوەی كەسانی بێ ئیشیی وكار بە بێ ئیشی نەمێننەوە هەركەسە و ئیش و كارێكی گونجاوی بۆ بدۆزێتەوە.

دیارە ئێستا لەم ڕۆژگارەی خۆماندا، بێكاریی یەكێكە لە قەیرانە گەورەكان لە دەوڵەتانی دیكەشدا نەك هەر لە لای ئێمە، كە ئێمە لە زۆر ڕووەوە بێ سەرو بەرین، بەڵكو ئەوە قەیرانێكی گشتییەو كێشەیەكی گەورەی كۆمەڵایەتیی و سیاسییە، بەڵام ئێمە پێمان وایە، كە ئەگەر شەریعەتی ئیسلامی پیادە بكرێ، دەوڵەتێكی ئیسلامیی هەبێ، بە تەئكید سەركەوتووترین دەوڵەت دەبێ لە هەموو بوارێكدا، لە بواری دابینكردنی كاریش بۆ بێكاران، بەڵام بێگومان بەمەرجی ڕەچاوكردنی یاسایەكانی خوا (سنن الله) لە ژیانی مرۆڤدا، كە یەكێكیان وەرگرتنو خواستنەوەی هەرچی ئەزموونو بیرۆكەی باشو بەكەڵكە لەهەر لایەكەوەو لە هەركەسێكەوە بێ.

### سێیەم: مافی دابینكرانی پێداویستییەكان (حق التأمين الضروريات):

هەمووتاكێك لەكۆمەڵگای ئیسلامییداو لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا، دەبێ پێداویستییەكانی بۆ دابین بكرێن، واتە: ئەو شتانەی، كەبەبێ وان ژیانی ناسووری، بۆی

دابین بکرێن، مادام بۆ خۆی نەتوانێ دابینیان بکات، هەڵبەتە لە پێشدامرۆڤـــ لە سـەر خۆی پێویستە، بەڵام ئەگەر بۆ خـۆی نـەیتوانی، ئـەوە لەسـەر دەورو بـەریو کۆمـەڵگاو دەوڵەت پێویست دەبێ، کە پێداویستییەکانی بۆ دابین بکەن.

با سەرەتا تەماشای ئەو ئایەتانەی قورئانو فەرمایشتانەی پێغەمبەری خـوا "صَلَى اللہ عَلَیـہِ وَسَـلَمَ" بکـەین، دواتـریش بێینـە سـەر ڕوونکردنـەوەی ئـەوە، کـە چـۆن پێداویستییەکان دابین دەکرێن:

١- خوای بەبەزەیی لە ئایـەتی ژمـارە (٢)ی سـوورەتی (المائـدة)دا دەفـەرموێ:﴿... وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ ...﴿٢﴾﴾ المائدة، واتە: وەهاوکاریی یەکدی بکـەن لەسـەر چـاکەکاریی و پارێزکـاریی، هاوکـاریی یەکـدی مەکەن لە سەر گوناهو دەستدرێژیی، ئنجا دیارە لە چاکەکارییو لە تەقوایە، کـە تۆ لەخەڵکەوە ڕانەمێنی، کاتێك، کەدەزانی بێ ئیشە، یان پێداویستییەکانی ژیانی خۆی بۆ دابین نەکراون، سەرەنجام ناچاربێ سواڵ بکاتو لە خەڵك بپاڕێتەوە!.

٢- خوای بەخشندە لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی ژمارە (١٧٧)دا دەفەرموێ:﴿ لَّيۡسَ ٱلۡبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ قِبَلَ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلۡكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلۡمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ ... ﴿١٧٧﴾﴾ البقرة، واتە: چاکەکاریی ئەوەنیە،کەڕووی خۆتان بەرە و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا وەرسووڕێنن، بەڵکو چاکەکاریی پیشەی کەسێکە کە بڕوای هێناوە بەخواو بە ڕۆژی دواییو بە فریشتەکانو بە کتێبەکانو بـــە پێغەمبەران، ماڵ وسامانی خۆی دەبەخشێ لەکاتێکدا،کەئەو ماڵ و سامانەیشی زۆر خۆشدەوێ: بە خزمانی (نەدارو ئاتاج)و بە هەتیوانو بە نەدارانو بە ڕێبواران و بـــە سواڵ کەران و بەو کۆیلانەی کە دەیانەوێ خۆیان ئازاد بکەن، ئنجا نوێژ بەرپا دەکاتو زەکات دەدات، وەك دەبینین: نوێژ بەرپاکردن و زەکاتدانی خستۆتە دوایی، تاکو بزانین کە دین تەنها نوێژ و ڕۆژووو زەکات نیە.

٣- پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" یش لەو بارەوە فەرمایشتی زۆرن، بۆ نموونە: {السَّاعِي عَلَى الأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ، أَوِ الْقَائِمِ اللَّيْلَ الصَّائِمِ النَّهَارَ}( أخرجه البخاري برقم: (٥٠٣٨))، واتە: کەسێك کۆشش بکاتو سەرپەرشتیی ئافرەتی بێوەژن و مرۆڤـــی نەدار بکات (پێداویستییەکانی ژیانیان دابین بکات) وەك کەسێك وایە، کە لە ڕێی خوادا جەنگ و جیهاد دەکات، یان کەسێك بەشەو هەمیشە شەو نوێژ دەکات و، بە ڕۆژیش هەردەم بەڕۆژووە.

٤/ لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" فەرموویەتی: {مَنْ كَانَ مَعَهُ فَضْلُ ظَهْرٍ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لاَ ظَهْرَ لَهُ، وَمَنْ كَانَ لَهُ فَضْلٌ مِنْ زَادٍ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لاَ زَادَ لَهُ }( أخرجه أحمد برقم: (١١٣١١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٧٢٨)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٦٦٣)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (١٠٦٤)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٤١٩) عَنْ أَبِي سَعِيدِ الخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) لە یەکێك لە جەنگەکاندا کە خەڵکێك ئاتاج بوون، پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" فەرمووی: هەرکەسێك پشتی زیادەی پێیە (واتە: وڵاخی زیادەی پێیە)، با بیگێڕێتەوە بۆ کەسێك، کە وڵاخی پێ نیە، هەرکەسێك خواردن و زەخیرەی زیادی پێیە، با بیدات و بیگێڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی،کە زەخیرەو توێشووی پێ نیە. جێی سەرنجە فەرمایشتەکە دەفەرموێ: (فَلْيَعُدْ بِهِ) با بیگێڕێتەوە! وەك ئەوەی هی خۆی نەبێ، مادام لە خۆی زیادە بیگڕێتەوە بۆ کەسێك، کە پێویستی پێیەتی.

هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" دەفەرموێ: واتە: {فَأَيُّمَا مُؤْمِنٍ مَاتَ وَتَرَكَ مَالًا فَلْيَرِثْهُ عَصَبَتُهُ مَنْ كَانُوا، وَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا أَوْ ضَيَاعًا فَلْيَأْتِنِي فَأَنَا مَوْلاَهُ}(أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٢٦٩))، واتە: هەر بڕوادارێك مردومالێکی بەجێهێشت، با خزمەکانی لێی بەمیرات بگرن، هەر کەسێکن (واتە: ئەوانەی میراتگرن با هەر بۆ ئەوان بێ)، بەڵام هەرکەسێك مردو قەرزێکی لەسەربوو، یان ماڵ و منداڵێکی بێ سەرپەرشتیاری هەبوو، بابێ بۆ لای من من سەرپەرشتیاریمی.

دیارە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" واتە حوکمڕانو هەرکەسێك، کە سەرپەرشتیاری مسوڵمانان بێ (دەوڵەت)، ئنجا ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە

هەرکەسێك خۆی بۆ بەڕێوەنەچووو، ژیان و گوزەرانی دابین نەبوو، ئەوە لەسەر دەوڵەتی ئیسلامیی پێویستە، کە پێداویستییەکانی بۆ دابین بکات، وەك (الشوكاني) لە (نيل الأوطار)دا دەڵێ: (**وَفِي ذَلِكَ إِشْعَارٌ بِأَنَّهُ "أَي النَّبِيّ "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"" كَانَ يَقضِي مِن مَال المَصَالِح**) [1] واتە: لەوەدا هەستکردن بەوە هەیە، کە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە سامانی گشتی (واتە: لە (بيت المال)) ئەو پێداویستییانەی ئەو کەسانەی، کە پێداویستییەکانیان بۆ دابین ناکرێ، بۆی دابین کردوون.

فەرمایشتێکی دیکە لەوبارەوە، کە بوخاریی و موسلیم لە (أبو موسى الأشعري)یەوە (خوای لێی ڕازی بێت)، هێناویانە، پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: {**إِنَّ الأَشْعَرِيِّينَ إِذَا أَرْمَلُوا فِي الْغَزْوِ، أَوْ قَلَّ طَعَامُ عِيَالِهِمْ بِالْمَدِينَةِ، جَمَعُوا مَا كَانَ عِنْدَهُمْ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ اقْتَسَمُوهُ بَيْنَهُمْ، فِي إِنَاءٍ وَاحِدٍ بِالسَّوِيَّةِ فَهُمْ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُمْ**}(أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٣٥٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥٠٠))، واتە: ئەشعەرییەکان (واتە: هۆزی ئەبوموسای ئەشعەریی کە خەڵکی یەمەن بوون)، کاتێك لە جەنگدا نان و نەفەقەیان کەم دەبوو، یان هەندێکیان نەیاندەما، یان لە مەدینە ماڵ و خێزانەکانیان، هەندێکیان هەژار دەکەوتن و زاد و زەخیرەیان نەدەما، هەرچی لە لایان دەبوو، لە پۆشاکێکیان دەکردو دوایی بە شێوەیەکی یەکسان لە نێوان خۆیاندا بە قاپێك بە شیان دەکرد (ئەگەر گەنم بووە، یان جۆ بووە،یان خورما بووە، بە یەکسانیی بەشیان کردوە)، دەجا ئەوان لە منن و، منیش لەوانم .

ئەوە یانی چی؟ واتە: ئا ئەوەم پێخۆشە، کەواتە: لە کۆمەڵگا و لە دەوڵەتی ئیسلامییدا قبووڵناکرێ قرپیو پڕیی هەبێو هەندێکی بچێتە ئاسمان و، هەندێکی بچێتە بن تەبەقەی زەوی! بەڵکو پێویستە ئاگایان لە یەکدی بێ، ئەگەرنا دەوڵەت لە بەرژەوەندیی هەژارو نەداران تەدەخخول دەکات!

لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: {**وَأَيُّمَا أَهْلُ عَرْصَةٍ أَصْبَحَ فِيهِمُ امْرُؤٌ جَائِعٌ، فَقَدْ بَرِئَتْ مِنْهُمْ ذِمَّةُ اللهِ تَعَالَى**}(أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم:

---
[1]) نيل الأوطار، ج٦ ص٥٧.

(٤٨٨٠) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٥٧٤٦) قال حسين سليم أسد: إسناده ضعيف)، واتە: خەڵکی هەر گەڕەکێك، یان خەڵکی هەر شوێنێك، مرۆڤێکی برسییان لە نێواندا هەبوو، مسۆگەر پەیوەندییان بە خواو بەپێغەمبەری خواوە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" نەماوە، مادام لەو برسێتییەدا بمێنێ و بە برسیەتی سەربنێتەوەو ڕۆژ بکاتەوە. واتە: لەو حاڵەدا، لەو مەسەلەیەدا لەسەر ڕێبازی خوا و پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" نەماون.

هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: {«**مَا آمَنَ بِي مَنْ بَاتَ شَبْعاناً وَجَارُهُ جَائِعٌ إِلَى جَنْبِهِ وَهُوَ يَعْلَمُ بِهِ**» }(أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِي فِي (الكبير) برقم: (٧٥١)، وَصَحَّحَه الشيخ الألباني في صحيح الجامع برقم: (٥٥٠٥) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، واتە: ئەو کەسە بڕوای بە من نەهێناوە، کە شەوگاربەسەردەبات بە تێریی، دراوسێکەشی لە تەنیشتیەوە، برسییەو پێشی دەزانێ، کە برسییە! زانایان دەڵێن: واتە لەو مەسەلەیەدا مسوڵمان نیە، نەك بە یەکجاریی لە بازنەی مسوڵمانەتیی و ئیسلام چوو بێتە دەرێ.

ئنجا لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بڵێت: باشە ڕیزبەندیی و ڕێکخستنی دابینکردنی پێداویستییەکان چۆنە؟ دەڵێین: ئەوەش دیسان لە بازنەی هەڵسوکەوتەکان دایە و بەجێهێڵراوە بۆ بیرکردنەوەو کۆشش کردنی زانایان، کە لە هەر قۆناغێکداو لە هەر هەل و مەرجێکداو لەهەرکۆمەڵگایەکدا،مسوڵمانان میکانیزم و ئامرازی و شێوازی گونجاو بۆ ئەوە دابنێن، بەڵام دەشتوانین لە چەند خاڵێکدا ئاماژە بکەین بەوەی شەریعەت لەوبارەوە چەند ڕێنماییەکی داناون، یان چەند حەقیقەتێکی ڕاگەیاندوون،کە دەگونجێ ئێمە ڕێك و پێکیی و ڕیزبەندییەکی لێوەر بگرین.

**یەك**: حاڵەتی ئاسای ئەوەیە، کە هەر کەسە بۆ خۆی پێداویستییەکانی خۆی دابین بکات، وەك خوا لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿...فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ...﴿١٠﴾﴾الجمعة، واتە: بە زەویدا بڵاو ببنەوە و لە بەخششی خوا داوا بکەن. خوای کاربەجێ نیعمەت و ڕۆزییەکانی خۆی بە زەویدا بڵاوکردۆتەوە: ئەوەی بەکشتەوکاڵ دەژی، ئەوەی بە بازرگانیی، ئەوەی پیشەسازیی، ئەوەی بە ئیش و کرێکاریی، ئەوەی بە

ماڵاتداریی ...هتد، بە هەر شێوەیەك لە شێوەكان خوای پەروەردگار ڕۆزیی‌و بژێوی زۆری لە زەویدا داناوە، تاكو هەر كەسە بە شێوەیەك لە شێوەكان، وەك پێشتریش گوتمان پێداویستییەكانی خۆی دابین بكات، پێغەمبەری خواش "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" لەوبارەوە دەفەرموێ: {مَا كَسَبَ الرَّجُلُ كَسْبًا أَطْيَبَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ}(أَخْرَجَهُ ابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢١٣٨) قال الشيخ الألباني: صحيح)، واتە: هیچ پیاوێك بەرهەمێكی وەدەست نەهێناوە، پاكتر و چاكتر لەوەی، كە بەدەستی خۆی وەدەستی هێناوە، بەڵێ ئەوە لە حاڵەتی ئاساییدا ئاوایە، كە دەبێ هەركەسەو بۆ خۆی خەمی خۆی‌و مشووری خۆی بخوات‌و ڕزق و بژێوی خۆی بۆ خۆی پەیدا بكات‌و، پێداویستییەكانی خۆی بۆ خۆی جێبەجێ بكات، هی خۆی‌و هی ئەوانەش، كە نەفەقەیان لەسەری پێویستە. بەڵام لە حاڵێكدا كە بابای كاسب و ئیشكەر، لە ڕووی كەمدەستییەوە توانای ئیش و كاری نەبێ، واتە: دەتوانێ كار بكات بەڵام كەمدەستە توانای جەستەیی هەیە، بەم ماڵ و سامانی نیە، بۆ وێنە: كابرا كشتوكاڵ دەكات، ئاژەڵداریی دەكات، بازرگانیی دەكات، باغداریی دەكات، زێڕینگەریی، بەرگدروێتی... بەڵام پارەی نیە كەل‌و پەلەكانی كارەكەی پێ دەستەبەر بكات، ئایا لەو حاڵەتانەدا چی بكات؟ زانایانی ئیسلام بە وردیی‌و ڕوونی باسی ئەوەیان كردوە، كە هەر كەسێك توانای كارو كەسابەتی هەبێ، بەڵام لە بەر نەداریی و ئاتاجیی و بێ ئیمكانیەتی ماددیی، كاروكەسابەتەكەی بۆ نەكرێ، پێویستە لە ماڵی زەكات، زەكاتی پێ بدرێت بایی ئەوەندە، كە ئەو ئیش و پیشە و كارەی خۆی بكات و پێداویستییەكانی خۆی پێ دابین بكات، بۆ وێنە: (النووي) لە (المجموع شرح المهذب)[1] لە ژێر باسی: (المسألة الثانية: في قدر المصروف الى الفقير والمسكين)دا باسی زەكات دەكات، كە ئایا بۆ هەژار و نەدار، دەبێ لە زەكات چەندەیان پێ بدرێ؟ لە ژێر ئەو سەرەباسەدا دەڵێت: هاوەڵە عێراقییەكانمان و زۆرێك لە خۆراسانییەكان گوتوویانە: هێندەیان دەدرێتێ، كە لە حاڵەتی هەژاریی دەریان بهێنێت و، بیانخاتە حاڵەتی دەوڵەمەندیی یەوە، ئەویش بریتیە لەو ئەندازەیە، كە بەبەردەوامیی تەمەنیان بەشی ژیان و گوزەرانیان بكات.... دوایی دەڵێت:

---

[1]) ج٦ ص١٨٠، ١٨١.

هاوەڵانمان گوتوویانە: ئنجا ئەگەر بابای ئاتاج، پیشەیەکی هەبوو، ئەوە هێندەی دەدرێتێ کە پیشەکەی، یان ئامرازەکانی ئەو پیشەیەی پێ بکڕێت ، جا نرخەکەیان زۆر بێت، یان کەم، دەبێ ئەو ئەندازە ماڵە، کە دەیدرێتێ، هێندە ببێ، کە بە قازانج و بەرهەمەکەی بژی و بەشی بکات ، دیارە ئەویش بە پێی جیاوازیی پیشەکانو وڵاتان و ڕۆژگار و کەسەکان دەگۆڕێ، هەندێك لە هاوەڵانمان وێنەیان هێناوەتەوە، گوتوویانە: کەسێك پاقلە بفرۆشێت، پێنج درەم، یان دە درەمی دەدرێتێ، بەڵام کەسێك کە پیشەکەی گەوهەر فرۆشیی بێ، دەهەزار درەمی دەدرێتێ، مادام بەو ئەندازەیە نەبێ مەداری ساز نەبێو کارەکەی بۆ نەکرێ، هەروەها ئەگەر بازرگان، یان نانەوا بێ، یان بۆنفرۆش، یان پارەگۆڕەوە (صرّاف)بێ، بەگوێرەی پێویستیی پیشەکەی دەیدرێتێ...).

(أَبو يُوسُفَ)یش لەوبارەوە گوتوویەتی: (**يُدْفَعُ لِلْعَاجِزِ عَنْ زِرَاعَةِ أَرْضِهِ الْخَرَاجِيَةِ بِسَبَبِ فَقْرِهِ، كِفَايَتُهُ مِنْ بَيْتِ الْمَالِ قَرْضًا لِيَعْمَلَ**) [1] واتە: کەسێك کە بە هۆی هەژارییەوە ناتوانێ زەوییە خەڕاجییەکەی خۆی بەرهەم بێنێ، دەبێ لە خەزێنەی دەوڵەت (بيت المال) بە قەرز هێندەی بدرێتێ، کە کاری تێدا بکات و زەوییەکەی خۆی ڕەنێو بهێنێ و کاری تێدا بکات. ئەوە لە حاڵێکدا کە کابرا توانای کاری هەبێت.

**دوو:** بەڵام ئەگەر ئەو کەسە بە هۆی پیریی، یان نەخۆشیی، یان کار چنگ نەکەوتنو... هتدەوە، نەیتوانی پێداویستییەکانی خۆی دابین بکات، ئەوە لەسەر خێزان و بنەماڵەی کەمەسرەف کێشانی لەسەریانە، پێویستە کاری ڕاپی بکەن، بە پێی فەرمانی خوا: ﴿ ... وَعَلَى ٱلْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَ ... ﴿٢٣٣﴾ ﴾ البقرة، واتە: لەسەر میراتگرە وەك ئەوەی ڕابرد، هەروەها: ﴿ ... وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ ... ﴿٦﴾ ﴾ الأحزاب، خزمان لە کتێبی خوادا، هەندێکیان لە هەندێکیان نزیکترن، یانی: پێویستە پێداویستییەکانی یەکدی دابین بکەن ، دیارە شەرعزانان بە تەفصیل باسی ئەو مەسرەفکێشانەیان کردوە، کە بە پێی پلە بەندیی پلەو پێگە.

---

[1] ) رد المحتار على الدرّ المختار، ج٣ص ٣٦٤.

**سێ:** ئنجا ئەگەر ئەو بابا ئاتاجە، کەسی وای نەبوو، کە مەسرەفکێشانی لەسەری پێویست بێت، یان هەر کەسی نەبوو، یان کەسەکانی هەژار و نەداربوون، ئەو ئەو ئەرکە دەچێتە ئەستۆی زەکاتەوە، کە مافی نەدارانە لەسەر دەوڵەمەندان، وەك پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" فەرموویەتی: {تُؤخَذُ مِنْ أغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ}( مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٦٨٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥٨٣))، واتە: لە دەوڵەمەندان وەردەگیرێ و دەگێڕدرێتەوە بۆ هەژارەکانیان، خوای کار بەجێ ئەوانەی زەکاتیان پێ دەشێت، بۆ خۆی دیاری کردوونو تەنانە بۆ پێغەمبەریشی بەجێ نەهێشتوون، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٦٠﴾ التوبة.

**چوار:** ئەگەر زەکاتیش بە شی ئەوەی نەکرد، پێداویستییەکانی ئەو ئاتاج و خاوەن پێداویستییانە دابین بکرێن، ئەوە پێویستە لە خەزێنەی دەوڵەت دابین بکرێن.

**پێنج:** ئەگەر خەزێنەی دەوڵەتیش توانای نەبوو، کە جاری وایە دەوڵەت توانای نیە، ئەوە لەسەر دەوڵەت پێویستە، کە پێداویستییەکانی ئاتاجانی بێ چارە و کلۆڵ، لە دەوڵەمەندان وەربگرێ، وەك (إبن حزم الأندلسي) لەوبارەوە دەڵێ: (**وفرض على الأغنياء من أهل كل بلد أن يقوموا بفقرائهم ويجبرهم السلطان على ذلك إن لم تقم الزكاة بهم، فيقام لهم مما يأكلون من القوت الذي لابد منه، ومن اللباس للشتاء والصيف بمثل ذلك وبمسكن يكنهم من المطر والصيف والشمس وعيون المارة**)[1] واتە: وە لەسەر دەوڵەمەندان پێویستە، ئەگەر خەزێنەی دەوڵەت تێیدا نەمابوو، کە ژیانی هەژارەکانی دابین بکەن، حوکمڕان لەسەر ئەوە فشاریان بۆ دێنێ و ناچاریان دەکات، کەوا بکەن، مادام زەکات بەشیان نەکات، ئەو کاتە بایی ئەوەندە،کەپێی بژین لە خواردن و خۆراك بۆیان دابین دەکرێ هەروەها بەرگ و پۆشاك بۆ زستان و هاوین بە هەمان شێوە،جێگاو ڕێگایەکیان بۆ دابین دەکرێ، کە لە باران و لە گەرما و لە خۆر و لە چاوی خەڵك بیانپارێزێ.

دیارە بەڵگەی ڕەوایی ئەم مەسەلەیەش کۆی ئەو ئایەت و فەرمایشتانەیە، کە فەرمان دەکەن بە هاوکاریی و دەستگرتنی هەژار و نەدار و هەتیو و قەرزدارو ڕێبوارو ئاتاج،

---

[1]) المحلّى، ج٦ ص ١٥٦.

وەك لە ڕابردوودا ئاماژەمان بە بەشێکیان کرد، (إبن حزم)یش لە (المحلى) کەیدا، لەبەرگی شەش دا لە لاپەڕە (١٠٥) تا (١٠٨) لە مەسەلەی (٧٢٥)دا بەڵگەی زۆری لەو بارەوە هێناونەوە، هەروەها ئێمەش لە کتێبی (خواپەرستیی ئیسلامیی) لە بەرگی سێیەم: (زەکات و ماڵبەخشین) لە لاپەڕە (٣٥) تا (٣٦) لەچاپی دووەم دا، بەدرێژیی قسەمان لەو بارەوە کردوە.

لەمەوە کە ڕابرد، بۆمان دەرکەوت چۆن ئیسلام تەماشای مافە کۆمەڵایەتییەکان دەکات، چۆن بۆ هەموو لایەکیان دابین دەکات، دیارە ئەوەش لە حاڵێکدایە، کە شەریعەت پیادە بکرێ‌و کۆمەڵگا ملکەچی شەریعەتی خوا بێ و، ئەو دەوڵەت و دەستەڵاتە، کە لە سەر مسوڵمانانەو سایەو سێبەریانە، پابەند بێ بە شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە.

## جۆری شەشەم: مافە سیاسییەکان:

خوێنەری سەنگین! ئەمجارە دەچینە سەرخستنە ڕووی شەشەمین جۆری ماف و ئازادییەکان، کە پێویستە لەکۆمەڵگاو دەوڵەتێکی ئیسلامییدا بۆ تاك تاکی ئەندامان دابین بکرێن، کە ئەویش بریتیە لە مافە سیاسییەکان، کە دیارە جۆری کۆتاییشە لە ماف و ئازادییەکان.

مافە سیاسییەکان، یاخود ماف و ئازادییە سیاسییەکان، زانایانی شارەزای بواری یاسا و دەوڵەتداریی، بەم جۆرە پێناسەیان کردوون: (الحقوق التي تثبت لشخص باعتباره عضوًا في جماعة سياسية معينة تمكنه من الإسهام في إدارة شؤون هذه الجماعة )[1] واتە: ئەو مافانەن کە بۆهەر تاکێك دەچەسپێن لەو ڕووەوە، کە ئەندامێکە لە نێو کۆمەڵێکی سیاسیی دیاریی کراودا، کە ئەو مافانەش ڕێگا تەخت دەکەن بۆ ئەو ئەندامە، کە بەشداربێ لە بەڕێوەبردنی کاروباری ئەو کۆمەڵ‌و کۆمەڵگایەدا، کە تێیدا دەژی.

### دەتوانین مافە سیاسییەکان بۆ حەوت بەش دابەش بکەین:

یەکەم: مافی گردبوونەوە و کۆبوونەوە (حق التجمع والإجتماع).

---

[1]) مبادىء القانون، د. محمد لبيب شنب، ص ١٢٨.

دووەم: مافی پێکهێنانی ڕێکخراو و کۆمەڵە مەدەنیی و سیاسییەکان (حق تكوين الجمعيات والجماعات المدنيّة والسياسية)

سێیەم: مافی هەڵبژاردن ( حق الإنتخاب).

چوارەم: مافی خۆکاندید کردنو کاندیدکران (حق الترشح والترشيح).

پێنجەم: مافی ڕاوێژکردن.

شەشەم: مافی بەئەستۆگرتنی ئەرك و بەرپرسیاریێتی ( حق تولِّي الوظائف ).

حەوتەم: مافی فەرمان بەچاکەو ڕێگریی لەخراپە.

## یەکەم: مافی گردبوونەوەو کۆبوونەوە (حق التجمع والإجتماع):

سەرەتا دەڵێم: بۆ یە گوتوومانە: گردبوونەوە یان خڕبوونەوەو کۆبوونەوە، مەبەستمان لە گردبوونەوە، یان خڕبوونەوە، ئەوحاڵەتی کۆبوونەوەی خەڵکە کە لە: خۆپیشاندان، ڕێپێوان، مانگرتن (المظاهرة، المسيرة، الإعتصام)دا خۆی دەنوێنێت، مەبەستیشمان لە کۆبوونەوە ئەوەیە، کە لە حاڵەتی بەستنی کۆڕێك، سیمینارێکدا بەرجەستە دەبێ‌و لە شوێنێکی تایبەتدا خەڵك کۆدەبێتەوە بەشێوەیەك، کە ڕێك و پێکیی زیاتری پێوە دیار بێ، ئەم مافەش کە پێشتریش باسمان کرد، مافی ڕەوای تاك تاکی ئەندامانی کۆمەڵگایە، کە ئەگەرپێویستی کرد، یاخود بەپەسەندیان زانی، هەم خڕببنەوەو گرد ببنەوەو، لە شێوەی ڕێپێوان و خۆپیشاندان و مانگرتن و ئەوانەدا خۆیان بنوێنن، هەم مافیشیانە کە کۆببنەوە، بەڵگەشمان لەسەر ئەوە، کە ئەم مافە سیاسییە، مافێکی ڕەواو دانپێداهێنراوی تاك تاکی ئەندامانی کۆمەڵگایە، ئەوەیە، کە بناغە لە هەڵسوکەوتەکانو نەریتەکاندا وەك چەندان جار باسمان کردوە، بریتیە لە ڕەوایی، ئنجا شتێکی سەلمێنراویشە کە مەسەلەی گردبوونەوەی خەڵكو کۆبوونەوەشیان، دەکەوێتە نێو بازنەی نەریتو هەڵسوکەوتەکانەوە، کەواتە: ئەویش شتێکی ڕەوایە، هەڵبەتە لە بناغەدا ڕەوایە، بەڵام جاری وا هەیە حوکمەکەی لە ڕەواییش دەچێتە سەرتر، دەبێتە شتێکی پەسەندو جاری وا هەیە دەچێتەسەرووتریشو، دەبێتە شتێکی پێویست، ئنجا جاری وایە پێویستییەکی تایبەتیی (فرض عين)وجاری واشە، پێویستییەکی گشتیی (فرض كفائي)، پێشتریش

باسمانکرد، کە هەموو ئەو شتانەی ڕەوان، هەرکات ئەرکێکی پەسەند (مندوب و مُسْتَحَبّ) پەکی لەسەری کەوت، ئەوشتە کە لە ئەسڵدا ڕەوایە، حوکمەکەی دەگۆڕێ بۆ پەسەندیی و (الإستحباب)،وە هەر کات شتێك پەکی لەسەری کەوت، کە پێویستە، ئەو کاتە ئەوشتە ڕەوایە، حوکمەکەی دەگۆڕێ بۆ پێویستیی بۆ(الوجوب) چ فەرزی عەین،چ فەرزی کیفایە.

## حوکمی گردبوونەوەو کۆبوونەوە

لێرەدا دەڵێم ئەوانەی، کە لە ژێر فشاری ڕژێمێکی سیاسییدا فەتوا لە دژی کۆبوونەوەی خەڵك و خڕبوونەوەو گردبوونەوەیان دەردەکەن‌و دەڵێن: ئەوە شتێکی ناشەرعییە، یاخود جاری وایە بیستراوە، کە گوتوویانە: ئەوە شتێکی بیدعەتە!! لە ڕاستیدا ئەسڵی حوکمدان بەسەرگردبوونەوخڕبوونەوەی خەڵك، یاخود کۆبوونەوەیاندا بەوە کە ناشەرعییە، ئەوە لە خۆیدا شتێکی ناشەرعییەو بە بیدعەت دانانی شتێکی نارەواو داهێنراوە، چونکە ئێمە پێشتر باسمان کرد، کە هەڵسوکەوتەکان بناغە تێیاندا دەستکراوەییە، بە تایبەت، بواری حوکم و سیاسەتکە دەقی کەمان هەن لە بواری حوکم و سیاسەتدا، ئەوەی، کە دەبێتە پێوەرو سەنگی مەحەك بۆ ئەوە، کە فلاَن هەڵسوکەوتە، فلاَن عادەتە باشەو بکرێ، یان خراپەو نەکرێ، بریتیە لە بەرژەوەندیی (مصلحة)و، ئەگەر بەرژەوەندییمان تێدا بینی، ئەوە دیارە شەرع ڕێی پێداوە بکرێ، یان بە حوکمی ڕەوایی، یان بەحوکمی بە پەسەند دانان، یان بە فەرز و پێویست دانان، بەلاَم ئەگەر خراپە (مفسدة)مان تێدا بینی، ئەو کاتە شەرع دەڵێ: با نەکرێ، یان بەحوکمی بە ناپەسەند دانان، یاخود بە حوکمی بەقەدەغە دانان.

ئنجا ئێمە کاتی خۆی لە (إبن تیمیة)وە ڕەحمەتی خوای لێبێ هێنامان، کە گوتوویەتی:( **وَالْعَادَاتُ الْأَصْلُ فِيهَا الْعَفْوُ، فَلاَ يُحْظَرُ مِنْهَا إلاَ مَا حَرَّمَهُ اللهُ**)[1] واتە: هەڵس‌و کەوت‌و عادەتەکان، بناغە تێیاندا ڕێپێدرانە، لێیان قەدەغە ناکرێ، مەگەر ئەوەی خوا قەدەغەی کردبێ، واتە: کە بە دەقێکی شەرعیی ڕوون، قەدەغە کرابێ. (إبن

---

[1]) القواعد النورانية الفقهية، ص ١١٢.

عقيل الحنبلي) (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) گوتوویەتی، وەك (إبن القيم) لە كتێبی: (الطرق الحكمية في السياسة الشرعية)[1] دا لیوەی نەقڵ دەكات: (السياسة: **ما كان من الأفعال، بحيث يكون الناس معه أقرب إلى الصلاح، وأبعد عن الفساد، وإن لم يشرعه الرسول** "صَلَى اللهُ عَلَيِهِ وَسَلَمْ"، **ولا نزل به وحي**) واتە: سیاسەت هەر كردەوەیەكە، كە خەڵك بە هۆیەوە لە چاكە و بەرژەوەندیی نزیك بن و، لە خراپەو زیان دوور بن، با ئەو شتە پێغەمبەریش "صَلَى اللهُ عَلَيِهِ وَسَلَمْ" داینەنابێ‌و وەحیشی لەسەر نەهاتبێت.

ئنجا ئایا ئەو زانایانەمان بۆچی وا دەڵێن؟ چونكە زانیویانە، كە لە بواری حوكم و سیاسەت و بواری هەڵسوكەوتەكاندا،دەقی شەرعیی كەمان هەن‌و تەنیا چەند دەقێكمان هەن، كە چوارچێوەیەكی فراوان‌و چەند بنەمایەكی گشتی دادەنێن بۆ ئەو بابەتە، بەڵام نە چوونەتە نێو وردەكارییەكانەوە، لەبەرئەوەی خوای كار بەجێ ( سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى ) زانیویەتی و دەزانێت، كە بواری هەڵسوكەوتەكان‌و بواری حوكم و سیاسەت و ئیدارەو دنیاداریی، مرۆڤـــ زۆر تێیدا بەرەو پێشەوە دەچێ، بۆیە ئەگەر وەحی چووبایە نێو وردەكارییەكانیەوەو، بە پێی ئەو هەلو مەرجە، كە كاتی خۆی قورئانی تێدا دابەزیوە، قاڵبێكی دیاریكراوی بۆ داڕشتبانایە، ئەوە بێگومان ئەو كاتە دەست و پێی خەڵك دەبەسترا.

ئەوە لە لایەكەوە، لە لایەكی دیكەشەوە دەڵێین: بیدعەت وەك زۆربەی هەرەزۆری زانایان ئەگەر نەڵێین هەموویان، لەسەر ئەوە یەكدەنگن، كە لەدوو بواری سەرەكیی دایە:

**یەكەم : بواری عەقیدە .**

**دووەم : بواری عیبادە .**

هەر بۆیە زانایانی ئیسلام ،ئەوانەیان بە بیدعەتچی یەكان (أهل البدع) لەقەڵەم داوە، كە لە بواری عەقیدەدا تووشی لادان بوون وەك: جەبرییەو قەدەرییەو موعتەزیلەو مورجیئەو ڕافیزەو...هتد، یاخود لە بواری عیبادەت دا، وەك زۆر لە ئەهلی تەصەووف كە لە شێوازەی شەریعەت چوونەتە دەر، زانایانی ئیسلام ، زیاتر ئەوانەیان بە

---

[1]) ص ٢٢

بیدعەتچیی و داهێنەر لەقەڵەم داوە، کە لەو دوو بوارەدا شتیان لە دین دا پەیدا کردوە، چونکە ئەو دوو بوارە، شەریعەت نوختەی تێدا خستوونەتە سەر پیت: عەقیدە و ئیمان، نوختەی تێدا خراوەتەسەر پیتو، بۆ ئیجتیهادو بۆ بیرو بۆچوونی زانایان بە جێ نەهێڵراوە، عیبادەتیش بەهەمان شێوە، شەریعەتی بەرجەستە لە قورئان و سوننەت دا، نوختەی تێدا خستۆتەسەر پیت، بۆیە هەرشتێك لە بواری عەقیدەو لە بواری عیبادەت دا زیاد بکرێ، بە بیدعەت و داهێنان لەقەڵەم دەدرێ، بەلاّم بە پێچەوانەوە، بواری هەڵسوکەوتەکان بە تایبەت، بواری حوکم و سیاسەت، شەریعەت نوختەی تێدا نەخستۆتە سەر پیت و دەرفەتی زۆر ماوەتەوەو بۆشاییەکی زۆر ماوەتەوە، کە ئینسانەکان بە ئیجتیهادو بۆچوونی خۆیانو بە پێی گەشەکردنی کۆمەڵگا لە ڕۆژگاری خۆیان دا، ئەو بۆشاییە پڕبکەنەوە،ئنجا ئەگەر بێتو ئێمە هەرچی لە بواری هەڵسوکەوتەکانو بواری ئیدارەو حوکم و سیاسەتدا داهێنراوەو پەیدا کراوە، بە بیدعەت لەقەڵەم بدەین، دەبێ زۆرێك لەوەی، کە چوار خەلیفە ڕاشیدەکان (خوا لێیان ڕازی بێ) کردوویانە،بە تایبەت عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێیی ڕازی بێ)، کە لە حوکم و سیاسەت و بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا، داهێنانی زۆری کردوە، دەبێ هەمووی بە بیدعەت لە قەڵەم بدەین !، بەلاّم لە ڕاستیدا ئەوە شتێکی هەڵەیە، بۆیە بە ناشەرعیی‌و بە بیدعەت لەقەڵەمدانی خڕبوونەوەی خەڵك‌و کۆبوونەوە کردنیان، لە لایەن هەندێك لە زانایانەوە، کە سەر بە دەوڵەت‌و ڕژێمێکی دیاریی کراون، هەڵەیەو زوڵمکردنیشە لە ئیسلام، چونکە ئیسلام لەو بوارەدا دەقێکی نەفەرمووە، کە نابێ خەڵك پێکەوە کۆنەبنەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، چەندان دەق هەن،کە ئاماژە بەوە دەکەن، کە خەڵك بۆ هەر بەرژەوەندییەك، کە بە پێویستی بزانن، یاخود بە پەسەندی بزانن بۆی کۆببنەوە، بەلاّم هیچ دەقێکمان نیە بڵێ: قەدەغەیە خەڵك کۆبێتەوە، جا لە شێوەی خۆپیشاندان، یان شێوەی ڕێپێوان، یان شێوەی مانگرتندا، یاخود لە شێوەی بەستنی کۆڕێك، سیمینارێك، ڕاوێژ کردنێکدا، خەڵك کۆبێتەوە، با پێچەوانەی سیاسەتی ئەو دەوڵەت و ڕژێمەش بێت و بۆ ڕەخنەگرتنیش بێت لێی، هیچ دەقێکمان نیە ڕێی لێبگرێ، بە پێچەوانەشەوە لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکاندا، خەڵك کۆبۆتەوەو ڕەخنەشی گرتوەو، هیچ کەسیش نەیگوتوە: شتێکی ناشەرعییتان کردوە،

مەگەر لە خودی کۆبوونەوەو خڕبوونەوەو خۆپیشاندانەکاندا شتی ناڕەوا بووبێ، بەلاَم ئەسڵەکەیان ناشەرعیی نیە، لەڕاستیدا - وەك پێشتریش گوتمان- ئەو مەسەلەی کۆبوونەوەو و گرد بوونەوەی خەڵك، پێنج حوکمەکانی بەسەردا دەچەسپن: ئەگەر بۆ مەبەستێکی موباح بێ، موباحەو، ئەگەر بۆ مەبەستێکی پەسەندبێ، پەسەندە، ئەگەر بۆ مەبەستێکی فەرز بێ فەرزەو،ئەگەر بۆ مەبەستێکی ناپەسەند بێ، ناپەسەندەو، ئەگەر بۆ مەبەستێکی قەدەغەو خراپیش بێ، وەك زیانگەیاندن بە کەل‌و پەلی خەڵك‌و کۆمەڵگا، ئەوە لەبەر زیان گەیاندنەکە قەدەغە بێ.

ئەوەش، کە زانایان دەڵێن: ئەسڵ لە هەڵسوکەوتەکاندا، دەستکراوەیی و ڕەواییە، لە گەلێك لەدەقەکانی قورئان وسوننەتی پێغەمبەر (صَلَى اللّٰه عَلَيه وَسَلَم)یان وەرگرتوە، بۆ وێنە:

١)- خوا ( سُبْحانَهُ وَتَعالَى ) لە سوورەتی (الجاثية) ئایەتی: (١٣)دا دەفەرمووێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ ...(١٣) ﴾، واتە: وە (خوا) هەرچی لەئاسمانەکان و زەمین دایە، تێکڕای لە لایەن خۆیەوە بۆ ئێوە دەستەمۆو مەیسەر کردوە،کەواتە: هەمو شتێك بۆ بەرژەوەندیی مرۆڤەکان خولقێنراوە و بەدیهێنراوە.

٢)- هەروەها لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٩)دا فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ...(٢٩) ﴾، واتە: (خوا) ئەو کەسەیە، کە هەرچی لە زەویدا هەیەو لەسەر زەوییە، تێکڕای بۆ ئێوە دروستکردوە.

٣)- لە سوورەتی (الرحمن) ئایەتی (١٠)دا خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ (١٠) ﴾، خواتە: (خوا) زەوی بۆ خەڵکی داناوە.

کەواتە: زەوی‌و ئەوی لە زەویدایە، بۆ خەڵك دروستکراوەو مانای وایە، نابێ هیچ شتێکیان لێ قەدەغە بێ، مەگەر ئەوەی کە شەریعەت بە دەقێکی ڕوون قەدەغەی کردبێ، یاخود عەقڵی سەلیم و ئەزموون دەری خستبێ، کە ئەو شتە خراپە.

٤)- هەروەها لە سوورەتی (الأنعام) لـە ئایـەتی (١١)دا دەفـەرموێ: ﴿قُلْ سِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ ...﴿١١﴾﴾، واتە: بڵێ: بە زەویدا بڕۆن، كەواتە: خەڵك بـۆی هەیـە هـەموو ئەو شتانەی، كە خوا دروسـتی كـردوون، لێیـان بەهرەمەنـدبێ، مەگـەر دەقێكـی شەرعیی ڕوون شتێكی قەدەغە كردبێ، وەك: گۆشتی بـەرازو خـوێن و مـردارو بـۆ جگە لەخوا سەربڕاو.

## دووەم: مـافی پێكهێنـانی ڕێكخـراوو كۆمەڵـە مـەدەنیی و سیاسییەكان:

جـۆری دووەمـی مافـە سیاسـییەكان، بریتیـە لـە مـافی پێكهێنـانی ڕێكخـراوو كۆمـەڵەمـەدەنیی و سیاسییەكان، ئەمیش دیسان لەسـەر بناغـەی ڕەوایـی و ڕێپێـدراویی هەڵسوكەوتەكان بەگشتی، لە بنەڕەت دا مـافێكی ڕەوایەو، دوایيش حوكمەكـەی بـە پێـی گرنگیی و پێویستیی ئـەو ئامـانج و مەبەسـتەی، كـە ئـەو ڕێكخـراوە مەدەنییـەی بـۆ د روست دەكرێ، یاخود ئـەو ڕێكخـراوو كۆمـەڵـە سیاسـییەی بـۆ پێـك دێ، حوكمەكـەی دەگۆڕێ، واتە: ئەو ئامانج و مـەبەسـتە، ئەگـەر شـتێكی پەسـەند بـێ، ئـەو ڕێكخـراوە مەدەنییە، یاخود سیاسییەش، كـە پێـك دەهێنـرێ، ئـەویش دەبێتـە شـتێكی پەسـەندو پاداشتی لەبەرانبەردا دەبێو، ئەگەر ئامانج و مەبەستەكە شتێكی پێویست بێ، ئەو كاتـە حوكمی پێكهێنانی ئەو كۆمەڵە ئـەو ڕێكخـراوە مەدەنییـە، یـاخود سیاسـییەش دەبێتـە پێویسـت، پێویسـتیش دوو جـۆرە: پێویسـتی عـەینی، پێویسـتی كیفـائیی، واتـە: پێویستییەك، كە پەیوەندیی بە تـاك تـاكی ئەندامانـەوە هەیـە،وە پێویسـتییەكیش، كـە پەیوەندیی بە هەموویانەوە هەیە بە گشتی.

ئنجـا دەتـوانین وێـڕای ئـەو بنچـینە شـەرعییە گشـتیە، كـە دەڵـێ بناغـە لـە هەڵسـوكەوتەكاندا ڕەوايیـە، كـە دیـارە پێكهێنـانی ڕێكخراوێكـی مـەدەنیی، یـاخود ڕێكخراوێكی سیاسییش، لە بواری هەڵسوكەوتەكان دایەو، ئەویش ئەسڵ و بناغـە تێیـدا ڕەواییە، وێڕای ئەو بنچـینە شـەرعییە، دەگـونجێ چـەند دەقێكـی قورئـان و سـوننەتیش بەبەڵگە بێنینەوە، بۆ وێنە:

١/ لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (٢)دا خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) دەفەرموێ: ﴿...وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى ...﴾، واتە: هاوكاریی یەكدی بكەن لەسەر چاكەكاریی و پارێزكاریی، واتە: هەر شتێك چاكە بێو بۆ خەڵك سوودی هەبێ ،ئێمە نەك هەر بۆمان ڕەوایە، بەڵكو لەسەرمان پێویستكراوە، كە لە نێو خۆماندا هاوكاریی لەسەر بكەین، بۆ ئەوەی ئەو شتە چاكە بێنینە دی، هەروەها هەر شتێك ،كە مایەی پارێزكاریی یەو مایەی ئەوەیە، كە ئێمە بپاریزرێین لە لێپرسینەوەی خواو لە سزاو جەزرەبەی خوا، پێویستە هاوكاریی لەسەر بكەین و دەستباری یەكدی بۆ بگرین، ئاشكراشە هاوكاریی یەكدی كردنو دەستبار بۆ یەكدی گرتن بەبێ ڕێكخستنو ڕێكو پێكی، ناكرێ.

٢/ هەروەها لە ئایەتی ژمارە (١٠٤)ی سوورەتی (آل عمران)دا خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) دەفەرموێ: ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾، واتە: با لە نێو ئێوەدا كۆمەڵێك هەبن، كە بانگەواز دەكەن بۆ چاكە، فەرمان دەكەن بە هەموو شتە پەسەندەكان، ڕێ دەگرن لە هەموو شتە ناپەسەندەكان، هەر ئەوانەش سەر فرازن و بەختەوەرن. كەواتە: نەك هەر ڕەوایە، بەڵكو پێویستیشكراوە، كە كۆمەڵێك هەبن، خەڵكێكی پێكەوە كۆبووەوە هەبن، كە ئەم سێ ئەركە جێ بەجێ بكەن:

أ/ بانگەواز بكەن بۆ چاكە، كە بە تەئكید هەموو خێرو چاكەیەك لە ئیسلام دا هەیە، ئنجا چ ڕاستەوخۆ فەرمانی پێكردبێ، چ ناڕاستەوخۆ، كە بریتیە لەوەی فەرمانی كردوە، یان ڕێگای داوە، كە ئەندامانی كۆمەڵگا، هەرچی بە چاك و پەسەندی دەزانن بۆ دینداریی و دنیاداریی خۆیان، بۆ دین و ژینی خۆیـ ن پەیدای بكەن.

ب/ فەرمان بە شتی پەسەند بكەن.

ج/ ڕێ لە شتی ناپەسەند بگرن.

كۆبوونەوە بۆ ئەو مەبەستە فەرزە، نەك هەر ڕێ بێدراوە!.

کەواتە: کۆبوونەوەو خۆڕێکخستنی مسوڵمانان، چ لە شێوەی ڕێکخراوێکی مەدەنییدا بێ، چ لە شێوەی ڕێکخراوێکی سیاسییدا، چ لە شێوەی هەر کۆبوونەوەیەکی دیکەدا، کە ئەو ئامانجانە بێنێتەدی، ئەوە مسوڵمانان و کۆمەڵگای ئیسلامیی لەسەریشیان پێویستکراوە، نەك هەر ڕێیان پێدراوە، چونکە هەرچی فەرزێك پەکی لەسەری بکەوێ، فەرز دەبێ.

٣) هەروەها پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: {«إِنَّ الْمُؤْمِنَ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا»}(أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بـرقم: (٢٣١٤)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٢٥٨٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٩٢٨) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٥٦٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٣١))، واتە: بێگومان بڕوادار بۆ بڕوادار وەك دیوار وان، هەندێکی هەندێکی مەحکەم دەکات، کەواتە: پێویستە ئێمە مەحکەمکەری یەکدی بین، پێکەوە پەیوەستو جۆشدراو بین، ئەوەش ئاماژەیەکی زۆر ڕوونە لەلایەن پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ەوە، کە مسوڵمانان پرژ و بڵاوو نەبنو بێ سەرو بەر نەبن، بەڵکو تێکترینجاو بنو پێکەوە جۆشدراوو پەیوەست بن و هۆندراوەو ڕێك و پێك بن، ئایا دەنکەکانی تەسبیحێك تەسبیحیان لێ پێکدێ، ئەگەر بەدەزوویەك بەیەکەوە نەبەسترێن؟ ئایا ئەڵقەکانی زنجیرێك، ئەگەر پێکەوە گرێ نەدرێن، دەبنە زنجیر؟ بە تەئکید نەخێر، بۆیە مسوڵمانانیش دەبێ پێکەوە پەیوەست بن، وەك چۆن بەردو خشتەکانی دیوارێك، بینایەك ئەگەر بەیەکەوە پەیوەست نەکرێنو پێکەوە نەهۆنرێنەوە، نابن بە دیوارو خانوو، بە هەمان شێوەش ئەندامانی کۆمەڵگایەکیش، ئەگەر پێکەوە پەیوەست نەبن و پێکەوە نەهۆنرێنەوە، نابن بە کۆمەڵو نابن بە کۆمەڵگا، واتە: کۆمەڵگا و کۆمەڵێکی تۆکمەو توندوتۆڵ و پتەو، ئەوەی خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) لە مسوڵمانانی دەوێ ئەوەیە، کە پێکەوە جۆشدراوو پەیوەست و گرێدراوو هۆندراوە بن، ئنجا ئەوەش جاری وایە لە شێوەی ڕێکخراوێکی مەدەنییدا خۆی دەبینێتەوە،ئەو ڕێکخراوە مەدەنییەش، جاری وایە لەسەر بناغەی پیشە دەبێ، وەك: مامۆستایان، قوتابیان، ئەندازیاران، پزیشکان ... تا کۆتایی،جاری واشە لەسەر بناغەی

ئامانجێك، كە وەدی دەهێندریٚ، بۆ وێنە: ئەوانەی كە دەیانەویٚ دژی هەژاریی و نەداریی بوەستنەوە، ئەوانەی دەیانەویٚ دژی سواڵكردن بوەستنەوە،ئەوانەی دەیانەویٚ دژی نەخۆشیی بوەستنەوە، ئەوانەی دەیانەویٚ سەرزەوی سەوز و جوان بیٚ... هەروەها، تا كۆتایی، جاری واشە لە شێوەی ڕێكخراوێكی سیاسیو حیزبێكی سیاسییدا، خۆی بەرجەستە دەكات.

## حوكمی خۆڕێكخستنی نامسوڵمانان
## لە كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا

ئنجا پێویستە لێرەدا ئەوەش بزانریٚ، كە دەڵێین: مافی گردبوونەوە و خڕبوونەوە، یاخود مافی كۆبوونەوە لە شێوەی ڕێكخراوی مەدەنیی، یاخود ڕێكخراوی سیاسییدا، مافێكی سەلمێنراوو دانپێدا هێنراوە بۆ تاك تاكی كۆمەڵگا، مەبەستمان تاك تاكی كۆمەڵگای مسوڵمانە، بە مسوڵمان و نا موسوڵمانەوە، واتە: ئەوانەی كە نامسوڵمانیشن ئەوانیش مافی خۆیانە، كە خڕ ببنەوە، یاخود كۆببنەوە، هەروەها بۆیان هەیە كە ڕێكخراوی مەدەنیی، یاخود ڕێكخراوی سیاسیی بۆ خۆیان دروست بكەن، هەڵبەتە من دەزانم لە نێوان زانایانی مسوڵمانی هاوچەرخدا، لەوبارەوە مشتومڕو ڕا جیاییەك هەیە، بەڵام ئەوەی من بۆم دەركەوتوە ئەوەیە، كە مادام ئیسلام ڕێگا دەدات بە نامسوڵمانان، كە نامسوڵمان بن، وەك پێشتر باسمان كرد: ﴿...فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ ... ﴿٢٩﴾﴾ الكهف، مادام ڕێگایان پێدەدات، كە غەیری ئیسلام هەڵبژێرن بەعەقیدەو دین، دیارە دەبیٚ ڕێگای مومارەسەكردنی ئەو فیكرەو دینەشیان پیٚ بدات، ئنجا ئەو مومارەسەكردنە، جاری وایە پەكی لەسەر ئەوە كەوتوە، كە خڕببنەوەو ڕاوێژ بكەن، جاری وایە پەكی لەسەر ئەوە كەوتوە، كە ڕێكخراوێكی مەدەنیی، یاخود ڕێكخراێكی سیاسیی پێك بهێنن، چونكە تۆ لەلایەكەوە بڵێی تۆ ئازادی ، چ دین و بەرنامەیەك هەڵدەبژێری، بەڵام دوایی بڵێی: ئازاد نیت لەوەدا، كە لەسەر ئەو دین و بەرنامەیە كۆببیەوە، یاخود ئەوەی پڕاكتیزەكردنو مومارەسەكردنی ئایینو بەرنامەكەی پەكی

لەسەری دەکەویّ، ڕێی لیّ بگری، مانای وایە ئـەوەی بـە دەسـتی ڕاسـت داوتـەتیّ ، بـە دەستی چەپ لێت وەرگرتۆتـەوە، ئـەوەش لـە ڕاسـتیدا، جۆرێکـە لـە پێکـەوە نـاکۆکیی (تنـاقض) ، ئیسـلام ڕێگـا بـە شـتی وا نـادات، ئەگـەر تەماشـای مێـژووی ئیسـلامو مسوڵمانانو مێژووی دەوڵەتی ئیسلامییش بکەین، تەماشا دەکەین کەمایەتییە دینیـیو فیکرییەکان، خۆڕێکخستنی ئیداریی خۆیانیان هەبووە، ئنجا نەصرانیی بوون، مەجووسیی بوون، جوولەکە بوون...هتد.

ئیسلام نەهاتوە پەیکەرو ڕێکخستنە ئیداریی و سیاسییەکانی ئەوان هەڵوەشێنێتەوە، بەڵکو زانایانی دینیی خۆیانیان هەبوون، جاری وابووە قەوارەی سیاسی خۆیانیان هـەبووە، کاروباری خۆیانیـان بـۆ خۆیـان بـەڕێوە بـردوە، لـە حاڵێکیشـدا، کـە لـە نێـو دەوڵـەتی ئیسلامییدا بوونو لە ژێـر سـایەی دەوڵـەتی ئیسلامییشـدا بـوون، هەڵبەتـە ئێمـە لـە داهاتووشدا، لەتەوەرێکی سەربەخۆدا باسی هەڵوێستی دەوڵەتی ئیسـلامیی دەکـەین، لـە گەڵ ئەوانەدا، کـە نامسـوڵمانن و لـە ژێـر سـایەیدا دەژیـنو لـەوێ زیـاتر ئـەو بابەتـە دەتوێژینەوە .

## سێیەم: مافی هەڵبژاردن (حق الأنتخاب):

مـافی سێیەمی سیاسـیی، یـاخود جـۆری سـێیەم لـە مافـە سیاسـییەکان، مـافی هەڵبژاردن (حق الإنتخاب)ە، هەڵبەتە ئێمـە پێشـتر لـە کـاتی توێژینـەوەی بنـەمای دووەمـی سیسـتەمی حـوکمڕانیی ئیسـلامییدا: (دەسـتەڵات هـی خەڵکـە) لـە کـاتی توێژینەوەی بنەمای چوارەمدا: (ڕاوێژ بناغەی هەموو کارەکانە) ئەووەمان خستە ڕوو، کە دەستەڵاتی سیاسیی و، دانانی بەرپرسانی هەر سیّ بوارەکانی: یاسـادانان و جێبـەجیّ کردن و دادوەریی مافی خەڵکە بە گشتیی، ئەو مافەش، کە هی خەڵکـە بەگشـتیی، لەسەر بناغەی ڕاوێژ پراکتیزە دەکریّ، چونکە خوا ( سُبْحانَهُ وَتَعالَی) لەبارەی کۆمەڵگای مسوڵمانەوە فەرموویەتی: ﴿... وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ...(٣٨)﴾ الشوری: کارو باریان لە نێو خۆیان دا بە ڕاوێژە .

دیارە هەڵبژاردن (انتخاب)یش، یەكێكە لە موفرەدەكانی ڕاوێژكردن و، لە ئەنجامی ڕاوێژكردندا مەسەلەی هەڵبژاردن دێتە پێشەوە، پێشتریش باسمان كرد، كە تاكەكانی كۆمەڵگا لە مەسەلەی ڕاوێژكردندا، هەموویان یەكسانن و هەموویان مافی خۆیانە بیروڕای خۆیان بخەنە ڕوو، مافی خۆیانە پرسیان پێ بكرێ و ڕاوێژیان پێ بكرێ، بێئەوەی ئەو مافە بۆ هیچ تاكێك و بنەماڵەیەك و هۆزێك و حیزبێك و توێژێك و نەتەوەیەك، قۆرخ بكرێ، بەڵكو بە گشتیی بۆ هەموو ئەندامانی كۆمەڵگای مسوڵمان و دەوڵەتی ئیسلامیی، ئەو مافە دەستەبەر دەكرێ.

ئنجا مافی هەڵبژاردنیش مەبەستمان پێی: هەڵبژاردنی بەرپرسانە ، ئەو كەسانەی كە دەبنە مشوورخۆرو بەڕێوەبەری وڵات،ئنجا دەتوانین وێڕای بنەمای: (دەسەڵات هی خەڵكە)و بنەمای: (ڕاوێژ بناغەی هەموو كارەكانە)، ئەوەش بەبەڵگەی ڕەوا بوون و بگرە پێویست بوونی بێنینەوە، كە خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) لە ئایەتی (٥٨)ی سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا...﴿٥٨﴾﴾، واتە: بێگومان خوا فەرمانتان پێدەكات، كە سپاردەكان بگێڕنەوە بۆ خاوەنی خۆیان، واتە بۆ خەڵكی شایستەی خۆیان، كە زۆر لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: (بەپێی سیاقی ئایەتەكانیش هەر وا دەردەكەوێ)، كە مەبەست لە (أمانات) بە پلەی یەكەم بەرپرسیارێتییەكانە (المسئولیات) بەڵگەشمان ئەوەیە، كە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" وشەی ئەمانەتی لە فەرمایشتی خۆیدا، بە مانای بەرپرسیارێتیی بەكارهێناوە، لەو فەرمایشتەیدا، كە بوخاریی لە(صحیح)ی خۆیدا هێناویەتی و دەفەرموێ: {«إِذَا ضُيِّعَتِ الأَمَانَةُ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ»! قَالُوا: يَا رَسُولَ الله مَا إِضَاعَتُهَا؟ قَالَ: «إِذَا أُسْنِدَ الأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ»}(رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٨٧١٤) الْبُخَارِيُّ برقم: (٥٩)) واتە: هەركاتێك سپاردە زایە بوو، چاوەڕێی قیامەت بكەن، گوتیان: زایە بوونی سپاردە چۆنە؟ فەرمووی: هەركاتێك كاربە خەڵكی ناشایستە سپێردرا، چاوەڕێی قیامەت بكەن.

هەڵبەتە لێرەدا،كە پێشتریش باسمان كردوە مەبەستی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە (ساعة) واتە: كۆتایی هاتنی ئەو كارەو كۆتایی هاتنی ئەو كۆمەڵە، كە كاروبار لە نێویاندا بە خەڵكی ناشایستە دەسپێرن، نەك قیامەتی گەورە، كەواتە: وەك دەبینین،

پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" وشەی ئەمانەتی بە بەرپرسیارێتیی‌و مشوورخواردن‌و سەرپەرشتیكردنی كاروبار لە قەڵەم داوە، وشەی (ساعة)ش بە تەئكید مەبەست پێی كۆتایهاتنی ئەو كارەیە، واتە: ئەو كارە، كە بە غەیری ئەهلی خۆی دەسپێردری‌و بە خەڵكی ناشایستە دەسپێردرێ، لە دەستیدا مردار دەبێتەوەو كۆتاییدا پێدێ.

ئنجا ئێمە، خوا پشتیوان بێ لە تەوەرەی سێیەم دا، باسی هەرسێ دەستەڵاتەكە دەكەین: دەستەڵاتی یاسادانان‌و جێبەجێكردن ودادوەریی، ئەو كاتە وردتر ئەم مەسەلەیە دەتوێژینەوە، كە بەرپرسیارێتیی چۆن چۆنی بە خەڵك دەسپێردرێ، چۆن ئەو مافە سیاسییە هاووڵاتییان لە نێو خۆیاندا مومارەسەی دەكەن!

## چوارەم: مافی خۆ كاندید كردن و كاندید كران ( حق الترشيح والترشّح )

جۆری چوارەمی مافە سیاسییەكان: مافی خۆ كاندید كردن‌و كاندید كران (حق الترشيح والترشُّح)، وشەی (كاندید) وشەیەكی بێگانەیە، واتە: دانان و پێشنیار كردنی كەسێك بۆ بە ئەستۆوەگرتنی كارێك، دیارە ئەم مافە كە بریتیە لە پێشنیاركردنی كەسێك، یان چەند كەسێك بۆ بە ئەستۆوەگرتنی ئەركێك (واتە: ئەركێكی سیاسیی) ئەمیش لە بنەڕەتدا مافی هەموو هاووڵاتییانەو مافێكە بۆ هەموو ئەندامانی كۆمەڵگا دەستەبەر دەكرێ، بۆچی؟ چونكە ئێمە هیچ دەقێكی قورئان و سوننەتمان نیە، هەر لە ڕێوە ئەرك و بەرپرسیارێتی، چ ئەرك و بەرپرسیارێتیی هەرە باڵا، كە بریتیە لە سەرۆكایەتی دەوڵەتی ئیسلامیی و قەوارەی ئیسلامیی، ئەرك و بەرپرسیارێتییەكانی دیكەی خوارتر، هیچ دەقێكمان نیە كە هەر لەرێوە بۆ توێژێك، یاخود بۆ ڕەگەزێك، یاخود بۆ نەتەوەیەك، یان بۆ بنەماڵەیەك، یان بۆ كەسانێكی دیاریكراوی دانابن، بەڵكو ئایەتەكە بەگشتیی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَىٰ أَهْلِهَا ...﴿٥٨﴾﴾، واتە: خوا فەرمانتان پێدەكات كە سپاردەكان بگێڕنەوە بۆ ئەهلی خۆیان، دیاریی نەكردوە (أهلها) كێن؟!

کەواتە: (أهلها) هەموو ئەو کەسانەن، کە شایستەن‌و توانایان هەیە، کە ئەو کارەیان پێ بسپێرری، بەڵام لێرەدا هەڵاوارددنێك دێتە سەر ئەم مەسەلەیە، ئەویش ئەوەیە، کە کەسانێك شایستە نەبن ئەو کارەیان پێ بسپێردرێ، هەرچەندە لە بنەڕەتدا مافیان هەیە، بەڵام مادام تواناو کەفائەتیان نەبێت و شایستەییان نەبێ، ئەو ئەرك و بەر پرسیارێتییە لەوان لا دەدرێ، وەك لەم دەقەدا هاتوە، کاتێك (عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ سَمُرَةَ) (خوا لێی ڕازی بێ) داوای بەرپرسیارێتییەکی لە پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" کردوە، ئەویش پێی فەرمووە: {«**يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ سَمُرَةَ لاَ تَسْأَلِ الإِمَارَةَ فَإِنَّكَ إِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا وَإِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا**»}(أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شيبة برقم: (٣٢٥٤٣)، وَأَحْمَد برقم: (٢٠٦٤٧)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٢٤٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٦٥٢)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٩٢٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٥٢٩) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٧٨٤))، واتە: ئەی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەمورە! داوای بەرپرسێتیی مەکە، چونکە ئەگەر بەبێ داواکردن پێت بدرێ، یارمەتیت دەدرێ لەسەری، بەڵام ئەگەر بە هۆی داواکردنی خۆتەوە پێت بدرێ، ئەوە حەواڵەی خۆت‌و کارەکەت دەکرێی، واتە: خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) یارمەتیت نادات.

کەواتە: بەلای کەمەوە شتێکی ناپەسەندو خراپە، کە ئینسان بە دوای بەرپرسیارێتییدا بگەڕێ، بەتایبەت لە حاڵێکدا، کە شایستە نەبێ‌و کەفائەت و توانای جێبەجێکردنی ئەو کارو ئەو بەرپرسیارێتییەی نەبێ، کە داوای دەکات، ئەو کاتە نەك هەر ناپەسند (مکروه)ە، بگرە قەدەغەش دەبێ داوای بکات.

ئنجا ئەگەر تەماشای دەقەکانی قورئان بکەین، خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) بۆ ئەوانەی کە ئەرك و بەرپرسیارێتییان پێ دەسپێردرێ - هەرچەندە ئێمە لە داهاتوودا بە تەفصیل باسی ئەو مەسەلەیە دەکەین، لەکاتی باسکرنی دەستەڵاتی جێبەجێکردندا-، ئەگەر تەماشای دەقەکانی قورئان بکەین، دەبینین چوار خەسڵەتی سەرەکی بە مەرج گیراون بۆ هەرکەسێك، کە ئەرك و بەر پرسیارێتیی وەردەگرێ:

یەکەم: هێز (القوة). دووەم: ئەمینداریێتیی (الأمانة). سێیەم: پاراستن (الحفظ). چوارەم: زانیاریی (العلم).

١) وەك خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى ) لە ئایەتی ژمارە (٢٦)ی سوورەتی (القصص)دا لەسەر زمانی یەکێك لە دوو کچەکانی پیاوە صالحەکە دەفەرموێ: ﴿ .. يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ٢٦ ﴾ واتە: ئەی بابە! بە کرێی بگرە (واتە: مووسا بەشوان بگرە)، چونکە باشترین کەسێك، کە تۆ بەکرێی بگری بۆ ئەو کارە، بریتیە لەوە کە بە هێزو ئەمیندار بێ، مووساش هەم بە هێزەو هەم ئەمینداریشە.

٢) لە سوورەتی (یوسف) ئایەتی (٥٥)دا، کە پادشای میصر بە (یوسف) علیه السلام دەڵێت: تۆ لە لای ئێمە بەڕێز و بە حورمەتی و متمانە پێکراوی، (یوسف) علیه السلام دەفەرموێ: ﴿ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ٥٥ ﴾، واتە: من لەسەر خەزێنەکانی زەوی دابنێ (واتە: بمکە بە بەرپرسی دارایی، یاخود وەزیری ئابووریی بە زاراوەی ئەمڕۆ) ، چونکە من پارێزەری زانام. یانی: ئەوشتەی پێم بسپێردرێ ، ئەمینم دەیپارێزم، زاناشم دەزانم چۆن کارەکەم دەکەم.

بەڵێ ئەم چوارە: (هێز و ئەمینداریێتیی و پاراستن و زانیاریی)، چوار مەرجی سەرەکیین بۆ هەر کەسێك، کە ئەرك و بەرپرسیاریێتی پێ بسپێردرێت، هەڵبەتە هێزو ئەمینداریێتییو پاراستن و زانیاریی، بە پێی ئەو کارە، کە بەو کەسە دەسپێردرێ، دیاریی دەکرێن، بۆ وێنە: ئەگەر ئەرك و بەر پرسیارییەتێکی فیکرییو زانستیی بێ، پێویستە لەو ڕووەوە بە هێزو ئەمیندارو زاناو پارێزەربێ، هەروەها ئەگەر ئەركو بەرپرسیارییەتییەکی ئیدارییە، یان سەربازییە: یان ئابووریی، وەك زاناو شەرعزانان دەڵێن: ئەو هێزو ئەمانەتو پاراستنو زانیارییە، بۆ هەر شتە بە پێی خۆی دەبنو دەبێ لەو بوارەدا ئەو کەسە بەهێزو ئەمیندارو پارێزەرو زاناو شارەزابێ.

## پێنجەم: مافی ڕاوێژ کردن:

یەکێکی دیکە لە مافە سیاسییەکان، کە بۆ تاك تاکی ئەندامانی کۆمەڵگایەکی مسوڵمان، خەڵکانێك، کە لە سایەی دەوڵەتێکی ئیسلامییدا دەژین، دابین دەکرێن، بریتیە لە مافی ڕاوێژکردن، دیارە ئێمە پێشتر لە کاتی توێژینەوەی بنەمای چوارەمدا، واتە: بنەمای چوارەمی سیستەمی حوکمڕانی ئیسلامیی، کە بریتی بوو لە: (ڕاوێژ بناغەی هەموو کارەکانە) لە وێ باسی ڕاوێژ (شوری)مان کردو، دیسان جارێکی دیکە لە تەوەرەیەکی سەربەخۆدا، کە باسی سێ دەستەڵاتەکان دەکەین: یاسا دانان و جێبەجێکردنو دادوەریی، دێینەوە سەری.

بۆیە لێرەدا بەکورتیی دەڵێین: مافی ڕاوێژکردن و قسەلێکردن، مافی پرس پێکران و ڕاوێژپێکران، مافێکی بنەڕەتیی یەك یەکی هاووڵاتییانی کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییە، دیارە مەبەستیشمان لە (ڕاوێژ) هەردوو جۆرەکەیەتی واتە:

أ/ کە هەرکام لە ئەندامانی کۆمەڵگا بۆی هەبێ قسەی خۆی بکات، بێ ئەوەی کەس پرسی پێ بکات، بیرو ڕای خۆی بخاتە ڕوو، پێشنیاری خۆی بکات، ئەوەی کە بە چاکی دەزانێو بە پێویستی، دەزانێ بیخاتە ڕوو.

ب/ پاشان مافی ئەوەشی هەبێ کە پرسی پێ بکرێ، ئنجا ئەگەر تەماشای ئەو دوو ئایەتە موبارەکە بکەین، کە ئەو مەسەلەیان تێدا باسکراوەو هەردووك وشەی: (شوری و مشاورة)یان تێدا باسکراون، زۆر بەڕوونیی دەزانین و بۆمان دەردەکەوێ ،کە خوا ( سُبْحانَهُ وَتَعالَی ) ئەو مافەی نەداوە بەکەسانێکی تایبەت، بەڵکو گشتاندوویەتی بۆ هەموو لایەك.

جارێ ئایەتی یەکەمیان (الشوری -٣٨-)، کە باسی ڕاوێژ (شوری) دەکات،ئەگەر تەماشای سیاقی ئایەتەکان بکەین، دەبینین، کە خوا (سُبْحانَهُ و تَعالَی) باسی سیفەتە سەرەکییەکانی کۆمەڵی مسوڵمانو خەڵکی مسوڵمان دەکات بەگشتی، واتە: تەنانەت ئەگەر دەوڵەت و قەوارەی سیاسیشیان نەبێ، دەفەرموێ:﴿ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱلَّذِينَ

يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُواْ هُمْ يَغْفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُواْ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾الشورى، وەك دەبینین ،خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) باسی کۆمەڵی مسوڵمان دەکات بە گشتی، کەواتە: ئەم (وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ)ە، واتە: کاروباری ئەو کۆمەڵە مسوڵمانەو ئەو خەڵکە مسوڵمانە بەگشتی، بەڕاوێژە، دەفەرموێ: هەر شتێکتان کە پێدراوە، ئەوە ڕابواردنێکی کەمی ژیانی دنیایە، ئەوەی لە لای خوایە باشترە، زیاتریش دەمێنێتەوە، بۆ ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن. وەئەوانەی کە خۆیان لە گوناحە گەورەکانو گوناحە ناقۆلاّیەکان دەپارێزن و کاتێك، کە تووڕە بوون، چاو پۆشیی دەکەن. ئەوانەی کە بە دەم بانگی پەروەردگاریانەوە دەچن، نوێژ بەرپا دەکەن، کاروباریان لە نێو خۆیاندا بەڕاوێژە، لەوەی کە پێمان داون دەبەخشن، ئەوانەی کە هەرکات دەستدرێژییان کرایە سەر، تۆڵە دەستێننەوە.

ئایەتی دووەمیشیان، کە باسی (مشاورة)یە، بریتییە لە ئایەتی (١٥٩)ی (آل عمران) کە ئەمە دەقەکەیەتی: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ ﴾، ئەم ئایەتەش وەك دەبینین ، خیتابە لەگەڵ پێغەمبەردا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" و، خوا دەفەرموێ: تۆ بە هۆی بەزەیی خواوە بۆیان نەرم بووی (واتە: بۆ هاوەڵەکانت) ، ئەگەر تۆ قسەڕەق و دڵ ڕەق بوای، لە دەورت دەپرژان، بۆیە چاوپۆشییان لێ بکەو، داوای لێبوردنیان بۆ (لەخوا) بکە و ڕاوێژیان پێ بکە لە کاروباردا، ئنجا هەرکات بڕیارت دا، پشت بەخوا ببەستە، بێگومان خوا پشت پێ بەستوانی خۆشدەوێن.

کەواتە: لەسەر سەرۆکی دەوڵەت و حوکمڕانان و بەرپرسان، فەرزە ڕاوێژ بە خەڵك بکەن بەگشتیی پرسو ڕایان پێبکەن، چونکە لێرەدا خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) فەرمان بە پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" دەکات، کە ڕاوێژ بە ئیمانداران و بە مسوڵمانانێك بکات، کە ئەو کاتە لە چوارچێوەی کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا بوون، دیارە یەکێ بۆی هەیە بپرسێو

بڵێ: ئەدی نامسوڵمانان؟ (ئەوانەی لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا دەژین) دەربارەی ئەوانیش - هەرچەندە ئێمە وەك چەندان جار گفتمان داوە لـە تـەوەرێکی سـەربەخۆ دا باسیان دەکەین -، بەڵاّم وەك مەبـدەئێکی گشـتیی، دەڵـێین: ئـەوانیش وەك هـاووڵاّتیی مـافی ڕاوێژکردن و ڕاوێژ پێکرانیان هەیـە، دەربـارەی کـارو بـاری دەوڵـەت و کۆمـەڵگا بەگشتیی، بەتایبەت ئەو بوارانەی، کە زیـاتر پەیوەسـتن بـە خۆیانـەوە، بەڵگـەشمان ئـەو بنچینە شەرعییە گشتییەیە، کە زانایان دایان نـاوە، لـە بـارەی هەڵسـوکەوت لەگـەڵ ئەوان دا، کە دەڵێ: (لَهَم ما لَنا وَعَلَيهِم ما عَلَينا) [1] واتە: هەر مافێـك ،کـە بـۆ ئێمـە هەیە ئەوانیش هەیانەو، هەر ئەرکێك لەسەر ئێمەیە، ئەوانیش لەسەریانە، کەواتە: بە گشتی ئەوانیش م فیـ ن هەیـە ڕەخنـە بگـرن بـیرو ڕای خۆیـان بخەنـە ڕوو ڕاوێـژ بکـەن مـافیشیان هەیە، دەربارەی کاروباری دەوڵەت و کۆمەڵگا، ڕاوێـژیان پـێ بکـرێو پـرس و ڕایان پێ بکرێ بەگشتیی، چونکە ئەوانیش ئەندامێکن لـەو کۆمەڵگایـەدا، بـە تایبـەت دەربارەی کاروباری خۆیان، کە دیارە بەبێ قسەی خۆیانو بە بێ ڕاوێژکردن بە خۆیـان، بـۆ ئەو شتانەی، کە تایبەتن بە خۆیانەوە، نابێ هیچ بڕیارێك بدرێ.

## شەشەم: مافی بە ئەستۆوە گرتنی ئەرك و بەرپرسیارێتی :

جۆری شەشەم لە مافە سیاسییەکان، مافی بە ئەستۆوە گرتنی ئەرك و بەرپرسیارێـتی (حق تولِّي الوظائف)ە ئەمیش جۆرێکی دیکەی گرنگە لـە مافـە سیاسـییەکان، کـە لـە بنەڕەت دا، ئەو مافە سیاسییانە بۆ هەموو هاووڵاّتییانو بۆ هەموو ئەندامان دەستەبەر دەکرێن، هەموویان تێیاندا بە یەکسانیی بەشدارن، بەڵاّم دوایی هەرکەسە بە پێـی توانـای

---

[1] ئەمەش دەقی بەشێك لەو پەیمانەیە کە پێغەمبەری خوا صـلى الله عليـه وسـلم لەگـەڵ (السـيد بـن الحارث بن كعب ولأهل ملّته ولجميع من ينتحل الدعوة النصرانية في شرق الأرض وغربها)دا بەستوویەتی: (..لأني أعطيتهم عهد الله على أن لهم ما للمسلمين وعليهم ما على المسلمين، وعلى المسلمين مـا علـيهم بالعهد الذي استوجبوا حق الذمام، والذب عن الحرمة، واستوجبوا أن يُذبّ عنهم كل مكروه حتى يكونـوا للمسلمين شركاء فيما لهم وفيما عليهم) مجموعة الوثـائق السياسـية.. لمحمـد حميـد الله، ص١٨٨-١٨٩، والوثيقتان رقم: ٩٦ و٩٧/ مكتوب النبـي إلى نجران.

خۆی و بە پێی لێهاتوویی‌و شایستەیی‌و پسپۆڕیی و شارەزایی لەو بووارەدا کە دەیەوێ، کاری تێدا بکات، ئەوکاتە ئیشەکان دیاریی دەکرێن، واتە: هەر کەسە بە ئەندازەی ئەوە کە شارەزایە لە شتێکداو توانای ئەنجامدانی ئەو کارەی هەیە، حەقی بەئەستۆوەگرتنیشی هەیە، بەلاّم کەسێك، کە توانای نەبێ لە شتێکدا پێی ناسپێرری.

کەسێك پزیشك نەبێت، ناگونجێ خەستەخانەیەکی تەسلیم بکەی‌و چارەسەری نەخۆشانی تەسلیم بکەی! کەسێك، کە موهەندیس نەبێ، ناکرێ ئەرکی نەخشەسازیی خانووی پێ بسپێری، هەروەها کەسێك، کە سەری لە سیاسەت‌و حوکمڕانیی دەرنەچێ، ئەو کارەی پێ ناسپێردرێ،وە کەسێك کە سەری لە بەڕێوەبردن دەرنەچێ، نالۆی ئەو کارەی تا کۆتایی کارەکان پێ بسپێری،...هتد.

هەر بۆیەش ئێمە دەبینین، پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" کەسانێك، کە شایستەیی جێبەجێکردنی ئەرکێکیان نەبووبێ‌و، توانای بەئەستۆوە گرتنی بەرپرسیارێتییەکیان نەبووبێ، پێی نەداون، بەڵکو جاری وابووە ڕێی لێ گرتوون، ئەگەر خۆیان داوایان کردبێ و سەرکۆنەشی کردوون، بۆ وێنە: با تەماشای ئەم فەرموودەیە بکەین: {**عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَلاَ تَسْتَعْمِلُنِي، قَالَ: فَضَرَبَ بِيَدِهِ عَلَى مَنْكِبِي ثُمَّ قَالَ: «يَا أَبَا ذَرٍّ إِنَّكَ ضَعِيفٌ وَإِنَّهَا أَمَانَةٌ، وَإِنَّهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ خِزْيٌ وَنَدَامَةٌ، إِلاَّ مَنْ أَخَذَهَا بِحَقِّهَا وَأَدَّى الَّذِى عَلَيْهِ فِيهَا»**}(أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شَيبة برقم: (٣٢٥٤٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٨٢٥)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٠٢٠)).

ئەبو زەر(خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ڕۆژێك گوتم: ئەی پێغەمبەری **خوا!** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" ئایا بەرپرسیارێتییم پێ نادەی؟ پێغەمبەریش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" دەستی لەشانمدا (وەك مولاتەفەیەك) ئنجا فەرمووی: ئەی ئەبو زەر! تۆ بێهێزی‌و ئەم بەرپرسیارێتییەش سپاردەیە ، ڕۆژی دواییش مایەی شەرمەزاریی و پەشێمانییە، مەگەر کەسێك بە حەقی خۆی وەری بگرێ،{ واتە: شایستەی بێت}و ئەو مافەش، کە لەسەریەتی لەو ئیشەدا جێ بەجێی بکات. واتە: پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" دوو مەرجی دانان بۆ هەرکەسێك کە بەرپرسیارێتیی وەردەگرێ:

یەکەم: دەبێ لە بنەڕەتدا شایستەی وەرگرتنی ئەو کارە بێ.

دووەم : دەبێ ئەرکی سەرشانیشی لەو کارەدا جێبەجێ بکاتو هەقی خۆی بداتێ.

بەلاّم ئەگەر وانەبێو وانەکات، ئەوە ئەو بەرپرسیارێتییە لەدوا ڕۆژدا، مایەی شەرمەزاریی و پەشێمانیی ئەوکەسە دەبێ.

ئنجا ئایا ئەبو زەر( خوا لێی ڕازی بێ) لە چ ڕوویەکەوە بێ هێز بووە؟ پێویستە سەرنج بدەین، چونکە ڕەنگە کەسی وا هەبێ، بڵێ: مادام فلاّنە کەس ئیمانداراەو مادام تەقوای باشە، یان مادام زانایە، یان مادام ئەهلی عیبادەتە، کەواتە: شایستەی هەموو کارێکە، بەلاّم لە ڕاستییدا وانیە، بۆچی؟ چونکە ئەبو زەڕ (خوا لێی رازی بێ) پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" شایەدیی بۆ داوە، کە پیاوێکی زۆر ڕاست بێژو سەر ڕاستو مەبدەئییە، مسوڵمانێکی زۆر باشە، چونکە ئینسان ناتوانێ زۆر ڕاست بێژ بێ بە تایبەتی، کە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" ئەو شایەدییەی بۆ بدا، ئەگەر مسوڵمانی زۆر باش نەبێ، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" لە بواری بەرپرسیارێتییو بەئەستۆوە گرتنی ئەرکو بەرپرسیارێتییدا ، فەرموویەتی: بێهێزی! بەڵگەشمان لەسەر ئەوە، کە ئەبو زەر ئەو شایەدییەی بۆ دراوە، ئەو فەرموودەیە کە (ابن ماجه) هێناویەتی، کە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" فەرموویەتی: **{مَا أَظَلَّتِ الْخَضْرَاءُ وَلاَ أَقَلَّتِ الْغَبْرَاءُ مِنْ رَجُلٍ أَصْدَقَ لَهْجَةً مِنْ أَبِي ذَرٍّ}**(أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (٦٥١٩)، وَابْنُ أَبِي شَيبة برقم: (٣٢٢٦٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٨٠١) وَقَالَ: حَسَنٌ، وَابْنُ مَاجَهْ بـرقم: (١٥٦)، وَالحَاكِمُ بـرقم: (٥٤٦١))، واتـە: ئاسمـانی سـەوز سـێبەری نـەکردوەو زەوی بـۆر هەڵینەگرتوە، زمان ڕاستتر لە ئەبو زەر، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" فەرموویەتی: (**إِنَّكَ ضَعِيفٌ**). کەواتە: ئایا بێهێزییەکەی لە چیدا بووە؟ دیارە بێهێزییەکەی لەوەدا بوە، کە کاروباری خەڵکی باش بۆ بەڕێوە نەچووە، نەك لە خودی خۆیدا مسوڵمانی باش نەبوو بێ، لە خودی خۆیدا مسوڵمانی باش بووە، هەیە مسوڵمانی باشەو لە خودی خۆیدا ڕاستو ساغە، بەلاّم لە هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکداو بەڕێوە بردنو سەرپەرشتیی کردنیاندا، سەرکەوتوو نیە.

ئنجا پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" لە فەرموودەیەکی دیکەدا کە پێشتریش

چەند جارێك ئاماژەمان پێدا دەفەرموێ: {«إِذَا ضُيِّعَتِ الأَمَانَةُ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ»! قَالُوا: يَا رَسُولَ الله مَا إِضَاعَتُهَا؟ قَالَ: «إِذَا أُسْنِدَ الأَمْرُ[1] إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ»} (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٨٧١٤) الْبُخَارِيُّ برقم: (٥٩))واتە: هەرکاتێ سپاردە زایە کرا، چاوەڕێی قیامەت بکە (چاوەڕێی کۆتایی هاتن بکە) پرسیاری لێکرا: چۆن سپاردە زایە دەکرێ؟ فەرمووی: هەرکاتێك کاروبار بە غەیری ئەهلی خۆی (واتە: بەکەسانی ناشایستە) سپێردرا، چاوەڕێی کۆتایی هاتنی ئەو کارە بکە .

کەواتە: ئەرك و بەرپرسیارێتیی لە ئیسلامدا، سپاردەیەو پێویستە بە خەڵکی خاوەن تواناو شایستە بسپێردرێ، سەرەتا خەڵك بەگشتی لەسەریان پێویستە، کە حوکمڕانێك، یان حوکمڕانانێك هەڵبژێرن، کە شایستەبن، پاشان حوکمڕان و کاربەدەستانیش لەسەریان پێویستە، بۆ کارەکانی، کە لە بەردەستیان دان، کەسانی شایستە هەڵبژێرن.

بەڵگەی هی یەکەمیان[2] ئەوەیە،کە خوا بە کۆمەڵگای ئیسلامیی دەفەرموێ:﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ...﴿٥٨﴾﴾ النساء، واتە: خوا فەرمانتان پێدەکات سپاردەکان بە خەڵکی خۆیان بسپێرن، یانی حوکمڕانانێك هەڵبژێرن و کەسانێك بکەنە بەرپرسی خۆتان، کە شایستەو لێوەشاوە بن، بەڵگەشمان لەسەر ئەوە، کە دوای ئەوەی حوکمڕانێك، یان دەستەیەکی حوکمڕان هەڵدەبژێررێ، ئەویش لەسەری پێویستە بۆ کارەکانی خوار خۆی، کەسانی شایستەو لێوەشاوە هەڵبژێرێ، وێڕای چەمکی گشتی ئایەتەکە، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەرە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کە (حاکم) هێناویەتی و بە (صحیح)یشی داناوە، کە دە فەرموێ: {مَنْ وَلِيَ مِنْ أَمْرِ الْمُسْلِمِينَ شَيْئًا فَولَى رَجُلاً وَهُوَ يجِدُ من هو أصْلَحُ للمُسلمينَ منه فقَدْ خَانَ الله وَرَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ} واتە: هەرکەسێك ئیشێکی لە کاروباری مسوڵمانان بە ئەستۆوە گرت، پیاوێکی دانا بە بەرپرس (واتە: لەو

---

[1]) وشەی (أمر) لەزاراوەی قورئان و سوننەت واتە: کارو باری گشتیی ،کە پەیوەندیی بە کۆی کۆمەڵگاوە هەیە، واتە: کاروباری سیاسی، بڕوانە: المعجم الوسيط ، ص ٢٦ ، کە گوتوویەتی: الأمر: الحال والشأن.
[2]) واتە: دانانی حوکمڕانی گشتی، یان دەستەیەکی حوکمڕان و سەرپەرشتیار.

ئیشە گشتییەی، کە پێی سپێردراوە) کارێکی بە پیاوێك سپاردو کردیە بەرپرس، کە لە نێو مسوڵمانانندا، لەو شایستە تری پێ شك دەهات، ئەوە خیانەتی لە خواو پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" و بڕواداران کردوە.

کەواتە: مسوڵمانان لەسەریان فەرزە کەسانی شایستە بکەنە بەرپرسی خۆیان، لەسەر بناغەی ڕاوێژ، کە هەڵبژاردن یەکێکە لە میکانیزمەکانی ڕاوێژکردن، پاشان بەرپرسانیش،ئەوانە خوارخۆیان دادەنێن. بۆ وێنە: کەسێك دەکرێ بە سەرۆك کۆمار، یان سەرۆك وەزیران، یاخود دەکرێتە پارێزگار، یان دەکرێتە قایمقام...، خۆ ناکرێ هەموو وردە بەرپرسەکانیشی بۆ دابنرێن، ئەوکاتە دەستبەستراو دەبێ، بەڵکو دەبێ دەستی کراوە بێ‌و، ئەویش ئەو کەسانەی دەبن بە هاوکاری یانی: بەرپرسە بچووکەکانی خوار خۆی، خۆی دیارییان بکات، لەسەری پێویستە کێ شایستەترە لە نێو کۆمەڵگادا بۆ وەرگرتنی ئەو کارە و بە ئەستۆوە گرتنی، ئەو کەسە دیاریی بکات، ئەگەرنا، ئەگەر بێت‌و کەسێك دابنێ، کە لەو شایستەتر هەبێت، بە خیانەتکار دادەنرێ، کە دیارە بۆچی دایدەنێ، یان تەماعێکی تێیدایە ،کە بەرژەوەندییەکی ناشەرعیی بۆ پێك بهێنێ، یان لە بەرئەوەی خزمیەتی، یان لەبەر ئەوەی برادەریەتی، بە تەئکید لەبەر ئامانجێکی باش نیەو ،حەتمەن بۆ مەبەستێکی خراپە، ئەگەرنا ئەگەر ئامانج و مەبەستی باش بێ، دیارە کەسێك دەکاتە بەرپرس لەسەر ئەو کارە، کە شایستە ترە.

هەروەها خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) ئەوە، کە ئیش بە غەیری خەڵکی شایستەی خۆی بسپێرێ، بە خیانەتی داناوە، وەك لە سوورەتی (**الأنفال– ٢٧**-)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە! خیانەت بە خواو بە پێغەمبەر مەکەن و خیانەت بە سپاردەکانتان مەکەن لە حاڵێکدا، کە دەشزانن- خیانەت چ گوناهێکی زلە-، خیانەت بە خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) ئەوەیە لەکاتێکدا، کە خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) فەرمانی کردوە کێ شایستەیە ئیش بەو بسپێردرێ، کەچی حوکمڕان بچێ کارەکە بە نائەهلێك بسپێرێ، وەخیانەت بە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ"یش بە هەمان شێوە، هەر کەس پێچەوانەی فەرمانی وی لەو بوارەدا بجووڵێتەوە، ئەوە خیانەتی پێکردوە، خیانەت بە ئەمانەتیش

ئەوەیە، ئەو سپاردەی بەرپرسیاریتییە، تۆ دەبێ بە کەسێکی بسپێری، کە بیپارێزێ، ئنجا کە بە کەسێکت سپارد، نەیپاراست، ئەوە مانای وایە تۆ خیانەتت بەو سپاردەیە کردوە.

(إبن تيمية) ڕەحمەتی خوای لێبێ لە کتێبی (السياسة الشرعية في اصلاح الراعي والرعية)دا[1] دەربارەی ئەوە، کە ئەو ئایەتە ئاماژەی پێدەکات، کە پێشتر هێنامان، دەڵێ: **{فَإِنْ عَدَلَ عَنْ الْأَحَقِّ الْأَصْلَحِ إِلَى غَيْرِهِ لِأَجْلِ قَرَابَةٍ بَيْنَهُمَا أَوْ وَلَاءِ عَتَاقَةٍ أَوْ صَدَاقَةٍ أَوْ مُرَافَقَةٍ فِي بَلَدٍ أَوْ مَذْهَبٍ أَوْ طَرِيقَةٍ أَوْ جِنْسٍ: كَالْعَرَبِيَّةِ وَالْفَارِسِيَّةِ وَالتُّرْكِيَّةِ وَالرُّومِيَّةِ، أَوْ لِرِشْوَةٍ يَأْخُذُهَا مِنْهُ مِنْ مَالٍ أَوْ مَنْفَعَةٍ، أَوْ غَيْرِ ذَلِكَ مِنْ الْأَسْبَابِ أَوْ لِضَغَنٍ فِي قَلْبِهِ عَلَى الْأَحَقِّ أَوْ عَدَاوَةٍ بَيْنَهُمَا، فَقَدْ خَانَ اللهَ وَرَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ وَدَخَلَ فِيمَا نُهِيَ عَنْهُ فِي قَوْله تَعَالَى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾}** واتە: ئەگەر ئەو بەرپرسە لە دانانی ئەو بەرپرسانەدا، کە دایان دەنێ، لایدا لەکەسێك، کە شایستە ترە و گونجاوترە و باشترە، بۆ کەسێکی دیکە، (واتە: کەسێکی دیکەی دانا، کە بەقەدەر ئەوان شایستە نیە) یان لەبەر ئەوە کە خزمایەتیان لە بەیندا هەیە، یان لەبەر ئەوەی کاتی خۆی کۆیلەی بووەو وەختی خۆی ئازادی کردبوو، یان لەبەر برادەرایەتیی، یان لەبەر ئەوەی خەڵکی شوێنەکەی ئەوە، یاخود لەسەر مەزهەبی ئەوە، یان لەسەر تەریقەتی ئەوە، یان لەبەر ئەوەی،کە لە جینس و نەتەوەو زماندا، وەك عەرەب بوونو فارس بوونو تورك بوونو ڕۆم بوون، یەکدەگرنەوە، یان لەبەر ئەوەی، کە ڕیشوەتێکی لێوەردەگرێ، جا چ سوود پێگەیاندنێك، یان ماڵ و سامانێك بێ، یان لەبەر هەر هۆیەکی دیکە بێ، یان لەبەر ئەوە بێت کە ڕقی لەو کەسەیە کە شایستە ترە، یاخود دوژمنایەتییەکیان هەبووە، لەبەر هەر کام لەو هۆیانە ئەو کەسە دابنێ، ئەوە خیانەتی کردوە لە خواو پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم"و لە ئیمانداران و، دەچێتە نێو ئەو قەدەغەو، کە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ الأنفال.

---

[1]) ص ١٢.

هەڵبەتە ئێمە ئەگەر لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتانەی قورئانو ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم"و قسەی زانایان دا، تەماشای واقیعی سیاسی خۆمان بکەین، ئەوجار بۆمان دەردەکەوێ، کەبە ڕاستیی خیانەت زۆرە بەرانبەر بە خواو پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم"و بەرانبەر بەئیمانداران و بەرانبەر بەو ئەرك و بەرپرسیارێتییانە، کە لەسەر بناغەی سەرپێبوونی حیزبیی و بنەماڵەیی و ناوچەگەریی و چاوەڕوانیی خراپ لەو کەسانەی دادەنرێن، ئەوکارانە دابەش دەکرێن، کەواتە: کە زۆر جار هەر دەڵێین: ئێمە مسوڵمانی تەواو عەیارین، بەڵام ئەگەر بێتو مەسەلەیەکی ئاوا بکەینە پێوەر، ئەوجا بۆمان دەردەکەوێ لە کوێی مسوڵمانەتین، بەتایبەتی ئەوانەی کە بەرپرسن، برادەر! تۆ کە سوور دەزانی ئەو کوڕەی تۆ، ئەو براو ئامۆزایەی تۆ،ئەو نێزیك و خزمەت، کەسێکی زۆر لەو بەتواناترو شایستەتر هەیە، بۆچی کارەکە هەر بە خزم و، کەسە نێزیکەکەی خۆت، کە ناشایستەیە، دەسپێری؟ ئایا نازانی ئەوە خیانەتە بەرانبەربەخواو پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" و سەرجەم مسوڵمانان؟ نازانی کە تۆ دەوری خۆت بەکەسانی فاشیل دەتەنی، دوایی سەرەنجام خۆشت فاشیل دەردەچی؟! بەتەئکید ئەوە گەورەترین خیانەتە، ئەوەش بناغەی گەندەڵیی و دزییە لەماڵ و سامانی خەڵك و میللەت، چونکە تۆ کەسێك ،کە ئەهل و شایستە نیەو کاری پێ دەسپێری، لەبەر خزمایەتیی، یان ناسیاوێتیی، یان لەبەر ئەوەی لەحیزبەکەی تۆدایە، یان لەبەر ئەوەی، کە تەماعت تێیدایەو، دەزانی کە بۆ هیچ فەرمانێکی تۆ (نەء)ی نیەو دەڵێ: قوربان! لە خزمەت دام، لەبەر ئەو ئامانجە ناشەرعییە کاری پێ دەسپێری، سەرەنجام ئیشەکەت فەشەل دێنیو تۆش بەرانبەر بە خواو پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم"و مسوڵمانان، خائین دەردەچیت.

ئنجا ئێمە پێشتریش باسمانکرد، کە هەر چوار سیفەتی سەرەکیی: هێزو ئەمینداریێتیی و پاراستنو زانیاریی (القوة والأمانة والحفظ والعلم)، چوار پێکهێنەری سەرەکیی هەر کەسێکن، کە دەکرێتە بەرپرس، بەڵام وێڕای ئەوەش بە سەرنجدانی قسەی زانایان، بۆمان دەردەکەوێ، کە پێنج مەرجیان بۆ بابای بەرپرس داناون ، هەرچەندە ئەو پێنج مەرجەش، هەر دەچنەوە نێو ئەو چوارسیفەتە سەرەکییە، کە لە قورئان دا هاتوون،

ئەو پێنج مەرجەش ئەمانەن:

**یەکەم/** دیندارو پارێزکار بێ، چونکە بە هۆی دین و تەقواوە، ئینسان لە زوڵم و لە ناپاکیی و لادان دەپارێزرێ.

**دووەم/** لێهاتووو بە توانا بێ، واتە: ئەو ئیشەی، کە پێی دەسپێردرێ لە جێبەجێکردنیدا، لێهاتوو بێ و توانای جێبەجێکردنی هەبێ، کە لێهاتوویی و توانایی دەبێتە هۆی کۆنترۆڵکردنی کاروبارو باش ڕاپەراندنی .

**سێیەم/** هاوسەنگ بێ لە نێوانی توندیی‌و نەرمییدا، واتە: زێدەڕۆیی نەکات، نەبەلای توندییدا، کە ببێتە هۆی چەوساندنەوەی خەڵك، نە بەلای نەرمییدا، کە خەڵك تەماعی تێبکات و ئیشەکەی لە دەستدا زایە بێ، بەڵکو هاوسەنگ‌و توندوتۆڵ بێ، توند بێ لە شوێنی توندییدا، نەرم بێ لە شوێنی نەرمییدا.

**چوارەم/** خاکیی (متواضع) بێ‌و خۆبە کەمزان‌و خۆبەکەمگر بێ، نەك لووتی لە ئاسمانێ بێت، کە ئەو ئیشەی پێ سپێردراوەو وابزانێ، تا قیامەتێ ئەو ئیشەی بە دەستەوە دەبێ، بێ ئاگا لەوەی: ئەو کورسیەی هاتۆتە بن وی، ئەگەر بۆ هی پێش خۆی مابایەوە، نەدەگەیشتە ژێر وی!

**پێنجەم/** ئەزموون و شارەزایی بە هۆی کاری پێشووەوە، واتە واباشترە ئەو کەسە کەسێك بێ پێشتر ئەزموونێکی هەبێ لەو کارەدا، کە پێی دەسپێردرێ، واتە: کار بە خەڵکی بێ ئەزموون و کەمتەجرەبە نەسپێردرێ، وەك گوتراوە: (**لا حكيم الاّ ذو تجربة**) هیچ کەسێك نابێتە حەکیم، مەگەر خاوەن ئەزموون بێت[1] .

## حەوتەم: مافی فەرمان بە چاکە کردن و ڕێ لە خراپە گرتن:

ئێستاش با بێینەسەر جۆری حەوتەم و کۆتایی لە مافە سیاسییەکان، مافی فەرمان بەچاکەکردن و ڕێ لەخراپەگرتن، ئەمیش دیسان مافێکی دیکەیە لەو مافە سیاسییانەی کە بە پێی شەریعەتی ئیسلام، بۆ هەموو تاکێکی کۆمەڵگا بە بێ لەبەر چاوگرتنی ڕەگەزو ڕەنگ و بنەماڵە و وەجاغ و ئیش و کار و، تەنانەت دین و عەقیدەش، بۆ

---

[1] حقوق الإنسان في الإسلام والنظم العالمية، ص٣٣٣، ٣٣٤، د. ساجر محمد الجبوري.

هەموو تاکێکی کۆمەڵگا، ئەو مافە دەستەبەر دەکرێ، دیارە ئێمە لەکاتی توێژینەوەی بنەمای نۆیەمدا، کە تایبەتە بەم مەسەلەیەوە: (چاودێریی کردنی کاربەدەستان و راستکردنەوەو لێپرسینەوەیان) لەوێ بەتەفصیلتر باسی دەکەین، بەڵام لێرەدا باسی ئەوە دەکەین و سەرنجی هەموولایەك بۆ ئەوە رادەکێشین، کە فەرمان کردن بە چاکەو رێگرتن لە خراپە، لە شەریعەتی ئیسلام دا تەنیا لایەنی سیاسی ناگرێتەوە و لەوێدا کورت هەڵنەهاتوە، بەڵکو ئەم مەسەلەی: (فەرمان بەچاکە و رێگریی لە خراپە) یەکێکە لە بنەما گەورەکانی ئیسلام، سەرجەم لایەنەکانیش دەگرێتەوە، هەموو لایەنەکانی دینداریی و دنیا داریی دەگرێتەوە، چونکە هەم ئایەتەکانی خواو ، هەم فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" کە باسی فەرمان بەچاکە و رێگریی لە خراپەیان کردوە، بەگشتی باسیان کردوە، واتە: نەیانگوتوە: لەرووی عیلمییەوە، لە رووی فیکرییەوە، لە رووی عیبادییەوە، لەرووی کۆمەڵایەتیی، لە رووی سیاسیی، لەرووی ئابووریی، تایبەتیان نەکردوە بە لایەنێکەوە، بەڵکو بەگشتی باسیان کردوە، بۆیە پێویستە فەرمان بە چاکە و رێگریی لە خراپە، بە گشتی لە هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵگادا وەك ئەرکێك جێبەجێ بکرێ، ئێستاش بۆ ئەوەی بەرچاومان روونتر بێ، دەربارەی ئەم جۆری حەوتەمی مافە سیاسییەکان: (مافی فەرمان بەچاکەو رێگریی لە خراپە) با تەماشای ئەم دەقانەی قورئان و سوننەت بکەین:

١/ خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) لە سوورەتی (التوبة) ئایەتی (٧١)دا دەفەرموێ:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ .... ﴿٧١﴾ ﴾، واتە: پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار هەندێکیان دۆست و پشتیوانی هەندێکیانن، فەرمان بە هەرچی شتی پەسەندە، دەکەن و، رێ لە هەرچی شتی ناپەسەندە دەگرن، کەواتە: خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) لێرەدا فەرمان بە چاکە کردن و رێ لە خراپە گرتنی کردوە بە صیفەتی تێکرای ئیمانداران، ئیماندارانی پیاوو ئافرەت، وە ئیمانداران، چ وردبن ، چ درشت، بە هەموو چین و توێژەکانیانەوە، هەرچی ئیماندارێ لە نێرو مێ لەسەری پێویستە، کە

لەسەر بناغەی دۆستایەتیی‌و پشتیوانیی کردنی یەکدی فەرمان بە چاکە بکات و ڕێ لە خراپە بگرێ.

٢/ هەروەها لە ئایەتی ژمارە (١٠٤)ی سووڕەتی (**آل عمران**)دا کە پێشتریش هێنامان خوا (سُبْحانَهُ و تَعالَى) دەفەرموێ: ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾، واتە: با لە نێو ئێوەدا کۆمەڵێك هەبن، کە بانگەواز بکەن بۆ چاکەو فەرمان بەشتە پەسەندەکان بکەن و ڕێ لەشتە ناپەسەندەکان دەگرن،هەرئەوانەش سەرفراز دەبن، وەك دەبینین خوا ( سُبْحانَهُ وَتَعالَى) هەر ئەوانەی بەسەرفراز و بەختەوەر داناوە، کە ئەم ئەرکی فەرمان کردن بەچاکەو ڕێگریی کردن لەخراپە، لە نێو کۆمەڵگادا ئەنجام دەدەن.

٣/ هەر لە سووڕەتی (آل عمران)دا لە ئایەتی (١١٠)دا خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) دیسان بە گشتی ڕوو لە مسوڵمانان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾، واتە: ئێوە باشترین کۆمەڵن بۆ مرۆڤایەتی دەرهێنراون و پەیدا کراون، ئنجا ئایا بۆچی ئۆمەتی ئیسلامو ئۆمەتی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيـهِ وَسَلَم" باشترین کۆمەڵن؟! چونکە فەرمان بە شتە پەسەندەکان دەکەنو ڕێگریی لە شتە ناپەسەندەکان دەکەن و ئیمان بە خوا دێنن، هەڵبەتە ئیمان بە خوا بناغەیە بۆ فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپەو بۆ هەموو سیفەتێکی دیکەی پەسەندیش، بەڵام لێرەدا خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) بۆیە خستوویەتە دوایە، تاکو بزانین، کە ئیمان بە خوا بوونێك جێی ئیعتیبارە، کە ئەو شوێنەوارە گەورەو گرنگە لە ئینساندا پەیدا بکات، کە بریتیە لەوەی لەگەڵ چاکەدا بێ و دژی خراپە بێ .

٤/ هەروەها لە سوننەتی پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيـهِ وَسَلَم"دا زۆر باسی فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە کراوە، با بۆ وێنە تەماشای ئەم فەرموودەیە بکەین: {**عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ خَطَبَنَا أَبو بَكْرٍ الصِّدِّيقِ فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ! إِنَّكُمْ تَقْرَءُونَ هَذِهِ الآيَةَ وَتَتَأَوَّلُونَهَا عَلَى غَيْرِ تَأْوِيلِهَا:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيْكُمْ

أَنفُسَكُمْ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ ﴾، وَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" يَقُولُ: «إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوْا الظَّالِمَ فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمْ اللهُ سُبْحَانَهُ بِعَذَابٍ مِنْ عِنْدِهِ»} (أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٤٣٣٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢١٦٨) وَقَالَ: صَحِيح، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٠٠٥)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (١٥٦٤))، واتە: قەیس (یەکێکە لە هاوەڵان خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئەبو بەکری صیددیق (خوا لێی ڕازی بێ) (ئەو کاتەی خەلیفەی مسوڵمانان بوو) وتاری بۆ دەداین، فەرمووی: ئەی خەڵکینە! ئەم ئایەتە دەخوێننەوەو ماناکەی بە هەڵە لێکدەدەنەوە، (وەك گوتم هەندێك زانا بە هەڵە مانای ئەو ئایەتەیان کردوە) ، گوتی: ئێوە وا تێدەگەن، ئەگەر بۆ خۆت مسوڵمان بی، هەقی کەست نەبی، (دنیا ئاو بیبات گوناهبارنی، مادام نوێژو ڕۆژووی خۆت بکەی،بەلام ئەو مانایە هەڵەیەو خوا مەبەستی ئەوە نەبووە)، بۆیە دەڵێ: { وَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" يَقُولُ: «إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوْا الظَّالِمَ فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمْ اللهُ سُبْحَانَهُ بِعَذَابٍ مِنْ عِنْدِهِ»}، واتە: من گوێم لە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بووە دەیفەرموو: هەرکاتێك خەڵك ستەمکارانیان بینی، دەستیان نەگرت، تا بیگێڕنەوە لەو ستەمە، ئەوە زۆر نێزیکە خوا لەلایەن خۆیەوە سزایەك بنێرێ بۆ هەموویان.

ئا ئەوە هەڵوێستی ئیسلامە بەرانبەر بە ستەمو خراپەکاریی، ئەوە ڕێنمایی ئیسلامە بۆ مسوڵمانان، کە چۆن دەبن بە (مُهتدي)، چۆن دەبن بە دیندار یَکی ڕێك وڕاست! ئایا بەوە کە نوێژو ڕۆژووی خۆیان بکەن، بەلام نەزانن حوکمی چ پادشایەکەو، کێ زوڵم دەکاتو، کێ زوڵمی لێدەکرێو کێ هەقی کێ دەخواتو، کێ هەقی کێ پێشێل دەکا؟ ئایا تەنیا بەوەندە خوا لێیان ڕازی دەبێ؟!، ئەوەتا خەلیفەی یەکەمی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بۆ مسوڵمانانی ڕاست دەکاتەوە، کە ئایەتەکە، کە دەفەرموێ: ئەی ئیماندارینە! وریای خۆتان بن! ئەگەر ئێوە ڕێی ڕاست بگرن، ئەوانەی گومڕان زیانتان لێنادەن، مەبەست ئەوە نیە، کە نوێژو ڕۆژووی خۆت بکەی و هەقی کەست نەبێ! بەڵکو مەبەست ئەوەیە، کە

وێڕای خۆت خەمی خەڵکیش بخۆی، وەك هێمنی شاعیر دەربارەی قازی موحەممەد دەڵێ:

(هەر کورد نەبوو بەشەر بوو خەمی خەڵکی لەبەر بوو)، ئینسان نابێ بەس خەمی خۆی لەبەر بێ، بەڵکو دەبێ خەمی خەڵکی لەبەر بێ‌و خەمی دەوروبەرو کۆمەڵگاشی بخوات.

کەواتە: ئەم ئایەتە مەبەست پێی ئەوە نیە کە ئەگەر بۆ خۆت نوێژو ڕۆژووی خۆت و تاعەتی خۆت لە ماڵی خۆت کرد، مادام مسوڵمانی هەقی خەڵك‌و دەوروبەرو کۆمەڵگات نەبێ، چونکە ئەوەتا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيـهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: ئەگەر خەڵك ستەمکار ببینن ستەم دەکات، ئەوانیش دەستی نەگرن‌و بەرپەرچی نەدەنەوە، نیزیکە خوا بە هۆی ئەو ستەمە، سزایەك بنێرێ هەموان بگرێتەوە، ستەمکاران و ئەوانەش کە لە بەرانبەر ستەمدا هەڵوێستیان نەبووە.

٥- لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيـهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: **{وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَتَأْمُرُنَّ بِالمَعْرُوفِ، وَلَتَنْهَوُنَّ عَنْ المُنْكَرِ أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللهُ أنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عِقَاباً مِنْهُ ثُمَّ تَدْعُوْنَهُ فَلا يُسْتَجَابُ لَكُمْ}**(أَخْرَجَهُ أحمد برقم: (٢٣٣٧٥)، تعليق شعيب الأرنؤوط: حسن لغيره التِّرمِذِيُّ برقم: (٢١٦٩) وَقَالَ الشيخ الألباني: حسن)، واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، بە تەئکید دەبێ فەرمان بەشتی پەسەند بکەن و، ڕێ لە شتی ناپەسەند بگرن، ئەگەرنا، زۆر نزیکە خوا سزایەکتان لەلایەن خۆیەوە بۆ بنێرێ، پاشان هەر چەندە لێی بپاڕێنەوە وەڵامتان ناداتەوە.

ئنجا ئایا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيـهِ وَسَلَم" چی دەگەیەنێ؟ ئەوە دەگەیەنێ کە کۆمەڵگای مسوڵمان‌و خەڵکی مسوڵمان هەر هەتا ئەو کاتە لە لای خوا ئیعتیبارو سەنگیان هەیە و ڕێزو حورمەتیان هەیەو، خوا داوایان دەگرێتەوەو دوعایان قبوولْ دەکات، کە فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە بکەن‌و لە نێو خۆیاندا پاکسازیی‌و چاکسازیی بکەن، بەڵام هەرکاتێك مسوڵمانان وایان لێهات، کە گوێ نەدەن بە خراپە کە دەکرێ و چاکەکە ئیهمال دەکرێ، ئەوە خوای

پەروەردگاریش گوێیان پێ نادات و داواکانیان وەرناگرێ، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ ﴾ البقرة: ١٥٢. واتە: یادم بکەن یادتان دەکەمو سوپاسم بکەن و سپڵە مەبن بە رانبەرم! بەڵێ، ئەگەر یادی خوا بکەین بە فەرمانبەریی کردن بۆ خوا، خواش یادمان دەکات بەوە، کە داواکانمان جێبەجێ دەکات .

٦/ فەرمایشتێکی دیکەی پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" ئەوەیە، کە دەفەرموێ: ﴿**سَيِّد الشُّهَدَاء حَمْزَة بْن عَبْدُ الْمُطَّلِب وَرَجلُ قَامَ إِلى إِمَامٍ جَائِرٍ فَأَمَره وَنَهَاه فقتله**﴾ (أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم: (٢٥٥٧) وَقَالَ: صَحِيح الإِسنَاد)، واتە: باشترینی شەهیدان حەمزەیە (واتە: پایە بەرزترین شەهید، حەمزەیە، مامی پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" کە بە (سید الشهداء ناسراوە)، پاش ئەویش پیاوێکە بۆ پێشەوایەك هەڵدەستێ (بەرامبەر بەرپرسێك حوکمڕانێك ڕاست دەبێتەوە) لەبەرخوا فەرمانی پێدەکات بە چاکەو ڕێی لێدەگرێ لە خراپە، ئەویش لە سەر ئەوە دەیکوژێ (ئەو کەسە لە دوای حەمزەوە دێت لە ڕیزبەندیی شەهیداندا).

تەماشا بکەن! ئیسلام چەند گرنگی داوە بە فەرمان بەچاکە کردنو ڕێ لە خراپە گرتن، چونکە خوای پەنهانزان دەزانێ، کە زیندوویەتی کۆمەڵگا بە جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەوەیە، بەڕاستی من زۆر خۆشحاڵمو گەشبینم ، کە دەبینم لە خوا بەزیادبێ لەنێو کۆمەڵگای ئێمەدا کەسانێك هەن، لەنێو هەموو چین و توێژەکان دا: لەنێو مامۆستایان دا - مامۆستایانی مزگەوت و مامۆستایانی قوتابخانەکان- لە نێو پزیشکاندا، لە نێو ئەندازیاراندا، لە نێو خەڵکی سیاسی و ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەنووسان و نووسەراندا، لە نێو خەڵکی ئیعلامییدا، لە نێو هەموو چین و توێژەکاندا، کەسانێك هەن، کە زیندوویەتی کۆمەڵگای ئێمە دەردەخەن: فەرمان دەکەن بە چاکەو ڕێگریی دەکەن لە خراپەو، دەست دەخەنە سەر نەخۆشییەکانو پەنجە بۆ خراپەکان درێژ دەکەن، لەوە ناسڵەمنەوە، کە بە ستەمکار بڵێن: تۆ ستەمکاری، چونکە فەرمایشتی پێغەمبەری خوایە "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم"

﴿ **إِذَا رَأَيْتُمْ أُمَّتِى تَهَابُ الظَّالِمَ أَنْ تَقُولَ لَهُ: إِنَّكَ أَنْتَ ظَالِمٌ، فَقَدْ تُودِّعَ**

**مِنْهُمْ}** (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٧٨٤)، وَالبَزَّار برقم: (٢٣٧٥)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٠٣٦) وَقَالَ: صَحيح الإِسنَاد ووافقه الذهبِي، وَالبَيْهَقِيُّ في شعب الإيمان برقم: (٧٥٤٦) وقال الهيثمي: رواه أحمد، والبزار بإسنادين، ورجال أحد إسنادى البزار رجال الصحيح، وكذلك رجال أحمد)

**واتە:** هەرکاتێك ئۆممەتی منەت بینی: دەترسا لەوەی بە ستەمکار بڵێ: تۆ ستەمکاری! ئەوە خوا حافیزییان لێکراوە[1].

بۆیە بەڕاستی پێویستە کاربەدەستانو حوکمڕانەکانیش ئەوانیش بەوە دڵخۆش بنو بزانن، کە ئەو کۆمەڵگایە، کاتێك بە کۆمەڵگایەکی زیندوو دادەنرێ، کە کەسانێك هەبن، یەخەیان بگرن لەسەر خراپەو گەندەڵیی‌و ستەم‌و لادان، ئەوکاتە با دڵیان بە میللەتەکەیان خۆش بێت، کە میللەتێکی زیندوە، بەڵام بەداخەوە ئەوانەی، کە تەبیعەت دیکتاتۆرن، هەمیشە میللەتی مردوویان خۆشدەوێ و کەسانێکیان خۆشدەوێ، کە لەبەرانبەرخراپەدا (نەء)یان نەبێت، لەبەرانبەر چاکەیەکدا، کە فەرامۆش کراوە (بەڵێ)یان نەبێت.

بەداخەوە، ئەوانەی تەبیعەت دیکتاتۆرن ئاوان، ئەگەرنا لە ڕاستیدا کەسێك بۆ خەڵکەکەی دڵسۆز بێ، لە هەر ئاستێکی بەرپرسیارێتییدا بێ، کاتێك کە دەبینێ ڕەخنەی لێ دەگیرێ، پێشنیاری بۆ دەکرێ، ئامۆژگاریی دەکرێ، دەبێ سوپاس بکات، وەك پێشەوا عومەر ( ڕەزای خوای لێبێت) چەند جوانی گوتوە: **(رَحِمَ اللهُ مَنْ أَهْدَى إِلَيَّ عُيُوبِي)** (أَخْرَجَهُ الدَّارَمِي برقم: (٣٢٦٩)، واتە: خوا بەزەیی بە کەسێکدا بێتەوە، کە عەیبەکانی خۆمم بە دیاریی بۆ دێنێتەوە، چەند جوانی گوتوە کاتێك یەکێك لە مەجلیسەکەی خۆیدا ئامۆژگاریی کردو، یەکێکی دیکە گوتی: چۆن وا بە گەورەی مسوڵمانان دەڵێی؟ ئەویش گوتی: **(دَعهُ، لا خَيرَ فيكم ان لن تَقولوها، وَلا خَيرَ فينا أن لم نسمعها)** واتە: لێیگەڕێ، با ئامۆژگارییم بکات، کابرا بە عومەری گوت: **(اِتَقِ الله يا عُمَر)** ئەی عومەر! پارێز لە خوا بکە، عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: لێیگەڕێ ڕێی لێ مەگرە، کەوام پێ بڵێ، ئەگەر ئێوە ئەوە

---

[1] ) بەند بوو و فەوتاو حیسابن.

نەڵێن خێرتان پێوە نیە، ئەگەر ئێمەش قبووڵی نەکەین، خێرمان پێوە نیە، باشترین کۆمەڵگا ئەو کۆمەڵگایەیە، کە کاربەدەستانو حوکمڕانانی خۆیان دێننە ژێر پرسیارەوە، پرسیاریان لێدەکەنو ڕەخنەیان لێدەگرنو عەیبو کەمو کوڕییەکانیان پێشان دەدەن، باشترین کاربەدەستانیش کەسانێکن، کە دڵیان بەو جۆرەکەسانە خۆشەو، هانیان دەدەن، نەك بە ڕەخنەو تێبینییەکانیان قەڵس بن.

لێرەشدا دێینە کۆتایی توێژینەوەی مافە سیاسییەکان وکۆتایی بەبنەمای حەوتەمی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی دێنین.

ئێستاش دێینەسەر توێژینەوەی بنەمای هەشتەم: (فەرمانبەریی لە سنووری چاکەدا) بنەمایەکی دیکەی گەورەو گرنگی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی، بریتیە لە بیستنو فەرمانبەریی کردن لەلایەن خەڵكو کۆمەڵگاوە بۆ حوکمڕان و کاربەدەستان و پشتگیریی کردنیانو هاوکاری کردنیانو دڵسۆزیی بۆ نواندنیان، بە م هەموو ئەوانە لە سنووری شەریعەت داو بەمەرجێك حوکمڕان و کاربەدەستان لە شێرازەی شەریعەت لانەدەنو فەرمانێك ئاڕاستەی خەڵك نەکەن، کە لەگەڵ شەریعەتدا تێك بگیرێ، کە دیارە هەرشتێك لەگەڵ شەریعەت تێکبگیرێ، بە تەئکید لەگەڵ دادگەریی و بەرژەوەندیی دنیاو دوارۆژی خەڵکدا تێکدەگیرێ، چونکە زانایانی ئیسلام هەموو لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە شەریعەت بۆ چەسپاندنی دادگەریی هاتوەو، بۆ دەستەبەرکردن و دابین کردنی بەرژەوەندییە ماددیی و مەعنەوییەکانی خەڵك هاتوە.

دیارە حیکمەتی ئەوەش، کە دەبێ خەڵك و کۆمەڵگا گوێڕایەڵ و فەرمانبەربێ بۆ حوکمڕان و کاربەدەستان لە شتی چاكو پەسەندا، وە لە سنووری شەریعەتدا وە هاوکارو دەستبارگر و دڵسۆزیان بن، حیکمەتەکەی زۆر ئاشکرایە، چونکە بەبێ ئەوە حوکمڕان و کاربەدەستان ناتوانن ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام بدەن، ئەوە لەلایەك، لە لایەکی دیکەشەوە، خوا سُبْحَانَهُ وَتَعالَى دەفەرموێ: ﴿ هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ٦٠ ﴾ الرحمن، واتە: ئایا پاداشتی چاکە، هەر چاکە نیە؟! مادام کاربەدەستانو حوکمڕانان مشوور لە خەڵك دەخۆنو دادگەریی لەنێو خەڵکدا دەچەسپێنن، بۆیان دڵسۆزنو سەرپەرشتییان دەکەن، لەسەر خەڵکیش پێویستە بۆ حوکمڕان و کابەردەستانێکی ئاوا، هاوکارو دەستبارگرو دڵسۆز بن.

جا ئێمە گەلێك ئایەتی قورئانمان لە بەردەست دان و گەلێك دەقی سوننەتی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَمَ" لەسەر ئەوە، کە دەبێت فەرمانبەرییو گوێڕایەڵیی یاخودبیستن و بە قسەکردن بۆ کاربەدەست و حوکمڕانان لە لایەن خەڵکەوە هەبێت، بەڵام هەمووی لە سنووری شەریعەتداو لەسنووری بە پەسەند زانراوداو لە سنووری ئەو شتانەدا کەبەچاك و پەسەند دەزانرێن و، پێچەوانەوەو دژی بەرژەوەندیی دنیا و دوارۆژی خەڵك نین .

ئێستاش با سەرنجی ژمارەیەك لەو ئایەتانەی قورئان و، ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بدەین، کە لەو بارەوە هاتوون، جارو باریش، شەرح و لێك دانەوەیەکی زانایانیشیان بۆ دێنینەوە:

١- خوا سُبْحانَهُ وَتَعالَى، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ ...﴿٥٩﴾ ﴾ النساء، زۆر جار ئەم ڕستە قورئانییەمان هێناوەتەوە، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن،وەهی کاربەدەستانێك لە خۆتانن، کەواتە: فەرمانبەرییکردنی کاربەدەستانێك، کە لە مسوڵمانانن‌و خۆیان هەڵیان دەبژێرن و دایان دەنێن‌و کاریان پێ دەسپێرن، لە بازنەی ئیمان و ئیسلامیشدان، ئەوکاتە لە سەر مسوڵمانان فەرزە، پاش فەرمانبەرییکردنیان بۆ خواو بۆ پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم".

(الزمخشري) لە تەفسیرەکەی خۆی (الكشاف)دا لەو بارەوە دەڵێ: (**لما أمر الولاة بأداء الأمانات إلى أهلها وأن يحكموا بالعدل، أمر الناس بأن يطيعوهم وينزلوا على قضاياهم**)[1]، واتە: دوای ئەوەی خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى)فەرمانی کرد بە حوکمڕانان، کە سپاردەکان بۆ خەڵکی خۆیان بگێڕنەوە و لە نێوان خەڵکدا بە دادگەرانە دادوەریی بکەن، دوای ئەوە فەرمانی کرد بەخەڵك، کە بە قسەیان بکەن (واتە: فەرمانبەرییان بۆ بکەن، بە پێی ئاڕاستەکانی ئەوان بەڕێوە بچن)و پابەند بن بەو بڕیارانەوە، کە دەیاندەن.

٢- خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ يُبَايِعۡنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشۡرِكۡنَ بِٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡرِقۡنَ وَلَا يَزۡنِينَ وَلَا يَقۡتُلۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأۡتِينَ بِبُهۡتَٰنٖ يَفۡتَرِينَهُۥ بَيۡنَ أَيۡدِيهِنَّ وَأَرۡجُلِهِنَّ وَلَا يَعۡصِينَكَ فِي مَعۡرُوفٖ فَبَايِعۡهُنَّ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُنَّ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢﴾ ﴾ لەم ئایەتە موبارەکەدا، خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) فەرمان بە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەکات‌و دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەر! هەر کاتێك ئافرەتانی بڕوادار هاتنە لات، پەیمانیان لەگەڵ بەستی، کە هیچ شتێك نەکەنە

---

[1]) الكشاف، ج١ ص٤٠٥.

هاوبەشی خواو دزیی نەکەنو، زینا نەکەنو، منداڵەکانی خۆیان نەکوژنو، تۆمەتی داوێنپیسیی بۆ کەس هەڵنەبەستن لە نێوان دەست و پێی خۆیانداو، لەشتی پەسەندا سەرپێچییت لێنەکەن، ئەوە تۆ پەیمانیان لەگەڵ ببەستەو داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکە، بێگومان خوا لێبوردەی بەبەزەییە.

(أبو السعود) خاوەنی تەفسیری (أبي السعود) لە شەرح و لێکدانەوەی ئەم ئایەتەدا دەڵێ: (**التنقيید بالمعروف مع أن الرسول "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لا يأمر إلا به للتنبيه على انه لا يجوز طاعة مخلوق في معصية الخالق**)[1] واتە: بەندداركردنی فەرمانبەریی (طاعة) بە وشەی چاكە (معروف) لە حاڵێكیشدا، كە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" تەنیا فەرمان دەكات بە شتە پەسەند و چاكەكان، بۆ ئاگادار كردنەوەیە، كە دروست نیە هیچ دروستكراوێك بەقسەی بكرێ لە شتێكدا، كەسەر پێچیی بەدیهێنەری خۆی بێ، واتە: ئەگەر گوێڕایەڵییمان بۆ پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ببەسترێتەوە و مەرجدار ، بكرێ بەشتی پەسەندەوە، دیارە غەیری پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" چاكتر و لە پێشترە، كە لە سنووری شەرعدا نەبێ، بە قسەیان نەكرێ.

٣- لە سوورەتی (**الأحزاب**) ٦٤-٦٨دا، خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) بۆمان باسی ئەو كەسانە دەكات، كە دەچنە دۆزەخەوە، تاكو بزانین لەبەر چی تووشی ئەو سەرەنجامە شوومە دەبن، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمۡ سَعِيرًا ٦٤ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ لَّا يَجِدُونَ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ٦٥ يَوۡمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيۡتَنَآ أَطَعۡنَا ٱللَّهَ وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ٦٦ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ٦٧ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا ٦٨﴾.

واتە: بێگومان خوا نەفرینی لە كافران كردوە و ئاگرێكی بڵێسەداری بۆ ئامادە كردوون، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، هیچ یارمەتی دەرو هیچ سەرخەرێكیان چنگ ناكەوێ. لە كاتێكدا، كە دەم و چاویان لە نێو ئاگردا

---

[1] ج٥ ص١٥٩.

هەڵگێڕو وەرگێڕ دەکرێ (دەسووڕێنرێتو ئەملاولای پێ دەکرێ بۆ ئەوەی چاك بسووتێ) دەڵێن: خۆزگە فەرمانبەریی خوا و فەرمانبەریی پێغەمبەری خوامان کردبوایە، هەروا گوتیان: ئەی پەروەردگارمان! ئێمە بەقسەی بەرپرسەکان و بەقسەی گەورەکانی خۆمان کردو لە ڕێگا لایان داین (واتە: ڕێگای ڕاست)، ئەی پەروەردگارمان! ئازاریان بۆ دوو قات بکەوەو نەفرینێکی گەورەیان لێبکە.

لێرەدا دەبینین کە کافر و بێبڕوایەکان لە دۆخدا پەشێمانن لەوەی، کە فەرمانبەریی خوا و فەرمانبەریی پێغەمبەری خوایان "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" نەکردوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، لە جیاتی ئەوە فەرمانبەریی گەورەکانی خۆیان کردوە، کە لە ڕێگای ڕاست لایان داون ، وا پێدەچێ مەبەست لە (سادة) بەرپرسە سیاسییەکان بنو، مەبەست لە (کبراء) بەرپرسە ڕووحییەکان بن، چونکە خەڵك کە بە قسەی دەکرێ یان لە ڕووی سوڵتەی زەمەنییو دنیاییەوە بە قسەی دەکرێ، یان لە ڕووی سوڵتەی ڕووحییو ئاینییەوە بە قسەی دەکرێ، بەلاّم هەرکەسێك بەدەر لە شەریعەتی خواو فەرمانی خواو پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بەقسەی هەر بەرپرسێك بکات، بەرپرسێکی زەمەنییو دنیایی و سیاسی بێ، چ بەر پرسێکی ڕووحیی و بەناوی ئاینەوە بێ، مادام پێچەوانەی شەریعەت بێ، بە تەئکید دووچاری دۆزەخ دەبێ و لەو بەقسەکردن و فەرمانبەریی کردنەی پەشێمان دەبێتەوە،چونکە هەندێ کەس وا دەزانێ مادام بەناوی دینەوە و لەسەر بناغەی ڕووحییو دینیی بێ بەقسەی هەرکەسێك بکەی قەیناکات، ئەگەر شێخێکی ساختە چی یە، ئەگەر مەلایەکی دینفرۆشە، ئەگەر کەسێکی فێڵبازە ! بەلاّم لە ڕاستییدا وانییە، ئەوەتا خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) زۆر بە ڕوونیی و ڕاشکاویی، ڕایگەیاندوە: هەم ئەوانە کە وەك حوکمڕان و سیاسەتمەدار بە قسەیان دەکرێ بەناوی سوڵتەیەکی دنیاییو، هەم ئەوانەی بەناوی دینو سوڵتەیەکی ڕووحییەوە بە قسەیان دەکرێ، مادام پێچەوانەی شەریعەتی خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) بێ، هەردوو بەقسەکردنەکە و هەردوو فەرمانبەرییەکە، هەر بێجێنو،ئینسان لەسەریان تووشی سزاو لێپرسینەوە دەبێ.

٤ - دەقێکی دیکە لەو بارەوە ئایەتی ژمارە (١٢١)ی سوورەتی (الأنعام)ە، خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ ۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَٰدِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴿١٢١﴾ ﴾ خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) ڕوو لە ئینسانەکان دەکاو دەفەرموێ: وەلەوە مەخۆن کە ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە لەکاتی سەربڕیندا، بێگومان ئەوە لە ڕێ دەرچوونە. (واتە: خواردن لە سەربڕاوێك، کە ناوی غەیری خوای لەسەر هاتوە، لە ڕێ دەرچوونەو ئینسانی پێ فاسق دەبێو لە ڕێ دەردەچێ، کە دیارە لە ڕێ دەرچوون (فسق)یش دوو جۆری هەیە: لە ڕێ دەرچوونێکی جوزئیی، کە ئینسان لە بازنەی ئیمانو ئیسلام ناباتەدەر، لە ڕێدەرچوونێکی گەورەش، کە ئینسان لە بازنەی ئیمان و ئیسلام دەباتە دەر). دوایی دەفەرموێ: بێگومان شەیتانەکان وەسوەسە دەکەن بۆ دۆستەکانی خۆیان، تاکو لەوبارەوە موجادەلەتان لەگەڵدا بکەن و ئەگەر بەقسەیان بکەن، بێگومان ئێوە لە هاوبەشدانەران دەبن.

(إبن کثیر) ڕەحمەتی خوای لێبێ، لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: {**وقال السُّدِّي في تفسير هذه الآية: إن المشركين قالوا للمؤمنين: كيف تزعمون أنكم تتبعون مرضاة الله، وما ذبح الله فلا تأكلونه، وما ذبحتم أنتم أكلتموه؟ فقال الله: (وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ) فأكلتم الميتة (إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ) وهكذا قاله مجاهد، والضحاك، وغير واحد من علماء السلف، رحمهم الله. وقوله تعالى: (وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ) أي: حيث عدلتم عن أمر الله لكم وشرعه إلى قول غيره، فقدمتم عليه غيره فهذا هو الشرك، كما قال تعالى: ﴿ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓا۟ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣١﴾ ﴾التوبة. وقد روى الترمذي في تفسيرها، عن عدي بن حاتم أنه قال: يا رسول الله، ما عبدوهم، فقال: "بل إنهم أحَلُّوا لَهُمُ الحَرَامَ، وَحَرَّمُوا عَلَيْهِمُ الْحَلاَلَ، فَاتَّبَعُوهُمْ فذلك عبادتهم إياهم**}[1]

[1]) المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير، ص ٤٤٤.

واتە: (سوددیی) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا گوتوویەتی: هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بە مسوڵمانانیان گوت: چۆن ئێوە وا گومان دەبەن ،کەبە دوای ڕەزامەندیی خوا دەکەون، لە حاڵێکدا، کە ئەوەی خوا دەیکوژێ (لە ئاژەڵ کە: مردار دەبێتەوە) لە گۆشتەکەی ناخۆن، بەلاّم ئەوەی بۆخۆتان (دەیکوژن‌و) سەری دەبڕن گۆشتەکەی دەخۆن؟ خوای بەرز فەرمووی: (...وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ ئەگەر ئێوە بەقسەی موشریکەکان بکەن (و مردارەوەبوو بخۆن)، ئەوە ئێوە لە هاوبەشدانەرانن ، هەروەها موجاهید و زەححاك و غەیری ئەوانیش لە زانایان بە هەمان شێوە تەفسیریان کردوە، فەرمایشتی خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) کە دەفەرموێ: (...وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ) واتە: ئەگەر فەرمانبەرییان بۆ بکەن‌و بە قسەی موشریکەکان بکەن، ئێوەش دەبنە هاوبەش بۆ خوادانەر، واتە: مادام لە فەرمانی خوا لابدەن‌و لەشەرعی خوا لابدەن و بچنەسەر قسەی غەیری خوا، قسەی غەیری خوا بەسەر قسەی خوای گەورەدا زاڵ بکەن، کە ئائەوە شیرکە وەك چۆن خوای بەرز لە شوێنێکی دیکە فەرموویەتی ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ...﴾ دەربارەی جوولەکەو نەصرانییەکان دەفەرموێ: زاناکانی خۆیان و ڕاهیبەکانی خۆیان لە جیاتی خوا کردن بە پەروەردگار، (ترمذي) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە عەدیی کوڕی حاتەمەوە گێڕاویەتەوە ،کە گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا! "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" جوولەکەو نەصرانییەکان زاناو ڕاهیبەکانی خۆیانیان نەدەپەرست!! فەرمووی: با، حەرامیان بۆ حەلاڵ دەکردن‌و حەلاڵیشیان لێ حەرام دەکردن‌و لەوەدا شوێنیان دەکەوتن، ئائەوەش بەندایەتی جوولەکەو نەصرانییەکان بوو بۆ زاناکانیان (کە لە حەرامکردنی حەلاڵ‌و حەلاڵکردنی حەرام دا شوێنیان دەکەوتن).

٥- دەقێکی دیکە، ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوایە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کە بوخاریی هێناویەتی دەفەرموێ: {**السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ حَقٌّ مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِالْمَعْصِيَةِ، فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ**} (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٧٩٦ )) ، واتە: بیستن و بە قسەکردن (یاخود گوێڕایەڵیی و فەرمانبەرداریی) پێویستە مادام

فەرمان بە سەرپێچیی نەکرابێ، بەڵام هەرکاتێك فەرمان بەسەرپێچیی کرا، نە بیستن هەیەو، نە بە قسەکردنیش هەیە .

٦- هەر لەوبارەوە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" ئەم فەرمایشتەی هەیە کە بوخاریی و موسلیم هێناویانە: {**إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوف**}(أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٢٢)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٧٢٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٨٤٠)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٢٠٥))، واتە: بێگومان بە قسەکردنو فەرمانبەریی کردن، تەنیا لە شتی پەسەند و چاك دایە، جا لەو بارەوە هەرکام لە (أحمد) لە (المسند)ی خۆیدا وە (ابن سعد) لە (الطبقات)دا وەك (المصباح المنير) لێی نەقڵ کردوون، ئەم بەسەرهاتە دەگێڕنەوە: {**عَنْ عَلِيٍّ** رَضِيَ الله عَنْهُ **قَالَ بَعَثَ رَسُولُ الله** "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" **سَرِيَّةً وَاسْتَعْمَلَ عَلَيْهِمْ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ قَالَ فَلَمَّا خَرَجُوا قَالَ وَجَدَ عَلَيْهِمْ فِي شَيْءٍ فَقَالَ: قَالَ لَهُمْ أَلَيْسَ قَدْ أَمَرَكُمْ رَسُولُ الله** "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" **أَنْ تُطِيعُونِي؟ قَالَ: قَالُوا بَلَى، قَالَ فَقَالَ اجْمَعُوا حَطَبًا، ثُمَّ دَعَا بِنَارٍ فَأَضْرَمَهَا فِيهِ، ثُمَّ قَالَ: عَزَمْتُ عَلَيْكُمْ لَتَدْخُلُنَّهَا قَالَ فَهَمَّ الْقَوْمُ أَنْ يَدْخُلُوهَا، قَالَ فَقَالَ لَهُمْ شَابٌّ مِنْهُمْ إِنَّمَا فَرَرْتُمْ إِلَى رَسُولِ الله** "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" **مِنَ النَّارِ فَلاَ تَعْجَلُوا حَتَّى تَلْقَوْا النَّبِيَّ** "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" **فَإِنْ أَمَرَكُمْ أَنْ تَدْخُلُوهَا فَادْخُلُوا، قَالَ: فَرَجَعُوا إِلَى النَّبِيِّ** "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" **فَأَخْبَرُوهُ فَقَالَ لَهُمْ: لَوْ دَخَلْتُمُوهَا مَا خَرَجْتُمْ مِنْهَا أَبَدًا إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوف**}(أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٢٢)، وَابْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٣٣٧٠٦) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين) عەلی کوڕی ئەبی تالیب (خوا لێی رازی بێ )دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" ڕۆژێك سریەیەك دەنێرێ و پیاوێکی ئەنصارییان لەسەر دەکاتە فەرماندە، کاتێك دەردەچن لەسەر شتێك لێیان تووڕە دەبێو پێیان دەڵێ: ئایا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" فەرمانی پێ نەکردوون بەقسەم بکەن ؟ دەڵێن: با ، دەڵێ: دە دارم بۆ کۆبکەنەوە، (کۆمەڵێ دار کۆدەکەنەوە) دوایی فەرمان دەکات ئاگرێکی بۆ لەو دارانە بەردەن کە کۆکراونەتەوە، دوایی دەڵێ: فەرمانتان پێدەکەم بچنە نێو ئاگرەکەوە!! ئەوانیش خەریك دەبن بچنە نێو ئاگرەکە، بەڵام گەنجێك لەوان دەڵێ: ئێوە بۆ لای

پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە ترسی ئاگر ڕاتان کردوە ، پەلە مەکەن هەتا دەچینەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئنجا ئەگەر فەرمانی پێکردین بچینە نێوی، بچنە نێوی، کاتێك دەچنەوە بۆ لای پێغەمبەری خواو هەواڵی پێدەدەن و بۆی باس دەکەن، پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: (**لَوْ دَخَلْتُمُوهَا مَا خَرَجْتُمْ مِنْهَا أَبَدًا إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوف**). ئەگەر چووبانایە نێوی بە پێی خۆتان، هەرگیز لێی نەدەهاتنەدەرێ، (واتە: لە قیامەتیش پێی دەسووتان. بێگومان بە قسەکردن و فەرمانبەریی کردن، تەنیا لە شتی پەسەندو چاك دایە ، بێگومان ئەمە دەرسێکی زۆر گەورەیە بۆ مسوڵمانان کە لە شتی چاكو پەسەندو شەرعییدا نەبێ، نابێ بەقسەی بەرپرسو گەورەکانی خۆیان بکەن، با ئەو بەرپرسە ئەمیرێکیش بێ، کە ڕاستەوخۆ پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" داینابێ.

٧- هەر لەوبارەوە فەرمایشتێکی دیکەی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" هەیە، کە دەفەرموێ: {**لاطَاعَةَ لِمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ الْخَالِقِ**}(أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٠٦٧٢)، وَالحَاكِمُ برقم: (٥٨٧٠) وَقَالَ: صَحِيحُ الإِسْنَاد، وَالطَّبَرَانِيُّ برقم: (٣٦٧)، وَصَحَّحَهُ الألباني في صحيح الجامع برقم: (٧٥٢٠))، واتە: هیچ دروستکراوێك لەسەر پێچیی کردنی دروستکەردا بە قسەی ناکرێ، واتە: شتێك کە سەرپێچیی خوای تێدابێ کە خاوەن و بەدیهێنەرە، بە قسەی هیچ کەسێك ناکرێ، ئەو دروستکراوە هەر کەسێك بێ، لە شتی ناشەرعیی و لە قەدەغەو ناپەسەنددا بەقسەی ناکرێ، چونکە شتی قەدەغەو ناپەسەند سەرپێچییە بۆ فەرمانی خوا، ئێمەش خوا پەرستینو خەڵك پەرست نین، ئێمە بەرپرس پەرستو حوکمڕان وخەلیفەو سەرۆك پەرست نین، ئێمە خوا پەرستین، حوکمڕانو سەرۆكو دەستەڵاتدارەکان، دەبێ خوا پەرست بنو بەرێی خوادا پێشمان بکەون، ئەوجار فەرمانەکەیان ڕەوا دەبێو بەقسەیان دەکرێ.

٨- هەر لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" هەیە کە دەفەرموێ: {**«الدِّينُ النَّصِيحَةُ»، قُلْنَا لِمَنْ؟ قَالَ: «لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ»**}(أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٠٥))، واتە: دینداریی

دڵسۆزییە، گوتمان: بۆ کێ؟ فەمووی: دڵسۆزیی بۆ خواو کتێبی خواو پێغەمبەری خواو پێشەوایانی مسوڵمانانو بۆ مسوڵمانان به گشتیی، (الخَطّابي) چەمکی ئەم فەرمایشتە جوان ڕوون دەکاتەوە: (**قال الخطابيُّ الدين النصيحة) وهي كلمة جامعة معناها حيازة الحظ للمنصوح له وَ مَعنَى الحديث عماد الدين وقوامه النصيحة كقوله الحج عرفة**...، **وأما النصيحة لأئمة المسلمين فمعاونتهم على الحق وطاعتهم فيه وأمرهم به، وهذا كله على أن المراد بأئمة المسلمين، الخلفاء وغيرهم ممن يقوم بأمور المسلمين من أصحاب الولايات**)[1] واتە: (الدين النصيحة) وشەیەکی کۆکەرەوەیە، ماناکەی ئەوەیە، کە تۆ چی چاکە بۆ ئەو کەسە، کە قسەکەی ئاڕاستە دەکەی ئاوا بکەی، (واتە: بۆی دڵسۆز بی من وشەی (النصيحة)م بە دڵسۆزیی لێکداوەتەوە) و مانای فەرموودەکە واتە: ڕاوەستانی دین وکۆڵەکەی دین بریتیە لە (النصيحة) دڵسۆزیی، وەك چۆن پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ (الحج عرفة) واتە: پایەی گەورەی حەج بریتیە لە ڕاوەستان لە عەرەفات، دوایی باسی چەمكو واتای (نصيحة) دەكات بۆ خواو بۆ کتێبی خواو بۆ پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ،دوایی دەڵێ: (**وأما النصيحة لأئمة المسلمين**) دڵسۆزیی بۆ پێشەوایانی مسوڵمانان و حوکمڕانانی مسوڵمانان: (**فمعاونتهم على الحق وطاعتهم فيه وأمرهم به**) بریتیە لەوەی کە لەسەر حەق هاوکارییان بکرێ، بەقسەیان بکرێ لەسەر حەق و فەرمانیشیان پێ بکرێ بەحەق، ئنجا دەڵێ: مەبەستیش لە پێشەوایانی مسوڵمانان، جێنشینەکانن و هەموو ئەوانەن، کە سەرپەرشتیی کاروباری مسوڵمانان دەکەن، چ گچکە بن چ گەورە.

٩- هەر لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" هەیە، کە موسلیم هێناویەتی، دەفەرموێ: {**«إِنَّهُ يُسْتَعْمَلُ عَلَيْكُمْ أُمَرَاءُ فَتَعْرِفُونَ وَتُنْكِرُونَ فَمَنْ كَرِهَ فَقَدْ بَرِئَ وَمَنْ أَنْكَرَ فَقَدْ سَلِمَ وَلَكِنْ مَنْ رَضِيَ وَتَابَعَ»، قَالُوا**

---

[1]) الأخلاق السياسية للدولة الإسلامية في القرآن والسنة، ص ٣٥٣، لمحمد زكريا النّداف.

**يَا رَسُولَ اللهِ أَلاَ نُقَاتِلُهُمْ قَالَ: «لاَ، مَا أَقَامُوا فِيكُمُ الصَّلاَةَ»**}(أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بِرقم: (٤٩٠٧))، پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ" هەواڵمان پێدەدات بە شتێك کە لە دوای وی دێ، دەفەرموێ: بێگومان لەمەودوا چەند بەرپرسو حوکمڕانێکتان بەسەرەوە دادەنرێن، هەندێك شتی ئەوانتان پێ چاکەو هەندێکیشتان پێ خراپە، (واتە: حەقو ناحەقیان هەیەو، شەرع و ناشەرع تێکەڵ دەکەن)، ئنجا هەر کەس بە دڵ خراپەکەیان ببوغزێنێو لەگەڵ خراپەکەیاندا نەبێ، (دیارە هەر ئەوەندەشی لە تواناد هەبێ، کە بەدڵ خراپەکەیانی ڕق لێببێتەوە) ئەوە بەریی بووە لە خراپەی ئەوان (خراپەی ئەوان لەسەروی حیساب ناکرێ، مادام پێی ڕازی نەبێ و جگەلە پێ ڕازی نەبوونیش، توانایەکی دیکەی نەبێ، نەبەدەستو نەبە زمان) (بەلاّم باشتر لەوە)، هەرکەسێك نکوولّیی بکات (بەرهەڵستیی بکاتو لە بەرانبەریان بوەستێ، چ بە دەست چ بە زمان) ئەوە سەلامەت بووە، بەلاّم کەسێك، کە ڕازی بێو شوێنیان بکەوێ (وەلاّمەکەی نەداوەتەوە، چونکە ئاشکرایە واتە: کەسێك وابێ ئەوە گوناهبارە) ،گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ" ئایا بە چەك و هێز، دژیان بجەنگین ؟ فەرمووی: نەخێر مادام پێش نوێژییتان بۆ بکەن (مادام دروشمەکانی دینداریيتان لەگەڵ بەڕێوەبەرن) قەیناکا بە چەكو هێز لەگەڵیاندا ڕووبەڕوو مەبنەوەو دژیان مەوەستنەوە.

لەبارەی ئەم فەرموودەیەوە (نەوەوی) گوتوویەتی: (**معناه من كره بقلبه ولم يستطع إنكارا بيده ولا لسانه فقد برئ من الإثم وأدى وظيفته ومن أنكر بحسب طاقته فقد سلم من هذه المعصية ومن رضى بفعلهم وتبعهم عليه فهو العاصي**)[1] ماناکەی ئەوەیە (من كره بقلبه) هەرکەسێك بەدڵ ڕقی لە خراپەکەیان بێ، بەلاّم نەبەدەست و نە بە زمان نەتوانێ خراپەکەیان بگۆڕێ، ئەوە لە گوناهی ئەوان بەرییەو دوورە، چونکە هەر ئەوەی لە توانادا هەیەو ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ کردوە، بەلاّم هەرکەسێ بە پێی توانای خۆی لە دژیان

---

[1]) رياض الصالحين، ص ١٠٢.

بوەستێ و لە دژی خراپەکەیان بێ و لێیان ڕاپەڕێ، ئەوە سەلامەت بووە لەو گوناهە (واتە: باشترە لەوەی یەکەم کە دیارە تواناشی زیاترە)، بەلاّم هەرکەسێك بەکردەوەکەیان ڕازی بێو شوێنیان بکەوێ، ئەوە گوناهبارە.

١٠- ئنجا دەقێکی دیکە لەوبارەوە ئەو قسەیەی ئەبوبەکری صیددیقە (خوا لێی رازی بێ)، یەکەمین جێنشینی پێغەمبەری خوا "صَلَی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَمَ" دوای ئەوەی، کە هەڵبژێردرا بە جێنشین، وتارێکی داو، لە وتارەکەدا گوتی: (**أَطِيعُونِي مَا أَطَعْتُ اللّهَ وَرَسُولَهُ فَإِذَا عَصَيْتُ اللّهَ وَرَسُولَهُ فَلاَ طَاعَةَ لِي عَلَيْكُمْ**)[1]

واتە: فەرمانبەرییم بۆبکەن، مادام من فەرمانبەریی بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەی "صَلَی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَمَ" بکەم، ئەگەر من سەرپێچیی خواو پێغەمبەری خوام "صَلَی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَمَ" کرد، ئەوە هەقی فەرمانبەریی بۆکرانم لە سەر ئێوە نیە، واتە: تەنیا لە شتێکدا، کە من پابەندی شەریعەتم و ملکەچم بۆ خواو پێغەمبەری خوا "صَلَی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَمَ" لەسەرتان پێویستە بەقسەم بکەن، بەلاّم کە لامدا، بە قسەم مەکەن .

ئنجا لە کۆتایی ئەم باسەدا، با جارێکی دیکە سەرنجی ئەم ئایەتە بدەین و سەرنجی ڕای هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان بدەین، ئەو ڕستە قورئانییە، کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ...(٥٩) ﴾ النساء، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بکەنو فەرمانبەریی پێغەمبەری خوا بکەن، وەهی کاربەدەستانێك، کە لە خۆتانن (الطبري) دەڵێ: (**الأمر بطاعة الأئمة والولاة فيما كان لله طاعةً، وللمسلمين مصلحة**) [2] واتە: کاتێ فەرمانمان پێ دەکرێ بەقسەی کاربەدەستان و حوکمڕانان بکەین، کە ئەو بەقسەکردنە فەرمانبەریی بۆ خوا، وەبەرژەوەندیی بێ بۆ مسوڵمانان. کە دیارە هەمیشە بەقسەکردنی خوا و فەرمانبەریی بۆ خوا، بەرژەوەندیی مسوڵمانانی تێدایە، هەمیشە هەر شتێك بەرژەوەندیی مسوڵمانان

[1]) السيرة النبوية لإبن هشام، ج٤ ص٣٩٣.

[2]) جامع البيان، ج٥ ص٨٩.

بێ بەتەئکید لەشەریعەتدا هەیە، واتە: (طبری) دوو قەیدی خستۆتە سەر فەرمانبەریی بۆ حوکمڕانان، کەلەڕاستیدا دوو قەیدەکە تێکهەڵکێشن: کاتێك بەقسەی حوکمڕان و کاربەدەستان دەکرێ، کە ئەو فەرمانەی ئەوان بریتی بێ لەپابەندیی بەشەریعەتەوە و، بەرژەوەندیی مسوڵمانانی تێدا بێ، بە تەئکید هەمیشە بەرژەوەندیی مسوڵمانان لەپابەندیی بەشەریعەت دایە، هەمیشە شەریعەت دەبێتە هۆی هێنانەدی بەرژەوەندیی مسوڵمانان.

(الزمخشري)یش هەر لەو بارەوە گوتوویەتی: (**أن أُمراء الجور، الله ورسوله بريئان منهم فلا يُعْطَفون على الله ورسوله في وجوب الطاعة لهم**)[1] واتە: بێگومان فەرماندەو حوکمڕانە ستەمکارەکان، خوا و پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لێیان بەریین، بۆیە نابێ عەتف بکرێنەوە سەر خواو پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لەوەدا کە دەبێ بەقسەیان بکرێ، کەخوا دەفەرموێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ ...(٥٩) ﴾ دوایی نەیفەرموە: (**وَأطيعوا أُولي الأمرِ مِنكُم**)، بەڵکو فەرموویەتی: (وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ) دیارە وشەی (إطاعة)ی بۆیە نەهێناوە، تاکو بزانرێ کە حوکمڕان و کاربەدەستان بەقسەکردنیان، شتێکی سەربەخۆ نیە، بەقسەکردنی خوا سەربەخۆیەو هی پێغەمبەری خوا "صَلَّى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" سەربەخۆیە، چونکە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" یش بە وەحیی خوا هەڵدەستێ و دادەنیشێ، بەڵام هی کاربەدەستان و حوکمڕانان شتێکی سەربەخۆ نیەو بەستراوەتەوە بە پابەندیی بە شەریعەتەوە.

جا (زەمەخشەریی) دەڵێ: کەسانێك کە ستەمکاربن ،ناگونجێ بڵێی: مەبەست لە: (وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ) ئەوانن، چونکە حوکمڕانانی ستەمکار عەتف ناکرێنە سەر خواو پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"، چونکە جیان لەوان و تەنیا حوکمڕانانێکی پارێزکارو پابەند بەشەرع لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە سیاقێکدا باس دەکرێن، کە دەبێ بەقسەیان بکرێ.

---

[1]) الكشاف، ج١ ص٤٠٥.

هەروەها (فخرالدين الرازي)یش لە تەفسیرەکەی خۆی (مفاتيح الغيب)دا، لە تەفسیری ئەم ڕستە قورئانییەدا دەڵێ: (**أن الأمة مجمعة على أن الأمراء والسلاطين إنما يجب طاعتهم فيما علم بالدليل أنه حق وصواب**)[1] واتە: بێگومان ئۆمەتی ئیسلام (واتە: زانایان و پێشەوایانی ئۆمەت) یەکدەنگن لەسەر ئەوە، کە فەرماندەکان و حوکمڕانەکان تەنیا لەوەدا، کە بەبەڵگە دەرکەوتوە حەقەو ڕاستە بەقسەیان دەکرێ. واتە: کە دەرکەوت ناشەرعییە، نەك بەقسەیان ناکرێ، بەڵکو دەبێ بەرهەڵستیی یان بکرێ.

هەروەها (البيضاوي)یش لە تەفسیرەکەی خۆیدا هەر دەربارەی ئەو ڕستە قورئانییەی پێشێ، دەڵێ: (**أمر الناسَ بطاعَتِهِم بَعدَ ماأمَرَهُم بالعَدلِ تَنبِيهاً عَلى أَنَّ وُجوبَ طاعَتِهِم ماداموا على الحَقِّ**)[2] واتە: خوا فەرمانی کردوە بە خەڵك، کە بە قسەی کاربەدەستانو حوکمڕانەکان بکات و فەرمانبەرییان بۆ بکات، دوای ئەوەی کە فەرمانی کردوە بەکاربەدەست و حوکمڕانەکان دادگەربن، ئەوەش ئاگادار کردنەوەیە بۆ ئێمە، کە بەمەرجێك لەسەرمان پێویستە بە قسەی حوکمڕانەکان بکەین، کە لەسەر حەق بن، بەلاّم ئەگەر لەسەر ناحەق بن ؟ بە تەئکید دروست نیە بە قسەیان بکرێ.

دیارە بەقسەکردن و فەرمانبەریی کردن بۆ حوکمڕانان لە سنووری شەریعەتدا، یەکێکە لەو شتانەی، کە لە شەریعەتی ئیسلامییدا زۆر بەئاشکرا زانراوە، چونکە وەك پێشتریش باسمان کرد: ئێمە خوا پەرستین، تەنانەت ئێمە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" پەرستیش نین، پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کە لە هەموو کەسمان خۆشتر دەوێ پاش خوای پەروەردگار، بەلاّم بۆیە بە قسەی دەکەین، چونکە خوا دەفەرموێ: بەقسەی بکەن! ئەگەرنا ئەوەی، کە دەپەرسترێو فەرمانبەریی موتلەقی بۆ دەکرێ، تەنیا خوایەو بەس خوا بەندایەتیی بۆ دەکرێ، بەلاّم پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بۆیە

---

[1]) التفسير الكبير، ج١٠ ص ١٤٥.

[2]) أنوار التنزيل وأسرار التأويل، ص ١١٥.

فەرمانبەریی‌و گوێڕایەڵیی بۆ دەکرێ، چونکە فەرمانی خوامان پێ ڕادەگەیەنێ، ئنجا ئەگەر بۆ پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" وا بێ، بێگومان بۆ حوکمڕان و کاربەدەستانی دیکە حیسابەکە زۆر جیایەو، دەبێ زۆر وریا بین‌و هیچ حوکمڕان و کاربەدەستێك بەدەر لەشەریعەت، نەك هەر بە قسەی ناکرێ، بەڵکو دەبێ لە دژیشی بوەستین، وەك لە بنەمای نۆیەمدا دەیخەینە ڕوو.

# بنەمای نۆیەم

## چاودێریی کردنی حوکمڕان و

## کاربەدەستان و لێپرسینەوەو ڕاستکردنەوەیان

ئێستاش با بێینەسەر توێژینەوەی نۆیەمین بنەمای سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی و چاودێریی کردنی حوکمڕان و کاربەدەستان و لێپرسینەوە و ڕاستکردنەوەیان، ئەم بنەمایەش یەکێکی دیکەیە لە بنەما گرنگ و سەرەکییەکانی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی، چونکە خەڵك و هاووڵاتییان، نەك هەر فەرمانیان پێ نەکراوە کە بەقسەی کاربەدەستو حوکمڕانان بکەن، کاتێك لەشەریعەت لادەدەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە، فەرمانیان پێکراوە، کە لە دژیان بوەستن، ئنجا نەك هەر مافیانە کە چاودێریی کاربەدەستانو حوکمڕانانی خۆیان بکەن و ئەگەر هەڵەیان کرد لێیان بپرسنەوەو، هەوڵبدەن ڕاستیان بکەنەوە، بەڵکو ئەوە ئەرکی سەرشانیشیانە، کە چاودێربن بەسەر حوکمڕانەکانەوەو، نەهێڵن تووشی لادان و هەڵە بن ، ئەگەر تووشیش بوون، بە زوویی ڕاستیان بکەنەوە، ئەگەر ڕاستیش نەبوونەوە، ئەوە چ شتێك بەرژەوەندیی ئەوانی دابین کرد، بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، وەك دوایی باسی دەکەین .

ئنجا ئێمە ئەم بنەمایەی نۆیەم: (چاودێریی کردنی حوکمڕانان و کاربەدەستان و لێپرسینەوەیان) لە پێنج بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

بڕگەی یەکەم: بناغەی فیکریی و یاسایی چاودێریی کردنو لێپرسینەوەی بەرپرسان.

بڕگەی دووەم: بەڵگەکانی چاودێریی کردنو لێپرسینەوەی بەرپرسان لە قورئانو سوننەت دا.

بڕگەی سێیەم: بوارەکانی چاودێریی کردنو لێپرسینەوەی بەرپرسان.

بڕگەی چوارەم: شێوازو جۆرەکانی چاودێریی کردنو لێپرسینەوەی بەرپرسان.

بڕگەی پێنجەم: دەرەنجامەکانی چاودێریی کردنو لێپرسینەوەی بەرپرسان.

## بڕگەی یەکەم: بناغەی فیکریی و یاسایی چاودێریی کردنی بەرپرسان و لێپرسینەوەیان:

بناغەی فیکریی‌و یاسایی ئەوە، کە خەڵك بۆی هەیە چاودێری حوکمڕانان هی کاربەدەستان بکات لێیان بپرسێتەوەو ڕاستیان بکاتەوە، لەم پێنج خاڵەدا دەخەینە ڕوو:

١ - ئۆممەت و خەڵك خاوەنی ئەسڵیی دەستەلاتی سیاسییە، وەك لەبنەمای دووەم: (دەستەلات هی خەڵکە)دا پێشتر ڕوونمان کردوەتەوە، باشترین بەڵگەش لەو بارەوە ئەوەیە کە خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) هەموو دواندنەکانی خۆی ئاڕاستەی خەڵك کردوون بەگشتی: (يا أيها الناس، يابني آدم،...يا أيها الذين امنوا) کەواتە: کۆمەڵگا و خەڵکی مسوڵمان ، دوێندراوی ڕاستەوخۆی خوایە، بۆ جێبەجێکردنی شەریعەتەکەی و هەرکات حوکمڕانان بوونە پەرچ، پێویستە ئەو پەرچە لابەرن‌و ئەو گرفتە ، چارەسەر بکرێ.

٢ – حوکمڕانان کەسی یەکەم چ هاوکارانی، بەجێگر و بەوەکیلی خەڵك دادەنرێن و لە جیاتی ئەوان دەستەلاتی سیاسی بەدەستەوە دەگرن، جا دیارە خاوەنی ئەسڵیی هەر شتێك، مافی چاودێریی کردن و سەرپەرشتیی کردن و، لێپرسینەوەو لادانی ئەو کەسەی هەیە، کە کردوویەتی بە وەکیل،وە لە ڕاستییدا پەیوەندیی نێوان حوکمڕانان و خەڵك، وەك پەیوەندیی نێوان وەکیل و ئەصیل وایە، دیارە کەسێك کە کەسێك دەکاتە وەکیل، بۆی هەیە چاودێریشی بکات و، لێشی بپرسێتەوەو لاشی بدات.

٣ - مادام بناغەی بەڕێوە بردنی کاروباری کۆمەڵگا بە ڕاوێژ بێ: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾ کە پێشتر باسمان کردوە، کەدیارە ئەوەش بە بێ چاودێریی کردن‌و ئاگالێبوونی خەڵك‌و بە بێ لێپرسینەوەیان لەگەڵ حوکمڕاناندا ئەو ڕاوێژکردنە نایەتە دی، کەواتە: حەقی خەڵك خۆیانە، کە وەك چۆن بۆ ئەسڵی کارەکە ڕاوێژ دەکەن، بۆ جێبەجێکردنیشی: ئایا چەندی جێبەجێ بووە؟ چۆن جێبەجێ بووە؟

چەند کەمو کورتیی تێدایە ؟ دیسان ئەو ڕاوێژکردنەیان و هەربەردەوام بێ، کە لە چاودێریی کردن و لێپرسینەوە و ڕاستکردنەوەدا بەرجەستە دەبێ.

٤- کۆمەڵگای مسوڵمان ئەرکی سەرشانیەتی، کە فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە، لە هەموو بوارەکاندا ئەنجام بدا، بەتایبەت لە بواری سیاسەت و حوکمڕانییداوەك پێشتر باسمان کرد، هەروا خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ... ﴿٧١﴾ ﴾التوبة.

که دیاره فەرمان بەچاکە کردن و ڕێگرتن لە خراپە، پەکی لەسەر زانین و شارەزایی بە خێرو شەڕی حوکمڕانان و کاربەدەستان کەوتوە، ئەویش بە بێ چاودێریی کردنو بەدواداچوونو لێپرسینەوە مەیسەر نابێ.

٥ - حوکمڕان و کاربەدەستان لە ڕوانگەی شەریعەتەوە تاکێکن وەك سەرجەم تاکەکانی دیکە، هیچ پلەو پایەو ئیمتیازێکیان بەسەر غەیری خۆیاندا نیە، وەك چۆن هەر تاکێك چاودێریی دەکرێ و لێی دەپرسرێتەوە، ئەمانیش بەهەمان شێوە پێویستە چاودێریی بکرێن و لێشیان بپرسرێتەوەو، پاداشت و سزاش ڕوویان تێ بکات ئەوە بەسە، کە یەکەمین جێنشینی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" (أبو بكر الصديق) (خوا لێی ڕازی بێ) لە یەکەم وتاری خۆیدا دەڵێ: (**أَمّا بَعْدُ أَيّهَا النّاسُ فَإِنّي قَدْ وُلّيت عَلَيْكُمْ وَلَسْت بِخَيْرِكُمْ فَإِنْ أَحْسَنْت فَأَعِينُونِي، وَإِنْ أَسَأْت فَقَوّمُونِي**)[1] **واتە**: دوای سوپاسو ستایشی خوا، ئەی خەڵکینە! من لەسەرتان کراومەتە سەرپەرشتیار، بەلاّم لە ئێوە باشتر نیم، ئەگەر چاکەم کرد هاوکارم بن و ئەگەر خراپەم کرد، ڕاستم بکەنەوە .

---

[1] ) **السيرة النبوية لإبن هشام، ج٤ ص٣٩٣.**

## بڕگەی دووەم: بەڵگەکانی چاودێریی کردن و لێپرسینەوەی بەرپرسان لە قورئان وسوننەت دا:

ئایا ئێمە چ بەڵگەیەکمان بەدەستەوەیە لە ئایەتەکانی قورئانو فەرمایشتەکانی پێغەمبەر "صَلَّى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کە خەڵك و کۆمەڵگا، نەك هەر مافیانە، بەڵکو ئەرکیشیانە، کە چاودێریی حوکمڕانان و کاربەدەستانی خۆیان بکەن، حوکمڕانان لەسەری سەریٚ، تا کو خواری خواریٚ، لە هەر ئاستێکدا بن چاودێرییان بکەنو لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکەنو ڕاستیان بکەنەوە، دواییش ئەگەر هەر ڕاست نەبوونەوە، هەر هەڵوێستێك کە بەبەرژەوەندیی دەزانن لەبەرانبەریاندا بیگرنە بەر، ئایا بەڵگەمان لەوبارەوە چییە؟! هەڵبەتە بەڵگە زۆرن، لەدەقەکانی قورئان و سوننەت، بەلاّم ئێمە هێندێك لە ئایەت و فەرمایشتەکانمان وەك نموونە لەبارەوە هێناوەتەوە:

١/ یەکێك لەوانە ئایەتی ژمارە (١٠٤) ی سوورەتی (آل عمران)ە خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَی) دەفەرمویٚ: ﴿ وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٠٤﴾ خوا فەرمانمان پێدەکاتو دەفەرمویٚ: ئێوە - ئەی مسوڵمانینە!- کۆمەڵێك بن، یان: با کۆمەڵێکتان هەبیٚ کە: بانگەواز دەکەن بۆ هەرچی شتی چاکە، فەرمان دەکەن بە شتە پەسەندەکان و ڕێگریی دەکەن لەشتە ناپەسەندەکان، هەر ئەوانەش سەرفرازن، بەڵیٚ، مسوڵمانان لەسەریان پێویستە هەموویان، یاخود لە نێویاندا کۆمەڵێك هەبن، کە ئەم سیٚ ئەرکە جێبەجیٚ بکەن: بانگەواز بکەن بۆ هەرچی شتی بەسوودو چاکە، یەکدی بۆ بانگ بکەن و خەڵکیشی بۆ بانگ بکەن، ئنجا ئەو شتە چاكو بەسوودە لەهەرکەسێكو لایەکەوە بیٚو لە هەر بوارێکدابیٚ، چونکە (راغب الأصفهاني) لە پێناسەی (الخیر)دا گوتوویەتی: **(الخير: ما يرغب فيه الكل)** واتە (خێر): هەر شتێکە کە هەموو کەس ئارەزووی دەکەنو حەزی پێدەکەن. فەرمان بکەن بە هەرچی شتی پەسندە،وە ڕێگریی بکەن لەهەرچی شتی ناپەسندە، کە دیارە شەریعەت یا فەرمانە بەشتە پەسەندەکان، یان ڕێگرییە لە شتە ناپەسەندەکان،

واتە: دەبێت مسوڵمانان هەموویان کۆمەڵێك بن، یاخود کۆمەڵێکیان لە نێودا هەبن، کە هەوڵبدەن بۆ چەسپاندنی شەریعەت و، لابردنی هەر شتێك،کە لەگەڵ شەریعەتدا ناکۆك و نەگونجاوە، دوایش خوا دەفەرموێ: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾﴾ هەر ئەوانەش سەر فرازن ، واتە: بەپێچەوانەوە کۆمەڵگایەکی مسوڵمان، کە هەموویان ، یاخود کۆمەڵێکیان لە نێودا نەبێ، کە ئەو سێ ئەرکە جێبەجێ بکەن، کۆمەڵگایەکی سەرفراز نیە، نە لە دنیادا بەختەوەر و سەرفراز دەبێو نە لە دوارۆژیش دا.

ئەوەش شتێکی واقیعییەو، هەر کاتێك کۆمەڵگاو خەڵکی مسوڵمان، میللەتانی مسوڵمان، زیندوویەتی ئەوەیان لەنێودا نەما، کە هەڵویستی ئیجابییان هەبێ دەربارەی سەرجەم شتە باش و پەسەندەکان، بەرگرییان لێ بکەن و هەوڵی چەسپاندنیان بدەن، هەڵوێستی سەلبییان هەبێت دەربارەی شتە خراپەکان، کە دژیان بن و نەیان هێڵن و ڕیشەکێشیان بکەن، ئەو کۆمەڵگاو میللەتانەی ئەو حاڵەتی زیندووێتی یەیان تێدا نامێنێ، بەرەو مردن و پووکانەوە دەچن.

٢- خوا لە ئایەتی ژمارە (١١٠)ی سووڕەتی (آل عمران)یش دا دەفەرموێ: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ...﴾ واتە: ئێوە - ئەی مسوڵمانینە!- باشترین کۆمەڵن بۆ خەڵکی پەیدا کراون، بۆ مرۆڤایەتی وەدیهێنراون، لەبەرچی؟ چونکە: فەرمان دەکەن بەهەرچی شتی پەسەندەو، ڕێگریی دەکەن لەهەرچی شتی ناپەسەندە و، ئیمان بە خوا دێنن، پێشتر باسمان کردوە، کە ئیمان بەخوا، بناغەیە بۆ هەموو تاعەت و چاکەیەك، بەلام لێرەدا خوا (سُبْحانَهُ وتَعالَى) خستوویەنە دوایە، تاکو سەرنجمان ڕابکێشێ: کە ئیمان بە خوابوونێك لە ئیسلامدا ئیعتیباری پێ دەکرێ، کە خاوەنەکەی وا لێ بکات، لەگەڵ چاکەدا بێو دژی خراپە بێ، چاکەو خراپەی خۆی و خەڵك، بڕوادار دەبێ لەگەڵ چاکەدا بێو دژی خراپە بێ.

٣- ئایەتێکی دیکە لەو بارەوە ئایەتی ژمارە (٢٥)ی سوورەتی (الأنفال)ە، کە خوا (سُبْحانَهُ وَتعالَى) فەرموویەتی: ﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةً وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢٥﴾ ﴾ واتە: لە بەلاّیەك بترسێن تەنیا تووشی ئەوانەتان نابێ، کە ستەمو خراپەیان کردوە، بزانن کە خوا سزاو تۆڵەی توندە، سزای خوا توندە، مانای چی یە؟ واتە: لە بەلاّیەك بترسێن کە بەهۆی ستەمکارەکانتانەوە تووشی چاکەکارەکانیش بێ، بزانن، کە سزاو تۆڵەی خوا توندە بەرانبەر بە کۆمەڵگایەك، کە دەستی خراپەکارەکانو ستەمکارەکان ناگرنو لە بەرانبەریاندا ناوەستن، بابزانن کە خوا، ئەگەر سزای دان، هەموویان پێکەوە سزا دەدات، بۆچی؟ ستەمکارو خراپەکان لەبەر ستەمو خراپەی خۆیان، بێ خراپەکانیش لەبەرئەوەی هەڵوێستیان نەبووە لەبەرانبەر ستەمو خراپەداو، گوێیان تەپ کردوەو ملیان شۆڕکردوە بۆ ستەم و خراپە، لە پێناو دوو هەناسە ژیانداو لە پێناو تۆزە ژیانێکی زەلیلانەدا، ئامادە نەبوون کە یەخەی ستەمکار بگرن، هەم ستەمکارەکەش لە ستەم دەرباز بکەنو، هەم خۆشیان قوتار بکەن، بۆیە هەموویان شایستەی ئەوەن، کە پێکەوە سزا بدرێن، وەك لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ" هاتوەو، هەمیشە سوننەتی پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ" و فەرمایشتەکانی ئەوەی، کە لە قورئاندا بەکورتیی هاتوە، زیاتر ڕۆشنی دەکەنەوەو، ئەوەی کە لە قورئاندا بەشێوەی تیۆریی (نظري) هاتوە، لە سوننەتی پێغەمبەردا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ" بەبەرجەستەکراویی پێشاندراوە.

٤- ئەوەتا یەکێك لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ" کە (أبو داودو الترمذي) هێناویانە، (الترمذي) گوتوویەتی: (حديثٌ حَسَنٌ) واتە: فەرمایشتێکی باشە لە ڕووی سەنەدەوە، پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ" دەفەرموێ: **{كَلاَّ، وَاللهِ لَتَأمُرُنَّ بالمَعْرُوف، وَلَتَنْهَوُنَّ عَنِ الْمُنْكَرِ، وَلَتَأخُذُنَّ عَلَى يَدِ الظَّالِمِ، وَلَتَأطُرُنَّهُ عَلَى الحَقِّ أطْراً، وَلَتَقْصُرُنَّه عَلَى الحَقِّ قَصْراً، أَوْ لَيَضْرِبَنَّ اللهُ بِقُلُوبِ بَعْضِكُمْ عَلَى بَعْضٍ، ثُمَّ لَيَلْعَننكُمْ كَمَا لَعَنَهُمْ}**(أخرجه أبو داود برقم: (٤٣٣٦)، والبيهقي برقم:

(١٩٩٨٣))، واتە: نەخێر وانیە[1]، وەك ئێوە دەڵێن و بیری لێدەکەنەوە: سوێند بە خوا، دەبێ فەرمان بەشتی پەسەند بکەن و، رێ لەشتی ناپەسەند بگرن و،دەبێ دەستی ئینسانی ستەمکار بگرن‌و نەهێڵن ستەم بکات و ،دەبێ بیسوورێننەوەو وەری سوورێننەوە بۆ لای حەق ، ئەگەر بەرەو باتیڵ چوو، دەبێ بای دەنەوەو ملی پێبسوورێننەوە بەرەو حەق،وە دەبێت کورتی بکەنەوە لەسەر حەق‌و نەهێڵن بەرەو ناحەقی‌و باتڵ بڕوا، ئەگەر وانەکەن، ئەوە خوا دڵی هەندێکتان لەگەڵ هەندێکیان پێکدا دەدات، دوایی خوا نەفرین لەئێوەش دەکات (ئەی ئەوانەی بێ هەڵوێست بوون) وەك چۆن نەفرینی لە ستەمکارەکان کردوە.

هەڵبەتە خوا نەفرینی لە ستەمکارەکان کردوەو بەدەقی ئایەت لە سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿...أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ١٨﴾ هود ، ئاگادار بە نەفرینی خوا لەستەمکارانە! کەواتە: ئەوە دەقی فەرموودەی پێغەمبەرە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کە کەسانێك لەبەرانبەر ستەمکاراندا هەڵویستیان نابێ، ئەوانەش لەعنەتیان لێ دەکرێ، با زوڵمیشیان نەکردبێ، مادام لەبەرانبەر زوڵمدا بێ هەڵویست و بێ دەنگ بن، ئەوانیش وەك ستەمکارەکان نەفرینیان لێ دەکرێ.

ئنجا تەماشا بکەن! ئەگەر خەڵکی مسوڵمان، ئەم ئایەتانەی خوای پەروەردگارو ئەم فەرمایشتانەی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" باش تێبگەن و ئیشیان پێ بکەن، کۆمەڵگای مسوڵمان چەند توندوتۆڵ و تۆکمە دەبێت‌و، چۆن جێگای زوڵم دەبێتەوەو جێگای گەندەڵیی دەبێتەوەو جێگای ماف پێشێلکردن دەبێتەوە، جێگای قۆرخکردنی دەستەڵات و ئیمتیازەکان دەبێتەوە، بۆ تاکێك، بۆ ماڵێك، بۆ حیزبێك، بۆ کۆمەڵێك؟! موستەحیلە ئەو شتانە لە کۆمەڵگایەکی مسوڵماندا جێگایان بێتەوە.

٥- فەرمایشتێکی دیکەی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لەوبارەوە، ئەو

---

[1]) وشەی (کلاّ) لە زمانی عەرەبیدا گوتراوە (کلمة رَدْع وَزَجْر) وشەیەکە بۆ سەرزەنشت‌و تێخوڕین‌و سەرکۆنە بەکاردێ.

فەرمایشتەیە، کە (أبو داودو الترمذي) هێناویانە و، (الترمذی) بە (حسن)ی داناوە: {أَفْضَلُ الجِهَادِ كَلِمَةُ عَدْلٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ}(أخرجه أبو داود برقم: (٤٣٤٤) وقال الشيخ الألباني: صحيح) واتە: گەورەترین و چاکترین جیهاد، وشەیەکی دادگەرانەیە لەلای دەستەلاّتدارێکی ستەمکارو لادەر. کەسێك قسەیەکی حەقی پێ بلّێ، ئەوە باشترین جۆری جیهاد کردنە لە پێناوی خوادا.

٦- کۆتا فەرمایشت، کە لەو بارەوە دەیهێنینەوە، ئەو فەرمایشتەیە، کە (مسلم) لە کتێبی صەحیحی خۆیدا بە ژمارە (٥٠) هێناویەتی، کە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: {«مَا مِنْ نَبِيّ بَعَثَهُ الله فِي أُمَّةٍ قَبْلِي إلاَّ كَانَ لَهُ مِنْ أُمَّتِهِ حَوارِيّون وَأَصْحَابٌ يَأْخُذُونَ بِسُنَنِهِ وَيَقْتَدُونَ بِهَا ثُمَّ يَخْلُفُ مِنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ وَيَفْعَلُونَ مَا لاَ يُؤمَرُونَ، فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنَ الإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ»}(أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٥٠))، واتە: هیچ پێغەمبەرێك نەبووە، کە خوا ڕەوانەی کردبێ لە کۆمەڵێکدا، مەگەر لە ئۆممەتەکەی خۆیداهاوەڵانێکی دانستەی هەبوونو، پشتیوانان و هاوکارانێکی هەبوون کە بە ڕێی ئەوەوە پابەند بوونو، بە فەرمانی ئەو بەڕێوە چوون، پاشان دوای ئەوان کەسانێك لە پاشەبەرەکان دێن، ئەوەی کە دەیلێن کاری پێناکەن، شتێك دەکەن کە فەرمانیان پێ نەکراوە، ئنجا هەرکەسێك بە دەست لە دژی ئەوانە بوەستێتەوە، ئەوە بڕوادارە،وە هەرکەسێك بەزمان لە دژیان بوەستێتەوە، ئەوە بڕوادارە، هەرکەسێك بە دڵیش لە دژیان بوەستێتەوە (مادام هیچی دیکەی لەتوانادا نەبێ)، ئەوەش بڕوادارە، بەلاّم لە دوای ئەوە بەقەدەر دەنکە خەرتەلەیەك ئیمان نیە، واتە: بەقەدەر دەنکە خەرتەلەیەك ئیمان لە دڵی کەسێکدا نیە کە نە بە دڵ و نە بەدەستو نە بە زمان لە دژی کەسانێك نەبێ، کە لەڕێبازی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لادەدەن و دەترازێن.

ئەوە بەڵگەکانی ئەرك و مافی چاودێریی کردن و لێپرسینەوەو ڕاستکردنەوەی خەڵك و کۆمەڵگا، بۆ حوکمڕان و کاربەدەستان.

## بڕگەی سێیەم: بوارەکانی چاودێریی کردن و لێپرسینەوەی بەرپرسان:

دیارە بوارەکان زۆرن، بەڵام من لە سێ خاڵ دا کورتم کردوونەوتەوە، لە سێ بواری سەرەکییدا خەڵكو کۆمەڵگا مافیانە و ئەرکیشیانە، کە چاودێربن بەسەر حوکمڕان و کاربەدەستانەوەو لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکەن و، لەبەرامبەریان دا بوەستن.

بواری یەکەم: پابەندیی بەشەریعەتەوە، یاخود پابەندی بە دەستوور و یاساوە: وەك خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) بە پێغەمبەری خۆی دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾

خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) دوای ئەوەی باسی جوولەکەو نەصرانییەکان دەکات، دەفەرموێ: دوایی تۆمان لەسەر بەرنامەیەك دانا لە ئایینی خۆمان، دەجا شوێنی بکەوەو بەدوای ئارەزووی ئەوانە مەکەوە، کە نازانن، کەواتە: هەر لە پێغەمبەری خواوە، تا هەر تاکێکی مسوڵمان، ئێمە مولزەم کراوینو لەسەرمان پێویستکراوە، کە پابەند بین بەو شەریعەت و بەرنامەوە، کە خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) ناردوویەتی، جادیارە ئێمە کاتی خۆی لە توێژینەوەی بنەمای سێیەم دا: (ملکەچکردنی هەموو لایەك بۆ دەستوورو یاسا) بە درێژیی ئەم بابەتەمان توێژییەوە، بۆیە لێرە بەو ئاماژە کورتە وازی لێدێنین.

بواری دووەم / پابەندیی بە دادگەرییەوە (الإلتزام بالعدل): خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) لە چەندان ئایەت دا فەرمانی بە ئیمانداران کردوە، کە پابەند بن بە دادگەرییەوەو دادگەریی لە نێو خۆیاندا بچەسپێننو بەدادگەریی بەڕێوە بچنو دادگەریی بڵێن، تەنانەت لەگەڵ دوژمنانیشیان دا، بۆ وێنە: خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) لە سوورەتی (النساء) لە ئایەتی (١٣٥)دا دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ...﴿١٣٥﴾﴾ واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! زۆر دادگەریی بەڕێوەبەرن، زۆر بە دادگەریی هەڵسن، شایەدو چاودێر بن بۆ خوا، ئەگەر لەسەر خۆشتان بێ، یان (ئەو چاودێریی کردن و شایەدیی دانە) لەسەر دایك و باب، یاخود خزمانیش بێ...، دیارە ئێمە ئەم مەسەلەی پابەندیی بە دادگەرییەوەش، کاتی خۆی لە کاتی توێژینەوەی بنەمای پێنجەم: (دادگەریی گشتگیر (العدالة الشاملة)دا، قسەمان لێکرد، بۆیە لێرەش بەم ئاماژە کورتە وازی لێدێنین، گرنگ ئەوەیە بزانرێ

کە ئەم بوارەش، واتە: بواری چەسپاندنی دادگەریی و پابەندیی بە داگەرییەوە بەتایبەت بۆ حوکمڕان و کاربەدەستان، بوارێکی گرنگی چاودێریی کردنی خەڵك و لێپرسینەوەی لەگەڵ حوکمڕان و لەگەڵ کاربەدەستان دا، کە ئایا تا چ ڕاددەیەك دادگەرانە بەڕێوە دەچن‌و، دادگەریی بەسەر هەمووﻻیەکدا بە خۆیشیان‌و دەوروبەریشیانەوە، جێ بەجێ دەکەن؟!.

<u>بواری سێیەم</u>/ سپاردنی بەرپرسیارێتییەکان بە کەسانی شایستە: خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) لە سووڕەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّواْ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِٱلْعَدْلِ ...﴿٥٨﴾﴾ واتە: خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) فەرمانتان پێدەکات بە جەختکردنەوە، کە سپاردەکان تەسلیمی خاوەنەکانیان بکەن، هەرکات دادوەرییتان لەنێوان خەڵکدا کرد، دادگەرانە دادوەریی بکەن... دیارە ئێمە پێشتر باسی ئەووەمان کرد، لە کاتی توێژینەوەی بنەمای حەوتەم دا: (دابینکردنی ماف و ئازادییەکان) خوا یاربێ لەداهاتووشدا جارێکی دیکە دەگەڕێینەوە سەری، مەبەستیش لەمە ئەوەیە کە ئەرکی سەرشانی حوکمڕانانە: ئەوانەی لە خوار خۆیانەوەن، بزانن کامەیان شایستەترە بۆ هەر کارو ئەرکێك، بەوی بسپێرن، بەبێ لە بەرچاو گرتنی خزمایەتیی‌و ناوچەگەرێتیی‌و، بە بێ حیزبایەتیی‌و هاومەشرەبیی‌و هاومەسلەکیی‌و بەرژەوەندیی شەخصیی کەلەبەینیاندا دەبێ، کێ کەفائەتی زیاترەو تواناو شایستەیی زیاترە، بۆ ڕاپەراندنی ئەو کارە، بەوی بسپێرن، ئەگەر وا نەکەن، ئەوە دیارە خیانەتیان لە ئەمانەتی خواو پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" کردوەو، خیانەتیان لە مسوڵمانان کردوە.

بەڵێ، ئەم سێ بوارە، سێ بواری سەرەکیین، کە دەبێ خەڵك وکۆمەڵگا تێیاندا چاودێریی حوکمڕان و کاربەدەستان بکەن و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکات، ئەگەر ﻻیاندا ڕاستیان بکەنەوەو هەڵوێستیان لەبەرانبەردا وەربگرن، ئنجا وەك گوتمان: نەك هەر مافیانە بەڵکو ئەرکێکی سەرشانیشیانە، جیاوازیی نێوان ئەرك‌و مافیش ئەوەیە، کە مرۆڤ دەتوانێ دەستبەرداری مافەکەی خۆی ببێت، بەڵام ئەرك، ئەگەر جێبەجێی نەکات و کەمترخەمیی تێدا بکات، لەسەری گوناهبار دەبێ‌و سزاو جەزرەبە ڕووی تێدەکات.

ئنجا ئایا لـەو سـێ بـوارەدا، خـەڵك چۆن چـاودێریی‌و بەدواداچـوون دەكـات، چۆن لێپرسینەوە دەكات لەگەڵ بەرپرسان دا؟! تەماشا دەكات: تا چ ڕاددەیەك ئـەو حـوكمڕان و كاربەدەستانە پابەندن بەشەریعەتەوە، پابەندن بەو دەستوورەوە، كە تەبەنیی كـراوە بـەو یاسـایانەوە،كە ئەنجوومـەنی نوێنـەران (پەرلـەمان) دەریـان دەكـات، لەبـەر ڕۆشـنایی شەریعەت دا؟! پاشـان: تـاچ ڕاددەیـەك دادگـەریی دەچەسـپێنرێ‌و بەدادگـەریی مامەڵـە دەكرێ، دادگەریی بـەمانای گشـتگیری؟ پاشـان: تـاچ ڕاددەیـەك بـە پێـی كەفائـەت و شایستەیی ئەرك و بەرپرسـیارێتییەكان بـە خـەڵك دەسـپێردێن، بـەبێ ڕەچـاوكردنی ئـەو شـتانەی كـە شـەریعەت ئیعتیبـاری بـۆ دانـەناون، وەك خزمایـەتیی، حیزبایـەتیی، ناسیاوێتیی، ناوچەگەرێتیی...هتد.

## بڕگەی چوارەم: شێوازو جۆرەكانی چاودێریكردن و لێپرسینەوەی بەرپرسان:

بۆ چاودێریی كردن‌و لێپرسینەوەی بەرپرسان، بەگشتی دوو شێواز هەن:

### یەكەم/ چاودێریی پارێزكردن (الرقابة الوقائية):

كە پێشی دەگوترێ: چاودێری كردن بەسەر دەستوریی بـوونی یاسـاكاندا (الرقابـة علـى دستورية القوانين) ، كە دیارە مەبەست لەم جـۆرە چـاودێریی كردنـە ئەوەیـە، كـە ڕێگـا بگیرێ لە دەرچوونی هەر یاساو بڕیارێـك، كـە پێچـەوانەی دەسـتوور بـێ، دەسـتوورێك كەتێك نەگیرێ لەگەڵ شەریعەتی بەرجەستە لە قورئان و سوننەت دا، كـە دیـارە ئـەمیش بە پلـەی یەكـەم لەلایـەن ئەنجوومـەنی ڕاوێـژ (مجلس الشـورى)- كـە پێشـی دەگـوترێ: (ئەنجوومەنی نوێنـەران) یـان (پەرلـەمان)ەوە ئـەنجام دەدرێ، چـونكە ئـەركی سـەرەكی ئەنجوومەنی ڕاوێژ، ئەنجوومەنی نوێنەران، بریتیە لە یاسادانان‌و دەبێ لەوێـدا چـاودێریی بكرێ، كە هیچ یاسایەك‌و هیچ بڕیارێـك دەرنەچـێ پێچـەوانەی شـەریعەت بـێ‌و دەبـێ پارێز بكرێ لە دەرچوونی هـەر یاسـاو بڕیارێـك، كـە پێچـەوانەی دەسـتوور بـێ، ئنجـا دەگونجێ ئەوە ڕاستەوخۆ لە ئەنجوومـەنی نوێنەرانـەوە بكرێ،دەشـگونجێ كـە دەزگایـەكی

تایبەتی بۆ دروست بکرێ، وەك لە هەندێ شوێن هەیەو پێی دەگوترێ: ئەنجوومەنی دەستووریی (المجلس الدستوري)، کە دەکرێ ئەنجوومەنێکی سەربەخۆ بێ، یاخود پێك بێ لە نوێنەرانی: ئەنجوومەنی نوێنەران و نوێنەرانی: حکوومەت، یاخود نوێنەرانی: دەستەڵاتی دادوەریی، گرنگ ئەوەیە دەزگایەك و لایەنێك هەبێ، کە چاودێریی بکات لەلایەن دەستەڵاتی جێبەجێکردنەوە، هیچ یاساو بڕیارێك دەرنەچێت ،کە پێچەوانەی دەستوورو شەریعەت بێ.

دەگونجێ بە کۆمەڵێك دەقی قورئان و سوننەت، بەڵگە بێنینەوە لەسەر ئەو جۆرە چاودێریی کردنەی حوکمڕان و کاربەدەستان:

١- بۆ وێنە: خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) لە سوورەتی (النساء) لە ئایەتی (٨٣)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِۦ ۖ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ...(٨٣)﴾ خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) ڕەخنە دەگرێ لە کەسانێکی دڵنەخۆش، یان کەم هۆش، ئنجا دەگونجێ، هەر مونافیق بووبن، یاخود هەر مسوڵمانی ناحاڵی و کرچ و کاڵ بوون، دەفەرموێ: ﴿... وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِۦ ...) ئەگەر هەواڵێکیان بۆ هات کە پەیوەندیی بەهێمنیی و ئاساییش، یان ترسەوە هەبوو، بڵاوی دەکەنەوە ﴿...وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ..﴾ ئەگەر ئەو هەواڵەیان گێڕابایەوە بۆ پێغەمبەرو بۆ لای ئەوانەی مشوورخۆرو کار بەدەستن، ئەوانەی توانای هەڵهێنجانیان هەیە، دەیانزانی کە ئایا: ئەو هەواڵە بە کەڵکی بڵاوکردنەوە دێ یان نا؟ کەواتە: دەبێ لە نێو مسوڵماناندا، کەسانێك هەبن ئەوان بڕیار بدەن، فلان هەواڵە بڵاوبکرێتەوە، یان بڵاو نەکرێتەوە؟ ئەو بڕیارە بدرێ ، یان نەدرێ؟ واتە: دەبێ لەنێو کۆمەڵگادا لایەنێکی چاودێر هەبێ.

٢- لە سوورەتی (الشورى) لە ئایەتی (٣٨)دا خوا کە دەفەرموێ: ﴿...وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ...(٣٨)﴾.

واتە: کاروباری بڕواداران بە ڕاوێژە لەنێو خۆیاندا. دیسان ئەمەش بەڵگەیە لەسەر

ئەوە، کە دەبێ مسوڵمانان دامەزراوەیەك ،یان دەزگایەکیان هەبێ، کە چاودێریی کاربەدەستان بکات، چونکە مادام کاروباریان بە ڕاوێژە، کەواتە: مسوڵمانان بۆیان هەیە لە نێو خۆیاندا ڕاوێژ بکەن: ئایا چی بکەن‌و چۆن بکەن؟ چونکە دیارە ئەو چاودێریی کردنە، وەك چۆن لە حاڵەتی جێبەجێکردن (تنفیذ)دا پێویستە، پێش جێبەجێکردنیش ، هەر پێویستەو لە کاتی بڕیاردانیشدا پێش ئەوەی کارەکە بچێتە قاڵبی جێبەجێکردنەوە، پێویستە چاودێریی ئەو بڕیارو یاسایانە بکرێ.

٣- هەروەها ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" کە پێشتر هێنامان‌و دەفەرموێ: {«**الدِّينُ النَّصِيحَةُ**»، **قُلْنَا لِمَنْ؟ قَالَ: «لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ**»}(أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٠٥))،دیسان ئەمیش هەمان مەبەست دەگەیەنێ، چونکە فەرمایشتەکە دەفەرموێ: دینداریی بریتییە لە دڵسۆزیی، هاوەڵەکانیش گوتیان: بۆکێ؟ فەرمووی: بۆ خوا دڵسۆز بی، چی خوا پێی خۆشە، ئەوە بکەی‌و چی خوا پێی ناخۆشە خۆتی لێ بەدوور بگری و، بۆ پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" دڵسۆز بی، بۆ کتێبی خواو دڵسۆز بی، بۆ بەرپرس‌و پێشەوایانی مسوڵمانان دڵسۆزبی، بۆ مسوڵمانان بەگشتی دڵسۆز بی، ئنجا دڵسۆزیی بۆ بەرپرس‌و پێشەوایانی مسوڵمانان، ئەوەیە، کە ئەگەر یاساو بڕیارێکیان دەرکرد، کە دەزانی بە کەڵك نایەت و ناشەرعییە، زوو لێیان وە دەنگ بێی، ئەوەیە دڵسۆزیی بۆ ئەوان، دڵسۆزیی ئەوە نیە ،کە هەمیشە دەستیان بۆ لە سینگ بدەی‌و، هەمیشە دەستیان بۆ لەسەر چاو دابنێی، بەڵکو لە ڕاستییدا ئەوە خیانەتە، بەڵێ، ئەو حوکمڕانە دڵی پێی خۆش دەبێ، بەڵام لە ڕاستییدا تۆ خیانی پێدەکەی، لە کاتێکدا بۆ ناحەقییەکانی‌و ناشەرعییەکانی، دەست لە سینگ دەدەی‌و بەڵێ قوربانی بۆ دەکەی.

٤- لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيِهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: {«**أَلاَ كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ**»}(أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٤٤٩٥)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٢٧٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٨٢٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٩٢٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٧٠٥))، واتە: ئاگاداربن! هەرکامێکتان چاودێرەو بەرپرسیاریشە بەرانبەر بە

كۆمەڵگایەكەی، كەواتە: كە تۆ چاودێربی، مانای وایە دەبێ چاودێریی حوكمڕانان بكەی، چاودێری خەڵك بكەی، چاودێریی دەستەلاتدار بكەی‌و چاودێریی بێ دەستەلاتیش بكەی، چاودێریی دەستەلاتدار بكەی، نەهێڵی لابدات‌و نەهێڵی بڕیارێك بدات، كە بە كەڵك نەیەت، چاودێریی بێ دەستەلات بكەی‌و نەهێڵی مافی بخورێ‌و هەقی پێشێل بكرێ.

## دووەم: چاودێریی كردنی چارەسەر كردن (الرقابة العلاجية):

جۆری دووەمی چاودێریی كردنی حوكمڕان و كاربەدەستان و بەرپرسان، بریتیە لە چاودێریكردنی چارەسەركردن (الرقابة العلاجية): ئەمیش دیارە بریتیە لەوەی، كە چاودێریی حوكمڕان و كاربەدەستان بكرێ، دوای ئەوەی كە یاساو بڕیارەكانیان دەردەكەن‌و دەكەونە قاڵبی جێبەجێكردنەوە، دەرەنجامی خراپیان لێدەكەوێتەوەو پەرێزو شوێنەواری خراپیان دەبێ، دەبێت لەو كاتەدا، ئەگەر پێشتر چاودێریی نەكرابێ، یاخود دەرك نەكرا، بێ بەوە كە ئەو یاساو بڕیارە، ئەو شێوە سیاسەتە هەڵەیە، دوای ئەوەی، كە دەرەنجامەكانی دەردەكەون، كە بەكەڵك نایەت، پێویستە چاودێریی بكرێ و بخرێتە ژێر لێپرسینەوەو ڕاستبكرێتەوە، دیارە ئەوەش ئەركی كۆمەڵگاو سەرجەم دام‌و دەزگاكانیشە، كە هەوڵ بدەن، ئەو بڕیارو یاسایانەو ئەو جۆرە سیاسەت‌و ڕەفتارە، كە دەرەنجامە خراپەكانی دەركەوتوون، بیگۆڕن‌و لایبەرن.

بۆ نموونە:

(البغدادي) كە یەكێكە لەزانایانی شارەزای بواری عەقیدەو بنچینەكانی دین لەو بارەوە دەڵێ: **(وَمَتى زاغَ عَن ذلك كانت الأُمةُ عياراً عليهِ في العُدُول بِهِ مَن خَطَئـهِ الى الصَّوابِ أو في العدولِ عَنهُ الى غَيرِهِ وَ سَبِيلُهُم مَعَهُ فيها كسبيلِهِ مع خلَفائـهِ وَقُضـاتِهِ وَعُمالِهِ وَسُعاتِهِ أن زاغوا عَن السُنَةِ عَدَلَ بِهِم أو عَدَلَ عَنهُم)**[1] لەباسی سەرۆك‌و كەسی یەكەمی وڵاتدا دەڵێ: هەركاتێك لەو ڕێیە لایدا، ئوممەت پێویستە بەسەریەوە چاودێرو پێوەر بێ، كە لە هەڵەوە بیگێڕێتەوە بۆ ڕێی ڕاست، یاخود ئەگەر بۆی ڕاست نەكرایەوە،

---

[1] أصول الدين، ص٢٧٨.

لایبدات‌و یەکی دیکە بێننە شوێنی و شێوەی مامەڵەکردنی ئۆممەت و خەڵك لەگەڵ ئەو حوکمڕانەدا لەو بارەوە وەك شێوەی مامەڵەکردنی ئەو حوکمڕانەیە لەگەڵ جێنشینەکانی و قازییەکانی و کاربەدەستەکانی و ئەوانەدا، کە دەیان نێرێ بۆ کۆکردنەوەی زەکات، (واتە: ئەو کارمەندو کاربەدەستانەی لەبەردەستیدا هەن) کە کاتێك لەو ڕێبازە لادەدەن کە بۆی دیاریی کردوون، دەیان هێنێتەوە سەر هەق، یاخود ئەوان لادەبات و کەسانی دیکەیان لە شوێندا دەنێ، (بەهەمان شێوە ئۆممەتیش، دەبێ کاتێك کە کەسی یەکەم، جا سەرۆك کۆماری پێدەڵێن، خەلیفەی مسوڵمانانی پێ دەڵێن، هەرچی پێ دەڵێن، کاتێك لادەدات، ئنجا لە کەسی یەکەمەوە بگرە، تا خوار کاتێك، کە لادەدات، دەبێ هەوڵ بدەن ڕاستی بکەنەوە، ئەگەر بۆیان ڕاست نەکرایەوە، لایببەن‌و کەسێکی دیکەی لە شوێن دابنێن).

هەروەها (**الباقلاني**)یش لەو بارەوە گوتوویەتی: (**فَإن قالوا: فَلِماذا يُقامُ الإمامُ ؟ قيلَ لَهُم لاَجلِ ما ذكَرناهُ مِن تَدبيرِ الجُيُوشِ وَ سَدِّ الثغورِ وَرَدعِ الظالِمِ والأخذ للمَظلومِ وَإقامَةَ الحُدودِ وقَسْمِ الفَيءِ بَينَ المسلمينَ وَ الدَفعِ بِهِم فى حَجِّهِم و غزوِهِم فَأن غلَطَ فى شَيءِ مِنهُ، أوعَدَلَ بِهِ عَن موضعِهِ، كانَت الامُةُ مِن وَرائهِ لِتَقويمِهِ**)[1] باقلانیی دەربارەی چۆنیەتی چاودێریی کردن و لێپرسینەوەی حوکمڕان، واتە: کەسی یەکەمی دەوڵەت و حکوومەت لە ئیسلام دا، گوتوویەتی: ئەگەر گوتیان: پێشەوا (واتە: حوکمڕانو دەستەڵاتدار) بۆچی دادەنرێ؟ پێیان دەگوترێ: لە پێناوی ئەوەدا، کە باسمان کرد، لە:

١) ڕێکخستن‌و مشوور لێخواردنی سوپا.

٢) پاراستنی سنوورەکان لەبەرانبەر دوژمنان دا (واتە: ئەو سەنگەرانەی لە پێشەوەن‌و لەگەڵ دوژمن دا هاوسنوورن بیانگرێ و بیانپارێزێ، کە دوژمن نەتوانێ بێتە خاکی مسوڵمانانەوە).

٣) بەرپەرچدانەوەی بابای ستەمکار، کە ستەم لەخەڵکی نەکات.

٤) بابای ستەم لێکراو مافەکەی بۆ بگەڕێندرێتەوە.

---

[1]) التمهيد، ص ١٨٥، ١٨٦.

٥) جێ بەجێ كردنی سزا شەرعییەكان (بەسەر كەسانێك دا كە دەستدرێژیی دەكەنە سەر نەفس و ماڵ و نامووس و هێمنییو ئاسایش و ژیانی خەڵك).
٦) دابەشكردنی دەستكەوت بەسەر هاووڵاتییان دا.
٧) سەرپەرشتیی كردنی مسوڵمانان لە كاتی حەج كردن و جەنگكردنیان لەگەڵ دوژمن دا.

دوایی دەڵێ: (فَـإن غلَـطَ في شَـيء مِنـهُ أوعَـدَلَ بِـهِ عَـن موضـعِهِ) ئنجا ئەگەر ئەوحوكمڕانە هەڵەی كرد لەیەكێك لەو شتانەدا، یاخود لە شوێنی خۆی لایدا (واتە: وەك دادگەریی دەخوازێ ڕەفتاری نەكرد لە یەكێك لەو بوارانەدا) (كانت الأمَّـةُ مِـن وَرائـهِ لِتَقويمِـهِ) ئەوە ئۆممەت لە پشتەوەیەتی بۆ ڕاستكردنەوەی (واتە: ئۆممەت دەبێ چاودێرو چوار چاوبێ بەسەر حوكمڕانەكانیەوە: كەسی یەكەم وئەوانەی خوار ئەو بۆ ئەوەی كە كاتێك كە لادەدەن و تووشی ستەم دەبنو تووشی هەڵە دەبن، ڕاستیان بكاتەوە، ئنجا ئەگەر بۆی ڕاستكرانەوە باشە، ئەگەر بەرپرسان ئامادەبن ڕاست ببنەوەو بێنەسەر ڕاستە هێڵ باشە، بەڵام ئەگەر بۆی ڕاست نەكرانەوە، لایان بداتو بیان گۆڕێ بە كەسانێك كە ئامادە دەبن ئەو سپاردەیە، كە ئەمانەتی حوكمڕانییە، ئەمانەتی سەرپەرشتیی كردنی كۆمەڵگایە، ئەمانەتی جێبەجێكردنی شەریعەتە، ئەمانەتی چەسپاندنی دادگەرییە، ئەو ئەمانەتە بەباشی هەڵبگرن و بپارێزن).

## بڕگەی پێنجەم: دەرەنجامەكانی چاودێریی كردن و لێپرسینەوەی بەرپرسان:

ئنجا با بێینەسەر بڕگەی پێنجەم و كۆتایی ئەم بنەمای نۆیەمینە: دەرەنجامەكانی چاودێریی لێپرسینەوەی حوكمڕان و كارەبەدەستان، كاتێك كە خەڵك هەڵدەستن بە ئەرك و مافی چاودێریی و لێپرسینەوەی حوكمڕان و بەرپرسان، واتە: كاتێك كە خەڵك و كۆمەڵگایەك كە زیندوون و نەمردوونو، خاوەن هەست و نەستن لەبەرانبەر لادان لەشەرعداو هەڵوێستیان هەیەو، گوێ تەپ ناكەنو چاو شۆڕ ناكەن، بەڵكو بە بەشێك لە دینی خوای دەزاننو بەبەشێك لە مسوڵمانەتیی خۆیانی دەزانن، كە وەك چۆن نوێژ دەكەن، ئاواش چاویان لەسەر حوكمڕان و دەستەڵاتداران بێ، كاتێك كە لادەدەن بیانگێڕنەوە سەر ڕاستە شەقام، كاتێك كە ستەم دەكەن، نەهێڵن ستەم بكەن، كاتێك مافەكانی كەسێك

پێشێل دەکەن دەستیان بگرن، کاتێك کۆمەڵگا ئەم ئەرکە ئەنجام دەدا لەگەڵ حوکمڕانو کاربەدەستانیدا، دوو دەرهاویشتە پەیدا دەبن:

## دەرهاوێشتەی یەکەم: وەلاٌمدانەوە و بەدەنگەوە هاتنی بابای حوکمڕان و بەرپرس:

وەلاٌمدانەوەو بەدەنگەوەهاتنی بابای حوکمڕان و بەرپرس و پابەندیی بەشەریعەتەوەو، دەستهەڵگرتنی لەو لادان و سەرپێچییانەی، کە لێی بەرەخنە گیراون و ڕەفتارکردنی بە پێی بنچینەی: (الرجوع الى الحق خير من التمادي في الباطل) گەڕانەوە بۆ حەق باشترە، لەبەردەوامبوون لەسەر ناهەق، کە دیارە هەر ئەم دەرهاویشتەی یەکەمە، حاڵەتێکی ئاساییەو، هەر ئەوە حاڵەتێکی خوازراوە بۆ کەسانێك، کە خۆیان بەمسوڵمان بزانن‌و خۆیان بە بەرپرسی مسوڵمانان‌و مشوورخۆری مسوڵمانان بزانن، وایان لێ چاوەڕێ دەکرێ، ئەوە حاڵەتی ئاسایی‌و سروشتییە بۆ ئەوان، کە کاتێك ئاگادار دەکرێنەوە، دەبێ کە بەنەزانیی ستەمیان کردووە،یان هەڵیان کردوە، یان بە هەر حاڵ، ئەگەر زانیبیشیان دوای ئەوەی خەڵك لێیان وەدەنگ دێ‌و ئاگادار دەکرێنەوە، بگەڕێنەوە سەر ڕاستە شەقام‌و ئامادە بن بێنەوە سەر ڕاستە هێڵ و دەست لەو خراپەیە هەڵگرن، ئنجا ئەگەر وایان کرد، ئەوە حاڵەتی خوازراوە و ویستراوەو، هەر ئەوەش چاوەڕێ دەکرێ لە کەسانێك، کە مسوڵمانان دایان نابن بەبەرپرس‌و چاودێری خۆیان‌و بە حوکمڕان و سەرپەرشتیاری خۆیان، کە کاتێك ئاگادار دەکرێنەوەو ڕاست دەکرێنەوە، قبووڵی ئەو ئاگادار کردنەوەیەو ڕاستکردنەوەیە بکەن.

چوار خەلیفە ڕاشدینەکان (خوا لێیان ڕازی بێ)، بەو شێوەی بوون، هەموو حوکمڕانێکی مسوڵمانی ڕەسەن بە درێژایی مێژوو بەو شێوەیە بووە، کاتێك کە زانایەك، بەڵکو هەرکەسێك ئامۆژگاریی کردبن، هەڵەی بۆڕاست کردبنەوە، نەك هەر توورە نەبوون، بەڵکو زۆر بە سینگ فراوانیی، سوپاسی بابای ڕەخنەگریشیان کردوەو دەست خۆشیشیان لێکردوە، بەڵکو جاری وا بووە خەلاتیشیان کردوە، ئنجا نەك تەنیا چوار خەلیفە ڕاشیدەکان، بەڵکو هەندێك دەستەلاٌتدارانی ئومەویی و عەبباسییش هەبوون، تاك تاك، یاخود لە هەندێك هەڵوێستیاندا زۆر جوامێرانە بوون، کە ئەگەر زانایەکی دین فرۆشیش

ویستبێتی لایان بدات، یان فتوایەکی هەڵەیان بۆبدات، ئەو حوکمڕانە ،کە ترسی خوای لەدڵدابووە، چاودێریی خوای پەروەردگاری هەست پێکردوە، جاری وا هەبووە سزای زانایەکەشی داوە، یاخود ئەگەر سزاشی نەدابێ، دوایی گوتوویەتی: ئەو زانایە ئەو فتوایەی لەبەر من بەو شێوەیە دا، تاکو من ڕازی بکا، نازانێ کە من بەوە ڕازی نیم!.

بەڵێ، ئەگەر دەرهاوێشتەی یەکەمیان دەرەنجامی چاودێریی‌و لێپرسینەوەی خەڵك بوو بۆ بەرپرسان ، ئەوە دیارە مسوڵمانان بە ئاسانیی گرفتەکەیان چارەسەر دەبێ لەگەڵ ئەو حوکمڕانەدا، کە هەڵەی کردوەو ستەمی کردوە، مادام ئێستا قبووڵ دەکات بێتەوە سەر ڕاستە شەقامو، قبوڵ دەکات لەو مەسەلەیەشدا پابەند بێتەوە بە شەریعەتەوە، ئەوە وەك جاران پێویستە فەرمانبەریی بۆ بکرێ، چونکە جارێ پەیمانەکەی هەر لە گەردنی خەڵك دایەو کاتی خۆیشی، کە مسوڵمانان بەیعەتیان پێداوە، لەسەر ئەو بناغەیە بەیعەتیان پێ نەداوە، کە هەڵە نەکات، چونکە تەنیا پێغەمبەران هەڵە ناکەن، بەڵکو لەسەر ئەو بناغەیە پەیمانیان پێداوە، کە بە پێی توانا پابەند بێ بە شەریعەتەوە، ئەگەر هەڵەی کرد،دان بەهەڵەکەیدا بێنێ و ڕاستی بکاتەوە، ئنجا مادام ئێستا ئامادەیە کە هەڵەکەی خۆی ڕاست بکاتەوەو دان بەهەڵەکەیدا دێنێ، ئەوە ئەو حوکمڕان و کاربەدەستە بەهۆی ئەو هەڵەیەوە، کە کردوویەتی و بۆی ڕاست کراوەتەوەو، بە هۆی ئەو زوڵمەوە، کە کردوویەتی‌و دوایی دەستی لێهەڵگرتوەو لێی پەشێمان بووەتەوە، هیچ زیانی پێ نەگەیشتوەو هەر لە شوێنی خۆیەتی، پێویستە مسوڵمانانیش وەك پێشوو فەرمانبەریی بۆ بکەن و گوێڕایەڵییان بۆی هەبێ.

بەڵام ئەگەر ئەوەی دووەمیان بوو، کە بریتیە لە دەست هەڵنەگرتن لە ناحەق‌و ستەم‌و ناشەرعیی و دانپێدا نەهێنانی هەڵە، ئەوە مسوڵمانانیش پێویستە هەڵوێستیان لەبەرانبەریدا بە جۆرێکی دیکە بێت.

هەڵبەتە ڕوونکردنەوەی ئەو هەڵوێستەش باسێکی دوورو درێژی دەوێ‌و، زانایان مشتومڕی زۆریان لەو بارەوە بووە، کە ئایاکاتێك حوکمڕان لادەدات‌و تووشی هەڵەو ستەم دەبێ‌و، ئامادەش نابێ خۆی ڕاست بکاتەوە دان بەهەڵەکانیدا بێنێ‌و لەسەر خراپەو زوڵم بەردەوام دەبێ، ئایا دەبێ خەڵك و کۆمەڵگا هەڵوێستیان چۆن بێ؟! خوا پشتیوان بێ لە باسی داهاتوودا وەڵامی ئەو پرسیارە دەدەینەوە.

## دەرهاوێشتەی دووەم: مل نەدانی بابای حوکمڕان و بەرپرسی لادەر بۆ هەق و بەردەوامبوونی لەسەر ستەم:

ئێمە لە باسی پێشوودا خستمانە ڕوو: کە حوکمڕان و کاربەدەستان کاتێك، کە خەڵك و کۆمەڵگا ئەو ئەرکەیان لەگەڵدا ئەنجام دەدا، واتە: هەڵدەستێ بەچاودێریی کردنیان و ڕەخنە لێگرتن و لێپرسینەوە لەگەڵدا کردنیان و ڕاستکردنەوەیان، دوو حاڵەتیان هەیە بە شێوەیەکی گشتی:

١) یان ئەوەتا بەدەم داوای خەڵکەوە دەچن و گوێ بۆ ڕەخنەی خەڵك دەگرن و، ئەو حەقەی،کە خەڵك پێیان دەڵێن، لێیان وەرەگرن و ئامادە دەبن، کە لاریی و لادانەکەی خۆیان ڕاست بکەنەوە و بێنەوە سەر ڕاستەهێڵ.

٢) یان هەرچەندە خەڵك ڕەخنەیان لێ دەگرێ و چاودێرییان دەکات و عەیبەکانیان دەخاتە ڕوو، بەڵام ئامادە نەبن دەست لە لاریی و کەم و کوڕییەکانی خۆیان هەڵبگرن و، لەسەر لاریی و ستەمکاریی خۆیان بەردەوام دەبن.

ئنجا ئێمە ئێستا باسی ئەو حاڵەتەی دووەم دەکەین کە: ئایا شەریعەتی ئیسلامیی چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو حاڵەتەی حوکمڕان و کاربەدەستانێکدا دەکات، کە ستەمکارن و لارن و هەڵەکارن، وەدەستدرێژیی دەکەنەسەر ماف و ئازادییەکانی خەڵك و کۆمەڵگا، پاشانیش هەرچەندە خەڵك ڕەخنەیان لێ دەگرێ و کەمو کوڕییەکانیان دەخاتە بەرچاویان، بەڵام ئامادە نابن کە دەستبەرداری هەڵەو کەم و کوڕیی و ستەم و لادانەکانیان ببن، ئایا شەریعەت هەڵوێستی چییە؟! سەرەتا زۆر بەکورتی: دەڵێین: هەڵوێستی شەریعەت ئەوەیە کە:

١) لە بنەڕەتدا هەر حوکمڕان و کاربەدەستێك ، کە ئەرکێکی پێ دەسپێردرێ، وەك سپاردە (**أمانة**) پێی سپێردراوەو دەبێ بیپارێزێ.

٢) پاشان لەسەر بناغەیەك ئەو ئەمانەتەی پێ سپێردراوە، ئەویش بریتییە لە گرێبەستێك لە نێوان حوکمڕان و خەڵکدا، نێوەڕۆکی ئەو گرێبەستەش ئەوەیە،کە ئەو حوکمڕان و کاربەدەستە، دەبێت بە پێی شەریعەت و بەگوێرەی ئەو مەرجانە ڕەفتار بکات، کە ڕەوایەتیی (شرعیة)یەکەی پێیانەوە بەندە، لەو

بەرپرسیارێتیەدا، کە خراوەتە سەرشانی، بەکورتیی: ئەگەر ئەو حوکمڕان و کاربەدەستە، ئەرکی سەرشانی خۆی بەرانبەر کۆمەڵگا جێبەجێ کرد، ئەو کاتە خەڵك و کۆمەڵگاش، پێویستە ئەرکی سەر شانی خۆیان بەرانبەری جێبەجێبکەن‌و بۆی دڵسۆز بن‌و گوێڕایەڵیی‌و فەرمانبەریی بۆ بکەن و هاوکار و دەستبار گری بن.

بۆیە کاتێك حوکمڕان و کاربەدەستێك لادەدات‌و ناشچێتەوە سەر ڕاستە هێڵ‌و لە خەڵك عاصیێ دەبێت، وەك کوردەواریی دەڵێن: (لە کەلی شەیتان دانابەزێ) ئەوە لەڕاستییدا ئەو گرێبەستەی کە بە پێی وی بۆتە حوکمڕان و کاربەدەست‌و چۆتەسەر کورسی حوکمڕانیی، ئەو گرێبەستە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی هەڵدەوەشێتەوە، چونکە وەك فەرمایشتی پێغەمبەرە "صَلَّى الله عَلَيه وَسَلَّمَ" (**المسلمون على شُروطِهِم**)[1] مسوڵمانان پابەندن بەمەرجەکانی خۆیانەوە، ئنجا خەڵك و کۆمەڵگا، مەرجیان لەسەر حوکمڕان و کاربەدەستان ئەوە بووە، کە پابەند بن بەشەریعەتەوەو دادگەریی بچەسپێنن و بەرژەوەندیی ئەوان بێننە دی، بۆیە کاتێك حوکمڕانێك لە شەریعەت لادەدات و لە جیاتی دادگەریی، چاوی لە ستەمکاریی دەبێ و لە جیاتی بەرژەوەندیی خەڵك، بەرژەوەندیی خۆی، یاخود کەسانێك، کە لە خۆیەوە نزیکن دابین دەکات، لەسەر حیسابی بەرژەوەندیی گشتی، مانای وایە ئەو مەرجەی کەلەسەریان بە مەرج گرتوە، نەیهێناوەتە دی، ئنجا کە مەرجەکەش لاچوو، کەواتە: ئەو گرێبەستەش کەلەسەری بنیاتنراوە، هەڵدەوەشێتەوە، وەك چۆن کاتێك کە بناغەی دیوارێك دەردەهێنرێ، دیارە دیوارەکەش هەرەس دێنێ.

شایانی باسیشە هەموو شەرعزانان و زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن: کاتێك کە حوکمڕان و کاربەدەستێك، بەرز بێ، یان نزم‌و لەهەر ئاستێکدا بێ لاریی‌و ستەمکاری لێ دەبینرێ، ئەرکی سەرشانی کۆمەڵگاو خەڵکە،کە یەخەی بگرن‌و هەوڵی ڕاستکردنەوی بدەن، ئنجا ئەگەر هەر ڕاست نەبۆوە، لاییەرن، بەمەرجێ پێویستی بەهێز نەکات‌و سەر نەکێشێ بۆ کوشتار، زانایان هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن‌و دوایی باسی بەڵگەکان دەکەین، بەڵام ئەوەی، کە زانایان تێیدا کەوتوونەتە کێشەو مشتومڕەوە، ئەوەیە ،کە ئایا

---

[1] رواه أبوداود: ٣٥٩٤، والترمذي: ١٣٥٢، وقال الترمذي: حسن وصحّحه الألباني.

ئەگەر بابای کاربەدەستی لارو ستەمکار بەئاسانیی لانەدراو پێویستی بەبەکارهێنانی هێز هەبوو، لابردنەکەی سەری دەکێشا بۆ کوشتن، وا باشە دەست بۆ هێز ببرێو بە هەر نرخێك تەواو بووە، ئەو حوکمڕانە هەر لاببرێ، یاخود بهێڵدرێتەوە؟

زانایان لەم حاڵەتەدا کەوتوونەتە ڕا جیاییەوە، ئەگەر نا، مادام بەبێ بەکارهێنانی هێزو، بەبێ تێچوونێکی زۆر کاربەدەست و دەستەڵاتدارەکە لابچێ، ئەوە خەڵك ئەرکی سەرشانیانە کەلای بەرن، چونکە بۆیە دایانناوە، کە شەریعەتیان بەسەردا پیادە بکات و دادگەرییان لەنێودا بچەسپێنێو، بەرژەوەندییان بۆ دابین بکاتو ماف و ئازادییەکانیان بۆ دەستەبەر بکات، بۆیە کاتێك ئەو ئامانجە شەرعییانەی کە پێویستنو بەمەرج گیراون بۆحوکمڕانێك، ناهێندرێنە دی، مانای وایە پاساوو بەڵگەی مانەوەی نەماوەو پێویستە لایبەرن، بەڵام لەوەدا کە ئایا: ئەگەر بەبێ بەکارهێنانی هێز بۆیان نەکرا، چی بکەن؟ لێرەدا زانایان بوونە دووبەش:

**یەکەم:** بەشێکیان، کە لەڕابوردوودا زۆربەی ئەوانە بوون، کە بە (أهل السنة) ناسراون و مەرجیش نیە،کە وەك ناوەکەیان وایە، نیوەڕۆکیشیان وابووبێ، واتە: پابەند بووبن بە سوننەتی پێغەمبەرەوە "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" وەك دوایی باسی دەکەین، بەڵام گرنگ ئەوەیە لە ژێر ئەو نازناوەدا زیاتر کۆبوونەتەوە، هەروەها شیعەی دوازدە ئیمامیش، هەمان ڕایان هەیە، ئەوانە ڕایان وایە کە پێویستە خەڵك و کۆمەڵگا لەسەر خۆڕاگریی و دڵسۆزییان لەگەڵ ئەو جۆرە حوکمڕانانەدا بەردەوام بن، ئەوان بەم بنچینەیە کاریان کردوە، کە دەڵێ: (**الفسق لا يمنع من استدامة الإمامة**) واتە: لاڕێ بوونو گوناهبار بوون ، ڕێگر نیە لە بەردەوام بوونی پێشەوایەتییو حوکمڕانێتیی دا، بەڵێ، ئەوان ئەم بنچینەیان کردوە بە بناغەی هەڵوێستەکەی خۆیانو، چەند بەڵگەیەکیش لەسەرڕاستیی ئەو هەڵوێستەی خۆیان دێننەوە، من پێنج دەقی قورئان وسوننەتم لەو دەقانەی، کە ئەوان بە بەڵگەیان دێننەوە، بەنموونە هێناونەوە:

## ١- بەڵگەكانی ئەوانەی دەڵێن: نابێ بۆ لادانی حوكمڕانی ستەمكارو لار، پەنا ببرێتە بەرهێز:

یەكەم// ئەم ڕستە قورئانییە بە بەڵگە دێننەوە، كە لەئایەتی ژمارە (٥٩) سوورەتی (النساء)دا هاتووە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ.... ﴿٥٩﴾﴾ كە لە ڕابوردوودا چەند جار هێنامانەوە، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بكەنو فەرمانبەریی پێغەمبەر بكەن، وەهی كاربەدەستانێك، كە لە خۆتانن.

دووەم// یەكێكی دیكە لەو دەقانە، كە ئەوان بەبەڵگەیان دێننەوە بۆ ئیسپاتی ڕاستیی هەڵوێستەكەی خۆیان، كە پێویستە حوكمڕان و دەستەڵاتدار، مادام كوفری ئاشكرای لێ نەبینرا بێو لە بازنەی ئیسلام دەرنەچووبێ، هەر چەندە ستەمكارو لادەرو خراپەكار بێ، بۆلادانی پەنا نەبرێتە بەرهێز، ئەم فەرمایشتەیە، كە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" دەفەرموێ: {**«مَنْ رَأَى مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئًا يَكْرَهُهُ فَلْيَصْبِرْ فَإِنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ يُفَارِقُ الْجَمَاعَةَ شِبْرًا فَيَمُوتُ إِلاَّ مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً»**}(أخرجه أحمد برقم: (٢٨٢٦)، والبخاري برقم: (٦٦٤٦)، ومسلم برقم: (١٨٤٩) وغيرهما)، واتە: هەركەسێك لە فەرماندەكەی خۆی شتێكی بینی، كە پێی ناخۆش بوو، با ئارامیی لەسەر بگرێ، چونكە هەركەسێك بستێك لەكۆمەڵی مسوڵمانان جیا بێتەوەو بمرێ، بە مردنێكی نەفامانە مردوە.

سێیەم // یەكێكی دیكە لەو دەقانە، ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەرە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" كە دەفەرموێ: {**«سَتَرَوْنَ بَعْدِي أَثَرَةً وَأُمُورًا تُنْكِرُونَهَا، قَالُوا: فَمَا تَأْمُرُنَا يَا رَسُولُ اللهِ؟ قَالَ: أَدُّوا إِلَيْهِمْ حَقَّهُمْ، وَسَلُوا اللهَ حَقَّكُمْ»**}(أخرجه البخاري برقم: (٦٦٤٤)، والترمذي برقم: (٢١٩٠))، واتە: ئێوە لەدوای من لەلایەن حوكمڕانەكانەوە بەشخۆراویی دەبینن (واتە: بەشی ئێوە دەخۆن، وەك دەڵێ: (هی خۆم بۆخۆم هی تۆش دەخۆم) و چەند شتێك دەبینن، كە لێیان بەرەخنە دەگرن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" ئنجا ئایا فەرمانمان

بەچی پێدەکەی؟ فەرمووی: ئەو مافەی ئەوان، کە لەسەر ئێوەیە ، بۆیان جێبەجێ بکەن، داوای مافی خۆشتان لەخوا بکەن.

چوارەم// دەقێکی دیکە، کە شوێنکەوتوانی ئەوڕایە بەبەڵگەی دێننەوە، بۆ پشتگیریی ڕایەکەیان ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەرە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کە دەفەرموێ: {«خِيَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُحِبُّونَهُمْ وَيُحِبُّونَكُمْ وَيُصَلُّونَ عَلَيْكُمْ وَتُصَلُّونَ عَلَيْهِمْ، وَشِرَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُبْغِضُونَهُمْ وَيُبْغِضُونَكُمْ وَتَلْعَنُونَهُمْ وَيَلْعَنُونَكُمْ»، قِيلَ يَا رَسُولَ اللهِ! أَفَلاَ نُنَابِذُهُمْ بِالسَّيْفِ؟ فَقَالَ: «لاَ مَا أَقَامُوا فِيكُمُ الصَّلاَةَ، وَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْ وُلاَتِكُمْ شَيْئًا تَكْرَهُونَهُ فَاكْرَهُوا عَمَلَهُ وَلاَ تَنْزِعُوا يَدًا مِنْ طَاعَةٍ»}(أخرجه مسلم برقم: (١٨٥٥))، واتە: باشترین پێشەوا و حوکمڕانەکانتان ئەوانەن، کە خۆشتان دەوێن و خۆشیان دەوێن، دوعاتان بۆ دەکەن و دوعایان بۆ دەکەن،وەخراپترین حوکمڕانەکانتان، ئەوانەن کە ڕقتان لێیانەو ڕقیان لێتانەو، نەفرینیان لێدەکەن و نەفرینتان لێدەکەن، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا! "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئایا بە شمشێر بەرەنگاریان ببینەوە؟ فەرمووی: نەخێر، هەتا نوێژتان لە نێودا بکەن، (واتە: هەتا بەشداریی نوێژ و جومعەو جەماعەتتان بکەن، هێز لەدژیان بەکار مەهێنن) هەر کاتێك شتێکتان لە سەرپەرشتیاران و لە حوکمڕانانی خۆتان بینی، کە پێتان ناخۆش بوو، ڕقتان لە کردەوەکەی بێ، بەڵام دەست لە فەرمانبەریی مەکێشنەوە.

پێنجەم // دەقی کۆتایی، کە من بەنموونەم هێناوەتەوە، کە ئەوان لەو بارەوە بەبەڵگە دێننەوە، ئەم فەرمایشتەیە: {عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: دَعَانَا النَّبِيُّ "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" فَبَايَعْنَاهُ، فَقَالَ فِيمَا أَخَذَ عَلَيْنَا، أَنْ بَايَعَنَا عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي مَنْشَطِنَا وَمَكْرَهِنَا وَعُسْرِنَا وَيُسْرِنَا وَأُثْرَةٍ عَلَيْنَا، وَأَنْ لاَ نُنَازِعَ الأَمْرَ أَهْلَهُ إِلاَّ أَنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا عِنْدَكُمْ مِنَ اللهِ فِيهِ بُرْهَانٌ} (أخرجه البخاري برقم: (٦٦٤٧)، ومسلم برقم: (٤٨٧٧))، واتە: عوبادەی کوری صامت (خوای لێ ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئێمەی بانگ کردو

پەیمانمان لەگەڵ بەست، ئنجا لەو پەیمانەدا کە لێی وەرگرتین، فەرمووی: کە دەبێ: بیسەر و جێبەجێ کەر بین (واتە: فەرمانی حوکمڕانەکانمان ببیستین‌و گوێڕایەڵ بین، فەرمانبەریش بین) لە حاڵێکدا، کە پێمان خۆشە و لە حاڵێکیشدا، کە پێمان ناخۆشە،وە لە کاتی سەغڵەتیی‌و لە کاتی ئاسانیی دا، لە کاتێکدا، کە تووشی بەشخوراوییش دەبین، (مانای وشەی (أَثَـرَة) ئەوەیە وە کە کەسێك بەشی خەڵك بۆخۆی ببات، پێچەوانەکەی (إیثار)ە، کە بریتیە لەوەی بەشی خۆشت بدەی بە خەڵك)، پەیمانی لێوەرگرتین، کە ناکۆکیی‌و دووبەرەکیی نەکەین لەگەڵ ئەوانەدا کە سەرپەرشتیار و حوکمڕانمانن، مەگەر کوفرێکی ئاشکرا ببینین، کە لەلایەن خواوە بەڵگەیەکەی ڕوون و ئاشکرامان لەسەر ئەو کوفرە هەبێ ،کە لەو حوکمڕانەی دەبینین (لەو حاڵەتەدا بەقسەکردن نامێنێ).

ئەمانە ئەو دەقانەن، کە لایەنگرانی ئەو ڕایەی دەڵێ: حوکمڕانان و دەستەڵاتداران هەرچەندە ستەم و دەستدرێژیی و خراپەکارییان هەبێ، نابێ بۆ لادانیان بەهێز لە گەڵیاندا بەرەنگار ببینەوە ئەگەر بەبێ بەکارهێنانی هێز بۆمان لاچوون، ئەوە هەموو زانایان لەسەری یەکدەنگن، بەڵام ،ئەگەر لادانیان سەری دەکێشا بۆ کوشتارو خوێنڕێژیی، دەبێ خۆڕابگرین‌و دەست بۆ هێز نەبەین.

(**ابن تیمیة**) ڕەحمەتی خوای لێبێ، وەك کۆکەرەوەی چەمك و واتای ئەو دەقانەی ئەو ڕایە هەموویان، دەڵێ: (**ولهذا كان المشهور من مذهب أهل السنة أنهم لا يرون الخروج على الأئمة وقتالهم بالسيف وإن كان فيهم ظلم كما دلت على ذلك الأحاديث الصحيحة المستفيضة عن النبي "صلى الله عليه وسلم" لأن الفساد في القتال والفتنة أعظم من الفساد الحاصل بظلمهم بدون قتال ولا فتنة فلا يدفع أعظم الفسادين بالتزام أدناهما ولعله لا يكاد يعرف طائفة خرجت على ذي سلطان إلا وكان في خروجها من الفساد ما هو أعظم من الفساد الذي أزالته**).[1] دیارە پێشتر چەند قسەیەك دەكات،

[1]) منهاج السنة النبوية، ج٢ ص ٨٧.

پاشان دەڵێ: لەبەر ئەوە ئەوەی، کە زاندراوە لە بۆچوونی ئەهلی سوننەت ئەوەیە، کە بە ڕەوایان نەزانیوە خەڵك لە دژی حوکمڕانان و پێشەوایان ڕاپەڕی و بەشمشێر (واتە: بەهێزو چەك) لەگەڵیان ڕوو بەڕوو بێتەوە، هەرچەندە ستەمیشیان هەبێ، وەك زۆر لە فەرموودە ڕاستە زانراوەکان دەلالەت لەسەر ئەوە دەکەن، (دوایی پاساوی ئەوە دەداتەوەو دەڵێ:) چونکە ئەو شوێنەوارە خراپانەی لە جەنگ و لە ئاژاوە پەیدا دەبن گەورەترن، لەو خراپەو ئاژاوەیەی بە هۆی ستەمی ئەوان، بێ جەنگ و ئاژاوە پەیدا بووە، بۆیە ئەو خراپەیەی، کە گەورەترە، دەبێت دوور بخرێتەوە بە هۆی تەحەمولکردنی ئەو خراپەیەی، کە کەمترەو بچووکترە (چونکە لە کاتێك دا، کە تۆ لەبەرانبەر دوو خراپەدا خۆت دەبینیتەوە، دەبێت تەماشا بکەی کامیان خراپەکەی زیاترە، ئەویان لە خۆت دوور بخەیەوەو ئەوەی، کە خراپەی کەمترە ، ئەویان تەحەمول بکەی، ئەگەر هیچ چارت نەبووو، دەبوو یەکێکیان هەر تەحەمول بکەی، وەك گوتراوە: (**احتمال أخف الضررين**) وە: (دَفع اعظم المفسَدَتين)، ئەوانە بنچینەی شەرعیین)، دوایی ئیبنو تەیمییە دەڵێت: زۆر کەم بووە، کە کۆمەڵێك لە دژی حوکمڕانێك دەرچووبن (واتە: بەرەنگاری بووبنەوە) مەگەر لە ئەنجامی دەرچوونیاندا خراپە و ئاشووبێك پەیدا بووە، کە گەورەتر لەو خراپە و زوڵم و شوێنەوارە بەدانەی، کە بە هۆی حوکمڕانییەکەیەوە لە نێو خەڵکدا هەبوون، (وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (ئیشەکەیان بنەتۆوی خۆی نەکردۆتەوە) وە(لەسەودایەکەیان دا قەرزار بوونەتەوە)، ئەمە ڕای یەکەمی زانایان بۆ چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ حوکمڕان دەستەلآتداریکدا، کە ستەمو خراپە و لادان دەکاتو ماف و ئازادییەکانی خەڵك پێشێل دەک بە ئاسانیی بۆیان لاناچێت، مەگەر بە بەکارهێنانی هێز و چەك، ئنجا ئەو بەشەی زانایان دەڵێن: نابێ هێزو چەك بەکاربێ ئەوەش بەڵگەکانیانە، کە خستمانە ڕوو.

**٢- بەڵگەکانی ئەوانەی دەڵێن: پێویستە کۆمەڵگا، ئەگەر بە پەنا بردن بـۆ هێزیش بێ، حوکمڕانێکی ستـەمکاری لار- کە ئـامادە نیـە ڕاست بێتەوە- لابدەن:**

بەشێکی دیکەی زانایان بە پێچەوانەوە، ڕایان وایە، کە لەو حاڵەتەدا نابێـت خـەڵك و کۆمـەڵگا دەستـەوستان دابنیشێو بێ دەنگـو بـێ هەڵوێسـت بـێ، بـەڵکو دەبـێ هـەوڵی گۆڕین و لادانی ئەو حوکمڕانە بـدەن، ئەگـەر بەبـەکارهێنانی هێـز و بـە تەحـەممولکردنی خوێنڕێژیی و کوشتاریش بێ، ئنجا ئایا ئەوانە کێن؟ لە ڕووی مێژوویی یەوە خاوەنانی ئەو ڕایە، بەشـێك لـە ئـەهلی سـوننەت (أهـل السـنة)ن و، تێکـڕای خـەواریجو زەیدییـەکان (الزيدية)و بەشێکی موعتـەزیلەن، هەڵبەتە (الخوارج) بۆیە ئەو ناوەیان لێنراوە، چونکە لـە دژی حوکمڕانە ستەمکارەکان یاخی بوونو دەرچوون، هەڵبەتە دیارە پیاوانی وەك (حسـين بن علي بن أبي طالب) (خوا لێیان ڕازی بـێ) کـە ڕای لەگـەڵ دەرچـوون دابـووە، هـەروەها پێشەوایانی دیکەی (أهل البيـت)، ئەوانە لە ڕاستییدا خاڵی هاوبەشی نێوان مسوڵمانانو هی تاقمو تایفەیەك نـین بـە تایبـەت، چـونکە ئـەهلی سـوننەتیش (حسـين بـن علـي)و هاوڕێنەکانی، خوا لە خۆی وبابی ڕازی بێ، بە پێشەوای خۆیان دەزانن، هەروەها (زيد بـن الحسين بن علي) بە هەمان شـێوە هـەروەها زۆرێـك لـە زانایـانی دیکـە لـە بنەماڵـەی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيـهِ وَسَلَم" کـە هـەمان ڕایـان هـەبووە، ئـەهلی سـوننەت و جەماعـەت بە پێشەوای خۆیانو بە زاناو بە دەمڕاستی خۆیانیان دەزانن و هی تائیفـەیـەك نین.

بەڵام دەبێ بزانرێ کە: ئەوانەی دەڵێن: پێویستە لـە دژی حـوکمڕان و دەسـتەڵاتداری ستەمکارو لادەر ڕاپەڕینو هەوڵبدەین لایبدەین، دەڵێن: بەمەرجێك، هێزمـان هـەبێ و لە خۆمـان ڕاببینین، چونکە ئەوە دیارە، کە ئەگەر هێز نەبێت، وەك خـــوا دەفـەرموێ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ...﴿٢٨٦﴾ ﴾البقرة: واتـە: خـوا لەسـەر هـیچ کەسـێك پێویست ناکات، ئەوە نەبێت، کە لە توانایـدا هەیـە، هـەموو عـاقڵمەنـدان لەسـەر ئـەوە یەکدەنگن، کە بەبێ هەبوونی هێزو بەبێ دەستڕۆیشتوویی و لە خـۆڕاببینین، دیـارە ئینسـان

خۆی لەبەر هیچ کارێك ڕاناكات.

ئنجا ئایە ئەم نە بەڵگەیان چییە بۆ ئەوە، کە ئەگەر حوکمڕان و کاربەدەستێ نی ستەمکار و لادەر بە قسەی خۆش‌و بەرەخنە لێگیران ڕاست نەبوونەوەو ئامادە نەبوون‌و گوێیان بۆ خەڵك نەگرت، ئەگەر لادانیان پێویستی بەبەکارهێنانی هێزیش کرد، مادام هێزەکە لە توانادا هەبێت، پێویستە لابدرێن؟! ئەوانیش چەند شتێك بەبەڵگە دێننەوە، کەبەندە،حەوت دەقی قورئان و سوننەتم لەو بەڵگانەی، کە ئەم بەشەی زانایان دەیانهێننەوە، بەنموونە هێناونەوە:

١- دەقی یەکەم: ئەم ڕستە قورئانییەیە، کە لە ئایەتی ژمارە (٢)ی سوورەتی (المائدة)دا هاتوە، خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) دەفەرموێ: ﴿...وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ (٢)﴾ واتە: وە هاوکاریی یەکدی بکەن لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی و هاوکاریی یەکدی مەکەن لەسەر گوناح و دەستدرێژیی ،وە پارێز لە خوا بکەن، بێگومان خوا تۆڵەی توندە.

کەواتە: دەبێ کۆمەڵگا هاوکاری یەکدی بێت بۆلابردنی ئەو حوکمڕانە لادەرو ستەمکارە، کە بێگومان ئەوە شتێکی چاکە و مایەی ڕەزامەندیی خوایە، ڕەزامەندیی خواش دیارە بەرهەمی تەقوایە، پاشان بەردەوام بوون لەسەر گوێڕایەڵیی بۆ حوکمڕانێکی ستەمکار بریتییە لە هاوکاریی کردنی لەسەر گوناح و دەستدرێژیی، چونکە هیچ حوکمڕانێك‌و هیچ دەسەڵاتدارێك، بە بێ هاوکاریی خەڵك و کۆمەڵگا، ناتوانێ لەسەر کورسی حوکم بەردەوامبێ، لە حاڵێکدا، کە خوا وەك چۆن هاوکاریی یەکدی لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی فەرز کردوە، بە پێچەوانەوەش هاوکاریی کردنی خەڵکی لەسەر گوناح و دەستدرێژیی، قەدەغە کردوە، دواییش هەڕەشەی کردوەو فەرموویەتی: ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ پارێز لە خوا بکەن (واتە: هاوکاریی کەس مەکەن لەسەر گوناح و دەستدرێژیی‌و بۆی مەبنە پردو دەستباریی لەگەڵ مەگرن) چونکە خوا تۆڵەو سزای توندە.

٢- دەقێكی دیكە: ئایەتەكانی ژمارە: (١٥١، ١٥٢)ی سوورەتی(الشعراء)ن، كە خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُطِيعُوٓاْ أَمۡرَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا يُصۡلِحُونَ ﴿١٥٢﴾) دیارە لەسەر زمانی صالح (علیه السلام) بۆ گەلی خۆی (سەموود) دەفەرموێ: فەرمانبەریی تێپەڕێنەران مەكەن، ئەوانەی كە خراپە لەسەر زەویدا دەنێنەوەو چاكە ناكەن.

كەواتە: هەركەس خراپەكار بێ و چاكەكار نەبێ، نابێ بەقسەی بكەین، یەكێك لە پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوا (علیه السلام) ئاوا ئامۆژگاریی گەلەكەی خۆی دەكات، هەموو ئەوەش، كە پێغەمبەران - علیهم الصلاة والسلام- فەرموویانە، مەگەر بەبەڵگەیەك بۆمان دەركەوێ، كە تایبەت بووە بەو كاتەوە، ئەگەرنا، ئەوەی كە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە قورئاندا، خوا لێی گێڕاونەتەوە بۆ هەموو لایەكمانە، چونكە خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) بە پێغەمبەر دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ ...﴿٩٠﴾ ﴾ الأنعام: دوای ئەوەی ناوی هەژدە (١٨) لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دێنێ، لە سیاقێكدا كە پێغەمبەری خاتەم دەدوێنێ، لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ئا ئەوانە، كەسانێكن كە خوا ڕێنماییكردوون، دە تۆش بە دوای ڕێنمایی‌و ڕێبازی ئەوان بكەوە. كەواتە ئێمە مولزەمین بەدوای پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بكەوین لەو بەهابەرزانەو، لەو حوكمە گشتییانەدا، كە هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) تێیاندا كۆكن و عەقڵی سەلیمیش دەلالەتیان لەسەر دەكات.

٣- دەقی سێیەم: ئایەتی ژمارە (١٢٤) سوورەتی (البقرة)یە، كە خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعالَى) دەفەرموێ: ﴿ وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِيۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾) واتە: كاتێك پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی بە چەند فەرمانێك تاقیكردەوە، ئەویش تەواوی كردن. (واتە: هەموو فەرمانەكانی خوای جێبەجێ كرد) (خوا) فەرمووی: دەتكێرم بە پێشەوا بۆ خەڵكی (مادام لە تاقیكردنەوە كان دەرچووی) فەرمووی: ئەدی لەوەچەكەم، ئایا لە

منداڵەکانم و نەوەکانم، ئەوانیش دەکەی بە پێشەوا؟) (خوا) فەرمووی: ﴿لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ستەمکاران پەیمانی من نایانگرێتەوە (کە بیانکەم بە پێشەوا بۆ خەڵك، چونکە شایستەی ئەوەنین، واتە: لەوەچە و لەنەوەکانی تۆ ئەوانەیان کە صاڵح بن، بەڵێ، بەلاّم ئەوانەیان، کە ناصاڵحو ستەمکار بن، نەخێر).

(ابن کثیر) ڕەحمەتی لێبێ، لە تەفسیرەکەی خۆیدا گوتوویەتی: (**لما جعل الله إبراهيم إمامًا، سأل الله أن تكون الأئمةُ من بعده من ذريته، فأجيب إلى ذلك وأخبر أنه سيكون من ذريته ظالمون، وأنه لا ينالهم عهد الله، ولا يكونون أئمة فلا يقتدى بهم وَقالَ (ابنُ خُويز منـدادَ المالِكي): الظالِم لا يَصلُح أن يَكونَ خَليفةً ولا حكماً وَلا مُفتياً ولا شاهِداً وَلا رَاوِياً**)[1] واتە: دوای ئەوەی خوا ئیبڕاهیمی کردە پێشەوا، داوای لە خوا کرد، کە پێشەوایان، لە دوای ویش لەوەچەی ویدا هەبن، خواش وەلاّمی بۆ ئەوەی دایەوە، بەلاّم هەواڵی پێدا ،کە لە وەچەی وی کەسانێك دەبن ستەمکار دەبن (واتە: گوناهبار دەبن) وە پەیمانی خوا نایانگرێتەوە (بەڵێن و پەیمانی خوا نایانگرێتەوە، با نەوەو وەچەی ئیبڕاهیمیش (علیه والسلام)بن، بۆیە ئەوان نابنە پێشەوا)، ئنجا (ابن کثیر) دەڵێت: (ابن خویز منداد)ی مالیکیی (کە یەکێکە لەزانایان) دەڵێت: ئینسانی ستەمکار شایستەی ئەوەنیە، کە خەلیفە، یان دادوەر، یان فەتوادەر، یان شاهید، یان ڕاوی بێ، (واتە: فەرمایشتی پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" بگێڕێتەوە) بە کەڵکی ئەوانە هیچیان نایەت.

٤- دەقێکی دیکە لەودەقانە، کە ئەم کۆمەڵە بەبەڵگەیان دێننەوە، لەسەر ئەوە، کە بەلای کەمەوە دروستە ،ئەگەر واجبیش نەبێ، کە لەگەڵ حوکمڕانانی ستەمکارولادەردا بە چەك وهێز ڕووبەڕوو ببیەوە، مادام بە قسەی خۆش و بە شێوازی دیکە لانەچوون، ئایەتی (٢٥)ی سوورەتی (الأنفال)ە، کە خوا (سُبْحانَهُ وَتعالَى) دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةً

[1]) المصباح المنير، ص ٩٨.

وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢٥﴾ واتە: خۆتان لە ئاژاوەیەك (یان لە بەلایەك) بپارێزن، کە تەنیا تووشی ئەوانەتان نابێ، کە ستەمیان کردوە، بزانن کە خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) تۆڵەی توندە! واتە: لەکۆمەڵگایەکدا، کاتێك دەستەیەکیان ستەم دەکەن (کە دیارە ئەوەی کاربەدەست و حوکمڕان نەبێ، ناتوانێ ستەم بکاتو ستەمکردن بەزۆریی لەگەڵ حوکمکردن دایە)، خەڵکەکەش بێ دەنگ دەبن، هەموویان پێکەوە سزا دەدرێن، بزانن کە خوا سزاو تۆڵەی توندە، واتە: خۆتان لە سزا و تۆڵەی خوا بپارێزن بە هۆی وەستانەوەتان لە دژی ئەوانەی، کە ستەم دەکەن، دەستیان بگرن مەهێڵن زوڵم بکەن، ئەگەرنا، خوا هەمووتان پێکەوە سزا دەدات.

(إبن کثیر) لە تەفسیری خۆیدا لەبارەی ئەم ئایەتەوە گوتوویەتی: (**يحذر تعالى عباده المؤمنين {فِتْنَةً} أي: اختباراً ومحنة، يعم بها المسيء وغيره، لا يخص بها أهل المعاصي ولا من باشر الذنب، بل يعمهما، حيث لم تدفع وترفع وقال: ابن عباس، في تفسير هذه الآية: أمر الله المؤمنين ألا يقروا المنكر بين ظهرانيهم فيعمهم الله بالعذاب**)[1] واتە: خوا، بەندە ئیماندارەکانی خۆی دەترسێنێو ورییایان دەکاتەوە لەبەلایەك، یانی: لەتاقیکردنەوەیەكو گرفتارییەك، کە خراپەکارو غەیری خراپەکاری پێ دەگرێتەوەو دەیگشتێنێ بەسەر هەمواندا، تەنیا ئەوانەیان کە گوناهبارن ناگرێتەوە، (تەنیا ئەوانەیان، کە ڕاستەوخۆ گوناهەکە دەکەن نایانگرێتەوە)، مادام ئەو خراپەو زوڵمە بنەبڕ نەکرابێو لانەبرابێت....

(عبداالله)ی کوڕی (عباس) خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا گوتوویەتی: خوا فەرمانی بە بڕواداران کردوە خراپە لە نێوان خۆیاندا نەهێڵنەوە و لێی بێدەنگ نەبن، ئەگەرنا ،خوا سزای هەموویان پێکەوە دەدات بەگشتی.

[1]) المصباح المنير، ص ٥٣٢.

٥- دەقێکی دیکە لەو بارەوە، ئایەتی ژمارە (١٨)ی سوورەتی (هود)ە، کە خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) دەفەرموێ: ﴿...أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾﴾ واتە: ئاگادار بن، نەفرینی خوا لەستەمکارانە، هەروەها لە سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتی (٤٤)یش دا دەفەرموێ: ﴿...أَن لَّعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾﴾ الأعراف. واتە: نەفرینی خوا لە ستەمکارانە، ئنجا ئایا کاتێك ستەمکار لەلایەن خواوە لەعنەتی لێکرابێ، چۆن شایستەی ئەوەیە، کە ببێتە حوکمڕان و پێشەواو مشوورخۆری مسوڵمانان و سەرپەرشتییان بکات؟!.

٦- دەقێکی دیکە لەوبارەوە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوایە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کە دەفەرموێ: {**«مَا مِنْ نَبِيّ بَعَثَهُ الله فِي أُمَّةٍ قَبْلِي إلاَّ كَانَ لَهُ مِنْ أُمَّتِهِ حَوَارِيّونَ و أَصْحَابٌ يَأْخُذُونَ بِسُنَّتِه وَيَقْتَدُونَ بِهَا، ثُمَّ يَخْلُفُ مِنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ وَيَفْعَلُونَ مَا لاَ يُؤْمَرُونَ، فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنَ الإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ»**}(أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٥٠))، پێشتریش ئەم فەرمایشتەمان هێنا، پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: هیچ پێغەمبەرێك نەبووە، کە لە پێش مندا خوا لە نێو کۆمەڵگاو ئۆممەتی خۆیدا ڕەوانەی کردبێ، مەگەر لە نێو کۆمەڵگاو ئۆممەتەکەیدا کەسانێکی تایبەت و هاوەڵانێکی دانستەی بووە، کە بە ڕێبازی ئەوەوە پابەند بوون و بە فەرمانی ئەو بەڕێوە چوون، دوایی پاشەبەرەیەکیان[1] هاتۆتە جێگا، کە شتێکیان گوتوە، کاریان پێ نەکردوە، وە شتێکیان کردوە، کە فەرمانیان پێ نەکراوە، ئنجا ئەوانە هەرکەسێك بەدەست لەبەرانبەریان بوەستێتەوە، ئەوە بڕوادارە،وە هەر کەسێ بە زمان لە دژیان بوەستێتەوە، ئەوە بڕوادارە، هەر کەسێك بە دڵ لە دژیان

[1] خُلوف: جمع خَلْف، ئەمیش بەمانای پاشینەی خراپە، پێچەوانەی (خَلَفْ) کە پاشینی چاکە، المعجم الوسيط، ص ٢٥١.

بوەستێتەوە، ئەوە بڕواداره،بەڵام دوای ئەوە (واتە: دوای ئەوەی کە بەدڵیش لە دژیان نەوەستێتەوە) بەقەدەر دەنکە خەرتەلەیەك ئیمان لەدڵی ئەو کەسەدا نیە!

کەواتە: ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" زۆر ڕوون و ئاشکرایە، کەدەبێ کەسانێك، کەلەڕێی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لادەدەن، بەدەست یانی: بەکردەوە بەرەنگارییان بکرێو ڕێیان لێ بگیرێ، بۆ کەسێك لە توانای دابێو بتوانێ، ئەوەی نەتوانێ بەزمان، بەلای کەمەوە کەسێك بەقسەش نەتوانێ لەبەرانبەریاندا بوەستێ، بەدڵو دەروونی بەرهەڵستییان بکات.

٧- دەقی حەوتەم وکۆتایی: ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوایە "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم": **{مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَده، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ}**(أخرجه أحمد برقم: (١١٤٧٨)، ومسلم برقم: (٤٩) وأبو داود برقم: (١١٤٠)، والترمذي برقم: (٢١٧٢) وَقَالَ: حسن صحيح، والنسائي برقم: (٥٠٠٨)، وابن ماجه برقم: (٤٠١٣)، وابن حبان برقم: (٣٠٧)) واتە: هەکامێك لە ئێوە خراپەیەکی بینی، با بەدەست بیگۆڕێ، ئەگەر نەیتوانی، با بەزمانی بیگۆڕێ، ئەگەرهەرنەیتوانی، با بەدڵی(دژی بێ)،ئەوەش بێهێزترین ئیمانە.

لەکۆتاییدا، (ابن الحزم الأندلُسي) ڕەحمەتی خوای لێبێ، لەو بارەوە وەك کۆکردنەوەی ڕای ئەو کۆمەڵە زانایە، کە ئەوە هەڵوێستیانە گوتوویەتی: (**والواجب إنْ وقع شيء من الجور وان قلَّ ان يُكَلِّم الإمام في ذلك ويمنع منه، فإن امتنع وراجع الحق وأذعن للقَود من البشرة أو من الأعضاء ولإقامة حد الزنا والقذف والخمر عليه فلا سبيل إلى خلعه وهو إمام كما كان لا يحل خلعه، فإن امتنع من إنْفاذ شيء من هذه الواجبات عليه ولم يراجعْ، وجب خَلْعُهُ وإقامة غيره ممن يقوم بالحق**)[1] واتە: هەرکات شتێك لە ستەم دەرکەوت، ئەگەر کەمیش بێ، لە لایەن حوکمڕانەوە، پێویستە قسە لەگەڵ ئەو حوکمڕان و پێشەوایەدا بکرێ و، پێشگیریی لێبکرێ، ئنجا ئەگەر قەناعەتی هات و گەڕایەوە بۆ هەق و ملی کەچکرد بۆ سزادانو تۆڵە، چ ڕوو لە پێستی بکات، یان ڕوو

[1] ) الفصل في المللِ والأهواء والنِّحل، ج٤ ص ١٧٥، ١٧٦.

ئەندامەكانی بكات (ئەگەر دزیی كردبێ، دەستی ببڕدرێ) وەملی كەچكرد بۆ ئەوە كە سزای زیناو سزای بوختانی داوێنپیسییو سزای شەڕابخۆریی بەسەردا بچەسپێندرێ، ئەوە ڕێگا نیە بۆ لادانیو، هەر بە پێشەوای مسوڵمانان لەقەڵەم دەدرێ، وەك پێشوو، نابێ لابدرێ، بەلاَم، ئەگەر لاملیی كرد، كە ئەو واجبانەی لەسەر جێبەجێ بكرێن، نەگەڕایەوە بۆحەق (واتە: ملكەچ نەبوو بۆ سزای شەرعیی) ئەوە پێویستە لابدرێو كەسێك كە حەق بەڕێوە دەبات، لە شوێنی دابنرێ. ئنجا (إبن حزم الأندلسي) هەر لەوبارەوە گوتوویەتی: **(هذا هو قول كثير من الصحابة والتابعين وهو قَولُ أبي حنيفة ومالك والشافعي وشريك وأصحابهم فان كل من ذكرنا من قديمٍ وَحديث إما ناطقٌ بذلك فَي فتواهُ وإما فاعلُ لذلك بسيلِ سيفِهِ في إنكار مارَأهُ منكراَ)**[1] واتە: ئا ئەوەی گوتمان: قسەی زۆرێك لە هاوەڵاَن و زۆرێك لە شوێنكەوتوانی هاوەڵاَنە و، قسەی ئەبو حەنیفەو قسەی مالیكو قسەی شافیعییو قسەی شوڕەیك و هی هاوەڵاَنیانە، چونكە هەركامێك لەوانە، كە باسما ن كردن، لە پێشكەوتووەكان و لە وانەی تازەتر، یان ئەوەتا بە فەتوا ئەوەی گوتوە، یا خود بە كردەوەو بەشمشێر هەڵكێشان و چەك ڕاكێشان بەشداریی كردوە، بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەوەی بەخراپو ناشەرعییان زانیوە.

كەواتە: ئەوە پوختەی هەردووك ڕایەكەیە، هەڵبەتە ئێمە پێویست دەكات لە باسی داهاتوودا بەراورد بكەین لەنێوان ئەو دووڕایەدا، پاشان هەڵسەنگاندنێك بكەینو بزانین داخۆ كام لەو دوو ڕایە ڕاستترنو، ئەو دوو كۆمەڵە دەقەش، كەهەركام لەو دوو ڕایە بەبەڵگەیان دێننەوە، چۆن پێكەوە كۆدەكرێنەوە، خوا پشتیوان بێ هەڵوێستی خۆمان لەو بارەوە ڕوون دەكەینەوەو ڕوونی دەكەینەوە، كە هیچ جۆرە تێكگیرانێك نیە لەنێوان ئەو دوو كۆمەڵە دەقەداو، ناگونجێ فەرمایشتەكانی خواو فەرمایشتەكانی پێغەمبەر "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَم" تێك بگیرێن، هەرچەندە بەڕواڵەت وادیارە، بەلاَم لە حەقیقەتدا وانیە، وەك ڕوونی دەكەینەوە.

---

[1]) سەرچاوەی پێشوو، ص١٧١، ١٧٢.

## بەراوردی نێوان هەردووك ڕایەكەو پێكەوە گونجاندن و كۆكردنەوەی دەقەكان:

خوێنەری بەڕێز! لە باسەكانی پێشوودا خستمانە ڕوو و سەلماندیشمان، كە خەڵكو كۆمەڵگە مافیانە، بەڵكو ئەركیشیانە، كە چاودێریی‌و لێپرسینەوە لەگەڵ حوكمڕان و دەستەڵاتدارانیاندا بكەن، لە كاتێكدا، كە لادەدەن و تووشی كەمتەرخەمیی‌و هەڵەو گوناح دەبن. هەروا باسمانكرد، كەئایا لەحاڵێكدا حوكمڕانێكی ستەمكارو لار لە خەڵك و كۆمەڵگا عاصیێ دەبێت‌و، بە قسەی خۆش و ڕەخنە لێگیران‌و بە ئاگاداركردنەوەی چەند جارە، نایەتەوەسەر ڕاستە شەقام و، پابەند نابێ بەشەریعەتەوەو لەسەر ستەم و خراپەی خۆی بەردەوام دەبێ، ئایا لەو حاڵەتەدا بەچەك و هێز دروستە لەگەڵیدا ڕووبەڕووی بیتەوە، یان نا؟

باسمان كرد، كە زانایان لەو بارەوە دوو ڕایان هەن: یەكیان دەڵێ: دەبێ هەر صەبر بگیرێ لەسەر ستەم و خراپەكەی، بەڵگەشیان ئەوەیە كە: ئەو شوێنەوارو دەرەنجامە خراپانەی، كە لەئەنجامی بەكارهێنانی هێز لە دژی ئەو حوكمڕانە ستەمكارەدا پەیدا دەبن، گەورەترو زیاترن لەو خراپەو زیانانەی، كە لە ستەم و لادانەكانی ئەو حوكمڕانەوە پەیدا دەبن، زیاتر ئەوە بە بەڵگە دێننەوە، وەك لە ڕابردوودا قسەیەكی ئیبنو تەیمییەم (ڕەحمەتی خوای لێبێ) لەوبارەوە هێناوە. ڕایەكی دیكەی زانایان دەڵێ: پێویستە بە چەك و هێز لەگەڵیاندا ڕووبەڕووببینەوە، مادام بەقسەی خۆش نەیەنەوە سەر ڕاستە هێڵ‌و بەشێوازی ئاشتییانە ڕاست نەبنەوە، پێویستە پەنا ببرێتە بەر هێزو زەبرو توندوتیژیی.

دیارە هەركام لەو دوو ڕایە،كە لە ڕابوردوودا بوون، ئێستاش هەركام لەو دوو ڕێڕەوە هەر هەن‌و، هەركامیشیان ژمارەیەك لەئایەتەكانی قورئان‌و فەرمایشتەكانی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بەبەڵگە دەهێننەوە، كە ئێمە لە ڕابوردوودا بەڵگەكانی هەردوو كۆمەڵەكەمان خستنە ڕوو، بەڵام لێرەدا ئیشكالێكمان بۆ دێتە پێش:

## ئیشکال‌و پرسیارەکەش ئاوایە:

یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: ئایا ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" پێکەوە تێك دەگیرێن و پێکەوە ناکۆکن؟ دیارە ئێمە دەڵێین: نەخێر هەرچەندە یەکێك لە زانایان، کە زانایەکی دیارە (إبن حزم الأندلسي) ڕەحمەتی خوای لێبێ، وای هاتۆتە بەرچاو، کە لە نێوان فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" جۆرێك لە تێکگیران هەیە لەو بارەوە، بۆیە لەکتێبی (الفِصَل في الملل والأهواء والنِّحل)دا باسی ئەوە دەکات، کە ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کە فەرمان بە ڕووبەڕوو بوونەوەو بەرەنگاربوونەوەی حوکمڕانانی ستەمکار دەکەن، ئەو فەرمایشتانەی دیکەیان نەسخ کردۆتەوە، کە فەرمانیان کردوە بە صەبرگرتن و پەنا نەبردنە بەر توندوتیژیی‌و بەرەنگار نەبوونەوە لەگەڵ حوکمڕاناندا، بەهێز، ئەو بەو شێوەیە خۆی لەو تێکگیران و ناکۆکییە ڕواڵەتییە دەربازکردوە، کە وای هاتۆتە بەرچاو لە نێوان فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" هەیە، بەلاّم من کە سەرنجی ئەم مەسەلەیەم داوە، نەك ئێستا، کە خەریکی نووسین‌و ئامادەکردنی ئەو باس و خواسانەم، بەڵکو زۆر لە مێژە لەو بابەتەم کۆڵیوەتەوەو، زۆر سەرنجی ئایاتەکانی قورئان‌و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" و سەرنجی قسەی زانایانیشم داوە، لە ئاکامدا گەیشتوومە ئەنجامێك، کە هیچ جۆرە تێکگیرانێك لەنێوان ئایەتەکان‌و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دا نیە، بەڵکو دەگونجێ هەموویان زۆر چاك بەیەکەوە کۆبکرێنەوە، بەلاّم پێش ئەوەی بێمە سەر چۆنیەتی پێکەوە کۆکردنەوەی ئەو دەقانەی قورئان وسوننەت، کە ئەو دوو کۆمەڵە دژ بەیەکە بەبەڵگەیان دێننەوە، بە پێویستی دەزانم سەرنجێکی قسەی حەوت لە زانایان‌و شارەزایانی ئیسلام بدەم، لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە، واتە: سەبارەت بە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ حوکمڕان و کاربەدەستانی لادەرو ستەمکارو لاڕێدا:

قسەو هەڵوێستى ژمارەيەك لە زانايان لەو بارەوە:

١/ يەكێك لەوانە (أبو حامد الغزالي) يە (ڕەحمەتى خواى لێبێ) لەكتێبى (إحياء علوم الدين)دا گوتوويەتى: (**أن السلطان الظالم عليه أن يكف عن ولايته وهو إما معزول أو واجب العزل فكيف يجوز أن يأخذ من يده وهو على التحقيق ليس بسلطان**)[1] واتە: حوكمڕانى ستەمكار، لەسەرى پێويستە واز لە حوكمڕانييەكەى بهێنێ، چونكە يان لادراوە، ياخود فەرزە لابدرێ، بێگومان (كەسێك كە ستەم بكاتو ستەمكار بێ) بە حوكمڕان دانانرێ. (واتە: ڕەوايەتيى (شرعية)ى لە دەستداوە)،كەواتە: چۆن دروستە كەسێك شتێكى لێوەربگرێ؟!

٢/ (فخرالدين الرازي) لەوبارەوە گوتوويەتى: (**أن الظالمين غير مؤتمنين على أوامر الله تعالى وغير مقتدى بهم فيها ، فلا يكونون أئمة في الدين، فثبت بدلالة الآية بطلان إمامة الفاسق**)[2] ئيمام فەخرەددينى ڕازيى لە تەفسيرى ئەو ئايەتەدا، كە پێشتر باسمان كردو لەكۆتاييەكەيدا خوا دەفەرموێ:﴿ ...لَا يَنَالُ عَهْدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾ ﴾البقرة، ستەمكاران پەيمانى من نايان گرێتەوە، دەڵێ : ستەمكاران ئەميندار نين لەسەر فەرمانەكانى خواى بەرزو پەيڕەوييشيان لێناكرێ، بۆيە بە پێشەواى دين دانانرێن، بە دەلالەتى ئەم ئايەتە چەسپا، كە حوكمڕانێتى باباى فاسق شتێكى بەتاڵەو ڕەوانيە.

٣/ (الشهرستاني) لە كتێبى (نهاية الأقدام في علم الكلام)دا دەڵێ: (**وإن ظهر بعد ذلك جهل أو جور أو ضلال أو كفر انخلع منها أو خلعناه**)[3] واتە: ئەگەر دواى ئەوە (واتە: لە پێشەواو حوكمڕان) نەزانينى لێدەركەوت، يان ستەمى لێدەركەوت، يان گومڕايى لێ دەركەوت، يان كوفرى لێ دەركەوت، ئەوە لە حوكمڕانێتى دەچێتەدەر، ياخود دەبێ دايبڕنين. (واتە: يان خۆى دادەڕنرێ بە ئۆتۆماتيكيى، مادام شايستە نەمابێ، يان ئێمە لەسەرمان پێويستە دايبڕنين.

---

[1] ) ج٢ ص ١١١.
[2] ) التفسير الكبير، ج٤ ص٤٧.
[3] ) ص٢٩٦.

٤/ (البغدادي) لە کتێبی (أصول الدين)دا، گوتوویەتی: (**وَمتى زاغَ عَن ذلكَ كانَتِ الأُمَّةُ عِياراً علَيهِ في العُدولِ بِهِ عَن خَطَئَهِ الى الصَّوابِ أو في العُدولِ عَنهُ إلى غَيرِهِ**)[1] کە پێشتریش ئەم دەقەمان هێنا، واتە: هەر کاتێك حوکمڕان لایدا لەوە (واتە: لەڕاستە شەقام لایدا) دەبێ ئۆممەت بەسەریەوە چاودێرو پێوەربێ، کە لەهەڵەوە بیهێنێتەوە بۆ ڕاستیی، یاخود: ئەو لا بداتو بەیەکێکی دیکەی بگۆڕی.

٥- (الجويني) لە کتێبی (الإرشاد الى قواطع الأدلة في أصول الإعتقاد)دا گوتوویەتی: (**ولايَجوزُ خَلعُهُ مِن غَيرِ حَدَثٍ وَ تَغَيُّرِ الأمرِ وَ هذا مُجمَعُ عَلَيهِ، فأما إذا فَسَقَ وَفَجَرَ وَخَرَجَ عَن سَمْتِ لإمامَةِ بِفِسقِهِ، فَانخِلاعُهُ مِن غَيرِ خَلعِ مُمكِنُ وَأن لَم يُحكَم بانخِلاعِهِ، وجَوازُ خَلعِهِ وَأمتِناعُ ذلِكَ وَتَقويمُ أودِهِ مُمكِنُ ما وَجَدنا إلى التَقوِمِ سبيلاً وَكلُ ذلكَ مِنَ المُجتَهَداتِ عِندَنا**)[2] واتە: دروست نیە بێ ئەوەی کەتنێکی کردبێ، یاخود بەبێ ئەوەی حاڵی گۆڕابێ، ئەو حوکمڕانە لابرێو دابڕندرێ، ئەوەش زانایان لەسەری یەکدەنگن (واتە: نابێت لەخۆوە لە حوکمڕان هەڵپێچرێ و بەهانەی پێ بگیرێ، بێ ئەوەی کە گۆڕانی بەسەردا هاتبێ) بەڵام ئەگەر لایدا و گوناهی کرد، یاخود لەوەی، کە پێویستە بۆ پێشەوایەتیی لەوە چووە دەرێ، بەهۆی لادان و گوناحیەوە، ئەوە بێئەوەی دابڕنرێ، داڕنرانەکەی شتێکی گونجاوە، هەرچەندە حوکمیش بەوە نەکرێ، (واتە: هەرچەندە هیچ کەسێك نەبێ بڵێ: تۆ حوکمڕان نەماوی، ئەوە لەواقیع و لە خودی خۆیدا بە حوکمڕانی مسوڵمانان لەقەڵەم نادرێ)، ئنجا دەڵێ: ئەوە کە ئایا لابرێ، یاخود لانەبرێو ڕاستبکرێتەوە، مادام ئەوە بگونجێ، هەموو ئەوانە لەو شتانەن، کە لەلای ئێمە جێگای ئیجتیهادن، (واتە: جێگای قسە تێدا کردنن)، واتە: بەلای (جوەینییەوە) دەگونجێ لێی بگەڕێی بمێنێتەوەو دەشگونجێ لای بەری‌و دووری بخەیتەوە لەکورسی حوکمڕانیی،کە من پێم وایە ئەو ڕایەی جوەینی لە هەموو ڕایەکان کۆدەکاتەوە.

---

[1]) ص٢٧٨.
[2]) ص٤٢٥، ٤٢٦،

٦/ (الباقلاني) لە کتێبی (التمهید)دا، گوتوویەتی: **(إن قال قائل ما الذي يوجب خَلْعَ الإمام عندكم؟ قيل له يوجب ذلك أمور: منها كفر بعد الإيمان، ومنها تركه إقامة الصلاة والدعاء إلى ذلك، ومنها عند كثير من الناس فسقه، وظلمه بغصب الأموال وضرب الأبشار، وتناول النفوس المحرمة، وتضييع الحقوق وتعطيل الحدود)**[1] واتە: ئەگەر بێژەرێك بڵێ: لەلای ئێوە چ شتێکی پێشەواو حوکمڕان، دەبێتە پاساوو بەڵگەی دارنین و لێسەندنەوەی حوکمڕانیی؟ دەگوترێ: ئەوەی ئەوە پێویست دەکات، چەند شتێکە:

١- دوای ئەوەی ئیمانی هێناوە، کافر بووبێتەوە (وە کوفری لێبینرابێ، یان بیسترا بێ).

٢- یەکێکی دیکە ئەوەیە، کە نوێژ بەرپا نەکات، یاخود خەڵك بانگ نەکات بۆ نوێژکردن.

٣- یەکێکی دیکە لەوانە - لەلای زۆرێك لەخەڵکی- ئەوەیە، کە تووشی فیسق ببێ (واتە: ئەو گوناهانە بکات، کە ئینسانیان پێ فاسق دەبێ، ئنجا دزییە، قەتڵە، شەراب خۆرییە، داوێنپیسییە...هتد)،

٤- هەروەها ئەگەر ستەم بکات: ماڵی خەڵك داگیر بکات، لە خەڵك بدات،ئەو نەفسانەی، کەخوا قەدەغەی کردوون لەبەینیان بەرێ، یاخود مافەکانی خەڵك بخواو بفەوتێنێ.

٥- یاخود سنوورەکانی شەرع پەك بخات، (واتە: سزا شەرعییەکان نەچەسپێنێ).

٧/ **(الإيجي)** لە کتێبی: **(شرح المواقف في علم الكلام)**دا، گوتوویەتی: **(وللأمة خلع الإمام وعزله لسبب يوجبه)** واتە: ئۆممەت بۆی هەیە پێشەوا (حوکمڕان) دابرنێ و لابدات بە هەر هۆکارێك، کە ئەوە پێویست دەکات، ئنجا **(الجرجاني)** هۆکارەکە ڕوون دەکاتەوەو دەڵێ: **(مثل: أن يوجد منه ما يوجب اختلال أحوال المسلمين،**

---

[1]) ص ١٦٤.

**وانتكاس أمور الدين، كما لهم نصبه وإقامته لإعلائها)**[1] واتــە: بــۆ وێنــە: كــە هۆكارێك لێی ڕوو بدات، ببێتە هۆی تێكچوونی حاڵی مســوڵمانان، یــاخود بــەرەو دوا گەڕانەوەی كاروباری دینــداریی، وەك چۆن بۆیــان هــەبووە كــە ئــەو پێشــەواو حوكمڕانە دانێن بۆ ئەوەی،كە كاروباری دیــن و دنیایــان بــۆ ڕێكبخــات، وەختێــك ببێتە مایەی ئەوە، كە كاروباری دینداریی‌و دنیاداریی مسوڵمانان تێك بچیٚ، بۆیان هەیە لایبەرن.

## چۆنیــەتــی كــۆكردنــەوەی دەقــەكان و پێكەوە گونجاندنیان و لابردنی ئیشكالەكە:

ئنجا بابێینە سەر باسی ئەوە: كەئایا چۆن چۆنی ئەو دەقانە بەیەكــەوە كۆدەكرێنــەوە؟ واتە: ئەو دووكۆمەڵە دەقە، كەهەركام لــەو دوو كۆمەڵــە زانایــە، بەشــێكیانیان بەبەڵگــە دەهێنانەوە، چۆن دەگونجیٚ پێكەوە كۆبكرێنەوە؟!

ئایا ئەو دوو ڕایە كامیان ڕاستە؟:

١- خۆڕاگریی‌و دان بەخۆداگرتن، لە بەرانبەر ستەمی حوكمڕان‌و لادانیدا.

٢- ڕاپەڕین‌و پەنابردنە بەرهێز لەدژی حوكمڕانی ستەمكارو لادەر.

لەوەلاٚمدا دەڵێین:-

یەكەم: لە ڕاستییدا ئایەتەكانی قورئان، زۆر بەڕوون و ڕاشكاویی ئەوەیان ڕاگەیانــدوە كــە ئینســانی ســتەمكارو لار شایســتەی حــوكمڕانیی و بەرپرســیارێتیی نیــە لــە نێــو مسوڵماناندا.

١- كــە خــوا دەفــەرمویٚ: ﴿...لَا يَنَالُ عَهْدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾﴾البقــرة، ســتەمكاران پەیمانی مــن نایانگرێتــەوە، خــوا بــە ئیــبڕاهیم (علیــه السلام) دەفــەرمویٚ: ئــەی ئیبڕاهیم! لەوەچەی تۆشــدا، كــە مەبەســتتە كەســانێك ببنــە پێشــەوا، پێشــەواو حوكمڕانان دەبن وكەسانێك دەبن، كــە سەرپەرشــتیی مســوڵمانان دەكــەن، بــەلاٚم

---

[1] ج٨ ص ٣٥٣.

پەیمانی من ستەمکاران ناگرێتەوەو شایستەی ئەوە نین ببنە پێشەوای ئیمانداران.

٢- پاشان ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿... أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾﴾ هود واتە: ئاگاداربن! نەفرینی خوا لە ستەمکارانە، ئایا کەسێك خوا لەعنەتی لێبکات، چۆن بەشایستەی ئەوەی دەزانێ، کە سەرپەرشتیی کاروباری مسوڵمانانی بخاتە دەست؟! شەریعەتێك لەعنەت لە زاڵم بکات، ئەو شەریعەتە چۆن ڕێگا دەدات ئەو زاڵمە ئەو شەریعەتە بەڕێوەبەرێ؟!! ئەوە شتێکی زۆر سەیرەو پێکەوە دژو ناکۆك (متناقض)ە!

٣- ئنجا خوا کە دەفەرموێ: ﴿...وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ...﴿٢﴾﴾ المائدة، حوکمڕانێك کە ستەم دەکات، ماف و ئازادییەکانی خەڵك پێشێل دەکات، دەستدرێژیی دەکات، دەست بۆ خوێن و نەفس و ماڵ و ناموسی خەڵك درێژ دەکات، ئایا ئەوە گوناحو دەستدرێژیی (إثم وعدوان) نیە؟ کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿...وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ...﴿٢﴾﴾ المائدة، هاوکارو دەستبارگری یەکدی مەبن لەسەر گوناح و دەستدرێژیی، واتە: ئەی خەڵك و میللەت! هاوکاری ئەو جۆرە حوکمڕانانە مەبن، کە گوناحو دەستدرێژیی دەکەن، کەواتە: کە لێی بێدەنگ بوونو بەقسەیانکردو صەبریان لەسەر خراپەو ستەمەکەی گرت، مانای وایە هاوکاری بوون.

٤- پاشان کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُطِيعُوٓا۟ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾﴾ الشعراء، فەرمانبەریی زێدەڕۆییکەرانو تێپەڕێنەران مەکەن. ئەوانەی، کە خراپە دەکەن لە زەویداو چاکە ناکەن، کەواتە: هەرکەسێك خراپەکاربێو چاکەکار نەبێ، نابێ بەقسەی بکرێو، بەدەقی ئایەت بە قسە کردنیو فەرمانبەریی بۆ کردنی قەدەغەکراوە.

٥- پاشان کەخوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّقُوا۟ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنكُمْ خَآصَّةً ۖ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٥﴾﴾ الأنفال، خۆتان لە بەلایەك، لە سزایەك بپارێزن ،کە تەنها تووشی ئەوانەتان نابێ، کە ستەمیانکردوە، بزانن

کە خوا سزاو تۆڵەی توندە. بەپێی سەرجەم ئەو ئایەتانە، بەڕوونو ڕاشکاویی خـوا پێمان دەفەرموێ: ئەگەر بێتو دەستی زاڵمان نەگرنو لەبەرانبەریانـدا نەوەسـتن، خوا پێکەوەو وێکڕا سزاتان دەدات، کەواتـە: شـتێك مسـوڵمانانی لەسـەر سـزا بدرێن، چۆن بەشتێکی ڕەواو شەرعیی دادەنرێ؟!.

دووەم: ئەوانەی ئەو ڕستە قوڕئانییەیان بەبەڵگە دەهێنایەوە - ئەوانەی کە دەیـانگوت: دەبێ بەهەر شێوەیەك بێ، پەنا نەبرێتەبەر چەكو هێزو شێوازی توند وتیژ بۆ لادانی حوکمڕانانێکی ستەمکار، کە بەقسەی خۆش وبە شێوازی ئاشتییانە لاناچن - ئەو ئایەتە قوڕئانییە کـە دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ...) ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! فەرمانبـەری خـوا بکـەنو فەرمانبەریی پێغەمبەربکەن، وە هی کاربەدەستانێك، کە لـە خۆتـانن ، جـا ئایـا ئەم ڕستە قوڕئانییە دەگونجێ بەبەڵگە بهێنرێتەوە بۆ ئەو ڕایەی، کـە دەڵـێ: دەبـێ صـەبر بگـیرێ لەسـەر سـتەمی حوکمڕانـەکانو لەشـەریعەت لادانیـانو مـاف پێشێلکردنیان؟! لەوەلامدا دەڵێین: نەخێر، چونکە:

أ/ فەرمانبەریی کردن بۆ خواو فەرمانبـەریی کـردن بـۆ پێغەمبـەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ڕێگا دەگرن لە فەرمانبەریی کردن بۆ حوکمڕانێکی ستەمکار لە حاڵێکدا، کە خوا لەعنەتی لەزاڵمان کـردوە، پێغەمبـەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" یـش وەك دوایی باسی دەکەینو پێشتریش باسمان کرد، دەفەرموێ: (دەسـتی زاڵـم بگـرنو بیگێڕنەوە بۆ حەق، ئەگەرنا خوا سزاتان دەدا) ئـەوە خـواو پێغەمبـەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئاوا دەفەرموون ،کەواتـە: خـوا کـە دەفـەرموێ: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ..) ئیمانداریـنـە! فەرمانبـەریی خـواو فەرمانبـەریی پێغەمبەرەکەی بکەن! بێگومان فەرمانبەریی کردنمان بـۆ خـواو بـۆ پێغەمبـەری خوا، ڕێگامان لێدەگرێ، کە فەرمانبەریی بکەین بۆ حوکمڕانێکی ستەمکار.

ب/ وشەی: لە خۆتان (منکم) بەڵگەیە لە سەر جـۆری ئـەو حوکمڕانـەی، کـە پـاش پابەندیی بەقورئانو سوننەتەوە، فەرمانبەریی بۆ دەکرێ، چونکە خوا دەفـەرموێ:

(...وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ...) فەرمانبەریی بکەن بۆکاربەدەستانێك، کە لە خۆتانن، لە (خۆتانن ) واتە: وەك ئێوە پابەندن بە قورئانو سونەتەوەو، ملکەچن بۆ خواو بۆ پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" نەك هەرکەسێك ڕاست بووەو دەستەلاتی هەبوو، ستەمکاربێ، دادگەر بێ، چاك بێ، خراپ بێ، هەر بە قسەی بکەین! شتی وا لە شەریعەتی ئیسلامییدا نیە.

ج- ڕستەی (...فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴿٥٩﴾) ئەگەر لە شتێکدا کەوتنە ناکۆکیی یەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئەگەر بڕواتان بە خواو بەڕۆژی دوایی هەیە، دیسان ڕێگرە لەو جۆرە بەڵگا هێنانەوەیە بەو ڕستە قورئانییە، بۆچی؟ چونکە دوای ئەوەی لە ئەنجامی ستەم و لادانی حوکمڕانەکەدا، ناکۆکیی لە نێوانی کۆمەڵگاو حوکمڕاناندا پەیدادەبێ، خوا دەفەرموێ: ئەی خەڵك و کۆمەڵگا! هەرکاتێك لەگەڵ حوکمڕانو کاربەدەستاندا کەوتنە ناکۆکیی، بیگێڕنەوە بۆلای خواو پێغەمبەر"صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئنجا کاتێك ئەو ناکۆکییە دەگێڕینەوە بۆلای قورئانو سوننەت، قورئان دەفەرموێ: لەعنەتی خوا لە زاڵمان واتە: قورئان حوکم دەدا بەسەر ئەو حوکمڕانە زاڵمەداو دەفەرموێ: تۆ لەعنەتی خوات لێیەو بەکەڵکی ئەوە نایەی مشوور خۆر و سەرپەرشتیار و حوکمڕانی مسوڵمانان بی!.

هەروەها فەرمایشتی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" یش دیسان ڕێ دەگرێ لەوە، کە بابای ستەمکار حوکمڕانی مسوڵمانان بێ، چونکە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: دەستی حوکمڕانی ستەمکار بگرنو لەبەرانبەریدا بوەستن، دەفەرموێ: هەرکەسێك بەدەست لە دژی ئەوانە بوەستێتەوە، ئیماندارە، هەرکەسێك بە زمان لە دژیان بوەستێتەوە، ئیماندارەو هەرکەسێك ئەگەر نەیتوانی، بەدڵیش لە دژیان بێ، هەر ئیماندارەو لەدوای ئەوە بەقەدەر دەنکە خەرتەلەیەك ئیمان نیە، واتە: کاتێك ئێمە ئەو ناکۆکییە دەگێڕینەوە بۆ لای

تەرازووی قورئان و سوننەت، ئاوا حوکم دەدەن، کەواتە: چۆن دەگونجێ ئەو ڕستە قورئانییە بەبەڵگە بهێنرێتەوە لەسەر ئەوە کە حوکمڕانان ، با ستەمیش بکەن‌و با خراپەکاریش بن‌و لادەریش بن، دەبێ هەر صەبریان لەسەر بگرین و بەچەك و هێز لە دژیان نەوەستینەوە و بەرەنگاریان نەبینەوە ؟! لەڕاستییدا ئەو ڕستە قورئانییە، بە هیچ شێوەیەك ناگونجێ ئەو بەڵگەیەی پێ بهێنرێتەوە.

سێیەم: هەرکام لەو فەرموودەیەی، کە پێشتر بەتەواویی هێنامان‌و دەفەرموێ: {«مَا مِنْ نَبِيٍّ بَعَثَهُ اللهُ فِي أُمَّةٍ قَبْلِي إلاَّ كَانَ لَهُ مِنْ أُمَّتِهِ حَوَارِيّون وَأَصْحَابٌ يَأْخُذُونَ بِسُنَّتِهِ وَيَقْتَدُونَ بِهَا ثُمَّ يَخْلُفُ مِنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ وَيَفْعَلُونَ مَا لاَ يُؤْمَرُونَ فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَيْسَ وَرَاءَ ذلِكَ مِنَ الإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ»} (أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٥٠))، وە فەرموودەی: {مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَده، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ} (أخرجه أحمد برقم: (١١٤٧٨)، ومسلم برقم: (٤٩) وأبو داود برقم: (١١٤٠)، والترمذي برقم: (٢١٧٢) وَقَالَ: حسن صحيح، والنسائي برقم: (٥٠٠٨)، وابن ماجه برقم: (٤٠١٣)، وابن حبان برقم: (٣٠٧))، بەڵێ هەرکام لەو دوو فەرموودەیە زۆر ڕوون‌و ڕاشکاوە، لەوبارەوە کە پێویستە خەڵك‌و کۆمەڵگا، بەدەست هەوڵی لابردن‌و نەهێشتنی ستەمکاران‌و خراپەکانیان بدەن، مادام لە توانایاندا هەبێ، مادام بەقسەی خۆش نەیەنەوە سەر ڕاستە هێڵ، چونکە زۆر بە ڕوونیی لە فەرمایشتەکەی یەکەمدا دەفەرموێ: {فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ} (أخرجه أحمد برقم: (٤٣٧٩)، ومسلم برقم: (٥٠))، واتە: هەرکەس بەهێز ڕووبەڕوویان بێتەوە ئیماندارە، وەك دەبینین: دەستی پێش خستوە! ئنجا فەرمایشتەکەی دیکەش، کە دەفەرموێ: {مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَده} واتە: هەرکەسێك لە ئێوە خراپەیەکی بینی، با بە دەست بیگۆڕێ، واتە: بە هێز لەگەڵی ڕوو بەڕوو بێتەوە، واتە: باشترین پلەی جیهاد لە دژی حوکمڕانی ستەمکار ئەوەیە، کە تۆ بەهێز نەهێڵی ئەو ستەم‌و خراپەیە بکات.

چوارەم: ئنجا ئایا مەبەست لەو فەرمایشتانە چییە، کە فەرمان دەکەن بە خۆڕاگریی‌و دەست بۆ هێز نەبردن لەبەرانبەر ستەم و خراپە و لادانی حوکمڕانانی ستەمکارو لاردا؟ لەوەلاّمدا دەڵێین: پێویستە ئەو مەتەڵە لێرەدا حەل بکرێ، ئەویش بەوە دەبێ کە هەرکام لەو فەرموودانە لە سیاق‌و شوێنی خۆیدا دابنرێ، بابزانین چۆن؟! جارێ ئەو فەرمایشتانەی، کە فەرمان دەکەن بەوەی دژی ستەم ڕاوەستین‌و بەگژ ستەمکاراندا بچینەوەو یەخەیان بگرین‌و، بەدەست‌و بەهێز لەگەڵیان ڕووبەڕوو ببینەوە، زۆر ڕوون و ڕاشکاون، ئایەتەکانیش لە پێش فەرمایشتەکاندا ڕوون و ڕاشکاوتریشن، بەلاّم ئایا مەبەست لەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئەوانەی، کە لەڕووی سەنەدەوە صەحیحن، ئایا مەبەست لەو فەرموودانە چییە؟ کە پێغەمبەر دەفەرموێ: صەبر بگرن، لەسەر ستەم و ماف پێشێلکردن‌و خراپەکردن‌و لادانی حوکمڕانان؟! لەوەلاّمدا دەڵێین: جارێ شتێکی مەحاڵ‌و نەگونجاوە، کە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" شتێك بفەرموێ، لەگەڵ قورئاندا ناکۆك بێ، یاخود شتێك بفەرموێ ،کە لەگەڵ فەرمایشتی خۆیدا ناکۆك بێ، هەرگیز شتی وا نابێ‌و ناگونجێ، بەڵێ، ناگونجێ پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە لایەکەوە بفەرموێ: بە دەست و هێز ڕوو بە ڕووی کاربەدەستانی ستەمکار و خراپەکار ببنەوە، وەك لەم فەرمایشتانەوە دیارە:

١/ {فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ}(أخرجه أحمد برقم: (٤٣٧٩)، ومسلم برقم: (٥٠))،

٢/ {مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَده...}(أخرجه أحمد برقم: (١١٤٧٨)، ومسلم برقم: (٤٩) وأبو داود برقم: (١١٤٠)، والترمذي برقم: (٢١٧٢) وَقَالَ: حسن صحيح، والنسائي برقم: (٥٠٠٨)، وابن ماجه برقم: (٤٠١٣)، وابن حبان برقم: (٣٠٧))،

٣/ {كَلاَّ، وَاللهِ لَتَأمُرُنَّ بالمَعْرُوفِ، وَلَتَنْهَوُنَّ عَنِ المُنْكَرِ، وَلَتَأخُذُنَّ عَلَى يَدِ الظَّالِمِ، وَلَتَأطِرُنَّهُ عَلَى الحَقِّ أطْراً، وَلَتَقْصُرُنَّه عَلَى الحَقِّ قَصْراً، أَوْ لَيَضْرِبَنَّ اللهُ بقُلُوبِ بَعْضِكُمْ عَلَى بَعْضٍ، ثُمَّ لَيَلْعَنكُمْ كَمَا لَعَنَهُمْ}(أخرجه أبو داود برقم: (٤٣٣٦)، والبيهقي برقم: (١٩٩٨٣) قال الشيخ الألباني: ضعيف).

٤/ {«إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوْا الظَّالِمَ فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمْ اللهُ سُبْحَانَهُ بِعَذَابٍ مِنْ عِنْدِهِ»} (أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٤٣٣٨)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٢١٦٨) وَقَالَ: صَحِيح، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٤٠٠٥)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (١٥٦٤))[1]

بەڵێ مەحاڵە لەلایەکەوە پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" ئاوا بفەرمویٚ، لەلایەکی دیکەشەوە بفەرمویٚ: لێیان گەڕێن و بیر لە بەکارهێنانی هێز مەکەنەوە، واتە: لەدژی حوکمڕانانی لادەرو ستەمکار!!

هەڵبەتە هەر ئەوەشە، کەوەك پێشتریش گوتمان: (إبن حزم) ڕەحمەتی خوای لێبێ، ناچار کردوە، کە پەنا بەرێتە بەر بیرۆکەی (منسوخ )بوونی ئەو فەرمایشتانەی، کە فەرمان دەکەن بەخۆڕاگریی و پەنا نەبردنە بەر هێزو، بڵێ: ئەو فەرموودانەی دیکە، کە گوتوویانە: پەنابەرنە بەر هێزو دژی ستەمکار بوەستنەوە، ئەوانە (ناسخ)ن‌و حوکمی ئەوانی دیکەیان نەهێشتوە! بەلاٚم من پێموایە دەبێ بەم شێوەیە ئەو دەقانەی قورئان و سوننەت بەیەکەوە کۆبکرێنەوەو، ئەمەی خوارەوە ئەنجام و پوختەی لێکۆڵینەوەی دوورو درێژی بەندەیە لەو بارەوە، کەمن لە پێنج خاڵدا دەیخەمە ڕوو:

## ڕای بەندەبۆچۆنیەتی پێکەوە گونجاندنی ئەودووجۆرە فەرمایشتانە:

١) مەبەست لەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" کە فەرمان دەکەن بە خۆڕاگریی و پەنا نەبردنە بەر هێز، ئەوەیە، کە لەکاتێکدا حوکمڕان تووشی هەڵەیەك و دوان دەبێ، نابێ شێوازی توندو تیژ لە دژی بەکار بهێنرێ، بەڵکو پێویستە بەخۆڕاگریی‌و دان بەخۆداگرتن‌و شێوازی نەرم‌و ئاشتییانە، عەیب‌و کەم‌و کوڕییەکانی چارەسەر بکرێن.

بەلاٚم ئەو فەرمایشتانەی دیکە، کە فەرمان دەکەن بە گۆڕینی حوکمڕانان و ڕوو بەڕووبوونەوە لەگەڵیانداو بەکارهێنانی هێزو شێوازی توند و تیژ، مەبەست پێیان

[1]) پێشتر ئەو فەرمایشتانەمان هێناو ماناشمان کردن، بۆیە لێرە ماناکردنیانمان دووبارە نەکردەوە.

ئەو حوكمڕانانەن، كە بەردەوام دەبن لەسەر ستەمكاریی‌ولادانو، دەیكەن بە شێوازو نەریتی حوكمی خۆیان و زولم دەكەن بەعادەت، ئەوە نیە جارێك و دووجاربێ ، هەڵەیەك بێ كردبێتیو دوو هەڵە بێو دوایی ڕاست بێتەوە، حوكمڕان مادام ئامادەیە ڕاست بێتەوە، دوای ئەوەی هەڵەیەكو دوان دەكات، پێویست ناكا سەنگەری لێبگرین، بەڵام وەختێك ئەو سەنگەر لە دژی شەریعەتو لە دژی خەڵكو جەماوەرو، لە دژی بەرژەوەندییەكانی خەڵك دەگرێ، بڕیاری كۆتایی دەدا، كە: دەست لە زولم وستەم هەڵناگرێ، ئەوە ئەو فەرمایشتانەی دیكەی پێغەمبەر "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَم" كە دەفەرموێ: بەچەك و هێز بە گژیدا بچنەوە، ئەوە مەبەستی ئەو جۆرەیانە، واتە: فەرمایشتەكانی پێغەمبەر "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَم" بۆ دوو حاڵ گوتراون:

أ- حاڵەتێكیان: حوكمڕانێك كە هەڵەیەكو دوان دەكاتو لادەدات، بەڵام نەیكردوە بە عادەتێكی هەمیشەیی و ئەگەری ئەوەی هەیە ڕاست بێتەوە، ئەوە پێویست ناكات بەچەكو هێز، سەنگەری لێبگیرێو پەنا ببرێتە بەر بەرەنگاربوونەوە .

ب- حاڵەتێكی دیكە هەیە، كە بابای حوكمڕان بڕیاری داوە لەسەر ستەم و لادانی خۆی بەردەوام بێ و، ئامادە نیە لە كەلی شەیتان دابەزێ، ئەوەیان دەبێ بەو شێوەیەی دیكە مامەڵەی لەگەڵدا بكرێ، وەك گوتراوە: (لكل مقام مقال).

٢/ دەشگونجێ مەبەست لە خۆڕاگریی‌و دەست بۆ هێز نەبردن كاتێك بێ، كە هەل و مەرج گونجاو نەبێو گۆڕانكاریی لە تواناد‌ا نەبێ، ڕێ پێدرانیش (واتە: ڕێپێدرانی بەكارهێنانی هێزو شێوازی توندو تیژیی) بۆ كاتێك بێ ،كە هەل و مەرج گونجاو بێ و توانای گۆڕانكاریی هەبێ، كەواتە: پێغەمبەر "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَم" بۆ حاڵەتێك كە هەل و مەرج گونجاو نیە بۆ لادانی ئەو حوكمڕانەو هێزو ئیمكانیەت نیە، دەفەرموێ: صەبر بگرن!،بەڵام كاتێك هەلو مەرج دەڕەخسێ و مسوڵمانان توانایان هەیە، دەفەرموێ: بە هێز لە گەڵیدا ڕووبەڕوو ببنەوە! كەواتە: هیچ تێكگیرانێك لە نێوان ئەو دوو جۆرە فەرمایشتانەدا نیەو پێغەمبەر "صَلَی الله عَلَیهِ وَسَلَم" بۆ حاڵەتێكیان وای فەرمووەو بۆحاڵەتێكی دیكەی جیاواز، ئەوەی دیكەی

فەرمووە، وەك گوتراویشە: فەتوا بە پێی كاتو حاڵ و شوێن و بارودۆخ دەگۆڕێ **(الفتوى تختلف زماناً ومكاناً وحالاً وظرفاً)**.

٣) ئنجا ئەگەر گۆڕانكاریی و ڕووبەڕووبوونەوە لە توانادا نەبێ، یان زیانی لە قازانجی زیاتر بێ، ئەوە ئەو زانایانەش، كە دەڵێن: پێویستە بەرەنگاریی هەبێ دەڵێن: لە حاڵێكی وادا دەبێ صەبر بگیرێ و چاوەڕوانیی بكرێ، واتە: ئەو زانایانەش كە بڕوایان بەبەكارهێنانی هێز و چەك و شێوازی توندو تیژیی هەیە، بۆ لادانی حوكمڕانی ستەمكارو لار، ئەوانیش دەڵێن: ئەگەر بزانرێ: زەرەری لە قازانجی زیاترەو بنەتۆوی خۆی ناكاتەوەو خەڵكو كۆمەڵگا لەسەری قەرزار دەبنەوە، وا باشترە دان بەخۆدا بگیرێ و خۆڕاگریی بكرێ.

٤) بەڵام لە هەموو حاڵاندا، پێویستە گوتنی حەق و فەرمان كردن بەچاكە و ڕێگریی كردن لەخراپە، بە زمان، یان بەلای كەمەوە بەدڵ، هەر هەبێت، واتە: هەموو زانایان لە هەموو حاڵاندا لەسەر ئەوە یەك دەنگن،كە پێویستە گوتنی حەق و فەرمان بەچاكە و ڕێگریی لەخراپە، هەر هەبێ، ئەوەی كە تێیدا كەوتوونە ڕاجیایی یەوە، بەكارهێنانی هێزەو، بەرەنگار بوونەوەی كردەیی یە، ئەویش لەبەر ئەوە، كە حاڵەتەكان جیا جیانو جاری وایە مسوڵمانان لە توناییاندا هەیەو، جاری وایە لە توناییاندا نیە،وە جاری وایە حوكمڕانەكە شایستەی ئەوەیە لابردرێو، جاری وایە ئومێدی ئەوە هەیە، كە چاك بكرێ، هۆكاری ڕاجیایی زانایان لەوبارەوە ئەوەیە، فەرمایشتەكانی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمْ"یش، كە جارێك وای فەرمووەو جارێك وای فەرمووە، هەر لەبەر ئەوەیە، كە جارێك حاڵەتەكە ئاوایەو جارێكی دیكە حاڵەتەكە بە جۆرێكی دیكەیە. ئنجا زانایان لەوبارەوە بنچینەیەكی شەرعییان هەیە، دەڵێ: **(لا يَسقُطُ الْميسُورُ بِالْمَعسُورِ)** واتە: ئەوەی كە بە ئاسانیی دەكرێ لەسەرت لاناچێ بە هۆی ئەوەوە، كە بە زەحمەت نەبێ بۆت ناكرێ، واتە: تۆ دوو ئەرك ڕووت تێدەكەن: یەكێكیان بەزەحمەت دەكرێ، یان هەر ناكرێو ئەوی دیكەش بەئاسانیی بۆت دەكرێ، ئنجا ئەوەی كە بە ئاسانیی دەكرێ، دەبێ بیكەی، ئەوەش كە بۆت ناكرێ لەسەرت نیە، بۆ وێنە: گوتنی قسەی حەق و

فەرمان بەچاکە و ڕێگریی لە خراپە بەزمان، بە نووسین، بە خۆ پیشاندان، بە هەموو شێوازەکان، ئەوە زۆرجاران دەکرێ و ئاسانە، ئنجا ئەگەر سەنگەر گرتن لەزاڵم زەحمەت بوو، ئەوە ئەوانی دیکە بەزۆریی هەر دەکرێن، بۆیە ئەوەی دەکرێ با ئەنجام بدرێو ئەوەی، کە ناشکرێو لە ئیمکان دا نیە، ئەو کاتە مسوڵمانان گوناهبار نابن.

٥) هەروەها هەموو زانایانیش لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە لە کاتی بینینی کوفری ئاشکرا و بێ پێچ و پەنادا، بابای حوکمڕان فەرمانبەریی بۆ ناکرێ، وەك لە فەرموودەکەی پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ" دا، کە بوخاریی‌و موسلیم هێناویانەو پێشتر هێنامان، هاتوە: (**إِلاَّ أَنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا عِنْدَكُمْ مِنَ اللهِ فِيهِ بُرْهَانٌ**) واتە: مەگەر کوفرێکی ئاشکراو بێ پێچ و پەنا ببینن، کە لە لایەن خواوە بەڵگەتان لەسەری هەیە، بەڵێ، هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کاتێك کوفری بێ پێچو پەناو ئاشکرا بینرا، بەهیچ شێوەیەك درووست نیە فەرمانبەریی بۆ ئەو حوکمڕانە بکرێ، بەڵکو دەبێ ڕاپەڕین لە دژی بەرپا بکرێ. لە فەرمایشتەکاندا ئەم تەعبیرە هاتوە: (**إِلاَّ أَنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا عِنْدَكُمْ مِنَ اللهِ فِيهِ بُرْهَانٌ**) مەگەر کوفرێکی بێ پێچ و پەنا و ڕوون و ڕاشکاو ببینن، کە لەلایەن خواوە بەڵگەتان لەسەری هەبێ، لە فەرمایشتێکی دیکەدا ئەمە هاتوە (لا، ما أقاموا فيكم الصلاة) نەخێر، لە دژیان مەوەستن هەتا نوێژتان لە نێودا بەرپا بکەن. کەواتە: کاتێك کە حوکمڕانانێك بەسەر مسوڵمانانەوە حاکم بوون، نوێژیان بەرپا نەکردو، کوفری ئاشکرایان لێ بینرا، ئەوە هیچ زانایەك نیە لە زانایانی ئیسلام کە نەیگوتبێ: لە دژیان ڕاپەڕن و هەوڵ بدەن بیانگۆڕنو بەرەنگاریان ببنەوە، بە مەرجێك کە هێز لە توانادا هەبێ و، هەل و مەرجەکە ڕەخساو بێو بزانرێ، کە ئەوەی دەکرێ، مسوڵمانان لەسەری قەرزدار نابنەوەو، زیانی لە قازانجی زیاتر نابێ.

دیارە ئێمە لێرەدا گەیشتینە کۆتایی توێژینەومان دەربارەی نۆیەمین بنەمای سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی، بەڵام ئەوەی کە دەمەوێ لە کۆتایی ئەم

توێژینەوەیەدا بیڵێم، ئەوەیە: کە هیچ گومانی تێدانیە، ئەو مەسەلانەی کە زانایانمانو پێشەوایانمان تێیاندا کەوتوونەتە ڕاجیاییو مشتومڕەوە، لەبەر ئەوەیە کە دەقەکانی قورئان و سوننەت ، یان ڕۆشن نین لەو بارەوە، یاخود لە چۆنیەتی جێبەجێ کردنی دەقەکانی قورئان و سوننەت بەسەر ئەو واقیعەدا، کە تێیدا بوون، لەوەدا ڕاجیاییان بووە، مەبەستم ئەوەیە، ئایەتەکان زۆر ڕۆشنن، کە خوا دەفەرموێ: ستەمکاران لەعنەتیان لێیە، وەخوا دەفەرموێ: ئینسانی ستەمکار پەیمانی من نایگرێتەوە، پێغەمبەریش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: خەڵکی ستەمکار و حوکمڕانی ستەمکار، دەبێت یەخەی بگیرێو دەستی بگیرێو ڕێی لێ بگیرێو جیهادی لەبەرانبەردا بکرێ، ئەدی بۆچی زانایان کەوتوونەتە ڕا جیاییەوە؟ لە ڕاستیدا دوو هۆکاری سەرەکیی بۆ ئەوە هەن:

**یەك:** هەندێك فەرمایشتی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" هەن، بۆ حاڵەتێکی دیکەی فەرمووون، ئنجا جاری وایە هەندێك لەزانایان دێنن، ئەو حاڵەتانە تێکەڵ دەکەن، یاخود لێیان تێکەڵ دەبنو، لەئەنجامی ئەوەدا ئەو تێککگیرانە ڕواڵەتییە دروست دەبێ، ئەگەرنا ئەگەر بێتو ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کە بۆ حاڵەتێکی فەرمووە، ئەو فەرمایشتە بۆ ئەو حاڵەتە بکرێتە یاساو بنچینەو ئاوا مامەڵە بکرێ، وە فەرمایشتێکی دیکەی، کە بۆ حاڵەتێکی دیکە فەرمووە، ئەویش لە شوێنی خۆیدا بەکار بهێنرێ، وەك گوتراوە: (لكل مقام مقال)، ئەو کاتە ئەو تێککگیران و ناکۆکییە ڕواڵەتییە ڕوونادات.

**دوو:** نابێ گومانیشمان لەوەدا هەبێ بە ڕاستی واقیعێك، کە مسوڵمانانو زانایانیشمان تێیدا ژیاون، کەم و زۆر فشاری هەبووە لەسەر زانایانمانو لەسەر شێوەی تێگەیشتنیان لە ئایەتەکانو شێوەی تێگەیشتنیان لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" چونکە وەك لە ڕابورددووشدا باسمان کرد، کاتێك کە زانایان دەڵێن: بۆ دانانی حوکمڕانی مسوڵمانان، بەتایبەت کەسی یەکەم، سێ ڕێمان هەن:

١- بەیعەت پێکردنی لەسەر بناغەی ڕاوێژ.

٢- وەصیەتکردنی باب بۆ کوڕ (**ولاية العهد**).

٣- حوکمڕانێتی زاڵبوو (**ولاية المتغلب**).

کاتێك ئێمە ئەوە دەخەینە تەرازووی قورئان و سوننەتەوە، تەماشا دەکەین لەشەریعەتدا تەنیا ڕێی یەکەمیان شەرعییە، ئەویش ئەوەیە، کەحوکمڕان مسوڵمانان بۆ خۆیان هەڵیبژێرن، بەپێی بنەمای: (وَأَمْرُهُمْ شُورى بَيْنَهُمْ) کاروباریان لەنێو خۆیاندا بەڕاوێژە، بەلاّم ئەدی ئەو دوو ڕێیەی دیکەیان لە کوێوە هێنان؟!

بێگومان هۆکارەکەی ئەوە بووە، کە تەماشایان کردوە حوکمڕانانی (ئومەویی‌و عەبباسی) وەصیەت دەکەن بۆ کوڕەکانی خۆیان، ئەو زانایەش، کە ئەو کتێبەی نووسیوە لەو کاتەدا، تەماشا دەکات سیستەمی حوکمڕانیی بەو شێوەیە، بۆیە ئەگەر گوتبای: تاکە ڕێی دانانی حوکمڕان بەڕاوێژو بەبەیعەت پێدانی ئازادانەیە، لەگەڵ واقیعەکە تێك دەگیراو ئەو واقیعەش زەختێکی سیاسی لەسەر دروست کردوە، ئنجا زانایانیش دیارە فریشتەی بێ هەڵە نەبوون‌و کەم‌و زۆر شێوەی تێگەیشتنیان بۆ هەندێك مەسەلە کارتێکراو (متأثِّر) بووە بەو واقیعەی تێیدا ژیاون، بەتایبەتی مەسەلەیەك کە دەقی ڕوون و ڕاشکاوی لەسەر نەبێ، ئاشکراشە کە لەدەقەکانی قورئان و سوننەتدا، بەڕوون و ڕاشکاویی‌و بە بێ پێچ و پەنایی، باسی ئەوە نەکراوە ،کە چۆن چۆنی حوکمڕانان هەڵبژێررێن؟ بەڵێ، چوا چێوەیەکی فراوان دیاریی کراوە، بەلاّم نوختە نەخراوەتە سەر پیت، لەبەر ئەوە بواری هێنان‌و بردن‌و مشتومڕی تێدا هەبووەو، واقیعەکەش زەختی لەسەریان هەبووە، ئەگەرنا (ولاية المتغلب) کە هەندێکیان کردوویانە بەبنچینە: (مَنِ اشْتَدَّت وَطأَتهُ وَجَبَتْ طَاعَتُهُ) کێ هێزی زۆر بێ، پێویستە بەقسەی بکرێ، کەی شتی وا لە قورئان و سوننەتدا هەیە؟! ئنجا ئەگەر وابێ، دەبێ حوکمی فیرعەون‌و نەمروودیش پاساو بدرێتەوەو لەبەر ئەوەی دەستەلاّتیان هەبووە، دەبوایە بەقسەیان بکرێ!! بۆیە پێویستە ئێمە زۆر بوێرانە ڕەخنە لە مێژووی خۆمان و کەلەپووری خۆمان بگرین و ئەوەی کە لەگەڵ قورئان و سوننەت‌و لەگەڵ بەرژەوەندیی بەشەردا تێك دەگیرێ، ڕەفزی بکەین،نەك بچین لەسەر ئیسلامی باربکەین!! هەروا دەبێ دان بەوەدا بنێین ، کە زانایانیشمان عەجایب نیە بەهەڵەدا چووبن، لەگەڵ ڕێزو حورمەتی زۆرمان بۆیان، بەلاّم وەك گوتراوە: (لکل جواد کبوة، ولکل عالم هفوة) هەموو ئەسپێکی باش جارجار هەڵدەنگوێ، زانای زۆر گەورەش جاروبار بەهەڵەدا دەچێ، دیارە پارێزران لە هەڵە (عصمة) تەنیا تایبەتە بە قورئان‌و سوننەتەوەو تەنیا خوا عزَّوجَلَّ،

وه پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"یش بە هۆی پاراستنی خوای پەروەردگارەوە، لەهەڵەو کەم و کورِیی بەدوور بووە، ئەگەرنا، خەڵکی دیکە هەمووی وەك (ئیمام مالیك) گوتوویەتی: هەموو کەس قسەشی لێوەردەگیرێو بەسەریشیدا دەردرێتەوە، جگە لەخاوەنی ئەم گۆڕە، کە لەو کاتەدا ئیشارەی کرد بۆ گۆڕی موبارەکی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم".

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

خوا پشتیوان بێ لەم باسەمان دا کۆتا بنەمای سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی دەتوێژینەوە، کە بنەمای دەیەمینە، بەناوونیشانی: (پابەندیی بە ئەدەب و ڕەوشتی پەسەند و بەها بەرزەکانەوە)، بنەمایەکی دیکەی گەورەو گرنگی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلام (نِظام اَلحُكم فِي اِلإسَلام) بریتیە لە خۆ ڕازاندنەوە و پابەندیی هەرکام لە حوکمڕان و کاربەدەستان لەلایەك و، خەڵك و هاووڵاتییان لەلایەکی دیکەوە، بەئەدەبی جوانو ڕەوشتی بەرزو پەسەندو ئەو بەها بەرزانەو ئاکارە پەسەندانەی، کە شەریعەتی خوای پەروەردگار لەسەر مسوڵمانانی پێویست کردوە، چ حوکمڕان بن، چ فەرمانبەر بن، لەهەر ئاستێکدا بن، خۆیانیان پێ بڕازێننەوە .

ئنجا ئێمە خوا پشتیوان بێ لەدوو بڕگەدا باسی ئەم دەیەمین وکۆتایەمین بنەمای سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی دەکەین، لە بڕگەی یەکەمیاندا ئەو ئەدەبو ڕەوشتو ئاکارە بەرز و پەسەندانەی، کە لە سەر حوکمڕان و کار بەدەستان پێویستە خۆیانیان پێ بڕازێننەوە، لە مامەڵەکردنیان لەگەڵ کۆمەڵگاو لەگەڵ خەڵك و هاووڵاتییان دا، دەخەینە ڕوو، ئەویش لە دە (١٠) خاڵدا، پاشان لە بڕگەی دووەمیش، لە پێنج خاڵدا باسی گرنگترین ئەدەبو ڕەوشتەکانی خەڵكو کۆمەڵگا لەگەڵ حوکمڕانو بەرپرساندا دەکەین:

## بڕگەی یەکەم: ئەدەب و ڕوشتە بەرزەکانی حوکمڕانان لە بواری مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکدا:

**یەکەم**: بەزەیی و دڵسۆزیی و نەرم و نیانیی:

بەڵێ، بابای حوکمڕان لە هەر ئاستێکی حوکمڕانیی دابێ، چ کەسی یەکەمی نێو کۆمەڵگای ئیسلامیی بێو لەسەرەوەی هەرەمی دەستەلات دابێ، چ لەهەر پایە و پێگەیەکی حوکمڕانیی دابێ، پێویستە خۆی بڕازێنێتەوە بەبەزەییو دڵسۆزیی بۆخەڵك

نەرم و نیانیی، ئەمەش چەند ئایەتێکی خوا (سُبحانَهُ وَتَعالی) و چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لەو بارەوە:

١- خوا لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (١٥٩)دا ڕووی دواندن دەکاتە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" و دەفەرموێ: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ... ﴿١٥٩﴾ ﴾ بە پێغەمبەری خاتەم دەفەرموێ: تۆ بەهۆی بەزەیی خواوە بۆیان نەرم بووی (بە هۆی بەزەییەکی تایبەت لە لایەن خواوە بەرانبەر بە تۆ، تۆ بۆ مسوڵمانانو بەپلەی یەکەم بۆ هاوەڵانێك، کە لە خزمەتت دان ڕاستەوخۆ نەرم بووی) ﴿...وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ﴾ ئەگەر تۆ قسە زبرو دڵڕەق بوایەی بەتەئکید لەدەورت دەپرژانو پەرتەوازە دەبوون، کەواتە: بە هۆی نەرمو نیانییتەوە توانیوتە، کە ئەوانە بگریە خۆتو بە دەوری خۆتەوە بیانهێڵیەوەو سەر پەرشتییان بکەیو ئەوانیش ئامادە بن لە ژێر چەترو سێبەری تۆدا بمێننەوە، ئەگەر وا نەبوایەی هەرچەندە پێغەمبەری خوایو گەورەترین بەشەریو چاکترین بەندەی، بەڵام ئەگەر قسە ڕەق و دڵڕەق بوایەی، ئەوە بە دەقی ئایەت خوا دفەرموێ: هاوەڵەکانت لە دەور دەپرژان، ئەدی کەسێك ،کە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" نیە، بە تەئکید ئەگەر قسە ڕەق و دڵڕەق بێ، خەڵك باشترو زیاتر لەدەوری دەپرژێن، ئەگەر چاریان هەبێ، جاری واش هەیە کەسانێك، هاووڵاتییانێك، بەناچاریی لە ژێر سایەی حوکمڕانێکدا دەمێننەوە، کە قسە ڕەقو دڵڕەقو بێبەزەییشە، بەڵام ناچارن، بەڵام دیارە ئەوە، کە خوا (سُبحانَهُ وَتَعالی) بە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ، لەبەر ئەوەیە، کە لە ئیسلامدا دینداریی و بەندایەتیی بۆ خوا، ئیختیارییەو ئازادانەیە، بۆیە دەفەرموێ: ئەگەر ڕازاوە نەبای بەنەرم و نیانییو قسە خۆشییو ڕووگەشییو دڵ پڕ ڕەحمو بەزەیی، ئەوە هاوەڵە بەڕێزەکانت لە دەورت نەدەمان.

٢- هەروەها لە سوورەتی (التوبة) لە ئایەتی ژمارە (١٢٨)دا، خوا ڕووی دواندن دەکاتە ئیمانداران و دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾ واتە: بێگومان لە خۆتان پێغەمبەرێکتان بۆ هاتوە (واتە: ئەویش وەك خۆتان ئینسانە) (...عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا

عَنِتُّمْ ...) هەرشتێك ببێتە مایەی نارەحەتیی‌و سەغڵەتیی ئێوە، لەسەر دڵی قورسەو پێی ناخۆشە ﴿..حَرِيصٌ عَلَيْكُم ..﴾ سوورە لەسەرتان (واتە: سوورە لەسەر ئەوەی، کە لە زیانەکان بتانپارێزێ و تووشی خێرو خۆشییتان بکات ﴿...بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾﴾ بەرانبەر بە بڕواداران یەکجار دڵنەرم‌و بەبەزەییە.

بێگومان ئەم ئایەتانە دەربارەی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"ن ، بەڵام پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" سەرمەشقی هەموو مسوڵمانانە بەگشتی‌و بەتایبەتی حوکمڕان و کاربەدەستان، مسوڵمانان بە گشتی لەسەریان پێویستە خۆیان بە ڕەوشتەکانی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بڕازێننەوە: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾﴾الأحزاب، بێگومان لە پێغەمبەری خوادا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" سەرمەشقییەکی باش هەیە بۆ ئێوە، بەڵام بە تەئکید حوکمڕانان‌و کاربەدەستانێك ، کە ئەرکی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کە بریتیە لە جێبەجێ کردنی شەریعەتی خوا، لە نێو کۆمەڵگادا جێبەجێ دەکەن، مولزەمترن‌و لەسەریان پێویستترە، کە خۆیان بە ئەدەب‌و ڕەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بڕازێننەوە.

٣- پێغەمبەریش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لەوبارەوە فەرموویەتی: {**«مَا مِنْ أَمِيرٍ يَلِي أَمْرَ الْمُسْلِمِينَ ثُمَّ لاَ يَجْهَدُ لَهُمْ وَيَنْصَحُ إِلاَّ لَمْ يَدْخُلْ مَعَهُمُ الْجَنَّةَ»**}(أخرجه مسلم برقم: (١٤٢))، واتە: هیچ کاربەدەستێك نیە کاروباری مسوڵمانان بگرێتە دەست (واتە: چ لە سەرەوەی هەرەمی دەستەڵات دابێ، چ لە هەر بەشێك لە بەشەکانی حوکمڕانیی لەهەر پێگەیەکدا بێ) پاشان خۆیان بۆ ماندوو نەکات‌و بۆیان دڵسۆز نەبێ، ئەوە لە گەڵ ئەوان ناچێتە بەهەشت. واتە: جاری وایە مسوڵمانەکان دەچنە بەهەشت! بەڵام ئەوەی کە برا گەورەو سەرپەرشتیاریان بووە، لەبەر ئەوەی بۆیان دڵسۆز نەبووەو، خۆی بۆ ماندوو نەکردوون، لەگەڵ وان ناچێتە بەهەشت، بەڵکو دووچاری سزاو جەزرەبەی خوای دادگەر دەبێ‌و لە دۆزەخ دا دەبێ.

٤- هەروەها پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە فەرمایشتێکی دیکەدا دەفەرموێ: (اللهمَّ مَنْ وَلِيَ مِنْ أُمَّتِي شَيْئًا فَرَفَقَ بِهِمْ، فَارْفُقْ بِهِ وَمَنْ شَقَّ عَلَيْهِمْ فَشُقَّ عَلَيْهِ)(أخرجه أحمد برقم: (٢٦٢٤٢) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم)، واتە: ئەی خوایە! هەر کەسێك شتێکی لە کاروباری ئۆممەتی من پێسپێردراو بە ئەستۆیەوە گرت، لەگەڵیان نەرم بوو، تۆش لەگەڵی نەرم و میهرەبان بە،وە ئەگەر لەسەریان توند و زبر بوو، تۆش لەسەری توندبە، هەڵبەتە کەسێکیش، خوا لەسەری توند بێ‌و لەگەڵی بەبەزەیی‌و میهرەبان نەبێ، دیارە سزای دەدات.

٥- هەروەها پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە فەرمایشتێکی دیکەدا دەفەرموێ: {«إِنَّ شَرَّ الرِّعَاءِ الْحُطَمَةُ»}(أخرجه مسلم برقم: (١٨٣٠))، واتە: بێگومان خراپترین‌و کاربەدەستان و سەرپەرشتیاران ئەوانەن، کە خەڵك تێکدەشکێنن، ئنجا چ تێکشکاندنی مەعنەویی، کە ڕوو شکێنیان دەکەن، یاخود ئازادییان لێ زەوت دەکەن و مافە مەعنەوییەکانیان لێ ڕاگیر دەکەن، یاخود تێکشکاندنی ڕواڵەتیی‌و ماددیی، ئازار و ئەشکەنجەیان دەدەن، ئەوانە خراپترین کاربەدەستانن، ئنجا خراپترین کاربەدەستانیش، بەدڵنیاییەوە چاویان بە بەهەشتی خوای میهرەبان ناکەوێ.

## دووەم: خاکیی بوون و خۆ بەکەمزانیی و خۆبەکەمگریی (التواضع):

یەکێکی دیکە لە سیفەتەکانی حوکمڕان و کاربەدەستانی مسوڵمان، کە پێویستە خۆیانیان پێ بڕازێننەوە، بریتیە لە خاکیی بوون‌و خۆبەکەمگریی، کە لووتبەرز نەبن‌و بە کەش‌و فش‌و فیزو دەعیەو دەمار نەبن، لە مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵك‌و کۆمەڵگادا، وەك لەم ئایەت‌و فەرمایشتانەدا دەردەکەوێ:

١/ خوا لە سووڕەتی (الشعراء) لە ئایەتی (٢١٥)دا بە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: ﴿ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢١٥﴾ ﴾ واتە: باڵت شۆڕ بکە بۆ ئەو بڕوادارانەی، کە شوێنت دەکەون. واتە: باڵە شۆڕەیان بۆ بکە، وەك چۆن باڵندە باڵ بە سەر بەچکەکانیدا دێنێ، دیارە کەسێکیش کە سەرپەرشتیار و بەرپرسی مسوڵمانانە،

هەر پێگەیەکی هەبێ، دەبێ لەقەدەر خۆی باڵ شۆڕ بکات بۆ ئەوانەی لە ژێر سایەو سێبەریدانو، لە گەڵیاندا بێ فیزو بەبەزەیی بێو باڵندە بۆ بەچکەکانی چۆنە، ئاوابێ.

٢/ ئنجا خوای پەروەردگار لە سوورەتی (القصص) لە ئایەتی (٨٣)دا دەفەرموێ: ﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾ واتە: ئا ئەم مەنزڵگای ڕۆژی دواییە، دەیگێڕین بەمەنزڵگا بۆ کەسانێك، کە لووت بەرزییو خۆبەرزکردنەوەی ناهەقیان مەبەست نیە لە زەویدا، خراپەکاریشیان مەبەست نیە. واتە: ئامانجیان ئەوە نیە خۆیان بەسەر خەڵکدا هەڵکێشنو خۆیان بەسەردا بەرز بکەنەوە بە ناهەق، ئامانجیشیان ئەوە نیە، بە هۆی دەستەڵاتو حوکمڕانییەکەیانەوە خراپەکاریی بکەن ﴿..وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ سەرنجامیش بۆ پارێزکارانە. واتە: سەرەنجامی خێرو چاکی دنیاو دواڕۆژ لە گرەوی پارێزکاران دایە.

لێرەدا خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) مەنزڵگای دوا ڕۆژی تایبەت کردوە بە کەسانێکەوە، کە چاویان لە خۆ فەرز کردن و لووتبەرزیی و خۆبەرزکردنەوە نیە لەسەر زەوی، وە چاویان لە خراپەکاریی نیە لە نێو کۆمەڵگادا، واتە: کاربەدەستانێك، کە ئاوا نەبن بەشیان بە مەنزڵگای دوا ڕۆژەوەنیە.

٣/ هەروەها خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) لە سوورەتی (الفرقان) لە ئایەتی (٦٣)دا دەفەرموێ: ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ ﴾ واتە: بەندەکانی خوای بەبەزەیی کەسانێکن، کە بە ئارامیی هێمنیی بەزەویدا دەڕۆن، کاتێك نەفامەکان بیاندوێنن، دەڵێن: سەلام، یاخود قسەیەکی سەلامەت دەکەن. ئەوانە کەسانێکن کە خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) لە کۆتایی سوورەتی (الفرقان) لە ئایەتی پێش کۆتایی دا لەسەر زمانی وان دەفەرموێ: ﴿ ...وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ ﴾، بمانگێڕە بە پێشەوا بۆ پارێزکاران، کەواتە: کەسانێك شایستەی پێشەوایەتیی پارێزکارانن، کە بەو سیفەتە بەرزانە خۆیان بڕازێننەوە، کە ڕۆیشتنە بەزەویدا بە ئارامیی و هێمنیی، دوانو قسە کردنە، لە بەرانبەر نەفامیی نەفامانندا بەشێوەیەکی سەلامەت، یاخود سڵاویان لێ دەکەنو لەگەڵیان ناچنە تەرازووەوەو، وەڵامی قسە نەفامانەکانیان نادەنەوە.

پێغەمبەر یش "صَلَى الله عَلَيه وَسَلَم" لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەی لێ گێڕدراوەتەوە: **{عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ قَالَ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلٌ فَكَلَّمَهُ فَجَعَلَ تُرْعَدُ فَرَائِصُهُ فَقَالَ لَهُ: هَوِّنْ عَلَيْكَ فَإِنِّي لَسْتُ بِمَلِكٍ إِنَّمَا أَنَا ابْنُ امْرَأَةٍ تَأْكُلُ الْقَدِيدَ}**(أخرجه إبن ماجه برقم: (٣٣١٢) قال الشيخ الألباني: صحيح)، واتە: ئەبو مەسعوود (خوا لێی رازی بێ) کە یەکێکە لە هاوەڵان، دەگێڕێتەوە: پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەر و "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" قسەی لە خزمەتدا کرد، لەو کاتەشدا لاتەنیشتەکانی هەڵدەلەرزین، پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" پێی فەرموو: لەسەرخۆبە، خۆت هێور بکەوە، من پادشا نیم، من کوڕی ئافرەتێکم،کە گۆشتی لەبەر هەتاو سوورکراوەی دەخوارد. واتە: من کەسێکی بە دەعیەو دەمار نیمو کەسێکی پادشا و ستەمکار نیم، کە تۆ لێم بترسی ،من ئینسانێکی سادەم، لەو ڕووەوە، کە خۆم پێ لە خەڵك زیاتر نیەو لە خێزانێکی سادەم، ئەگەرنا، دیارە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لەبەنی هاشم بووەو، ئەوان لە هەموو تیرەو هۆزەکانی نێو قورەیش و قورەیشیش لە نێو هۆزەکانی عەرەب، خانەدانترو نەجیبزادەتر بوون.

## سێیەم: ڕوونیی و ڕاشکاویی:

یەکێکی دیکە لە ڕەوشتەو و ئاکارە بەرز و پەسەندەکانی حوکمڕان و کاربەدەستان، ئەوەیە، کە لەگەڵ خەڵکدا ڕوونو ڕاشکاو بنو بە گرێو گۆڵۆ، بە قۆرت وپێچ نەبن، وەك لەم ڕووداوەدا دەردەکەوێ: **{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ نَاسًا مِنَ الأَنْصَارِ قَالُوا لِرَسُولِ اللهِ** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"**، حِينَ أَفَاءَ اللهُ عَلَى رَسُولِهِ** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" **مِنْ أَمْوَالِ هَوَازِنَ مَا أَفَاءَ فَطَفِقَ يُعْطِي رِجَالاً مِنْ قُرَيْشٍ الْمَائَةَ مِنَ الإِبِلِ" فَقَالُوا: يَغْفِرُ اللهُ لِرَسُولِ اللهِ** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" **يُعْطِي قُرَيْشًا وَيَدَعُنَا، وَسُيُوفُنَا تَقْطُرُ مِنْ دِمَائِهِمْ قَالَ أَنَسٌ: فَحُدِّثَ رَسُولُ اللهِ** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" **بِمَقَالَتِهِمْ، فَأَرْسَلَ إِلَى الأَنْصَارِ فَجَمَعَهُمْ فِي قُبَّةٍ مِنْ أَدَمٍ، وَلَمْ يَدْعُ مَعَهُمْ أَحَدًا غَيْرَهُمْ، فَلَمَّا اجْتَمَعُوا جَاءَهُمْ رَسُولُ اللهِ** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"**، فَقَالَ: مَا كَانَ حَدِيثٌ بَلَغَنِي عَنْكُمْ قَالَ لَهُ فُقَهَاؤُهُمْ: أَمَّا ذَوو آرَائِنَا يَا رَسُولَ اللهِ فَلَمْ يَقُولُوا شَيْئًا، وَأَمَّا أُنَاسٌ مِنَّا حَدِيثَةٌ أَسْنَانُهُمْ، فَقَالُوا: يَغْفِرُ اللهُ لِرَسُولِ اللهِ** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" **يُعْطِي قُرَيْشًا وَيَتْرُكُ الأَنْصَارَ، وَسُيُوفُنَا تَقْطُرُ مِنْ دِمَائِهِمْ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ**

"صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم": **إِنِّي لأُعْطِي رِجَالاً حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ بِكُفْرٍ، أَمَا تَرْضَوْنَ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالأَمْوَالِ، وَتَرْجِعُونَ إِلَى رِحَالِكُمْ بِرَسُولِ اللهِ** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" **فَوَاللهِ مَا تَنْقَلِبُونَ بِهِ، خَيْرٌ مِمَّا يَنْقَلِبُونَ بِهِ قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ قَدْ رَضِينَا**}(أخرجه البخاري برقم: (٣١٤٧)، ومسلم برقم: (١٠٥٩)) ، ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: کەسانێك لە پشتیوانەکان لە کاتێکدا، کە خوا (سُبحانَهُ وَتَعالَى) ئەو دەسکەوتەی گێڕایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە ماڵ و سامانی هۆزی (هەوازین) دەستکەوتێکی زۆریان کەوتە دەست پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بە پیاوانێك لە قوڕەیش سەد حوشتر، سەد حوشتری پێدەدان (وەك دڵ ڕاگرتن)، کەسانێك لە پشتیوانەکان گوتیان: خوا لە پێغەمبەری خوا ببوورێ، ماڵ و سامان دەدات بە قوڕەیشییەکانو واز لە ئێمە دێنێ، لە حاڵێکدا کە شمشێرەکانی ئێمە خوێنی ئەوانی لێ دەتکێ! (واتە: ئەو قوڕەیشییانەی کە هەتا ئەوکاتە دژایەتیی ئیسلام و مسوڵمانانیان کردوە) ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئەو قسەیەی ئەوانی بۆ گێڕدرایەوە، ئەویش لە دوای پشتیوانەکانی نارد، هەموویانی لە ژێر خێوەتێکی چەرم دا کۆکردنەوە، بەڵام غەیری خۆیان ،کەسی لەگەڵ کۆنەکردنەوە (تەنیا پشتیوانەکانی کۆکردنەوە) ، کاتێك هەموویان کۆبوونەوە، پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" هاتە لایان و فەرمووی: ئەوە چییە قسەیەکم لە ئێوەوە پێگەیشتوە؟ ئەوانەی، کە شارەزا بوون لە پشتیوانان، گوتیان: ئەوانەمان، کە خاوەن ئەزموونو عاقڵین، ئەی پێغەمبەری خوا! "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" هیچمان نەگوتوە، بەڵام هەندێکمان، کە گەنجن، تەمەنیان کەمە گوتوویانە: خوا لە پێغەمەری خوا ببوورێ ماڵ و سامان و دەسکەوتی جەنگ دەدا بە قوڕەیشییەکانو واز لە پشتیوانەکان دێنێ لە حاڵێکدا ، کە شمشێرەکانی ئێمە خوێنی ئەوانی لێدەتکێ، پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" فەرمووی: بێگومان، من کەسانێك کە لە کوفرەوە نزیکن (واتە: تازە لە نێو کوفرەوە هاتوونەتە نێو ئیسلام) ماڵ و سامان و دیارییان پێ دەدەم، بۆ ئەوەی کە دڵیان ڕابگرم، ئایا ڕازی نابن، کە خەڵك ماڵ و سامان لەگەڵ خۆی بباتەوەو، ئێوەش پێغەمبەر"صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لەگەڵ خۆتان بەرنەوە لای بارگەو بنەکانتان، یاخود لای ماڵەکانی خۆتان؟ سوێند بە خوا، ئەوەی کە ئێوە

دەیبەنەوە بۆ ماڵەوەتان، یان بۆلای بارگەو بنەکانتان، باشترە لەوەی، کە ئەوان دەیبەنەوە! ئەوانیش گوتیان: با، ئەی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئێمە ڕازین (کە تۆ پشك و بەشی ئێمە بی، با لە دەستکەوتیشدا بەشمان نەبێ)، کە دیارە حیکمەتەکەی ئەوەیە، کە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئەوانی بە ئیمانەکەیان سپاردوە، بەڵام کەسانێکی دیکە، کە تازە مسوڵمان بوون، پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ویستوویەتی بەماڵو سامانو دیاریی پێدان، دڵیان هۆگر بکات بەئیسلامەوە، بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە کە لەگەڵیان دایە، مسوڵمانان لە دەست و لە زمانیان سەلامەت بن.

## چوارەم: گرنگیی دان بە فێرکردن و ڕێنمایی کردن:

حوکمڕان وکاربەدەستو مشورخۆرانی مسوڵمانان، پێویستە فێرکەرو مامۆستاو بەرچاو ڕۆشنکەرەوەی خەڵكو کۆمەڵگابن، وەك لەم ئایەتانەی قورئان و فەرمایشتانەی پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"ەوە، دەردەکەوێ.

١- خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) لە سوورەتی (الجمعة) لە ئایەتی (٢)دا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٢﴾ ﴾ واتە: ئەو (خوا) کەسێکە، کە لە نێو نەشارەزایەکاندا لە خۆیان پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون، ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوەو تەزکیەیان دەکاتو کتێبو حیکمەتیان فێر دەکات، بەدڵنیاییەوە لەوە پێشیش لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بوون. کەواتە: پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" چوار ئەرکی سەرەکی هەبووە لە نێو ئۆممەتیدا، کە ئەو چوار ئەرکە لەسێ شوێنی دیکەش لە قورئاندا هاتوون، واتە: لە چوار ئایەتدا:

١و٢: (البقرة): ١٢٩،١٥٣ ، ٣:(آل عمران): ١٦٤، ٤:(الجمعة): ٢، ئەو چوار ئەرکەش ئەمانەن:

١/ خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا.

٢/ تەزکیە کردنی خەڵك، واتە: پاکسازییو چاکسازیی تێدا کردنیان.

٣/ کتێب فێر کردنیان، واتە: شەریعەتیان فێر دەکات.

٤/ حیکمـەت فێرکردنیـان، واتـە: ئـەو ئـەدەبو ڕەوشـتە بـەرز و جـوان و پەسەندانەیان فێر دەکات، کە لە شەریعەتەوە سەرچاوە دەگرن.

لەو بارەوە فەرمایشتی پێغەمبەر "صَلَى اللہ عَلَیِہِ وَسَلَمَ"یش زۆرن، بۆ وێنە:

٢- (**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ:كَانَ نَاسٌ مِنْ الأَسْرَى يَوْمَ بَدْرٍ لَمْ يَكُنْ لَهُمْ فِدَاءٌ فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِدَاءَهُمْ أَنْ يُعَلِّمُوا أَوْلَادَ الْأَنْصَارِ الْكِتَابَةَ**) (أخرجه أحمد برقم: (٢٢١٦)، تعليق شعيب الأرنؤوط: حسن)، واتـە: ئیبنـو عـەبباس دەڵـێ: کەسانێك لە دیلەکانی جەنگی بەدر، پارەیان نەبوو فیدیە بـدەنو خۆیـان بکڕنـەوە، بۆیـە پێغەمبـەر "صَلَى اللہ عَلَیِہِ وَسَلَمَ" فیدیەکـەی بـەوە دانـان ، کـە منـداڵی پشتیوانەکان فێری خوێندن و نووسین بکـەن. لـە شـوێنێکی دیکـەدا هـاتوە: کـە هەرکامێکیان دە (١٠) کەس لەمنـداڵی پشـتیوانەکان فێـری خوێنـدن و نووسـین بکات.

٣- فەرمایشتێکی دیکە لەوبارەوە: (**عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ قَالَ لَنَا النَّبِيُّ: «ارْجِعُوا إِلَى أَهْلِيكُمْ فَعَلِّمُوهُمْ »**) (أخرجه أحمد برقم: (١٥٦٣٦)، والبخاري برقم: (٧٨٥)، ومسلم برقم: (٦٧٤)، والنسائي برقم: (٦٣٥)، وابن حبان برقم: (١٦٥٨))، مالیکی کوڕی حوەیریس، کـە لـە فەرمایشـتێکی درێـژدا دەڵـێ: ئێمـە کۆمەڵـە گەنجێك بووین ، چووین بۆ خزمەت پێغەمبەر "صَلَى اللہ عَلَیِہِ وَسَلَمَ" هـەتا کاتێـك پێغەمبەر "صَلَى اللہ عَلَیِہِ وَسَلَمَ" زانی کە ئارەزوو مەندین بچینەوە بۆ لای ماڵـەوە، بۆ لای کەس و کارمان، فەرمووی: بگەڕێنـەوە بـۆ لای کـەس و کارتـان فێریـان بکەن، ئەوەی، کە لەلای من فێری بوون، ئێوەش فێری ئەوانی بکەن.

٤- هەروەها پێغەمبەر "صَلَى اللہ عَلَیِہِ وَسَلَمَ" لە فەرمایشتێکدا، کە هەر لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە لەهـەمان بەسـەرهاتی پێشـوودا، فەرموویـەتی: {**«صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي»**}( أخرجه أحمد برقم: (١٥٦٣٦)، والبخاري برقم: (٧٨٥)، ومسلم برقم: (٦٧٤)، والنسائي برقم: (٦٣٥)، وابن حبان برقم: (١٦٥٨))، پێغەمبەر نوێژی کرد لەبەر چاوی کۆمەڵەگەنجێك، دوایی فەرمووی: نوێژ بکەن وەك چـۆن منتـان بینـی نوێـژم کرد، واتە: وەك چۆن ئێوە فێر دەکەم، ئێوەش خەڵکی دیکە فێربکەن.

٥- فەرمایشتێکی دیکە لەوبارەوە: (**عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَتِ النِّسَاءُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَلَبَنَا عَلَيْكَ الرِّجَالُ فَاجْعَلْ لَنَا يَوْمًا مِنْ نَفْسِكَ فَوَعَدَهُنَّ يَوْمًا لَقِيَهُنَّ فِيهِ فَوَعَظَهُنَّ وَأَمَرَهُنَّ**) (أخرجه البخاري برقم: (١٠١))، واتە: ئەبو سەعیدی خودریی دەگێڕێتەوە، کە ئافرەتان هاتن بۆلای پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" گوتیان: پیاوان لە دانیشتن و کۆبوونەوە لەگەڵ تۆ بەسەر ئێمەدا زاڵ بوون، (واتە: بەشی ئێمەشیان بۆ خۆیان بردوە) ڕۆژێکمان بۆ دابنێ ،کە ئێمە بێین بۆ خزمەتتو لەگەڵت کۆبینەوە، ئەویش ڕۆژێکی بۆ دیاریی کردن، کە لەو ڕۆژەدا پێیان دەگەیشتو ئامۆژگاریی دەکردنو فەرمانی پێ دەکردن. دەگونجێ کە لە هەفتەدا، یاخود لە مانگدا ڕۆژێکی بۆ دیاریی کردبن، دیارە ئەوە جگە لە ڕۆژی جومعە، کە پیاوانو ئافرەتان، لە نوێژی جومعەدا بەشدار دەبن، دیارە بۆیەش ئافرەتان داوایان کردوە، چونکە هەندێ پرسیاریان دەبن ،کە پرسیاری تایبەتن بەخۆیانەوە، بۆیە پێویستە ڕۆژێکی تایبەت و دیاریی کراویان هەبێت، کە پیاوان لەوێ نەبن، بۆ ئەوەی ئازادانەتر پرسیارەکانی خۆیان بکەن ،یان وتووێژی خۆیان لەخزمەت پێغەمبەر"صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم"دا بکەن.

## پێنجەم: خۆڕاگریی و چاوپۆشیی لە بەرانبەر قسەو ڕەفتاری نەفامانەدا:

یەکێکی دیکە لەو ئاکار و ڕەفتارانە، کە دەبێ حوکمڕان و کاربەدەستان خۆیانیان پێ بڕازێننەوە، لە مامەڵەکردن و ڕەفتارەکردن لەگەڵ خەڵك و کۆمەڵگادا، بریتیە لە (خۆڕاگریی‌و چاوپۆشیی لەبەرانبەر قسەو ڕەفتاری نەفامانەدا): بابای بەرپرس‌و مشورخۆرو سەرپەرشتیار، پێویستە بەصەبرو حەوسەڵە بێ‌و، پێویستە چاو پۆشیی‌و لێبوردنی هەبێ لەگەڵ خەڵکێکدا، کە قسەیەك ڕەفتارێکی ناشایستی لەبەرانبەردا دەکات، ئەگەرنا، کەسێك، کە وانەبێ، ئەوە هیچ منەتی تێدا نیە، کە لەگەڵی خۆڕاگرو بەڕێز بێ‌و بە سەماحەت و سینگ فراوانبێت.

لەو بارەشەوە ئەم دەقانە هەن:

١- لە سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتی: (١٩٩)دا خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) دەفەرموێ: ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ ﴾ دیارە بە پێغەمبەر"صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ، واتە: ئەوەی، کە ئاسانە لە خەڵك ئەوە وەربگرە (ئەوەی کە لەتوانایان زیادە، یاخود بە ئاسانیی بۆیان جێبەجێ ناکرێ، لێیان چاوەڕێ مەکە)، (وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ ) فەرمان بە چاکە بکە، واتە: خۆت چاکە بکەو فەرمانیشی پێ بکە، (وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ) ڕوو وەربگێڕە لە نەفامان، ئەگەر نەفامییەکیان کرد، ڕوویان لێ وەربگێڕە، واتە: چاو پۆشییان لێبکە.

هەروەها لەوبارەوە فەرمایشتی پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" زۆرن، بۆ وێنە:

٢- { **عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ** رَضِيَ اللهُ عَنهُما **قَالَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ** - صلى الله عليه وسلم- **كان يَقْبِضُ الناس فِي ثَوْبِ بلالٍ يوم حُنَيْنٍ يُعْطِيهم فَقَالَ إِنْسَان مِنَ النَّاسِ اعدِلْ يَا مُحَمَّدُ. فقَالَ: «وَيْلَكَ وَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَكُنْ أَعْدِلُ لَقَدْ خِبْتَ وَخَسِرْتَ إِنْ لَمْ أَكُنْ أَعْدِلُ»؟! فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ** رضى الله عنه: **دَعْنِي يَا رَسُولَ اللهِ فَأَقْتُلَ هَذَا الْمُنَافِقَ. فَقَالَ: «مَعَاذَ اللهِ أَنْ يَتَحَدَّثَ النَّاسُ أَنِّى أَقْتُلُ أَصْحَابِي إِنَّ هَذَا وَأَصْحَابَهُ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنْهُ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ»**}(أخرجه أحمد برقم: (١٤٨٤٦)، والبخاري برقم: (٣٤١٤)، ومسلم برقم: (١٠٦٣)، والطبراني برقم: (١٧٥٣)، وابن حبان برقم: (٤٨١٩))، واتە: (جابر)ی کوڕی (عبدالله) خوالێی ڕازی بێ، دەڵێ: بڕێك پارە هەبوو لە کۆشی بیلال دا بووە، پێغەمبەر"صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" بە دەستی دەری هێنا و دەیدا بەخەڵك، مرۆڤێك لەو خەڵکە گوتی: ئەی موحەممەد! دادگەر بە، بەدادگەریی ببەخشە، پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" فەرمووی: بێ قەزا بی! ئەگەر من دادگەر نەبم، کێ دادگەر دەبێ؟ پەشێمان و زەرەرمەندم، ئەگەر دادگەر نەبم، عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" لێم گەڕێ، با لە گەردنی بدەم! (چونکە ڕەخنە گرتن لە پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" کوفرە) پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم" فەرمووی: پەنا بەخوا، کە خەڵك دوایی لە نێو خۆیاندا بڵێن: کە من هاوەڵانم دەکوژم، دوایی فەمووی: بێگومان ئەمەو هەندێك هاوەڵی هەن (واتە:

هەندێکی دیکە وەك ئەو دەچن، لەسەر ئەو جۆرە تەرزە بیرو سروشتەن، کە ڕەخنە لە هەموو کەس دەگرن، تەنانەت پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ"یش، لەکەس ڕازی نین، ئەوەندە خۆ پەسەند و کەللە وشکن) قورئان دەخوێننەوە، بەلاّم لە ەروویان ئەودیو نابێ (واتە: تەنیا زانیارییان هەیە، بەلاّم زانیارییەکەیان لەگەروویان ئەو دیو نەبووە، تاکو بێتە نێو دڵ و دەروونیانەوە، تەفاعول لەگەڵ ئەو زانیارییانەدا بکەنو حالّی بوونەکەیان ببێتە حالّو، زانینەکەیان بگۆڕێ بۆ توانین).

٣- فەرمایشتێکی دیکە لەوبارەوە: (**عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ** رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، **قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ حُنَيْنٍ آثَرَ النَّبِيُّ** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" **أُنَاسًا فِي الْقِسْمَةِ فَأَعْطَى الأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ مِائَةً مِنَ الإِبِلِ، وَأَعْطَى عُيَيْنَةَ مِثْلَ ذلِكَ، وَأَعْطَى أُنَاسًا مِنْ أَشْرَافِ الْعَرَبِ، فَآثَرَهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي الْقِسْمَةِ" قَالَ رَجُلٌ: وَاللهِ إِنَّ هذِهِ الْقِسْمَةَ مَا عُدِلَ فِيهَا، وَمَا أُرِيدَ بِهَا وَجْهُ اللهِ فَقُلْتُ: وَاللهِ لأُخْبِرَنَّ النَّبِيَّ** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" ، **فَأَتَيْتُهُ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: فَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ يَعْدِلِ اللهُ وَرَسُولُهُ رَحِمَ اللهُ مُوسَى، قَدْ أُوذِيَ بِأَكْثَرَ مِنْ هذَا فَصَبَرَ)** (أخرجه البُخاري برقم: (٢٩٨١) وَمُسلِم برقم: (١٠٦٢)، واتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود دەگێڕێتەوە: لەجەنگی حونەین دا پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" هەندێ کەسی هەڵبژارد لە بەخشینو دیاریی پێدان دا بەسەر هەندێك کەسدا، بۆ وێنە: ئەقرەعی کوری حابیس (کە سەرۆکی هۆزێك بوو تازە مسولّمان بوو بوو) سەدحوشتری پێدا، عویەینەی کوڕی حوصنی فیزاریی، ئەویش بە هەمان شێوە،کەسانێکی دیکەش لە پیاوانی ناو بەدەرەوەی عەرەب بە هەمان شێوە، لەو ڕۆژەدا لە دابەشکردنی ئەو دەسکەوتەدا، ئەوانی هەڵبژارد بەسەر خەڵکی دیکەدا، پیاوێك گوتی: بەخوا ئەم دابەشکردنە، دادگەریی تێدا نەکراوەو ڕەزامەندیی خوای تێدا ڕەچاونەکراوە! عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود دەڵێ: گوتم بەخوا دەبێ هەواڵ بدەمە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ" بەو قسەیە، چوومە خزمەتیو هەواڵم پێدا، ئەویش فەمووی: ئەگەر خواو پێغەمبەری خوا دادگەر نەبن کێ دادگەرە؟! خوا بەزەیی بە مووسادا بێتەوە، بە زیاتر لەوەش ئازار درا، بەلاّم خۆی ڕاگرت. واتە: منیش خۆڕادەگرم، خۆ نابێت لە مووسا کەمتر بم لەم

ڕەوشتەدا، دیارە پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە هەموو ڕەوشتێکی بەرزدا، لە پێش هەموو پێغەمبەرانەوە بووە، واتە: وەك چۆن مووسا خۆڕاگر بووە لەبەرانبەر ئازاری لەوەش زیاتردا، منیش دەبێ خۆڕاگر بم، هیچ کاردانەوەیەکی خراپم نەبێ، تەنیا ئەوەندەی فەرموو: ئەگەر من دادگەر نەبم، خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) دادگەر نەبێ، منیش لە فەرمانی ئەو دەرناچم، دەبێ کێ دادگەر بێ؟! .

٤- ئەمەش فەرمایشتێکی دیکە لەوبارەوە: (**عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ** رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، **قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"، **وَعَلَيْهِ بُرْدٌ نَجْرَانِيٌّ غَلِيظُ الْحَاشِيَةِ، فَأَدْرَكَهُ أَعْرَابِيٌّ، فَجَذَبَهُ جَذْبَةً شَدِيدَةً، حَتَّى نَظَرْتُ إِلَى صَفْحَةِ عَاتِقِ النَّبِيِّ** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"، **قَدْ أَثَّرَتْ بِهِ حَاشِيَةُ الرِّدَاءِ مِنْ شِدَّةِ جَذْبَتِهِ، ثُمَّ قَالَ: مُرْ لِي مِنْ مَالِ اللهِ الَّذِي عِنْدَكَ" فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ، فَضَحِكَ، ثُمَّ أَمَرَ لَهُ بِعَطَاءٍ**) (أخرجه البخاري برقم: (٣٣٤٨))، واتە: دیسان ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم"دا دەڕۆیشتم، بوردێکی نەجرانیی لەبەردابوو (جۆرە پۆشاکێك بووە کەلە نەجران دروستکراوە) کە یەخەکانی زۆر ڕەق و پتەو بوون، کابرایەکی عەرەبی خێڵەکیی پێی گەیشت و لە پشتەوە ڕایکێشا، هەتا من تەماشای لا ملی پێغەمبەرم "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" کرد قەراغ و یەخەی ئەو عەبایە کە لە بەری بوو (کاری تێکرد بوو ، دیارە لە پشتەوە کە ڕای کێشاوە لە ملی توند بووەو ملی سوور کردۆتەوە، لە ئەنجامی زۆر توند ڕاکێشانی دا) دوایی کابرای عەرەبی خێڵەکیی گوتی: ئەو ماڵی خوایەی، کە لەلاتە فەرمان بکە، با بمدرێتێ! پێغەمبەریش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئاوڕی لێدایەوە، پێکەنی و فەرمانی کرد، فەمووی: پێی بدەن.

## شەشەم: چاو پێداگێڕان و پشکنینی حاڵ و باڵی خەڵك:

لە ئاکاری حوکمڕان و کاربەدەستان، لەوسیفەتە بەرز و جوانانەی، کە دەبێت خۆیانیان پێ بڕازێننەوە، ئەوەیە،کە: (چاو پێدا گێڕان و پشکنینی حاڵ و باڵی خەڵك)، صیفەتێکی بنچینەییان بێ و نابێ لە خەڵك بگەڕێن، کێ زوڵم دەکات، بیکا، کێ چی دەکات، بیکا

كیێ چۆن دەكات بیكا، كیێ غەش دەكات بیكا، بەڵكو دەبێ چوار چاوبن و خۆیان ڕاستەوخۆ، یاخود لە ڕێی كەسانێكی تایبەتەوە ،كە جێی متمانەیانن، ئاگایان لە حاڵ و باڵی خەڵكی بێ و پشكنینیان هەبێ بۆ خەڵك، وەك لەم ئایەت و فەرموودانەوە دەردەكەوێ:

١- خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) لە سوورەتی (النمل)دا لە ئایەتی (٢٠)دا فەرموویەتی: ﴿وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَالِيَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾﴾ باسی سولەیمان (علیه السلام) دەكات: واتە: چاوی بە باڵندەكان دا گێڕا (سوپایەكی هەبوو لە باڵندە، دیارە كاری تایبەتی پێ سپاردوون) فەرمووی: بۆچی پەپووسلێمانە نابینم؟ یاخود هەر لێرە نیە، (واتە: لە باڵندەیەكی دیكە گیراوە، یاخود دوورە، یان هەر ئامادەی ئێرە نیە؟) دیارە دواییش بەسەرهاتەكەی گێڕراوەتەوە، كە ئەو هودهودە دەڵێ: من لە سەبەء بووم، هەواڵی ڕاستم بۆ هێناوی،گرنگ ئەوەیە لێرەدا سولەیمان تەنانەت باڵندەیەكیش ،كە لەوێ ئامادە نەبووە زانیویەتی، دوای ئەوەی كە پشكنیویەتی و چاوی گێڕاوە، خۆی ڕاستەوخۆ، یاخود لە ڕێی كەسانێكی تایبەتەوە، گرنگ ئەوەیە بە ئامادەنەبوونی ئەو پەپوسلێمانەی زانیوە.

٢- ئەم فەرموودەیەش لەوبارە وە دێنینەوە: (**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** رَضِيَ اللهُ عَنْهُ **أَنَّ رَسُولَ اللهِ** "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ" **مَرَّ عَلَى صُبْرَةِ طَعَامٍ، فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِيهَا، فَنَالَتْ أَصَابِعُهُ بَلَلاً ، فَقَالَ:"مَا هَذَا يَا صَاحِبَ اَلطَّعَامِ؟" قَالَ: أَصَابَتْهُ اَلسَّمَاءُ يَا رَسُولَ اللهِ. فَقَالَ: أَفَلاَ جَعَلْتَهُ فَوْقَ اَلطَّعَامِ، كَيْ يَرَاهُ اَلنَّاسُ؟ مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنِّي**) (أخرجه مسلم برقم: (١٠٢)، ئەبو هورەیرە (خوای لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ" ڕۆژێك بەلای كۆمەڵە خواردنێك دا (كە مەبەستی: دەغڵە (گەنم، جۆ) كە دیارە هەڵدراوەتەوە، وەك چۆن لەسەر (جۆخین)و خەرمان هەڵدەردرێتەوە، دیارە كابرا كۆ دەغلێكی لەوێ بووە) پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ" دەستی بردە نێوی، كاتێك دەستی برد، پەنجەكانی تەڕ بوون، فەرمووی: ئەی خاوەنی ئەم دەغڵ و گەنمە! ئەمە چییە؟ ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ" ئەوە باران لێیداوە، پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ"

فەرمووی: ئەدی بۆچی ئەو دەغڵە تەڕەت نەدەخستە سەرەوە، تاكو خەڵك بیبینێ؟ (چونكە خەڵك بە حیسابی گەنمی وشك لێی دەكڕێو نازانێ نێوەكەی گەنمی تەڕە، وەك چۆن جاری وایە كابرایەك كاكڵە گوێز دادەنێ ئەوەی دیوی كڕیارە، زۆر جوانە، بەڵام هی لای خۆی هەمووی ورتكەو پرتكەیە، یان میوەی جوانی پێشان دەداتو دوایی لە جۆرێكی دیكەی دەداتێ) بۆیە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لێرەدا فەرمووی: (مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنِّي) هەركەسێك غەش بكات (واتە: خیانەتو فێڵ بكات) لە من نیە، واتە: لەوسیفەتەدا، با خۆی بە شوێنكەوتووی منو پەیڕەوی منو ئۆممەتی من نەزانێ نەك لە هەموو شتێكدا، دیارە كەسێك لە هەموو شتێكدا غەش بكات، بە تەئكید مانای وایە لە هەموو شتێكدا پەیوەندیی بە پێغەمبەرەوە نیە!.

## حەوتەم: سووربوون لەسەر پاراستنی ماڵ و سامانی گشتی:

یەكێكی دیكە لە ئاكارەكانی كاربەدەستان و حوكمڕانان، ئەوەیە،كە بە تەنگ ماڵ و سامانی خەڵكەوە بنو، ماڵ و سامانی خەڵك، بەهی خۆیانو كوڕو بنەماڵەو خزم و كەسو دەست و پێوەندیان نەزانن، ماڵو سامانی خەڵك بە هی خەڵك بزانن، خۆشیان بە ئەمیندار بزانن، جگە لەو ئەندازەیەی، كە بە شێوەی ڕەسمیو یاسایی دەیان درێتێ، ئەوی دیكە هەمووی لە خۆیان و لە دەوروبەریانی بە قەدەغە بزانن، نەك پێیان وابێ،ئەوە غەنیمەتەو لە خەڵكیان گرتوە، دەستكەوتێكەوكەوتۆتە دەستیانو (شاپو گوپی پێ لێ بدەن)، وەك لەم ئایەتو فەرمایشتانەوە دیارە:

١/ خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) لە سووڕەتی (الفرقان) ئایەتی (٦٧)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامٗا ﴿٦٧﴾ ﴾ واتە: (بەندەكانی خوای بەبەزەیی) ئەوانەن، كە كاتێك كە دەبەخشن ومـاڵو سامان خەرج دەكەن، نەزێدەڕۆیی دەكەنو، نەچرووكییو دەستقوو چاندنیش دەكەن، بەڵكو لەو نێوانەدان، (نە دەستبلاّ ونو نە چنگ قووچاون، بەڵكو لە شوێنی خۆیداو بە ئەندازەی خۆی خەرج دەكەن).

٢/ لەو بارەشەوە با ئەو فەرموودەیە بێنین: { **عَنْ أَبِی هُرَیْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ "صَلَى اللهُ عَلَیهِ وَسَلَم": «إِنَّ اللهَ یَرْضَی لَکُمْ ثَلاَثًا وَیَکْرَهُ لَکُمْ ثَلاَثًا فَیَرْضَی لَکُمْ أَنْ تَعْبُدُوهُ وَلاَ تُشْرِکُوا بِهِ شَیْئًا ، وَأَنْ تَعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللهِ جَمِیعًا وَلاَ تَفَرَّقُوا ، وَیَکْرَهُ لَکُمْ قِیلَ وَقَالَ وَکَثْرَةَ السُّؤَالِ وَإِضَاعَةَ الْمَالِ»**}(أخرجه أحمد برقم: (٨٧٨٥)، ومسلم برقم: (١٧١٥))، واتە: خوا، سێ شتی بۆ ئێوە لەلا پەسەندن، سێ شتیشی لە لا ناپەسەندن: ڕازییە لێتان، کە بیپەرستن‌و، هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشی، دەست بە ڕێسمانی خوا بگرن و پەرتەوازە نەبن ، پێشی ناخۆشە بۆ ئێوە: گوتراو گوتی: (بە دوای قیل‌و قال کەوتن)، زۆر پرسیار کردن، ماڵ بە هەدەردان.

٣/ کۆتا فەرمایشت لەو بارەوە ئەوەیە، کە پێغەمبەر "صَلَى اللهُ عَلَیهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: (**مِنْ أَخْوَنِ الْخِیَانَةِ تِجَارَةُ الْوَالِي فِي رَعِیَّتِهِ**) (أخرجه الطبراني في مسند الشامیین برقم: (١٣٢٣)، وَحَسَّنَهُ السیوطي، ولکن ضَعَّفَهُ الألباني في ضعیف الجامع برقم: (٥٢٨٠)، واتە:خراپترین جۆری ناپاکیی، بازرگانیی کردنی حوکمڕانە لە ماڵ و سامانی میللەت دا. دەڵێم: بە داخەوە سیاسەتمەدارانی ئێستا بەشێکیان بوونە بازرگان، کاتێك سیاسەتمەدارو حوکمڕانیش دەبێتە بازرگان، بازاڕ بۆ خۆی قۆرخ دەکات و زوڵم لە خەڵك دەکات و بژێویی خەڵك بەدەست خۆیەوە دەگرێ و لەبەرانبەرکڕینی ئیرادەیان دا، (قوت لا یموت)یان پێدەدا!! کە ئەوە پێغەمبەری خوا "صَلَى اللهُ عَلَیهِ وَسَلَم" بە پیسترین جۆری خیانەتی لە قەڵەم داوە.

کەواتە: کاتێك حوکمڕان لە جیاتی بەتەنگ موڵك‌و سامانی گشتییەوە بوون‌و پارێزگاریی لێکردنی، بە پێچەوانەوە تەماع لە ماڵ‌و سامانی کۆمەڵگا دەکات، تەنانەت ئەگەر لە ڕێی بازرگانیشەوەبێ - کە شتێکی ڕەوایە- ئەوە بە ناپاك (خائن)و موخەننەت دادەنرێ بەرانبەر بەخەڵك‌و کۆمەڵگا، بەڵام ئەدی ئەگەر بە نوێژی نیوەڕۆ دەست بەسەر موڵك‌و سامانی گشتیدا بگرێ‌و، هەتا بنانگوێی بە دزیی‌و گەندەڵیدا بچێتە خوار،وەك لە هەندێك بەرپرس‌و حوکمڕانی ئەم ڕۆژگارەی دەبینین؟! دیارە ئەوە پێویستی بە پێناسەیەکی تایبەت دەکات!

## هەشتەم: خۆنەشاردنەوە لە خەڵك و جەماوەر:

ئەوە کە کاربەدەست و حوکمڕانان، هەمیشە لە نێو خەڵکدا بن و، ئاگایان لێیان بێ و خۆیان لێ نەشارنەوە، لێیان نەچنە (بورجی عاجیەوە)، یەکی دیکەیە لە سیفەت و ئاکارە پێویستەکانی کاربەدەست و حوکمڕانانی کۆمەڵگای مسوڵمان، لەهەر پێگە و ئاستێکدا بن، بە تایبەت مەبەست لێرەدا خۆ نەشاردنەوەیە لە خەڵکی پەککەوتەو بێهێزو ئاتاج، ئەگەرنا، زۆر کەسی دیکە هەیە، کە بێ منەتە لەوەی کاربەدەست و حوکمڕانان ببینێ، یان نەبینێ و هیچ پێویستیی پێیان نیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە بەرپرسان خۆیان لە خەڵکی ئاتاج و هەژارو بێ دەرەتان و پەککەوتەو خاوەن پێداویستی تایبەت و ئەوانە نەشارنەوە، کە بەداخەوە زۆرجارکاربەدەست و حوکمڕانان، دەرگایان ئاوەڵایە بۆ کەسانێك، کە هیچ پێویستییان پێیان نیە، بەڵام دەرگایان دادەخەن بەڕووی کەسانێکدا کە پێویستییان بەهاوکارییانەو لە سەریشیان پێویستە، کە هاوکارییان بکەن و گرفت و کێشەکانیان چارەسەر بکەن.

ئنجا با لەو بارەوە دوو دەقی سوننەتی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بێنینەوە:

١/ پێغەمبەر "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە یەکێك لە فەرمایشتەکانی دا دەفەرموێ: **{عَنْ مُعَاذٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله** "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم": **«مَنْ وَلِيَ مِنْ أَمْرِ النَّاسِ شَيْئًا، فَاحْتَجَبَ عَنْ أُولِيَ الضَّعَفَةِ وَالْحَاجَةِ، احْتَجَبَ الله عَنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»}** (أخرجه أحمد برقم: (٢٢٤٢٦) تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره)، واتە: هەرکەسێك کاروبارێکی مسوڵمانانی بکەوێتە دەست، بەرپرسێتییەکی خەڵکی پێ بسپێررێ، کەسانێك کە بێهێزن و، کەسانێك کە ئاتاجن، خۆیان لێ بشارێتەوە، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) خۆی لێ پەنهان دەکات.

واتە: وەك چۆن ئەو دەرگا بەڕووی ئەو جۆرە کەسانەدا دادەخات، خواش دەرگا بەڕوویدا دادەخات و لێی ناپرسێتەوە، دیارە بەرپرس، ئەگەر ئیمانی هەبێ، ئەو هەڕەشەیە بەسە بۆ ئەوەی خۆی لە خەڵکی بێهێزو بێچارەو ئاتاج، نەشارێتەوە.

٢/ هەروەها پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە فەرمایشتێکی دیکەدا دەفەرمویٚ: (مَا مِنْ إِمَامٍ أَوْ وَالٍ يُغْلِقُ بَابَهُ دُونَ ذَوِي الْحَاجَةِ وَالْخَلَّةِ[1] وَالْمَسْكَنَةِ إِلاَّ أَغْلَقَ اللَّهُ أَبْوَابَ السَّمَاءِ دُونَ خَلَّتِهِ وَحَاجَتِهِ وَمَسْكَنَتِهِ)(أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٢٥٠٩)، وأبي يعلى في مسنده برقم: (١٥٦٦) تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره)، واتە: هیچ پێشەوایەك نیە، یان هیچ سەرپەرشتیارێك نیە، کە دەرگای خۆی دابخات بەڕووی کەسانی خاوەن پێداویستییدا و، کەسانیٚ، کە کەمو کورپییەکیان هەیە و، کەسانی هەژارو نەدارن، مەگەر خوا دەرگاکانی ئاسمان بە ڕووی پێداویستییەکانیو کەموکورپییەکانیو نەدارییەکانی دا دادەخات. (واتە: لە ڕۆژی دواییدا).

بەڵیٚ، بە ڕاستیی خۆشاردنەوەی بەرپرسان لە خەڵكو جەماوەر، سیفەتێکی زۆر خراپە،کە بەداخەوە زۆر لەحوکمڕان و کاربەدەستانی ئەم ڕۆژگارە وان، کەوەك گوتم: کەسانێك کە هیچ پێویستییان پێیان نیە، هەموو ڕۆژێك فەرموویان لێدەکەنو دەرگایان ئاوەڵایە بۆیان، بەڵام کەسانێك کە پێویستییان پێیانە: کەسانێکی ئاتاجو لێقەوماوو بیٚ دەرەتان، دەرگا بە ڕوویاندا دادەخەن، کە بە تەئکید ئەو سیفەتە، سیفەتی کاربەدەستانی مسوڵمان نیەو، کۆمەڵگای مسوڵمانیش، نابیٚ بە حوکمڕانێتیی کاربەدەستێتی ئەو جۆرە کەسانە ڕازی بیٚ!.

## نۆیەم: داخستنی دەرگای جاسووسی و قسە هێنان و بردن:

حوکمڕانوکاربەدەستی مسوڵمانان، نابیٚ کەس بەسەر کەسەوە بکاتە جاسووسو خەڵك لەیەك دڕدۆنگ[2] بکات، بەڵیٚ، بابزانیٚ هەست و خوستی نێو خەڵك چیە ؟ بەلاّم نەچیٚ خەڵك هانبدا لەسەر جاسووسی بەسەر یەکدییەوە کردن بەناحەق، کە دوایی پیلانو فێڵ لەدژی یەکدی بگێڕنو نەخشەی خراپ بۆ یەکدی دابنێنو بە غەرەزی شەخصی یەکدی تووشی تەڵەو داو بکەن!

---

[1]) الخَلَّة: الحاجة والفقر. المعجم الوسيط ص ٢٥٣.

[2]) دڕدۆنگ کردن: گوماندارو دڵخراپ کردن.

با لەو بارەوە سەرنجی ئەم دەقانە بدەین:

١- ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقُۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوْمًۢا بِجَهَـٰلَةٍ فَتُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَـٰدِمِينَ ۝٦﴾ الحجرات، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئەگەر فاسقێك (لادەرێك) هەواڵێکی بۆ هێنان، ڕوونی بکەنەوە، نەوەك بە نەزانیی کەسانێك تووشی گرفت و کێشەیەك بکەن و لەسەر ئەوە تووشی پەشیمانیی ببن. واتە: ئەگەر هەواڵێکتان پێگەیشت لەفاسقێکەوە، بەر لەوەی کاری پێ بکەن، ساغی بکەنەوەو ڕوونی بکەنەوە. (فاسق هەرکەسێکە فەرزێك بچوێنێ، یان قەدەغەیەك بشکێنێ) و هەر کەسێك گوناهێکی گەورە بکات، پێی فاسق دەبێ، ئەدی کەسێك، کە زەم و غەیبەتی مسوڵمانان دەکاتو نانی ڕاپۆرت نووسین لەسەر خەڵك دەخوات!! بەتەئکید ئەوەش فاسقە، ئەگەر لە فاسقیش خراپتر نەبێ!، کەواتە: ئەو جۆرە کەسانە، نابێ هەواڵەکەیان بەبێ قەیدو شەرت یەکسەر وەربگیرێ ئەگەر گریمان لە دەزگایەکی هەواڵگریی‌و زانیارییشدا دانرابن، بەڵکو پێویستە هەواڵەکە ساغ بکرێتەوە.

٢- لە سوورەتی (النمل) لە ئایەتی (٢٢)دا (هود هود) بە سولەیمان دەڵێ: ﴿...وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ۝٢٢﴾ واتە: لە سەبەئەوە هەواڵێکی جێی دڵنیاییم بۆ هێناوی. واتە: هەواڵێکی ڕێك و ڕاستم بۆ هێناوی، بەڵام ئایا سولەیمان (علیه السلام) بەو قسەیەی هودهود، یەکسەر قەناعەت دەکات؟ نەء، بەڵکو دەڵێ: ﴿سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ۝٢٧﴾ تەماشا دەکەین بزانین ڕاستت کردوە، یاخود لە درۆزنانی؟ واتە: تۆ کە هەواڵەکەت بۆ هێناوین، بێ قەیدو شەرت وەریناگرین، بەڵکو ساغی دەکەینەوە بە شێوازی تایبەتی خۆمان، بزانین ئەو هەواڵە ڕاستە، یان نا؟ ئنجا ئەگەر هەواڵەکە هەڵە بێ، نابێ هیچ ئەنجام گیرییەکی لەسەر بکرێ، نەك وەك ئێوە: هی وا هەیە چوار ساڵ گیراوە، بەڕاپۆرتی درۆو جاسووسیی‌و بە پیلان و فێڵ بۆ دانران، لەلایەن کەسێکەوە، کە غەرەزی شەخصیی هەبووە، دوایی گوتوویانە: هیچت لەسەر نیە! کە بێگومان غەدرو ستەم‌و غەش‌و ناپاکییە لەگەڵ خەڵك‌و میللەتدا، بەڵکو جاری وا هەیە، کە غەرەزی شەخصییش

نیەو، هەر تەصفیە حیساباتی حیزبییە، یاخود وەك دەڵێن: شەڕ بە كۆنە قین دەكرێ، كابرا ڕقیان لێیبووە لەبەر ئەوەی لە ڕووی ئایدۆلۆژییەوە لەگەڵیان نەبووە، یاخود مەترسیی داهاتوو، یان لێی هەبووە، یاخود لەبەر ئەوەی ڕقیان لەو بەرنامەو ڕێبازە بووە، كە ئەو شەخصە هەیبووە، هەر لەبەر ئەوە تووشی گرتن و نارەحەتییان كردوە، بێ ئەوەی كە هیچ بەڵگە و ئیسپاتێكی لەسەربێ، پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لەوبارەوە فەرمایشتی زۆرن، بۆ وێنە:

٣- یەكێك لە فەرمایشتەكانی ئەمەیە: (**لا يُبَلِّغُنِي أَحَدٌ مِنْ أَصْحَابِي عَنْ أَحَدٍ شَيْئاً، فإنِّي أُحِبُّ أَنْ أَخْرُجَ إِلَيْكُمْ وأنَا سَلِيمُ الصَّدْرِ**) (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٧٥٩)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف بهذه السياقة ولبعضه شواهد، وَأَخْرَجَهُ وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٨٦٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٨٩٦) تحقيق الألباني: ضعيف الإسناد، لكن الشطر الثاني منه في القسمة صحيح)، واتە: با هیچ كەس لە هیچ كام لە هاوەڵانمەوە، هیچ شتێكم بۆ نەهێنێ، هیچ هەواڵێكم بۆ نەهێنێ،( كە ببێتە مایەی نیگەرانییم لە هاوەڵە بەڕێزەكانم) چونكە من دەمەوێ لە حاڵێكدا، كە دێمە نێوتان ،سینەم سەلامەت بێ لە بەرانبەرتاندا.

٤- لە فەرمایشتێكی دیكەدا پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: {«**إِنَّكَ إِنِ اتَّبَعْتَ عَوْرَاتِ النَّاسِ أَوْ عَثَرَاتِ النَّاسِ أَفْسَدْتَهُمْ أَوْ كِدْتَ أَنْ تُفْسِدَهُمْ**»}(أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٨٨٨) وأورده الهيثمي في مجمع الزوائد وقال رواه أبو داود وأحمد والطبراني ورجاله ثقات، قال الألباني: صحيح)، واتە: بێگومان تۆ ئەگەر بە دوای عەیب و عاری خەڵك بكەوی، تێكیان دەدەی، یان نزیك دەبێ كەتێكیان بدەی، بۆچی؟ چونكە: ئەگەر كەسێك زۆر بە دوای عەیب و عاری خەڵك بكەوێ، ئەوكاتە خەڵك ڕەنگە لەلای ئەو خۆیان چاك و جوان بكەن، لە حاڵێكدا كە خراپن، بەڵام بۆ بەرچاوی ئەو، كە دەزانن چاودێرییان دەكات، خۆیان چاك دەكەن! ئنجا بەهەر حاڵ بە دوای عەیبی خەڵكدا گەڕان، شتێكی خراپەو خەڵك لە یەكدی دەخاتە گومان و دوودڵییەوە، بەڵام ئەوە هەمووی لە كاتێكدایە ، كە هیچ هۆكارو پاساوێكی مەنتیقیی نەبێ، بەڵام ئەگەر پاساوێكی هەبێ، ئەو كاتە حوكمەكەی

جیایە، وەك پێغەمبەری خوا "صَلَی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَم" لە فەرمایشتێكدا دەفەرموێ: {«الْمَجَالِسُ بِالأَمَانَةِ إِلاَّ ثَلاَثَةُ مَجَالِسَ: سَفْكُ دَمٍ حَرَامٍ ،أَوْ فَرْجٌ حَرَامٌ ،أَوِ اقْتِطَاعُ مَالٍ بِغَيْرِ حَقٍّ»}(أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بـرقم: (٤٨٦٩)، وَالبَيْهَقِيُّ في شعب الإيمان بـرقم: (٢٠٩٥١) وَضَعَّفَهُ الشيخ الألباني)، واتە: كۆڕو مەجلیسەكان ئەمانەتن (واتە: ئەو قسانەی كە تێیاندا دەكرێن دەبێ بپارێزرێن)، جگە لە سێ كۆڕو مەجلیس: كۆڕو مەجلیسێك كە خوێنی حەرامی تێدا بڕیار دەدرێ ، كە بڕێژرێ، (یان باسی قەتلێكی بەناحەقی تێدا دەكرێ كە: فلاّن كەس فلاّن كەسی كوشت، ئەوە ئەمانەت نیەو، دەبێ بگەیەنرێتە شوێنی خۆی)، یان كۆڕو مەجلیسێك كە زینایەكی تێدا بكرێ (یان باسی دەستدرێژییەكی جینسیی تێدا دەكرێ كە بەبەڵگە دەچەسپێ)، یان كۆڕێك كە باسی لێستاندنی ماڵێكی بە ناحەق، باسی دزییەك، باسی پیلانێك دەكرێ كە دزییەك بكرێ، ماڵێك ببردرێ. هەموو ئەوانە پێویستە بە شوێنی خۆیان بگەیەندرێن، بۆ ئەوەی ماڵ و نامووس و نەفسی خەڵك سەلامەت و پارێزراو بێ، واتە: حوكمڕان و كاربەدەستان بۆیان هەیە، كە چاویان هەبێ لە نێو خەڵك داو ئەو شتانەیان پێ بگات، بۆئەوەی ڕێگا بگرن لە لە دەستدرێژیی بۆسەر ماڵ و نەفس و نامووسی خەڵك ، بەڵام نەك بۆ ئەوەی كە یەكدی بە داوەوە بكەن و تەڵە بۆ یەكدی دابنێن، پاشان كابرا نانی جاسووسی و ڕاپۆرت نووسین و درۆ و دەلەسە بخواتو بە پەیژەی غەیبەت و زەم كردنو جاسووسییدا سەركەوێ، حوكمڕان و كاربەدەستەكەش ئەو كەسەی خۆش بوێ، كە زیاتر ماستاوی بۆ بكاتو زەم و غەیبەتی خەڵكی بۆ بكات بە ناحەق، چونكە سەرەنجام ئەو حوكمڕان و كاربەدەستە، چوار دەوری دەتەندرێ بە كەسانی ماستاوچییو خۆڕەپێشكەرو بوودەڵەو هیچ لەباراندا نەبوو، بەكەسانێك، كە هەر ڕق و بوغزی دەخەنە نێو دڵ لەبەرانبەرخەڵك و كۆمەڵگادا،لەلایەكی دیكەشەوە، دنیای بۆ دەكەن بە شامی شەریفو دەڵێن: خەڵك هەمووی تۆی خۆش دەوێ! لە حاڵێكدا، كە ڕەنگە خەڵك هەمووی نەفرینی لێ بكاو ڕقی لێبێ، پێیدەڵێن: قوربان! خەڵك هەمووی چەپڵە بۆ تۆ لێدەداو تۆی خۆشدەوێ، سەرەنجام ئەو حوكمڕانە چەواشەدەبێو كەسانی

خراپ لێی نزیك دەکەونەوەو کەسانی باش و لەباراندا بوو، لێـی دوور دەکەونـەوە! کەسـەرەنجامی ئـەو جـۆرە کەسـانەو ئـەو جـۆرە حوکمڕانانـەش هـەر فـەوتانو سەربەفەتارەت چوونە.

## دەیەم و کۆتایی: ڕێز لێگرتن و هاندانی کەسانی شایستە:

حوکمڕانو کاربەدەستان پێویستە ڕێـز لـە کەسـانی شایسـتە بگـرن، هانیـان بـدەنو زەمینەیان بۆ خۆش بکەن، کە زیاتر گەشە بکـەن و خزمـەت بکـەن، وەك لـەم دەقانـەدا دەردەکەوێ:

١/خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) لە سوورەتی (الكهف) لە ئایەتی (٨٨)دا دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾﴾ دوای ئـــەوەی خـــوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) بـە (ذوالقـرنین) ڕادەگەیـەنێ، کـە ئـەوە دەسـتی تۆمـان ئـاوەڵا کردۆتەوە،کە چاکە لەگەڵ خەڵك بکـەی، یاخودسـزایان بـدەی! زولقەرنـەین دەڵـێ: هەرکەس ئیمانی هەبێو کردەوەی باش بکات، ئەوە پاداشتی چاکی هەیە لە لایـەن خواوە، ئێمەش لەلایەن خۆمانەوە قسەیەکی ئاسانی بۆ دەکەین. واتە: ئەگـەر هـەر قسەیەکی خۆش و هاندانێك و دستخۆشییەك و تەقدیرێکیش بێ، درێغیـی ناکـەین لە هاندانو پشت گرتنیدا بۆ چاکە.

پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە بارەی هاوەڵە بەرێزەکانییەوە (خوا لێیان رازی بێ). بەتایبەتی ئەوانەی کە زۆر لێی نزیك بـوون، شـوێن دەسـتیان دیـارە بـە مێژووی ئیسلام و کۆمەڵگاو دەوڵـەتی ئیسـلامییەوە، زۆر ڕێـزو تەقـدیری بۆیـان پێشانداوە، بۆ وێنە:

٢/ لەبارەی (أبو بكر الصديق)ەوە (خوا لێی رازی بێ)، فەرموویەتی: {«إِنَّ أَمَنَّ النَّاسِ عَلَيّ فِي مَالِه وَصُحْبَتِهِ أَبُو بَكْرٍ وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلاً لاَتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلاً»} (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٦٣٢٠) عَنْ عَبْدَ الله بْنَ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

واتە: بێگومـان لەنێو کەسانێکدا، کە لە هەموو کەس زیاتر چاکەیان بەسەر منــەوە هەیە لە ماڵی داو لە هاوەڵێتیی دا، ئەبوبەکرە ،وە ئەگەر من هیچ کەسم کردبایـە

بە خەلیل، (واتە: کەسێك کە لە هەموو کەسم خۆشتر بوێ) ئەبو بەکرم دەکردە خەلیل. بەڵام برامەو هاوەڵمە (واتە: کەسێك کە هەموو خۆشەویستییەکەم بۆ ئەوە، تەنها خوایە) کەواتە: پێغەمبەری خوا، پاش خوا لە نێو هاوەڵان دا ئەبوبەکری لەهەموویان خۆشتر ویستوە. هەڵبەتە ئەوەش وەفاو پێزانینو تەقدیرێکی گەورەیە لە پێغەمبەری خواوە بۆ ئەو هاوەڵە بەرێزو خۆشەویستو دڵسۆزەی خۆی.

٣/ دەربارەی (عمر بن الخطاب)یش( خوا لێی ڕازی بێ)، فەرمایشتی زۆرن، لە یەکێکیان دا فەرموویەتی: (**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا لَقِيَكَ الشَّيْطَانُ قَطُّ سَالِكًا فَجًّا، إِلاَّ سَلَكَ فَجًّا غَيْرَ فَجِّكَ**) (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٤٨٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٣٩٦))، واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هیچ کاتێ شەیتان نەگەیشتۆتە تۆ (ئەی عومەر)، کە ڕێگایەکت گرتبێ، مەگەر شەیتان ڕێیەکی دیکەی گرتوە، غەیری ڕێی تۆ. واتە: نەیوێراوە بە ڕێگای تۆدا بێتو لێت ترساوە.

٤/ دەربارەی (عثمان بن عفان) (خوا لێی ڕازی بێ)، ڕۆژێك پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە سەر بیرێك دانیشتوەو لاقی پێدا شۆڕکردۆتەوە و نەعلەکانیشی داون بەبیلال، وە پێی فەرمووە: هەرکەسێك پێی گەیشتی، موژدەی بەهەشتی پێ بدەو با بێتە ژوور، ئنجا کاتێك عوسمان دێ پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: (**ائْذَنْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ، عَلَى بَلْوَى تُصِيبهُ**)(أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٦٧٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٤٩٣))، واتە: مۆڵەتی بدە، بابێتە ژوور، موژدەشی بدەیە بەبەهەشت، لەگەڵ بەلاو ناڕەحەتییەکدا، کە تووشی دێ. ئەوە بوو کە بە مەزڵوومی شەهید کرا (خوا لێی ڕازی بێ).

٥/ لەبارەی (علي بن أبي طالب)ەوە (خوا لێی ڕازی بێ) : (**عَنْ سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ أَنَّ رَسُولَ الله صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَوْمَ خَيْبَرَ: لأُعْطِيَنَّ هَذِهِ الرَّايَةَ رَجُلاً يَفْتَحُ الله عَلَى يَدَيْهِ، يُحِبُّ الله وَرَسُولَهُ وَيُحِبُّهُ الله وَرَسُولُهُ**) (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٩٤٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٤٠٦))، واتە: سەهلی کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ڕۆژی خەیبەر فەرمووی: ئەم ئالایە دەدەمە دەست پیاوێك، کە خوا لەسەر دەستی ئەو، دەروازەی ئەم قەلایە مان بۆ دەکاتەوە (دیارە قەلایەك بووە

لێیان عاصیٚ بووە) ،کە خواو پێغەمبەری خوای خۆش دەوێن، خواو پێغەمبەری خوایش ئەویان خۆشدەویٚ، ئنجا دواییش ئالأیەکە دەداتە دەست عەلی کوڕی ئەبو تالیب (خوا لێی ڕازی بیٚ).

٦/ دەربارەی دایکی ئیمانداران (**عائشة**) هاوسەری بەڕێزی فەرموویەتی: (**وَإِنَّ فَضْلَ عَائِشَةَ عَلَى النسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ**)(أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٧٧٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٤٤٥))، واتە: چاکیی عائیشە بەسەر ئافرەتانی دیکەوە، وەك پەسندیی خواردنی (**ثريد**) وایە بەسەر جۆرەکانی دیکەی خواردن دا. کە دیارە عەرەب خواردنی (**ثريد**)- کە ئێمە تشریب یان تێگوشینی پیٚ دەڵێین- زۆر پیٚ خۆشە، یان دیارە ئەو کاتە (**ثريد**) بە شێوەیەکی تایبەت سازکراوە، نەك بەو شێوەیەی، کە ئێستا هەیەو باوە.

٧/ دەربارەی (خالد بن الوليد) (خوا لێی ڕازی بیٚ)، فەرموویەتی: (**نِعْمَ عَبْدُ الله خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ سَيْفٌ مِنْ سُيُوفِ الله**)أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٣٨٤٦) وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيب، وَقَالَ الشيخ الألباني: صحيح)، واتە: باشترین بەندەی خوا، خالیدی کوڕی وەلید، شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خوا. وەك دەبینین پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" هاوەڵانی بەڕێزی خۆی داوەو ستایشی کردوونو لەسەر کردەوە باشەکانیانو خەسڵەتە پەسندەکانیانو هەڵوێستە جوامێرەکانیان تەقدیری کردوون، تاکو بەردەوام بنو باشتریش بن.

## بڕگەی دووەم: ئەدەب و ڕەوشتە بەرزەکانی خەڵك لە گەڵ حوکمڕان و کاربەدەستان دا:

وەك چۆن حوکمڕان و کاربەدەستان، کە لە دە خاڵی ڕابردوودا باسمان کردن، لەسەریان پێویستە خۆیان بەکۆمەڵێك خەسڵەت وڕەوشت و بەهای بەرز بڕازێننەوەو بەو ڕەوشتە بەرزانە مامەڵە لەگەڵ خەڵك و کۆمەڵگادا بکەن، خەڵك و کۆمەڵگاش بەهەمان شێوە، لەبەرانبەردا لەسەریان پێویستە کۆمەڵێك ڕەوشتی بەرز و جوان و ئاکاری پەسەند ڕەچاو بکەن، بۆ مامەڵە کردنیان لەگەڵ حوکمڕان وکاربەدەستاندا، کە پێم وایە ئەم پێنجە بنەڕەتییەکانیانن:

## یەکەم: گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی لەبازنەی شەریعەتدا:

خـەڵك و كۆمـەڵگاو هاووڵاتییـان، پێویسـتـە گوێڕایـەڵ بـن فەرمانبـەر بـن بـۆ كاربەدەستانی خۆیان، هەڵبەتە لە جوغز و بازنەی شەریعەتدا، وەك پێشتر لە كاتی توێژینەوەی بنەمای هەشتەم دا بەدرێژیی باسمان كرد.

ئەمەش چەند دەقێكی شەریعەت لەو بارەوە:

١- خوای بەرزو مەزن كۆمەڵگای مسوڵمانانی دواندوەو، فەرمووبـەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ ...﴿٥٩﴾﴾ (النسـاء) واتـە: ئـەی ئـەو كەسانەی ئیمانتان هەیە! فەرمانبەریی خوا بكەن و فەرمانبەریی پێغەمبەر بكـەن، وەهی كاربەدەستانێك كە لە خۆتانن.

٢- پێغەمبەری خـواش "صَلَى اللهُ عَلَيـهِ وَسَلَمَ" لـە فەرمایشـتێكی دا فەرموویـەتی: (**السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ، مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِمَعْصِيَةٍ" فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَـمْعَ وَلاَ طَاعَـةَ**) (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بـرقم: (٧١٤٤)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (١٨٣٩))، واتە: ئینسانی مسوڵمان گوێگرتن‌و بە قسەكردن (بیستن‌و فەرمانبـەریی كردن)ی لەشتێكدا، كە حەزی لێدەكاو، لە شتێكیشدا كە حەزی لێناكـا، لەسـەری پێویستە، مەگەر فەرمانی پێ بكرێ بە سەرپێچیی (خوا)، ئنجا ئەگـەر فـەرمانی پێكرا بەسەرپێچیی، ئەوە نە گوێ دەگرێ‌و، نە جێبەجێش دەكا. یـانی: ئـەو كاتـە بیستن‌و بە قسەكردنی، نەك هەر لەسەری پێویست نیە، بەڵكو بۆشی دروست نیە.

٣/ لە فەرمایشتێكی دیكەدا پێغەمبەری خـوا "صَلَى اللهُ عَلَيـهِ وَسَلَمَ" فەرموویـەتی: {«**إِنْ أُمِّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ مُجَدَّعٌ** {**حَسِـبْتُهَا قَالَـتْ أَسْـوَدُ**} **يَقُـودُكُمْ بِكِتَـابِ اللهِ تَعَالَى فَاسْمَعُوا لَهُ وَأَطِيعُوا**»}(أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بـرقم: (١٨٣٨))، واتە: ئەگەر كۆیلەكی كونەلووت فش (یان لووت بڕاو، یـان كەمئەنـدام)[١] كرایـە بەرپرسـتان (ڕاویەكـە دەڵێ: پێم وایە گوتی: "دیارە ڕاویەكە ئەوەی، كە لە پێغەمبـەری خـوا "صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ" بیستوویەتی ئافرەت بووە" ئەگەر ڕەش پێستیش بوو) مادام بە كتێبـی

---

[١]) المعجم الوسيط، ص١١٠.

خوا سەرپەرشتییتان بکات،گوێی بۆ بگرن و فەرمانبەریی بۆ بکەن. واتە: کاربەدەست، ئەگەر ڕەش پێست بێ، ئەگەر کۆیلەبێ، ئەگەر نوقسانییەکیشی هەبێ، مادام پابەند بێ بەشەریعەتی خواوە، پێویستە ڕێزی لێبگیرێ و، ئەرکی گوێڕایەڵیی و بەقسەکردنی لەگەڵدا جێبەجێ بکرێ.

## دووەم: ڕێزو حورمەت لێگرتن و پشتگیریی کردنی:

خەسڵەتی دووەم ،کە لەسەر خەڵك و کۆمەڵگا پێویستە بەرانبەر بەحوکمڕان، لە خۆیانیدا بهێننە دی و خۆیانی پێ بڕازێننەوە، بریتیە لە: (ڕێز و حورمەت لێگرتن و پشتگیریی کردن) خەڵك و کۆمەڵگا پێویستە ڕێز و حورمەت لە حوکمڕانەکانی خۆیانو پرسەکانیان بگرن و،پشتگیرییان بکەن، بۆ شتی حەق چەسپاندنی دادگەریی‌و لابردنی ستەمو شتی خراپ، وەك لەم دەقانەدا دەردەکەوێ:

١- خوای گەورە بە پێغەمبەری کۆتایی "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٨﴾ لِّتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٩﴾﴾ واتە: ئێمە تۆمان ناردوە، کە چاودێر بی بەسەر خەڵکەوە،وە مژدە دەر و ترسێنەر بی، تاکو بڕوا بێنن بە خواو بە پێغەمبەرەکەی و، ڕێزی لێبگرن (یاخود: سەری بخەن) و[1] بەمەزنی بگرن،وە بەیانیان و ئێواران خوا بە پاك بگرن.

٢- هەروەها لە سووڕەتی (الأعراف)دا فەرموویەتی: (...فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾﴾ واتە: ئەوانەی کە ئیمانیان پێ هێناوە، (واتە: بە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" وە یارمەتییان داوەو پشتیان گرتوەو سەریان خستوەو شوێن ئەو ڕووناکییە کەوتوون، کە لە گەڵی نێردراوە، ئا ئەوانە سەرفرازن.

[1]) المعجم الوسيط، ص ٥٩٨.

٣- پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" فەرموویەتی: {«إِنَّ مِنْ إِجْلَالِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ إِكْرَامَ ذِي الشَّيْبَةِ الْمُسْلِمِ وَحَامِلِ الْقُرْآنِ غَيْرِ الْغَالِي فِيهِ وَلاَ الْجَافِي عَنْهُ وَإِكْرَامَ ذِي السُّلْطَانِ الْمُقْسِطِ»}(أخرجه ابْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٣٢٥٦١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٨٤٣) قال الشيخ الألباني: حسن)، واتە: لە ڕێز لێگرتنو بەگەورە گرتنی خوایە، کە ڕێز بگیرێ لە مسوڵمانی سەرسپی (واتە: مسوڵمانێك کە کەتۆتە تەمەنەوە) و هەڵگری قورئان، کە نەتێیدا زۆر ڕۆچووە و تێپەڕاندوە، نە خۆی لێ دوور گرتوە (واتە: کەسێك،کە بەڕاستیی قورئان هەڵدەگرێ و چاك لێی تێگەیشتوەو پێوەی پابەندەو تێیدا تووشی تێپەڕاندن و بەزایەدان نەبووە) وە (لە ڕێزلێگرتنی خوایە) ڕێزگرتن لە حوکمڕانێکی دادگەر.

٤- خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) لە سوورەتی (الحجرات) لە ئایەتی (٢)دا بە ئیمانداران دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ﴿٢﴾ ﴾ واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! دەنگی خۆتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا بەرز مەکەنەوە، بەدەنگی بڵند مەیدوێنن، وەك لەگەڵ نێو خۆتاندا قسەدەکەن، نەوەك کردەوەکانتان هەڵبوەشێنەوە، بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن، دیارە لێرەدا بەو جۆرە ڕێز لێگرتنی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" تایبەتە بەوەوە، بەڵام بە تەئکید ئەوانەش کە دەوری پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەبینن لە نێو مسوڵماناندا، ئەوانیش پێویستە لەقەدەر خۆیان هەمان ئەو ڕێزەی، کە لە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دەگیرێ، ئەوانیش لەقەدەر خۆیان ڕێزیان لێ بگیرێ و، دەنگیان بەسەر دەنگدا هەڵنەهێندرێ، بەو شێوازە، کە هاوەڵانی ڕێزیان لە پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" گرتوە، مسوڵمانان ڕێز لە حوکمڕانو کارەبەدەستان و قسە ڕۆیشتوانی خۆیان بگرن، مادام لەسەر ڕێی پێغەمبەری خوان "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دیارە هی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە قەدەر خۆیو هی غەیری پێغەمبەری خواش، هەر کەسە لەقەدەر خۆی .

## سێیەم: دڵسۆزیی و بەتەنگەوەبوون:

سیفەتێکی دیکەی خەڵکی مسوڵمان لەگەڵ کاربەدەستان و حوکمڕانانیدا، ئەوەیە کە بۆیان دڵسۆز بن‌و بەتەنگیانەوە بن‌و پەرۆشیان بن، وەك لەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوادا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دیارە، کە فەرموویەتی: {«الدِّينُ النَّصِيحَةُ»، قُلْنَا لِمَنْ؟ قَالَ: «لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ»}(أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٠٥))، واتە: دین بریتیە لە نەصیحەت، (لێرەدا مەبەست لە دین، دینداریی یەو (نصیحة)ش یانی: دڵسۆزیی) گوتمان: بۆکێ؟ فەرمووی: دڵسۆزیی بۆ خواو، بۆ کتێبی خواو، بۆ پێغەمبەرەکەی‌و، بۆ پێشەوایانی مسوڵمانان‌و، بۆ مسوڵمانان بەگشتی.

وشەی: (النصیحة) جارێکی دیکەش گوتوومانە: لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێن: نەصیحەتی کرد،واتە: ئامۆژگاریی کرد، بەلاَم لە ڕاستییدا ئامۆژگاریی (موعظة)یە،کە بەشێکە لە (النصیحة)، چونکە (نصیحة) واتە: دڵسۆزیی، ئنجا تۆ کەسێك کە بۆی دڵسۆزبی، دیارە لە شوێنی خۆیدا ئامۆژگاریی دەکەی، بەلاَم دڵسۆزیی تەنیا بریتی نیە لە ئامۆژگاریی کردن‌و، ئامۆژگاریی بەشێکە لە بەشەکانی دڵسۆزیی، چونکە لە پێناسەی (النصح)دا (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (**النصح تحرِّي فعل أو قول فيه صلاح صاحبه وناصح العسل خالصه**)[1] واتە: (النصح) بریتیە لە لێخەفتان لە قسەیەك، یان کردەوەیەك کە قازانجی خاوەنەکەی تێدایە (هەر کردەوەیەك قازانجی خاوەنەکەی تێدا بێ تۆ لێی بخەفتێی، کە ئەو قسەیە بکات، یان ئەو کردەوەیە بکات، یان ئەو قسەوکردەوەیەی لەگەڵدا بکرێ، ئەوە دڵسۆزییت بۆ نواندوە)، دەشگوترێ: (**ناصح العسل خالصه**) یانی: هەنگوینی ساغ‌و بێ غەش.

---

[1] مفردات ألفاظ القرآن، ص٨٠٨ .

## چوارەم: بەنەرمی و لێزانانە دواندن:

پێویستە هاووڵاتییان‌و خەڵك و كۆمەڵگا، بەنەرمیی و بە لێزانانە كاربەدەستانی خۆیان بدوێنن، وەك لەم دەقانەدا دەردەكەوێ:

١- خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾ ﴾الحجرات، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانەدا هاتوە: ڕۆژێك كۆمەڵێك هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" بەبێ مەوعیدو یەكسەر بانگیان كرد: (**يَا مُحَمَّدُ أُخْرُجْ إِلَيْنَا**)[1]، واتە: ئەی موحەممەد! وەرە دەرێ ئیشمان پێتە! خوای پەروەردگاریش ئەم ئایەتانەی ناردەخوار: بێگومان ئەوانەی لە پشت ژوورەكانەوە (واتە: ژووری هاوسەرەكانییەوە، كەبە تەنیشت مزگەوتەوە بوون) بانگی تۆ دەكەن، زۆربەیان نافامن، ئەگەر سەبریان گرتبایە هەتا بۆ خۆت دەچووی بۆ لایان، بۆ ئەوان باشتر بوو، خوا لێبوردەی بەبەزەییە. كەواتە: پێویستە بەنەرمیی كاربەدەستان بدوێندرێن‌و ڕێزیان لێ بگیرێ.

٢- خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی مووسا (علیه السلام)و فیرعەون دا، كاتێك كە مووساو هاروونی برای (علیهما السلام) بۆ لای فیرعەون دەنێرێ، فەرموویەتی: ﴿ ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ ﴾طه، واتە: بڕۆن بۆی لای فیرعەون، یاخی بووە. قسەیەكی نەرمی لەگەڵدا بكەن، بەڵكو وەبیری بێتەوە، یاخود بترسێ، واتە: قسەی نەرم ونیان‌و شێوازی جوان، زیاتر مەزەنەی ئەوەی لێ دەكرێ، كە بەو هۆیەوە قسەكەتان لێوەر بگرێ.

---

[1] عن أبي سلمة بن عبدالرحمن عن الأقرع بن حابس، أنه أتى النبيَّ صلى الله عليه وسلم فقال: يا محمد! اخرج إلينا. فلم يجبه فقال: يا محمد! فإن حمدي زين، وإن ذمي شين، فقال: (ذاك الله). فأنزل الله تعالى: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِنْ وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْقِلُونَ﴾. رواه أحمد في المسند (٣/٤٨٨)، والطبراني في جامع البيان (٢٦/٧٧) والطبراني في المعجم الكبير: ٨٧٨، قال مؤلفا (الإستيعاب في بيان الأسباب) ج٣ ص٢٦٣: وقلنا، وسنده صحيح.. وله شاهد، سنن الترمذي: ٣٢٦٧، والنسائي: ٥٣٥.

٣- هەروەها پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" لە فەرمایشتێکیدا دەفەرموێ: {مَنْ أَرَادَ أَنْ يَنْصَحَ لِسُلْطَانٍ بِأَمْرٍ، فَلاَ يُبْدِ لَهُ عَلانِيَةً، وَلَكِنْ لِيَأْخُذْ بِيَدِهِ فَيَخْلُو بِهِ، فَإِنْ قَبِلَ مِنْهُ فَذَاكَ، وَإِلاَّ كَانَ قَدْ أَدَّى الَّذِي عَلَيْهِ لَهُ}(أَخْرَجَهُ أحمد برقم: (١٥٣٦٩)، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره دون قوله : من أراد أن ينصح لسلطان بأمر ...فحسن لغيره وهذا إسناد ضعيف، وَلكن صَحَّحَهُ الألباني في (ظلال الجنة) برقم: (١٠٩٧))، واتە: هەرکەسێك ویستی دڵسۆزیی بنوێنێ بۆ خاوەن دەستەڵاتێك، با بەئاشکرا پێی نەڵێ، بەڵکو با دەستی بگرێو بە پەنامەکییو بە جیا پێی بڵێ، ئنجا ئەگەر لێی وەرگرت ئەوە باشە، ئەگەر لێشی وەرنەگرت، ئەوە ئەرکی سەر شانی خۆی بەرانبەر ئەنجام داوە. بەڵام هەڵبەتە جاری واش هەیە کە حوکمڕانەکە (فاسق بالجهر) دەبێتو خراپەو ستەمەکەی دەنگ دەداتەوە ، ئەو کاتە حوکمی ئەو مەسەلەیە دەگۆڕێ، بەڵام بە ڕاستیی بەشێوەی پەنامەکییو تایبەتیی، ئامۆژگاریی کردنو دڵسۆزیی بۆ نواندن، باشترو کاریگەر ترە، مەگەر حاڵەتەکە وابێ پێویست بکات ئاشکرا بکرێو دەنگی لێ بهێندرێ، ئەو کاتە حوکمەکەی جیایە .

## پێنجەم: هاوکارییکردنی لە چاکەداو گێڕانەوەی لە خراپەو هەڵە:

خەسڵەتی پێنجەمو کۆتایی: هاوکاریی کردنی لە چاکەدا و گێڕانەوەی لە خراپە و هەڵە، ئەمیش ڕەوشتێکی دیکەی بەرزو جوانە، کە دەبێت هاوولاتییانو خەڵكو کۆمەڵگا لە گەڵ کاربەدەستان و حوکمڕاناندا ڕەچاوی بکەن، وەك (أبو بكر الصديق) یەکەمین جێ نشینی پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" دوای هەڵبژاردنی لەیەکەمین وتاریدا گوتی: (أَمّا بَعْدُ أَيّهَا النّاسُ فَإِنّي قَدْ وُلّيت عَلَيْكُمْ وَلَسْت بِخَيْرِكُمْ فَإِنْ أَحْسَنْت فَأَعِينُونِي، وَإِنْ أَسَأْت فَقَوّمُونِي)[1] واتە: پاش ستایش بۆ خوای بەرزو مەزن، ئەی خەڵکینە! من بەسەرتانەوە کراومە سەرپەرشتیارو بەرپرس، بەڵام لە ئێوە باشتر نیم، ئنجا ئەگەر چاکەم کرد، هاوکارم بن، ئەگەر خراپەم کرد، ڕاستم بکەنەوە.

لە کۆتایی ئەم توێژینەوەشدا دەڵێین: وەك دەبینین سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی،

---

[1]) السيرة النبوية لإبن هشام، ج٤ ص٣٩٣.

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەوەیە، کە تێکهەڵکێشە لەگەڵ ڕەوشت وئەدەب و بەها بەرزو پەسەندەکاندا، بۆیە پێویستە هەرکام لە حوکمڕانو کاربەدەستان،وە خەڵكو هاووڵاتییان، خۆیان بەو ئەدەبو ڕەوشتو بەها بەرزو جوانانە بڕازێننەوە، بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ یەکدا، چونکە ئامانجی هەموویان: حوکمڕانو کاربەدەستان و خەڵكو کۆمەڵگا، بریتیە لە گوزەراندنی ژیانێکی خواپەسەندانە لەسەر زەوی، کەواتە: دەبێ هەر کامیان دەستبارگرو هاوکاری ئەوی دیکەبێ، دیارە پێشتریش باسمان کرد، کە بناغەی فیکریی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی، بریتیە لە بووناسیی ئیسلامییو ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی ، سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی لەو دوانەوە هەڵدەقوڵێ، ئنجا ئەگەر یەکێکیش بپرسێ: ئەدی پەیوەندیی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی لەگەڵ خواپەرستیی (**عیبادة**)دا چیە؟

دەڵێین: لە ڕاستیدا دەوڵەتداریی‌و حوکمڕانیی، جۆرێکەو بەشێکە لە خواپەرستیی، بە ماناو چەمکی فراوانی خواپەرستیی، وەك خوا (سُبحانَهُ وتَعالى) دەفەرموێ: ﴿ ..إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾ یوسف، کە دیارە لەسەر زمانی (یوسف) (علیه السلام) دەفەرموێ: حوکمڕانیی، تەنیا هی خوایە، فەرمانی کردوە تەنیا ئەو بپەرستن (واتە: تەنیا کاتێك بەس خوا دەپەرستن، کە تەنیا خوا حاکمتان بێو بەس ئەو حەڕام و حەڵاڵتان بۆ دیاریی بکاتو تەنیا ئەمرو نەهییتان ئاڕاستە بکات) ئا ئەوە دینداریی ڕاستەقینەیە ، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن. هەروەها خوا دەربارەی جوولەکەو نەصرانییەکان فەرموویەتی: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٣١﴾ ﴾التوبة، واتە: جوولەکەو نەصرانییەکان، زاناو گۆشەو نشینەکانی خۆیان کردە پەروەردگارانی خۆیان لەجیاتی خوا، هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەمیشیان کردە پەروەردگاری خۆیان، لە حاڵێکدا فەرمانیان پێ کرابوو، کە تەنیا یەك پەرستراو بپەرستن، بێجگە لەو، هیچ پەرستراو نین، پاکیی بۆ خوا لەوەی کە دەیکەنە

هاوبەشی، دیارە پێشتریش باسمان کرد کە (أحمد و الترمذي و ابن جرير) لە (عدي بن حاتم الطائي) دەگێڕنەوە، کە کاتێك دەچێتە خزمەت پێغەمبەری خوا "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" و خاچێکی زیوی لەملدایە، پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوە ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ عەدیی دەڵێ: گوتم: (**إِنَّهُمْ لَمْ يَعْبُدُوهُمْ**) ئەوان زاناکانو گۆشەگیرەکانی خۆیانیان نەدەپەرست (ئێمە ئەوانمان نەدەپەرست!) پێغەمبەری خواش "صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَم" فەرمووی: (**بَلَى إِنَّهُمْ حَرَّمُوا عَلَيْهِمْ الْحَلاَل وَأَحَلُّوا لَهُمْ الْحَرَام فَاتَّبَعُوهُمْ فَذَلِكَ عِبَادَتهمْ إِيَّاهُمْ**) واتە: با، ئەوانە حەڵاڵیان لێ حەرام دەکردنو، حەرامیشیان بۆ حەڵاڵ دەکردن، ئەوانیش شوێنیان دەکەوتن، ئەوەش خوا پەرستیی و بەندایەتیی ئەوان بوو بۆ ئەو زاناو ڕاهیبانەیان[1].

لە کۆتاییدا دەڵێین: بێگومان بۆ توێژینەوە دەربارەی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی (**نظام الحكم في الإسلام**) لێرەدا نەهاتووینە کۆتایی، بەڵکو جارێ تەنیا دە (١٠) بنەما گشتییو سەرەکییەکانیمان خستوونە ڕوو، خوا پشتیوان بێ لە تەوەرەی داهاتوودا باسی هەرسێ دەستەڵاتەکەی نێودەوڵەتی ئیسلامی دەکەین: دەستەڵاتی یاسادانان، دەستەڵاتی جێبەجێ کردن، دەستەڵاتی دادوەریی.



[1] ) المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير. ص ٥٦٣.

ISLAM AND THE STATE

## ئەم کتێبە

بەهەرچوار تەوەرەکەیەوە لێکۆڵینەوەیەکی نەفەس درێژانەیە لەبارەی دەوڵەتداریی و حوکمرانییەوە لەئیسلامدا و، وەڵامی چەند پرسیارێکی گرنگی لەوبارەیەوە گرتۆتە خۆی:

١| ئایا ئیسلام بەسروشت دەوڵەت و قەوارەی سیاسیی دەخوازێ؟

٢| ئایا تایبەتمەندییەکانی قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا چی و چین؟

٣| ئایا بنەمایەکانی سیستەمی حوکمرانیی ئسلامیی چەندن و چۆنن؟

٤| ئایا سێ دەسەڵاتەکانی: یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەریی لەئیسلامدا چۆنن و سنوورو صەلاحەتیان چییەو چۆنە؟

٥| ئایا نامسوڵمانان لە دەوڵەتی ئیسلامییدا چۆن تەماشایان دەکرێ و، چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ؟

ئەمانەو گەلێک پرسیارو ئیشکالی دیکەش لەم کتێبەدا، وەڵام دراونەتەوەو چارەسەر کراون.





نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شیرین پالاس
Mob:00964 750 460 51 22
Tel: 0964 750 25 18 138
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com



